# دیوانی سالم

## عەبدوڕڕەحمان بەگی صاحێبقڕان



**بەرگی دووەم**

ساغکردنەوە و لێکدانەوە
مەلا عەبدولکەریمی مودەڕریس
فاتیح عەبدولکەریم
محەمەدی مەلا کەریم

ئامادەکردن
سدیق ساڵح

# دیوانی سالم

## عەبدوڕڕەحمان بەگی صاحێبقڕان

ساغکردنەوە و لێکدانەوە
مەلا عەبدولکەریمی مودەڕریس
فاتیح مەلا عەبدولکەریم
محەمەدی مەلا کەریم

ئامادەکردن
سدیق ساڵح

**بنکەی ژین**

**سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح**


زنجیرە: ۱۷٤

کتێب: دیوانی سالم، عەبدوڕڕەحمان بەگی صاحێبقڕان

ساغکردنەوە و لێکدانەوە: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، فاتیح مەلا عەبدولکەریم و محەمەدی مەلا کەریم

ئامادەکردن: سدیق ساڵح

بەرگ: دووەم

پیتچنین: سیروان خەلیل

لەقاڵبدانی ناوەڕۆك: لاس

ئامادەکردنی کۆمپیووتەریی دەستنووس: ساڵح بێچار

لەقاڵبدانی دەستنووس: یادگار ئەوڕەحمان

ڕووبەرگ: قادر میرخان

خەتی ڕووبەرگ: ئەحمەد سەعید

ژمارەی سپاردن: ۱۸٥٤ی ساڵی ۲۰۱٥ی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان





**بنکەی ژین**

بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی

عیراق: هەرێمی کوردستان، سلێمانی؛ شەقامی ۱۱ پیرەمەگروون، گەڕەکی ۱۰۷ بەرانان، تەلاری ژین- تەنیشتی مزگەوتی شێخ فەرید

تەلەفۆن: ۱- ۰٥۳۲۳۰۱۲۹۲ ئاسیا: ۰۷۷۰۱٤۸٤٦۳۳ یان ۰۷۷۰۱٥٦٥۸٦٤ کۆرەك: ۰۷٥۰۱۱۲۸۳۰۹ ژ. سندووقی پۆست: ۱٤ بەختیاری

پێگە: www.binkeyjin.com ئارنیشانی ئەلکترۆنی: info@binkeyjin.com



**بەڕێز خاتوو هێرۆ ئیبراهیم ئەحمەد هاوکاریی لەچاپدانی ئەم کتێبەی کردووە**

# پیتی (ۆ)

## -١- (*)

عاقیبەت لەذذەتی دا کەشمەکەشی زەحمەتی تۆ
میننەتی نایە سەرم، مەیمەنەتی مەینەتی تۆ (١)
میهری ڕووت بەسکی لە دڵمایە، شەوی هیجرانت
نیمە یەك ذەڕڕە لە ڕۆژا هەوەسی ڕوئیەتی تۆ (٢)
تۆ بە چاو عەینی غەزالیی و لەچاو عاشقی زار
شێری خوونرێزی شکاری نییەتی صەولەتی تۆ (٣)
مەردومەك دێ لە نەظەرا وەکوو موویێکی ضەعیف
مونعەکیس بوو کە لەنێو دیدەیی من، قامەتی تۆ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە بەشی (غزلهای جدیده)ی (مان)دا هەیە.
کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.
(١) مەیمەنەت: موبارەکی، پیرۆزی.
واتە: گێرە و کێشەی زەحمەت و ئازاری تۆ، لە ئەنجامدا بوو بە خۆشی بۆ من. پیرۆزیی مەینەتی تۆ، منەتی نایە سەرم کە هەمیشە لە دڵمای و لەم جیا نابیتەوە. دیارە مەینەتی یار بۆ سالم ڕەحمەتە.
(٢) میهر: خۆر، خۆشەویستی.
واتە: خۆری ڕوومەتت لە شەوی جیاییدا ئەوەندە لە دڵدا جێگیرە، لە ڕۆژدا ئارەزووی بینین ناکەم. من لە شەودا ڕۆژم هەیە، لە جیاییدا خۆری ڕوخساری تۆ لە دڵمدا جێگیرە.
یان واتە: خۆشەویستیت لە شەوی جیاییدا لە دڵمدا ئەوەندە جێگیرە، حەز ناکەم ڕۆژ ببێتەوە.
نیوەی یەکەمی بەیتەکە لەنگە.
(٣) خوونرێز: خوێنڕێژ. صەولەت: هەڵمەت.
واتە: تۆ بە چاو خودی ئاسکی، بەڵام لەچاو عاشقی مات و مەلوولدا لە شێری خوێنڕێژی شکاری بەهەڵمەتتری.
(٤) مەردومەك: گلێنەی چاو.

**نەمەکت حوججەتی خووبی بو لەسەر صەفحەیی ڕوو**
**خاتیمەی حوسنە کە وا «صَحّ»ەیی لێ دا، خەتی تۆ (٥)**
**فیکرهیچی، کە لە لات نوقطەیە، "سالم!"، دەهەنی**
**هەتە عەقڵێکی درشت، ئەر ئەمەتە دیققەتی تۆ! (٦)**

واتە: کە وێنەی باڵای تۆ هاتە ناو گلێنەی چاوم، گلێنەکە بە کاریگەریی باریکیی ناوقەدی تۆ، وەك موویەك دەینواند.

(٥) نەمەك: خوێ. حوججەت: بەڵگە. خاتیمەی حوسن: ئەوپەڕی جوانی، دواچۆڕی جوانی. «صَحّ»ە: وشەیەکە یا ڕستەیەکە لە کاتی نووسینەوەی دەقەکەدا لەبیرچووە، دوایی لە نزیکی دەقە ناتەواوەکەوە لە پەراوێزدا نووسراوەتەوە و وشەی ڕاستە «صحّ» لە کۆتاییی دەدرا. یانێ ڕستەکە هەڵەی تێدا نییە و بە هەڵە بە چەوت و هەڵە دانراوە.

واتە: سوێری و خوێداریی تۆ بەسەر لاپەڕەی ڕووتەوە، بووە بە بەڵگەی سەلماندنی جوانیت. ئەمە مانای سەرەنجام خێرییە بۆ من کە خەت و خاڵی تۆ بووەتە بەڵگەی ڕاستی و دروستیی داواکەم، کە دەڵێم تۆ زۆر جوانی و شیاوی ئەوەی ئێمە خۆمان بکەین بە قوربانت.

(بوو) بڕگەیەکی کورتە، بۆیە بە (بو) نووسراوە.

(٦) فیکرهیچ: بیر و بۆچوون پووچەڵ و بێبناغە.

واتە: سالم! بیر و زەینی تۆ شتێکی هیچوپووچە، کە لات وایە دەمی یار خاڵە! ئەگەر وردبینی و وردەکاریی تۆ ئەمە بێ کە دەمی یار بە خاڵ بشوبهێنی، بێگومان فام و هۆشت درشتە و وردبین نیت. پوختەی مەبەست ئەوەیە کە دەمی یار لە خاڵ بچووکترە.

-٢- (*)

**له سینەمدا صەدای ناڵینە بێ تۆ**
**دڵی زارم بەسێ غەمگینە بێ تۆ (١)**
**ئەبەد وەك من غەمیش صاحیبوەفایە**
**ڕەفیق و هەمدەمی دێرینە بێ تۆ (٢)**
**هەناسەی سەردی من دێنێ زمستان**
**گڕەی گەرمی دڵم هاوینە بێ تۆ (٣)**
**دەمم تاڵ و سروشکم شۆرە دایم**
**ترشڕووم و قصەم شیرینە بێ تۆ (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، غ، ج، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) بەسێ: زۆر.

واتە: کە بێ تۆم، لە سینەمەوە دەنگی ناڵین بەرز دەبێتەوە و دڵی نارەحەتم بەبێ تۆ زۆر خەفەتبارە.

بەسێ (عا، غ، ج، ڕ): دەڵێ.

(٢) دێرین: کۆن.

واتە: وەك من وەفاداری یارم، خەمیش یاری کۆن و وەفاداری منە و هەرگیز لێم جیا نابێتەوە.

غەمیش (عا، غ): غەمت. یانێ غەمی دووریی تۆ.

(٣) واتە: کە بێ باڵای تۆ هەناسەی ساردم دەردەچێ، زستان لەگەڵ خۆی دەهێنێ، تۆف و با و بۆرانە. لە هەمان کاتدا گەرمیی دڵیشم هاوینە، چەند جوانە زستان و هاوین لە یەك سات و یەك شوێندا کۆبوونەتەوە.

گڕەی گەرمی دڵم (ج): ڕەفیق و هەمدەمی. (عا، غ، ڕ) دووەم نیوەی بەیتی پێشووی دووبارە کردووەتەوە.

(٤) شۆر: سوێر.

واتە: بەهۆی بێتۆییەوە، هەمیشە دەمم تاڵ و فرمێسکم سوێرە و ڕووم لە ڕووی خەڵکدا ترشە. بەڵام قسەم شیرینە، چونکە ئەوەم کە پێوەندی بە خۆمەوە هەیە ناخۆشە، بەڵام ئەوەم کە پێوەندی بە خەڵکەوە هەبوو -کە تۆیش یەکێکیانی- شیرینە. هەرچی لەتەك خەڵك دەیڵێم و بۆ ئەوانی دەڵێم، لەبارەی تۆوەیە و دەبێ ئەوەیش شیرین بێ.

**دڵم باغ و گوڵم فرمێسکی ئاڵە**
**بەهار عومر و ئەجەل گوڵچینە بێ تۆ (٥)**
**سروشکم قرمز و دیدەم سفیدە**
**ڕوخم زەرد و لیباسم شینە بێ تۆ (٦)**
**فەرەح ڕابورد، ئەبەد بێ تۆ عوبوور کا**
**بە ڕووی دڵما خەفەت پەرژینە بێ تۆ (٧)**
**لە چنگ غەم صەیدە "سالم" وەك کەبووتەر!**
**لە دڵیا میخلەبی شاهینە بێ تۆ (٨)**

دایم (ج): دائیم.

(٥) واتە: دڵی سالم باخە و بە یادی یار ئاوەدانە، بەڵام گوڵی باخەکەی فرمێسکی ئاڵە. تەمەنی بەهاری کورتە و ئاکام گوڵچینە و زوو دەیمرێنێ.

بەهار (کم، گم): بەهاری.

(٦) قرمز: سوور. سفید: سپی، چاوی سپی کینایەیە لە کوێربوون.

واتە: بەبێ تۆ، فرمێسکم لەبەر گریانی زۆرم سوور بووە و چاوم لێڵاییی داهاتووە و سپی دەنوێنێ. ڕەنگم زەرد هەڵگەڕاوە و شینپۆشم، وەك بڵێی پرسەمە.

(٧) واتە: دەوراندەوری ڕوخسارم بە خەم پەرژین کراوە، بێ تۆ هەرگیز خۆشی بەلامدا تێپەڕ ناکا.

ڕابورد، ئەبەد (عا): ڕابورد و. لەنگە.

(٨) کەبووتەر: کۆتر. میخلەب: چنگۆڵ. شاهین: باز.

واتە: سالم وەك کۆتری ڕاوکراوی خەم و خەفەتە و دڵی لە چنگاڵی شاهێنی دووری لە تۆوەدایە.

غەم (عا): خەم.

## (*) -٣-

**ڕێی نەجاتی موشکیلە، هەر کەس ببێ دەسگیری تۆ**
**فەرمو وا گەردنکەچم، حاضر لە بەر شەمشیری تۆ (١)**
**زوڵفی تاتات تا ئیحاطەی گەردنی داوی، بووە**
**باری ئەهلی کوللی عالەم، جوملە گەردەنگیری تۆ (٢)**
**مەردومەك خوێنڕێژی ئەشکن، وەك موژەت خوێنڕێژی دڵ**
**مەردومی ئاویش دەبن وەك مەردومان تەسخیری تۆ (٣)**
**ماری ضەححاکن یەکایەك موت بە مەحبووسانی زار**
**وەه چ صەعبە بەندْبەندی سیلسیلەی زەنجیری تۆ! (٤)**
**دەنگی خەمیازەی دڵم دەبیەم لە شەوقی خەنجەرت**
**ئینتیظاری کوژتنم، تا کەی دەبێ تەئخیری تۆ؟! (٥)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) دەسگیر: دەستبەستە.

واتە: ئەو کەسەی کە تۆ بیگری و دەستبەستەی بکەی، ڕزگاربوونی گرانە. جا کە مادام وایە، فەرموو ملکەچم، گەردنم ئامادەی شمشێری تۆیە.

(٢) واتە: ئەی یار! ئەوەتی زوڵفی تاتات دەوری گەردنتی داوە، ئەوەندەیتر جوانی کردووی و ئۆباڵی هەموو عاشقانی جیهان بە گەردنی تۆیە.

(٣) ڕەنگە دوو لێکدانەوە هەڵبگرێ: یا مەردومی ئاوی کە بیلبیلەی چاوە، وەك مەردومانیتر کە بریتین لە مرۆڤی لەسەر وشکانی ژیاو، هەموو سوخرەکێش و ملکەچ و ڕامی دەستی تۆن، یان ئەم بەیتە بەو جۆرە بووە: «مەردومەك خوێنڕێژی ئەشکە، وەك موژەت خوێنڕێژی دڵ

مەردومی چاویش دەبن وەك مەردومان تەسخیری تۆ»

واتە: گلێنەی چاوی من خوێنی فرمێسك دەڕێژێ و برژانگی تۆ خوێنی دڵ. گلێنەی چاویش وەك خەڵك تەسیخر و داگیرکراوی تۆیە.

(٤) واتە: تاڵەکانی موت یەك یەك وەك ماری ئەژدەهاکن بۆ دیلە بێهێزەکانت. ئای ئەڵقە ئەڵقەی زنجیری زوڵفت کە قورس و گرانە!

(٥) خەمیازە: باوێشك کە نیشانەی بێتاقەتییە. دەبیەم: دەبیستم.

**بۆ خەیاڵی نەقشی تۆ، "مانی" لە من کەودەنترە**
**ڕەنگی خامەی کردگارە، صەنعەتی تەصویری تۆ (٦)**
**زەخمی تیشنەم، گەر لە تیغت دەفعەیێ ئاوت نەدا**
**عیللەتی بەختی بەدم بوو، نەك لەبەر تەقصیری تۆ (٧)**
**هەر کە سانی تیپی موژگان دێ بە ڕەسمی قەبض و بەسط**
**((طرفة العین))ێ دەبێ صەد موڵکی دڵ تەسخیری تۆ (٨)**
**تێکشکا پشتی خەمی "سالم" لە دووریی قامەتت**
**ڕاستە دەشکێنێ کەمان، وەختی جودایی، تیری تۆ! (٩)**

پوختەی مەبەست: دڵم چاوەڕوانی شەوقی خەنجەری بریقەدارتە بیکوژێ. وا دەنگی باوێشکی بێتاقەتی و چاوەڕوانیی دڵم دەبیستم، چاوەڕوانی کوشتنم؛ تا کەی دوادەکەوی؟!

کوژتنم (کم): کوشتمی، یانێ چاوەڕوانی کوشتمی و بێتاقەتی کردم. (کوژتنم) لە ئەسڵدا (کوشتنم) بووە و گۆڕراوە.

(٦) خامە: قەڵەم. کردگار: خودا.

واتە: "مانی"ی نیگارکێشی بەناووبانگ، بۆ خەیاڵ و بیرکردنەوە لە کێشانی وێنەی تۆ، لە من نازیرەکترە، چونکە وێنەی تۆ کردەی کردگاری ئاگادارە و کاری بنیادەم نییە.

(٧) واتە: ئەگەر جارێ برینی تینوومت ئاو نەدا، ئەوە خەتای تۆ نییە، تۆ درێغیت نەکردووە، من خۆم بەدبەختم و ئەو بەختەوەرییەم بەنسیب نەبووە.

(٨) سان: بە ڕیز وەستانی سەربازان و تێپەڕینی فەرماندە یا کاربەدەستی پایەبەرز بە بەردەمیاندا بە ڕێوڕەسمێکی تایبەت. تیپ: تیپی سەرباز. موژگان: برژانگ. قەبض: گرتن، نووقاندن. بەسط: بەردان، کردنەوە. طرفة العین: چاوبەیەکدادان.

واتە: هەر کە ڕانواندنی سەربازانی برژانگ دەست پێدەکا بە نیازی گرتن و بەردان (نووقاندن و کردنەوە)، بە یەك چاوبەیەکدادان سەد موڵکی دڵان دەخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆشەویستیی تۆ.

(هەر کە سانی تیپی موژگان دێ)، لە (کم)دا (هەر کسانی تیپی موژگانی دی) و لە (گم)دا (هەر کەسانێ تیپی موژگانی دی)یە کە لەنگە و هەڵەیە.

(٩) واتە: پشتی چەماوەی سالم لە دووریی باڵای ڕێکت بەسەر یەکدا تێکشکا. ئەمە شتێکی ڕاستە، چونکە بەتایبەتی تیری تۆ –نەك هەر تیرێکیتر– کە لە کەوان جیا دەبێتەوە، کەوانەکە دەشکێنێ. دیارە کەوانەکە پشتی چەماوەی سالمە و تیرەکە بەژنی یار.

## -٤- (*)

له زیندانا که بێهەمدەردم ئەمڕۆ
ئەسیری ناکەس و دڵبەردم ئەمڕۆ (١)
له دارولحوزنی دووریدا، صەبا بوو
گەیاندی نامەیی هەمفەردم ئەمڕۆ (٢)
له پام گەر بەندە دەر، وازە له مەیلم
دڵم لاته، زەبوون و زەردم ئەمڕۆ (٣)
گلەی ناحەق مەکە، پرسی دڵم کە
ئەگەر بێمەیلە، من نامەردم ئەمڕۆ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (دیوانی کوردی، بەرگی یەکەم، ل٤٧٧-٤٧٨)دا هەیە. "سالم" لە وەڵامی نامەیەکی شیعریی مستەفا بەگی "کوردی"دا نووسیویە، کاتێك لە زیندان بووە. هەر خۆی لە شیعرێکی‌تریدا ئاماژەی بۆ گیران و بەندکرانی خۆی کردووە لە (تاران)، کە وتوویە:

ئیبتیدا بۆ (ڕەی) کە هاتم، فیکری عەقڵیم لێ نەکرد
حەبسی تارانم گوناهی کاری بێتەدبیرمە!

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەحزووف.

(١) هەمدەرد: هاودەرد. ئەسیر: دیل. دڵبەرد: دڵڕەق و بێبەزەیی.

واتە: من کە لەناو زینداندا بێهاودەمم، لەبەرئەوەیە کە دیلی دەستی کەسانێکی ناکەس‌بەچە و دڵڕەق و بێبەزەییم.

(٢) دارولحوزن: خەفەتخانە. صەبا: بای لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە هاتوو. هەمفەرد: دۆست و ئاشنا.

واتە: بای سەبا نامەی دۆستی ئاشنای بۆ گەیاندمە خەفەتخانەی دووریم.

(٣) پا: پێ. بەند: گیراو، بەستراو. واز: کراوە و ئاوەڵا.

واتە: هەرچەندە ئەمڕۆ داماو و ڕەنگ‌زەردم و دەرگام لێ بەستراوە، بەڵام بەر بە ئارەزووم نەگیراوە و بەدڵ لای تۆم.

(٤) گلە: گلەیی و بناشت.

واتە: گلەیی ناهەقم لێ مەکە و لە دڵم بپرسە. ئەگەر دڵ بێمەیل و بێوەفا بێ، من ئەمڕۆ خۆم بە نامەرد دەزانم.

**به سروەی فێنکی بادی شەماڵت**
**بووە هاوین لە ئاهی سەردم ئەمڕۆ (٥)**
**خۆشا گەر تۆ لە پەروازی وەکوو مەل**
**ئەمن پابەندی بەندیی فەردم ئەمڕۆ (٦)**
**ئەگەرچی بولبولی سەر خاری هیجرم**
**تەمەننای عەطری عەینی وەردم ئەمڕۆ (٧)**
**قەریحەی شیعرەکەی پێشووم نەماوە**
**ئەوەند خەستە و دەروون پڕدەردم ئەمڕۆ (٨)**
**بەدڵ دەستی دوعای بەرزە کە "سالم"**
**بەرەو شەمسی جەمالت گەردم ئەمڕۆ (٩)**

(٥) ئەم بەیتە ڕوون نییە، چونکە ڕێی تێناچێ بڵێ: ئاهی ساردی من بە شەبای فێنکی بای شەماڵی تۆ بووە هاوین! (هاوین) بۆ ئەم جێیە دەست نادا و (بەهار)، یا تەنانەت (زستان) گونجاوتر بوو. ئەگەر ئاهەکە گەرم بووایە، دەگونجا بای شەماڵی گەرم بکردایە و ببووایەتە هاوین!

(٦) خۆشا: خۆشە. پەرواز: فڕین. فەرد: تاك.

واتە: لە کاتێکدا تۆ بە خۆشییەوە وەك مەل لە فڕینداى، من پێبەستراوی بەندیی تاکەکەسێکم.

(٧) خار: دڕك. هیجر: دوورکەوتنەوە. تەمەننا: ئاواتەخواز.

واتە: هەرچەندە من بولبولی سەر دڕکودالّی دوورکەوتنەوە لە یارم، بە ئاواتەوەی بۆنی گوڵم لە کاتی پشکووتندا.

(٨) قەریحە: زەوق.

واتە: زەوقی شیعری جاری پێشووم نییە، چونکە نەخۆشم و دەروونم پڕ لە دەردە.

(٩) شەمس: خۆر. جەمال: جوانی.

واتە: سالم، بە گیان و دڵ دەستی دوعا بەرز بکەرەوە، ئەمڕۆ بە دەوری خۆری جوانیتدا دەسووڕێمەوە.

## -٥- (*)

ئەی دڵا! حەلقەیی ئەو زوڵفە هەموو دامە، مەچۆ
ڕۆینی ئەو ڕەهە سەرخود هەوەسی خامە، مەچۆ (١)
لازمە، گەرچی دڵا! دیدەنی دڵبەر، لاکین
قەولی ئەو دەرحەقی تۆ توندیی و دوشنامە، مەچۆ (٢)

(*) ئەم چوارینە هەر لە (عا، غ) هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) دام: داو. ڕەه: ڕێ. سەرخود: سەربەخۆ. خام: کاڵ.

واتە: ئەی دڵ، هەموو ئەڵقەکانی ئەو زوڵفە داون نراونەتەوە، بە لایاندا مەچۆ. بـچی، دەکەویتـە داوەوە و گرتنەبـەری ڕێگـای ئـەو زوڵفـە بـێ ڕێپـێشاندەرێك و بـە سـەربەخۆیی، ئارەزوویـەکی خودسەرانەیە، مەیگرە بەر.

هەوەسی (غ): طەمەعی.

(٢) دوشنام: جنێو.

واتە: ئەی دڵ، هەرچەند دیدەن و سەرلێدانی یار پێویستە، بەڵام قسەکانی ئەو بەرانبەر بە تۆ، هەموو قسەی توند و جنێوپێدانن. مەچۆ بۆ لای، با ئەو قسانەی لێ نەبیستی.

# پیتی (ه)

## -١- (*)

**طەڵەب کەم گەر بە غەیرەز تۆ لە ((الله))**
**بە عەفوا چێ موناجاتی سەحەرگاه (١)**
**لەبەر ئەشکم لە خاکا جیسمی فەرتووت**
**لە قوڕدا ڕووبەڕووی دیوارە وەك کاه (٢)**
**وەها پڕبوو بە ئیما دڵ لە پەیکان**
**بە دەمما دێتە دەر ئاهەن لە جێی ئاه (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، غ، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەقسوور.

(١) طەڵەب: داوا. غەیرەز: جگە لـە. بـە عەفواچـێ: بفـەوتێ. موناجـات: ڕاز و نیـاز کـردن. سەحەرگاه: دەمی بەرەبەیان.

واتە: ئەگەر لە تۆ زیاتر داوا لە خودا بکەم، با هـەموو ڕاز و نیـازێکی دەمـی بەرەبـەیانم لەگـەڵ خودا نەمێنێ و بفەوتێ.

غەیرەز (مان، کم): غیر از (فارسییە و بەم جۆرە هێنراوەتە کوردییەوە).

(٢) ئەم بەیتە لە (حا)دا نییە.

ئەشك: فرمێسك. جیسم: لەش، جەستە. فەرتووت: پەڕپووت. کاه: کا.

واتە: ئەوەندە فرمێسك دەڕێژم، لەشی پـەڕپووت و نـابووتم نیـشتووەتە نـاو قـوڕی خـاك. ئیتر جەستەی سووکم لە ئاستی دیواردا وەك کایە.

فەرتووت (عا، ڕ): خەستەم. (غ، کم، گم): پەڕپووت. لە قوڕدا (گم): لە نووردا.

(٣) ئیما: ئیشارەت. پەیکان: سەرەتیر. ئاهەن: ئاسن.

واتە: بە نیگاکردنی یار و تیرتێگرتنم، دڵم پڕ بووە لە سەرەتیری ئاسن. لەباتی ئاه و ناڵە، ئاسن لە دەمم دێتە دەرێ.

وەها (ڕ): وەلێ. دەمما (کم، گم): مادە. هیی (کم) هەڵەی چـاپە و (گم) دووپاتی کـردووەتەوە.

دڵم دوزدانە بۆ سێبی زەنەخ چوو
لە خەوفا پای ئەلەغزی، کەوتە ناو چاه (٤)
بنێرە شەهری دڵ فەوجێ لە موژگان
ویلایەت نەظمی کوا بێ لەشکری شاه؟! (٥)
گەهی ئیما لە هەر سوو تورکی چاوت
بە مەستی خەنجەری کێشا لە ڕووی ماه (٦)
قەدت نەخل و ڕوطەب لێوی عەقیقت
هەوەس پڕزۆر و "سالم" دەستی کۆتاه (٧)

ئاه (مان): چاه. ئەمیش هەڵەیە.

(٤) دوزدانە: وەك دز، دزانە. سێب: سێو. زەنەخ: چەناگە. خەوف: ترس. پا: پێ. ئەلەغزی: دەخلیسکا. چاه: چاڵ.

واتە: دڵم وەك دز بەرەو سێوی چەناگەی یار چوو. لە ترساندا پێی هەڵخلیسکا و کەوتە ناو چاڵی چەناگە.

پای ئەلەغزی (حا، عا، غ، ڕ، کم، گم): پایی لەغزی. دروستترە. کەوتە (کم): کەرەوتە. هەڵەی چاپە.

(٥) شەهر: شار. فەوج: هێز. موژگان: برژانگ. ویلایەت: مەملەکەت. نەظم: نیزام، ڕێکوپێکی. شاه: پادشا.

واتە: هێزێکی تیربەدەستی برژانگت ڕەوانەی شاری دڵ بکە. ئەگەر لەشکری تۆی شای جوانی لەناو مەملەکەتی دڵدا نەبێ، پاشاگەردانی دەبێ و ڕێکوپێکی و نیزام نامێنێ. یانێ دڵ ئەگەر تیرباران نەکرێ، ئارام ناگرێ.

(٦) گەه: کات. هەر سوو: هەر لا. تورکی چاوت: جوانیی چاوت. ماه: مانگ.

واتە: کاتێ نیگا دەکەی، جوانیی چاوی مەستت لە هەر ڕوویەکەوە خەنجەر لە ڕووی مانگدا کە ڕوومەتیەتی، هەڵدەکێشێ و خۆی بە جوانتر دەزانێ.

(٧) نەخل: دارخورما. ڕوطەب: خورما. عەقیق: ئاقیق، بەردێکی گرانبەهایە ڕەنگ‌سوورەکانی زیاتر پەسەندن. هەوەس: حەز و ئارەزوو. پڕزۆر: بەهێز، بەتین‌وتاو. کۆتاه: کورت.

واتە: قەدت بەرز و باریکە وەك دارخورما و لێوی سوورت شیرینە وەك خورما. حەز و ئارەزوویەکی بەتین‌وتاوم هەیە و دەستم کورتە و ناگاتە قەدت.

(*) -٢-

**موزدی ڕەنجم، کە بدەی، نەقدی ویصاڵم طەڵەبە**
**ئەجری هیجرم، کە بدەی، باغی جەمالم طەڵەبە (١)**
**شۆری یەك بۆسەیی شیرین لە لەبت کەوتە سەرم**
**حەددی بۆسەم نییە، ئەمما بە خەیاڵم طەڵەبە! (٢)**
**بکە خوونبەستی سروشکم، بە عەدالەت، لە نیگاه**
**دڵ کە غەڵـطانە لە خوێنا، لەبی ئاڵم طەڵەبە (٣)**
**طائیفەی هیندووە بۆ کەعبەیی ڕوو، هادییی دڵ**
**دەستی ئەگریجە کە کۆتایە، لە خاڵم طەڵەبە! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە بەشی (غزلهای جدیدە)ی (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) موزد: هەقدەست، کـرێ. نەقـد: نەختینـە، دراو. ویـصاڵ: بەیارگەیـشتن. طـەڵـەب: داوا، خواست. ئەجر: پاداشت. هیجر: دووری. جەماڵ: جوانی.

واتە: ئەگەر هەقدەست و کرێی ڕەنج و ئەرکی خۆمم بدەیتێ، نەختینەی گەیشتن بە تـۆم داوایـە. ئەگەر پاداشتی دووریشم بدەیتەوە، باخی جوانیتم بەرامبەر بەوە دەوێ.

(٢) شۆر: کەڵکەڵە. بۆسـە: ماچ. لـەب: لێو. حەد: پلە، ڕادە. ئەمما: بەڵام.

واتە: کەڵکەڵەی ماچێکی شیرینی لێوی تۆم کەوتووەتە کەللـە. ڕێم ناکەوێتە ئەوە ماچت بکەم و ئەو هەقەم نیـە، بەڵام ئەوەم بە خەیاڵ دەوێ.

(٣) خوونبەست: خوێن خۆش‌کـردن، مەسـەڵەت‌کـردن، خـوێن‌وەسـتاندن. سروشـك: فرمێـسك. عەدالەت: داد. نیگاه: تەماشا. غەڵـطان: خەڵتان، هەڵکێشراو لە.

واتە: بەدادانە بکەوە نێوان فرمێسکی من و نیگای دڵبەر، ئەو خوێنە خـوش بکـە کـە چـاوم لـە پێناویدا ڕشتوویە و ئەو دوژمنایەتییە بکوژێنەوە. دڵم، ئەگەرچی برینداره و لـە خـوێن هەڵکێـشراوە، من لێوی ئاڵی یارم گەرەکە.

(٤) طائیفە: تیرە. هیندوو: هیندی، کینایەیە لە خاڵ. هادی: ڕێبەر، ڕێ‌نیشاندەر. کۆتا: کورت.

واتە: خاڵی تۆ ڕێ‌نیشاندەری دڵە بۆ کەعبەی پیرۆز و سپیی ڕوخسارت، چونکە ئەگریجە دەستی کورتە و ناگاتە ڕووت، داوامە خاڵ ئەم کارەم بۆ بەجێ‌بهێنێ.

تۆ کە دەهـ سالەیی بەم نەوعە هەتا چارْدەهەم
بۆ جەمالت، وەکوو مەهـ، حەددی کەمالْم طەلەبە! (٥)
جەور و بێدادیی ڕەقیبم دلی هێنامە ئەمان
ظولْمی ظالْم لە کەمالایە، زەوالْم طەلەبە (٦)
دێوی نا"سالم"ی نەفسم پڕی غاری بەدەنە
قووەتێکی بەقەدەر ڕۆستەمی زالْم طەلەبە (٧)

(٥) دەهـ: دە. نەوع: چەشن. جەمال: جوانی. مەهـ: مانگ. حەد: ڕادە، ئەندازە. کەمال: تەواوی، پڕی.

واتە: تۆ کە تەمەنت دە سالە، بەم جۆرە تا دەگەیتە چواردە سالی و وەك مانگی چواردەت لێ دێ، دەمەوێ جوانییەکەت تەواو بێ و بگەیتە ڕادەی تەواوی و پڕی.

(٦) جەور: ستەم. ڕەقیب: بەدکار. ئەمان: دلنیایی و ئارامی، نەترسان. ظولم: زۆرداری. ظالم: زۆردار. زەوال: نەمان، لەناوچوون.

واتە: ستەم و بێدادیی بەدکار دلیان هێنامە سەر داواکردنی دلنیایی و ئارامی. زۆرداریی ستەمکار لەوپەڕیدایە، بۆیە لەناوچوونیم گەرەکە.

(٧) ناسالم: ناسەلامەت. غار: ئەشکەوت. بەدەن: جەستە. قووەت: هێز. بەقەدەر: هێندەی. ڕۆستەمی زال: پالەوانی ئێرانی.

واتە: دێوی دەروونم بێوەی نییە و ئەشکەوتی جەستەمی پڕکردووەتەوە، بۆیە هێزێکی ئەوەندەی هیی ڕۆستەمی زالم گەرەکە لەناوی بەرێ و دەروونم ئارام ببێتەوە.

(زال)، بە هەلە بە (ذال) نووسراوە.

-٣- (*)

**ئەگەر ظوڵمەت ببێ، زوڵفی سیاتە**
**حەصاری چەشمەیی ئاوی حەیاتە (١)**
**قەباڵەی موڵکی عیشقە، لێوی تیشنەم**
**لە باغی ڕووت طەڵەبکاری زەکاتە (٢)**
**لە میصری دڵبەری تەنگی دەهانت**
**شکستی قیمەتی قەند و نەباتە (٣)**
**بە حەلقەی کوفری زوڵفت تێکەڵە، دڵ**
**دەسا هەڵسە، دەخیل، وەختی غەزاتە (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (م)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەحزووف.

(١) ظوڵمەت: تاریکی. سیا: ڕەش. حەصار: دیوار. چەشمە: سەرچاوە. ئاوی حەیات: ئاوی ژیان.

واتە: ئەگەر تاریکایی هەبێ، ئەگریجەی ڕەشی تۆیە کە بووە بە دیواری دەوراندەوری سەرچاوەی ئاوی ژیانت کە لێوتە.

(٢) قەباڵە: قەواڵە، بەڵگە. تیشنە: تینوو. طەڵەبکار: داواکار. زەکات: ئەو بەشە لە داهات کە موسوڵمان دەیبەخشێ بە هەژاران.

واتە: قەواڵەی موڵکی عیشق لێوی تینوومە. داواکاری زەکاتی باخی ڕووی تۆیە کە بەشێکی ئەو موڵکەیە.

(٣) میصر: وڵاتی میسر. دڵبەر: دڵکێش، دڵبۆخۆبردوو. تەنگ: تەسك. دەهان: دەم. شکست: داشکان، دابەزین. بەها: قیمەت. قەند: شەکر. نەبات: جۆرە شەکرێکی مینایی ڕەنگە.

واتە: دەمی چکۆلە و تەسکی دڵبەری تۆ وڵاتی میسرە، نرخی شەکر و نەباتی تێدا شکاوە، لەبەرئەوەی شیرینیی لێوت ڕەواجی پەیدا کردووە.

(٤) کوفر: ڕەش. دەخیل: دەستەودامان بوون.

واتە: دڵ دەستی بە ئەڵقەی کوفری ئەگریجەتەوە گرتووە و تێکەڵی بووە. دەستم بە دامانت، هەستە، ئیتر کاتی ئەوە هاتووە داگیرم بکەی.

**ئەگەر لەیلاصیفەت شیرین‌زوبان بی**
**دوصەد فەرهاد و مەجنوون خاکی پاتە (٥)**
**بە مەرگی تۆ، لەپاش قەڕنێ لە قەبرا**
**بە دایم دیدەیی "سالم" لە ڕاتە (٦)**

(٥) لەیلاصیفەت: سیفەت و خەسڵەت وەك لەیلا. شیرین‌زوبان: زمان‌شیرین. پا: پێ.
واتە: ئەگەر وەك لەیلا زمانت شیرین بێ، دووسەد فەرهاد و مەجنوون دەبنە خاکی بەری پێت.
(٦) قەڕن: سەدە، سەدساڵ. قەبر: گۆڕ. دایم: بەردەوام، هەمیشە. دیدە: چاو. ڕا: ڕێ.
واتە: سوێند بە مەرگی تۆ، سالم پاش سەدەیەکیش لەناو گۆڕدا هەمیشە چاولەڕێتە.

(*) -٤-

**تەفەڕووجگاهی دڵ گوڵزاری ڕووتە**

**هەتا زەنجیرییی زەنجیری مووتە (١)**

**دەلەرزێ دڵ لەبەر سەرهەنگی چاوت**

**لە ڕووتا، تا برۆ شەمشێری ڕووتە (٢)**

**نەکەی مەنعی صەبا، با بێ بەسەرتا**

**دەماغی من فەرەحئەفزایی بووتە (٣)**

**بمێنێ ڕەونەقی یاقووتی لێوت**

**هەتا بۆ ئەم غەریبی ڕووتە، قووتە (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، غ، ڕ، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەحزووف.

(١) تەفەڕڕوجگاه: سەیرانگە، شوێنی گەڕان و شادی. (زەنجیر)ی یەکەم: دێوانە. (زەنجیر)ی دووەم: پێوەبەستراو، زنجیرکراو.

واتە: باخی ڕوخسارت سەیرانگەی دڵە، تا بە زنجیری مووی ئەگریجەت زنجیرکراو بێ.

هەتا زەنجیریی (کم): هەتاو زنجیرەیی. (ق): هەتا دڵبەستەیی. (گم): هەتاو نێچیرەیی.

(٢) سەرهەنگ: پلەیەکی ئەفسەریی سوپایە، فەرماندەر.

واتە: تا برۆت وەك شمشێر بەسەر ڕوخسارتەوە بێ، دڵ وەك سەرباز لە بەردەم سەرهەنگی چاوتدا دەلەرزێ.

سەرهەنگی (ق): ئاهەنگی. برۆ (کم، گم): بە ڕوو. هەڵەیە.

(٣) مەنع: قەدەغە. صەبا: بای بەیانی. فەرەحئەفزا: شادی زیادکەر. بووتە: بۆنوبەرامەتە.

واتە: ڕێی بای بەیان بدە بەسەرتدا بێ و بۆنوبەرامەت هەڵگرێ و بیهێنێ، چونکە مێشك و دەماغی من بە بۆنی تۆ زیاتر شاد و کەیفخۆش دەبێ.

نەکەی.. بەسەرتا (گم): مەکە.. بەسەرما. فەرەحئەفزایی بووتە (ڕ): دڵ فەرەحئەفزا بە بووتە.

(٤) ڕەونەق: ڕووناکی و درەوشانەوە. یاقووت: بەردێکی گرانبەهای سوورە. غەریب: نامۆ. قووت: خۆراك، بژیو.

واتە: تا لێوی سوورت خۆراکی گیانی ئەم شێت و سەوداسەرەی ڕوخسارت بێ، با ڕەونەق و جوانیی لێوت وەك خۆی بمێنێ.

**چ حاجەت سورمەسا بێ چاوی "سالم"،**
**هەتا «کُحل الجواهر» خاکی کووتە! (٥)**

بمێنێ (عا): نەمێنێ. (گم): معینی. هەتا بۆ ئەم غەریبی ڕووتە، قووتە (کم، ق): هەتا بۆ ئەم غەریبە ڕووتوقووتە (گم): هەتا بۆ ئەم غەریبەی ڕووتوقووتە.

(٥) حاجەت: پێویستی. سورمەسا: بەکلڕێـژراو. کحـل الجـواهر: کلـی وەك گەوهـەر. کـوو: بەردەرگا. مەنزڵ.

واتە: تا خاکی بەردەرگای تۆ کلی وەك گەوهەری گرانبەها و دەگمەن وا بێ، چ پێویست دەکا "سالم" چاوی خۆی بە کلی عادەتی بڕێژێ.

کحل الجواهر (کم، گم): کحلی جەواهیر.

(*) -٥-

سەوادی قیرگوونشەبها لە نوسخەی عەنبەرینمووتە
سەراسەر ڕەونەقی دونیا لە عەکسی ئاینەی ڕووتە! (١)
بە ناحەق کوشتمی موژگانی خوونڕێزت، وەلێ زانیم
لەگەڵ من ئەم هەموو کەچبازییە، تەحریکی ئەبرووتە (٢)
سیەهڕوو بم، وەکوو زوڵفت، سەری موو گەر خیلافی بێ:
بە حەققی مەصحەفی ڕووی تۆ، دزی دڵ خاڵی هیندووتە (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، غ، ج، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) سەواد: ڕەشایی. قیرگوون: ڕەش وەك قیر. شەبها: شەوان. نوسخە: ڕوونووسکراو. عەنبەرینموو: مووی وەك عەنبەر بۆنخۆش. ڕەونەق: درەوشانەوە. عەکس: شەوقدانەوە، ڕەنگدانەوە. ئاینە: ئاوێنە.

واتە: ڕەشایی بە شەوان وەك قیر ڕەشی تۆ ڕوونووسکراوێکە لە مووی عەنبەر پێوەبووی تۆ. ڕووناکی و درەوشانەوەی دنیایش، تێکڕا ڕەنگدانەوەی ئاوێنەی ڕوخسارتە.

قیرگوونشەبها (کم، گم): قیرگوونی شەو. دونیا (ج): ڕووی تۆ. ئاینەی ڕووتە (کم): خاڵی هیندووتە.

(٢) ئەم بەیتە لە (حا، کم، گم)دا سێیەمە.

موژگان: برژانگ. خوونڕێز: خوێنڕێژ. وەلێ: بەڵام. کەچبازی: خواروخێچی. تەحریك: بزواندن. ئەبروو: برۆ.

واتە: تیری برژانگی خوێنڕێژت بە ناهەق کوشتمی، بەڵام زانیم ئەم هەموو خواروخێچییە لەگەڵ من، بە هاندانی برۆکانت بووە.

کوشتمی (گم): کوژتمی. موژگانی خوونڕێزت (ج، ق، کم، گم): موژگانی خوێنڕێژت.

(٣) سیەهڕوو: ڕووڕەش. خیلاف: پێچەوانە. مەصحەف: قورئان، کتێبی پیرۆز. هیندوو: ڕەش، پاسەوان.

واتە: وەك ئەگریجەی ڕەشت ڕووڕەش بم، ئەگەر هێندەی موویەك شتێکی پێچەوانەم وتبێ. سوێند بە قورئانی ڕوخسارت، خاڵی ڕەشی تۆ دڵی دزیوم.

خیلافی (ج): خیلافم.

وەکوو موژگانی تۆ بەرگەشتەیە طالیع بە ڕووی مندا
پەرێشانزوڵفی موشکینت لەگەڵ ئەحواڵی من جووتە! (٤)
بەهەشتە وەصڵی تۆ بۆ من لەبن خاری موغەیلانا
لە وەختی دووریيا، گوڵشەن وەکوو صندووقی تابووتە! (٥)
دڵی ساحیر، لەبەر زوڵف و زەنەخ، ناگاتە ڕوخسارت
لە یەکسوو حەلقەیی ئەفعا، لە یەکسوو چاهی هارووتە (٦)
جەوازی دا حەکیم بادامی چاو و شەککەری لێوت
لە قانوونی ویصالا بۆ دڵی من قووەت و قووتە (٧)

(٤) بەرگەشتە: هەڵگەڕاوە. طالیع: بەخت. پەرێشانزوڵف: ئەگریجەی ئاڵۆزکاو و شێواو. موشکین: بۆنی میسك پێوە.

واتە: بەخت لە ڕووی مندا وەك برژانگی تۆ لێم هەڵگەڕاوەتەوە و دوژمنمە. ئەگریجەی ئاڵۆزکاوی بۆنی میسكپێوەی تۆ لە هەمان حاڵی پەرێشانی مندایە.

موژگانی تۆ (عا): موژگان. بەرگەشتەیە (غ): بەرگەشتەی. هەڵەیە. پەرێشان (کم): پەرێشانی. لەنگە. لەگەڵ (ق): دەگەڵ.

(٥) وەصڵ: بەیارگەیشتن. خار: دڕك. موغەیلان: درەختێکی زۆر دڕکاوییە. گوڵشەن: باخ و گوڵزار.

واتە: ئەگەر بە تۆ بگەم، با لەبن سێبەری درەختی دڕکداری موغەیلانیشدا بێ، وەك بەهەشت وایە لام. کە تۆ دووریش دەبی لێم، باخ و گوڵزارم لا وەك تابووتە و دڵم ناپشکوێنێ.

تۆ بۆ من (کم، گم): تۆ و من. لە وەختی دووریيا (ج): لە وەختی دووریدا.

(٦) ئەم بەیتە لە (حا، کم، گم)دا حەوتەمە و لە (ق)یشدا نییە.

ساحیر: سیحرباز. زەنەخ: چەناگە. سوو: لا. حەلقە: پێچ و پاپۆکە. ئەفعا: مار. چاه: چاڵ. هارووت: فریشتەیەکی ئەفسانەییە هاتە سەر زەوی و گوناهی کرد و لە بیری بابلدا زیندان کرا.

واتە: دڵی سیحرباز لە ترسی ئەگریجە و چاڵی چەناگەت، ناگاتە ڕوخساری تۆ؛ چونکە لە لایەکەوە ماری ئەگریجەت پاپۆکەی خواردووە، لە لایەکیتریشەوە چاڵی چەناگەت هەیە کە هەرچی تێبکەوێ بە دەردی هارووت دەچێ.

هەردوو (لە یەکسوو) (کم): لە لایێ. هارووتە (عا): هاروونە. هەڵەیە.

(٧) جەوازی دا: ڕێی پێ دا. حەکیم: پزیشك، چارەکەری دەرد. بادامی چاو: چاوی وەك بادام.

## بەسێ دوونهیممەتە گەر ئارەزووی ئەورەنگی شاهی کا
## هەتا سەرگەشتە"سالم" ئووفْتادەی سایەیی کووتە (٨)

شەککەر: شەکر. قانوون: یاسا، ڕێوشوێن. قووەت: هێز. قووت: بژیو، خواردەمەنی.

واتە: پزیشك مولّەتی دا و سەلماندی بادامی چاو و شەکری لێوت بۆ چارەسەری دەرد دەبن، لە ڕێوشوێنی گەیشتن بە تۆدا بادام مایەی هێز و گوڕ و تین و شەکری لێویشت خۆراکی گیانە.

جەوازی دا حەکیم بادامی (کم، گم): جەوازی حوکمی بەهرام. هەلّەیە. لە قانوونی ویصالا (حا): بە قانوونی ویصالا. قووەت و (کم، گم): قووەتی.

(٨) بەسێ: زۆر. دوونهیممەت: ورەڕووخاو، ئەورەنگ: فەڕ و شکۆ، گەورەیی، عەقلّ و زانین. شاهی: پادشایی. سەرگەشتەسالم: سالمی سەرلێشێواو. ئووفتادە: کەوتوو، پەککەوتە. سایە: سێبەر. کووتە: بەردەگاتە، مەنزلّتە.

واتە: سالمی سەرلێشێواو تا لە سایەی بەردەرگای تۆدا کەوتبێ، ئەگەر ئارەزووی فەڕ و شکۆ و گەورەیی شاهانە بکا، زۆر ورەڕووخاوە و دەزانێ هیچی لەگەلّ تۆ بۆ ناکرێ.

کا (ق): بێ.

## -٦- (*)

**خەمی قەددم لە غەمدا شێوەیی ئەبرووتە تا مووتە**
**بە دایم پێچشی خاطر وەکوو گێسووتە تا بووتە (١)**
**دڵی تەنگم، لە عیشوە و سیحری تۆ، مەحبووسی جاویدە**
**لە چاهی میحنەت و غەمدا، هەتا وا خووتە، هارووتە (٢)**
**خەیاڵم تیزە وەك ئەڵماس و هەم لەم فیکرەدا کوڵە**
**لەبانی خاتەمی دڵبەر مەگەر یاقووتە، یا قووتە؟ (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، غ، ج، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) خەم: چەماوە. ئەبروو: برۆ. دایم: هەمیشە. پێچش: پێچ و لوول. خاطر: خەیاڵ و بیر. گێسوو: ئەگریجە. بووتە: هەتبووە، بۆنوبەرامەتە.

واتە: چەماوەیی باڵام بەهۆی خەم و خەفەتی تۆوە، شێوەی برۆی کەوانیی تۆی گرتووە و بە درێژایی مووی ئەگریجەکانت هاتووە. پێچولوولی خەیاڵ و بیریشم وەك ئەگریجەی تێکئاڵاوی تۆ وایە، ئەوەتی هەتبووە.

تا (گم): یا. دایم (گم): دائیم.

(٢) عیشوە: ناز. سیحر: جادوو. مەحبووس: بەندکراو. جاوید: هەمیشەیی. چاه: چاڵ. میحنەت: مەینەت. خووتە: ئەمە ڕەوشتتە. هارووتە: وەك هارووت وایە و دیلە.

واتە: دڵی من تەنگە و تا تۆ ئەمە خوو و ڕەوشتت بێ، بە ناز و عیشوە و جادووی تۆوە بەندکراوێکی هەتاهەتاییە، لە چاڵی مەینەت و خەمدا وەك هارووت وایە.

سیحری (غ، ج، کم، گم): فەننی. جاویدە (عا): جادووتە. وا خووتە (عا): دا خونە. هەڵەیە.

(٣) تیزە: تیژە. لەبان: جووتەلێو. خاتەم: ئەموستیلە. یاقووت: بەردێکی گرانبەهایە. قووت: مایەی ژیان.

واتە: ئەگەرچی خەیاڵم وەك ئەڵماس تیژە، بەڵام لەم بیر و ئەندێشەیەدا کوڵەوارە. لێوەکانی ئەنگوستیلەی دڵبەر کە دەمیەتی، وەك یاقووت گرانبەهان، یان مایەی ژیانن.

تیزە (عا، ج، کم، گم): تیژە. هەم (عا): باز. کوڵە (ج): کوڵم. دڵبەر (عا، غ، ج، کم، گم): لەعلت.

**له حه‌لقه‌ی چینی زوڵفا دیده‌بانی عاریضه‌، خاڵت**
**له‌گه‌ڵ دڵداده‌گان تا سیحر و ئه‌فسوون خووته‌، هیندووته (٤)**
**مه‌کانی دڵ له گێسووته‌، ئه‌به‌د هه‌رگیز جودا نابێ**
**له له‌نگه‌ردا، هه‌تا ماهی له‌گه‌ڵ گا جووته‌، وا جووته (٥)**
**عیلاجی حاڵی "سالم" که‌، حه‌کیم‌ئاسا، ده‌خیلت بم**
**ده‌وایی ده‌ردی بێده‌رمانی ئه‌و لیمووته‌، یا بووته (٦)**

(٤) دیده‌بان: ئێشکگر، پاسه‌وان. عاریض: ڕوومه‌ت. دڵداده‌گان: عاشقان، دڵداران، ئه‌وانه‌ی که دڵی خۆیان داوه به یار. هیندوو: پاسه‌وان، خاڵی ڕه‌شی هیندوو.

واته: خاڵی تۆ له‌ناو ئه‌ڵقه‌ی چین‌چینی ئه‌گریجه‌دا پاسه‌وانی ڕوومه‌ته‌، تا جادوو و ئه‌فسوون له‌گه‌ڵ عاشقان ڕه‌وشتی تۆ بن، ئه‌ویش غولامی خزمه‌تکاری به‌رده‌ستی تۆیه‌.

خاڵت (ج): ڕووته‌. دڵداده‌گان (کم): دڵ داده‌که‌ن. (گم): دڵداده‌که‌ت. هه‌ڵه‌ن.

(٥) مه‌کان: جێ، شوێن. ئه‌به‌د: هه‌میشه‌. جودا نابێ: جیانابێته‌وه‌. ماهی: ماسی.

واته: شوێنی دڵ ناو ئه‌گریجه‌ی تۆیه و هه‌رگیزاوهه‌رگیز لێی دوور ناکه‌وێته‌وه‌. تا ماسی و گای گۆی زه‌وی له‌سه‌ر پشتی خۆڕاگرتوو، جووت و ڕێك بن و نه‌جوولێن، ئه‌ویش ئه‌گه‌ر ئه‌گریجه‌ت ئارام بگرێ و نه‌شێوێ، له‌گه‌ڵی جووت و ڕێکه‌.

گێسووته (غ): گێسووتا. وا جووته (عا): بووته‌. هه‌ڵه‌یه‌. (غ): و جووته‌.

(٦) عیلاج: چاره‌سه‌ر. حه‌کیم‌ئاسا: وه‌ك پزیشك. ده‌خیلت بم: ده‌سته‌وداوێنت بم. ده‌وا: ده‌رمان. لیموو: لیمۆ، مه‌مك. بووته‌: بۆن‌وبه‌رامه‌ته‌.

واته: ده‌ستم به دامێنت، وه‌ك پزیشك، چاره‌سه‌ری ده‌ردی "سالم" بکه‌. ده‌رمانی ده‌ردی بێده‌رمانی ئه‌و لیمۆی مه‌مکه‌کانت، یا بۆن‌وبه‌رامه‌ی ئه‌گریجه‌کانته‌.

لیمووته (عا، غ، کم): تابووته‌.

(*) -٧-

**سەوادی پەردەیی ظوڵمەت، سیاهیی نوسخەیی مووتە**
**شوعاعی ماهی دووهەفتە، لە عەکسی پەرتەوی ڕووتە (١)**
**نیگاهت گەر بە ئاهووی چین بدەم نیسبەت، درۆی مەحضە**
**خەطایە گەر بڵێم: موشکی خەتا هەمبۆیی گێسووتە (٢)**
**زیادیی غوصصەیە بۆ من، تەفەڕڕوج مەوسیمی هیجران**
**فەضای دونیا، بەبێ ڕووی تۆ، وەکوو صندووقی تابووتە (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، غ، ج، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) نوسخەی (غ) هەر ئەم بەیتەی هەیە، چونکە پەڕەی دوایی کەوتووە.

سەواد: ڕەشایی. ظوڵمەت: تاریکی. سیاهی: ڕەشی. شوعاع: تیشك. ماه: مانگ. دووهەفتە: چواردە. عەکس: ڕەنگدانەوە. پەرتەو: ڕووناکی.

واتە: ڕەشایی پەردەی تاریکی، ڕەشی مووی ڕەشی ئەگریجەکانتە. تیشك و تریفەی مانگی چواردە، تیشکدانەوەی ڕووناکیی ڕوخساری تۆیە.

پەرتەوی (ج، کم، گم): ئایینەی.

(٢) ئەم بەیتە هەر لە (کم، گم)دا هەیە.

ئاهوو: ئاسك. نیسبەت بدەم: بەراورد بکەم، بشوبهێنم، مەحض: ڕووت، پەتی. خەطا: گوناه. موشکی خەتا: میسکی وڵاتی خەتا. هەمبۆ: هاوبۆن. گێسوو: ئەگریجە.

واتە: ئەگەر تەماشای چاوت بە ئاسکی چین بشوبهێنم، درۆیەکی پەتییە. هەڵە و چەوتییە ئەگەر بڵێم میسکی وڵاتی خەتا هەمان بۆنی ئەگریجەی تۆی هەیە.

(٣) غوصصە: مەراق و ماتەمینی. تەفەڕڕوج: سەیران. مەوسیم: وەرز. هیجران: دووری. فەضا: بۆشایی.

واتە: سەیران و گەڕانی ناو باخ و گوڵزار لە وەرزی دووریی تۆدا، مەراق و خەفەتێکی زیاترە بۆ من. دنیا بەبێ ڕوخساری تۆ، لای من وەك تابووت وایە و هیچ تروووسکاییەکی ژیان و ئومێدی تێدا بەدی ناکەم.

(قەضای) لە (مان)دا هەڵەیە و (فەضای) ڕاستە. دونیا (گم): هیجران. (تۆ) لە (عا)دا کەوتووە.

**جیهان تاریکە بێ وەصڵت لە بەرچاوم، وەکوو دەیجوور**
**سیاهیی مەردومی دیدەم، لە نوقطەی خاڵی هیندووتە (٤)**
**لە صیدقی عیشقتا طاقم، وەلێ عومرێکە بێ وەصڵت**
**دڵی پڕحەسرەتم دایم لەگەڵ هەمزادی غەم جووتە (٥)**
**شکاندت خاطری "سالم" لەسەر بۆسەی لەبی لەعلت**
**لە سایەی گریەوە ئێستا سروشکی ڕەنگی یاقووتە (٦)**

(٤) وەصڵ: بەیارگەیشتن. دەیجوور: شەوی تاریکی ئەنگوستەچاو. سیاهی: ڕەشی. مەردوم: گلێنەی چاو. دیدە: چاو. نوقطە: خاڵ، نوختە.

واتە: ئەگەر بە تۆ نەگەم، جیهان لە بەرچاومدا وەك شەوی تاریکی ئەنگوستەچاو وایە. ڕەشی گلێنەی چاوم شەوقدانەوەی نوختەی خاڵی ڕەشی تۆیە لە چاومدا، بۆیە وا ڕەشە.

نوقطەی (عا، غ، کم، گم): عەکسی.

(٥) صیدق: ڕاستگۆیی. طاق: تاق، تاقانە، تەنیا و تاك. وەلێ: بەڵام. هەمزاد: دووانە، جووت، جمك، پێکەوە لەدایکبوو.

واتە: ڕاستگۆیانە عاشقی تۆم و بێوێنەم، بەڵام تەمەنێکە بە تۆ نەگەیشتووم. دڵی پڕ داخ و کەسەرم هەمیشە لەگەڵ کەسێك کە بە خەم و خەفەت هاتبێتە دنیاوە، ڕێك و جووتە.

عومرێکە (ج): موددێکە. (کم): موددەیێکە. لەنگە.

(٦) خاطر: دڵ. بۆسە: ماچ. لەب: لێو. لەعل: بەردێکی گرانبەهای سوورە. سایە. سێبەر. سروشك: فرمێسك.

واتە: دڵی "سالم"ت لەسەر ماچێکی لێوی وەك لەعل سوورت شکاند. بۆیە گریام و ئێستا فرمێسکی چاوم، بە هۆی گریانەوە، وەك ڕەنگی یاقووت سوور بووە و خوێنینە.

خاطری (کم): خاتری.

(*) -٨-

**دڵا! ئازاری بێیاری، موشەخخەص، دەردی کاریتە**
**بە حاڵی دڵ، دەسا، ئەی دیدە! بگری؛ گاهی زاریتە (١)**
**وەصییەتنامەیی دڵ سوویی دڵبەر کێ بەرێ، پەنهان؟!**
**بە قوربانی پەڕت بم، ئەی کەبووتەر! وەختی یاریتە (٢)**
**لە هەنگامی تەضەرروعدا بە واضیح دای فەلەك جوابم**
**دەڵێ: ئەییامی شادی چوو، زەمانی سووگْواریتە! (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) دڵا: ئەی دڵ. موشەخخەص: دەستنیشانکراو. کاری: کاریگەر. دیدە: چاو. گاه: کات، دەم. زاری: شیوەن و گریان.

واتە: ئێش و ئازاری بێدڵبەری دەردی کاریگەری تۆیە. بۆیە ئەی چاو نۆرەتە و دەمی شیوەن و گریانی تۆیە، بگری بۆ حاڵی شڕی دڵ.

دڵا! ئازاری (کم): دڵ ئازاری و. دیارە هەڵەن. گاهی (کم، گم): وەختی.

(٢) وەصییەتنامە: وەسێتنامە، نامەی ڕاسپێریی پێش مردن. سوو: بەرەو. پەنهان: نهێنی، بە دزییەوە. کەبووتەر: کۆتر. یاری: یارمەتی.

واتە: کێ وەسێتنامەی دڵ کە ڕوو لە مردنە، بۆ دڵبەر بەرێ؟ ئەی کۆتر، لە دەوری پەڕ و باڵت گەڕێم، بە هانامەوە بێ، کاتی یارمەتیدانی تۆیە.

کێ (کم، گم): کەی. بەرێ (کم): پەری. هەڵەیە.

(٣) هەنگام: کات. تەضەرروع: پاڕانەوە. بە واضیح: بە ڕوونی. فەلەك: چەرخی ڕۆژگار. جواب: وەڵام. ئەییام: ڕۆژان. سووگواری: ماتەمینی، پرسەداری.

واتە: چەرخی ڕۆژگار لە کاتی پاڕانەوەدا بە ڕوونی وەڵامی دامەوە. وتی: ڕۆژانی خۆشەویستی و شادی تێپەڕین، ئیتر سەردەمی پرسەباری و ماتەمینییە.

دەڵێ (کم، گم): وتی. سووگواریتە (گم): سۆگەواریتە.

**له یادی دڵبەر ئەمشەو دڵ دەمێ، ئەی سینە! مەسرووورە**
**مەدە ڕێگەی غەمی بێگانە، گاهی پەردەدارێتە! (٤)**
**کە زانیی: بۆ نیشان تیری نیگاهت قەد حەذەر ناکا**
**لە قەلعەی سینەیی تەنگا، دڵی "سالم" حەصارێتە (٥)**

(٤) سینە: سنگ. مەسروور: شادمان. گاه: کات. پەردەداری: خزمەتکاریی ژووری تایبەت.

واتە: ئەمشەو –ئەی سینە– دڵ ماوەیەکە بە یادی دڵبەرەوە شادمانە. خەم بێگانە و غەریبە، ڕێی هاتنی مەدە، ئیتر نۆرەی خزمەتکاریی تۆیە.

لە (کم، گم): بە.

(٥) نیگاه: تەماشا. حەظەر ناکا: حەذەر ناکا، وریا نابێ، خۆی ناپارێزێ. قەلعە: قەڵا. حەصاری: دیواری دەوراندەوری قەڵا.

واتە: کە سالم زانیی تیری تەماشات وریا نابێ و خۆی ناپارێزێ و ڕووی لە نیشانی دڵیەتی، ئەوسا دڵی دەبێتە دیواری قەڵای سینەی تەنگی خۆی.

قەد (کم، گم): قەت. حەظەر (کم): خەطەر. (گم): خەتەر. (حەذەر ناکا) لە (مان)دا بە هەڵە بە (حەظەر ناکا) نووسراوە. حەصارێتە (کم، گم): حەسارێتە.

## -٩- (*)

**لە وادیی فیرقەتا ڕۆژم وەکوو زوڵفت شەوی تارە**
**بە یادی چاوی بیمارت، دڵم دایم بریندارە (١)**
**مەگەر باعیث بە هیجرانە، وەیا لێڵاوە بیناییم؟!**
**کەوا ڕۆژی ڕوناك ئەمڕۆ لە بەرچاوم شەوی تارە (٢)**
**لە فیرقەت نەوگوڵی باغ و بەهاری عاریضی یارم**
**بە ئەشکی ئاڵی گوڵگوونم سەراپام ڕەنگی گوڵنارە (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (عا، نم)دا هەیە. ناسناوی "سالم" نیـە، بـەڵام (عـا) نووسـیویە ((از گفتهٔ سالم)). (نم)یش بە ناوی "بیمار"ەوە نووسیویە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) وادی: شیو، دۆڵ. فیرقەت: جیابوونەوە. تار: تاریك. بیمار: نەخۆش. دایم: هەمیشە.

واتە: ڕۆژم لەناو دۆڵی دووری و لێكجیاییدا وەك ئەگریجەی ڕەشی تۆ شـەوێکی تاریکـە. دڵـم هەمیشە لە بیری چاوی مەستی تۆدایە و بریندارە.

لە وادیی فیرقەتا (نم): سەوادی فیرقەتت.

(٢) ئەم بەیتە لە (نم)دا چوارەمە.

باعیث: هۆ، سۆنگە. هیجران: دووری. لێڵاوە: لێڵ بووە.

واتە: ئاخۆ کە ئەمڕۆ ڕۆژی ڕووناك لە بەرچـاومدا بـووە بـە شـەوێکی تاریـك، ئـەوە بـە هـۆی دووریەوەیە، یا لەبەرئەوەیە کە چاوم لێڵایی داهاتووە؟!

(٣) ئەم بەیتە لە (نم)دا سێیەمە.

نەوگوڵ: گوڵی تازەپشکووتوو. عاریض: ڕوومەت، گۆنا. ئەشك: فرمێسك. گوڵگـوون: شـێوە گوڵ. سەراپا: سەر تا پێ. گوڵنار: گوڵی هەنار.

واتە: سەراپای لەشم لە داخی گـوڵی تـازە پـشکووتووی بـاخ و بـەهاری ڕوومـەتی یـارم، بـە فرمێسکی ئاڵی وەك گوڵ سوورم ڕەنگی گوڵی هەناری گرتووە.

لە فیرقەت (نم): لە حەسرەت. باغ و بەهاری (نم): باغی بەهاری. بە ئەشـکی ئـاڵی گوڵگـوونم سەراپام ڕەنگی گوڵنارە (نم): دڵی سەودازەدەم دایم وەکوو بولبول بە هاوارە.

**که یادی پیرەهەنئاڵی دەکەم، دڵ وا بە تاو دەکوڵێ**
**سروشکی جۆششی گریانی چاوم ڕەنگی گوڵناره (٤)**
**ئەگەر ئاهم گەلووگیر بێ، لە دەورم شین ئەکەن یاران**
**هەموو شەو دەفعەیێ ئەم عیللەتە قانوونی بیمارە (٥)**

(٤) ئەم بەیتە لە (نم)دا دووەم بەیتە.

پیرەهەنئاڵ: کراسی سووری بە خوێن ئاڵ. بەتاو: بەتین و گەرم. سروشک: فرمێسک. جۆشش: کوڵوکۆ.

واتە: کە کراسی سوور و ئاڵی یار دەکەوێتەوە بیرم، دڵم بە جۆش و خورۆشەوە دەکوڵێ. فرمێسکی گەرمی گریانم لە سووریدا هەمان ڕەنگی گوڵی هەناری هەیە.

کە یادی پیرەهەن ئاڵی دەکەم (نم): گەر یادی پیراهەن کەم دڵی زار. لەنگە. جۆششی (نم): جۆشی. چاوم (نم): دوچاوم. ڕەنگی (نم): نەوعی.

(٥) ئەم بەیتە هەر لە (نم)دا هەیە.

گەلووگیر بێ: گەروو بگرێ. دەفعە: جار، کەڕەت. عیللەت: دەرد. قانوون: ڕێوشوێن و یاسا. بیمار: دەردەدار.

واتە: ئەگەر ئاه و هەناسەم گەرووم بگرن و بمرم، یاران لە دەورم دەکەونە شین و گریان. ئەم دەردی مردنە بووە بە قانوونی ژیانی "بیمار" و هەموو شەوێ جارێك یەخەی پێدەگرێ.

(ئەکەن)، دەبێ (دەکەن) بووبێ و گۆڕرابێ.

ئەم پارچەشیعرە بەگشتی بێداروبار و کەمهێزوپێزە.

-١٠- (*)

نه تەنها هەر دڵم مەحبووسی طوڕڕەی زوڵفی تاتارە
لە هەر چینێکی صەد خاقانی چین تێدا گرفتارە (١)
هەتا دێم سەرحیسابی دڵ ببم، ڕۆحم دەبا چاوی
عەجەب صاحێبفەن و ئەفسوونگەر و پڕمەکر و سەححارە (٢)
طەڵاقی خاوی دا چاوم، لە عیشقی ماهی ڕووی یاری
وەکوو ئەجرامی سەبعە، هەر طەرەف بێظەرف و سەییارە! (٣)
عەجایەب دڵ لە گەردشدایە بۆ خاڵی لەبی دڵبەر
بە میثلی جەدوەلی پەرگاری کەشتی، هێندە دەووارە (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (پ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) مەحبووس: بەندکراو. طوڕڕە: پێچولوول. تاتـار: وڵاتـی تاتـار، تاڵانکـەر. خاقـان: پادشـا. گروفتار: گیرۆدە.

واتە: دڵی من نەك هەر بەندکراوی ناو پێچولوولی ئەگریجەی بۆنوبەرامە خۆشی وڵاتی تاتارە، یـا ئەگریجەی تاڵانکەری تۆیە، بەڵکوو سەد پادشای وڵاتی چینیش کە لـە من گـەورەتر و بەدەسـەڵاتترن، لـەناو هەر چینێکی ئەگریجەدا گیرۆدەیە و بەستراونەتەوە.

(٢) سەرحیساب: حیسابڕاگر، ئاگادار، سەرهەڵوێسـت. صـاحێبفەن: هونەرباز. ئەفـسوونگەر: جادووگەر. سەححار: سیحرباز.

واتە: تا دێم ئاگاداری کاروباری دڵ ببم و بزانم لـە چ حاڵوبارێکدایە، چاوی ئەو دەمترسـێنێ و زارەترەکم دەکا. ئەم دڵـبەرە هونەرنوێن و جادووگەر و مەکرباز و سیحربازێکی سـەیرە!

(٣) طـەڵاق: دەستلێهەڵگرتن. خاو: خەو. مـاە: مـانگ. ئـەجرامی سـەبعە: حەوتەوانـە. هـەر طەرەف: هەر لا. بێظەرف: بێقەدر. سەییار: گەڕۆك.

واتە: ئەوەندە عاشقی مانگی ڕوخسـاری یارم، خەو لـە چاوم تـۆراوە و ناسـرەوم، چـاوەکانم وەك حەوتەوانەیان لێ هاتووە، لـە هەموولایەکەوە لـە هیچ بـەرگ و دەفرێکـدا ناشـاردرێنەوە و گـەڕۆکن، یانێ پێڵوو لێك نانێن و هەردەم زەقەیان دێ و کراوەن!

(٤) عەجایەب: سـەیر. گەردش: گەڕان و سووڕانەوە. لـەب: لێو. میثل: وەك. جەدوەل: خشتە.

**به یادی ماهی گوڵڕوخ ئەشکی خوێن وا دێ لە دیدەمدا**
**کەنارم هەر طەرەف، تێدەفکرم، وەك عەینی گوڵزارە (٥)**
**لە بارانی حەوادیث قەد قوبووڵ ناکا تەڕیی قەلبم**
**سەراسەر جامەیی چاکم، لە خوێنا ئەصڵی ئاهارە (٦)**
**هیلالئاسا لە فیکرا خەم بووە ئەبرۆ، لەپاڵ چاوی**
**وەکوو شاگردی ئەفلاطوون لەسەر بالینی بیمارە (٧)**
**خودا تۆی شاهیدی صیدقی من و خەصمم کە لەیلایە،**
**بەقەد ئیخلاصی من، ئەو ((بالمضاعف)) ضیدد و ئەغیارە (٨)**

پەرگار: ئامرازی دیاریکردنی گۆشە. دەووار: خولاوە.

واتە: دڵ بە شێوەیەکی سەیر لە گەڕان و سوورانەوەدایە بە دوای خاڵی لای لێوی دڵبەردا، وەك خشتەی ژێر پەرگاری کەشتی لە گەڕان و خولانەوەدایە.

(٥) ماه: مانگ. گوڵڕوخ: ڕوخسار وەك گوڵ. ئەشك: فرمێسك. دیدە: چاو. کەنار: باوەش. عەین: کانی.

واتە: فرمێسکی خوێنین بە یادی مانگی ڕوومەتی ئەو دڵبەرە ڕوخسار وەك گوڵەوە، وا بە چاوەکانمدا دێتە خوارەوە. هەر لایەکی باوەشم -وەك بیر دەکەمەوە- لە وێنەی کانیی ناو باخ و گوڵزاردایە.

(٦) حەوادیث: کۆی (حادثة)یە، ڕووداو، بەسەرهات. قەد: قەت، هەرگیز. قەلب: دڵ. جامە: کراس. چاك: دوولەت، دادڕاو. ئەصڵی: لە بنچینەدا. ئاهار: پۆڵای جەوهەردار.

واتە: دڵی بریندار و خوێناویم هەرگیز ئەوە لە بارانی بەسەرهاتی ڕۆژگار قوبووڵ ناکا، وای بەسەر بهێنێ، چونکە کراسی دادڕاوی دوولەتم سەرتاپێ شەڵاڵی خوێنە و وەك پۆڵای جەوهەرداری لێ هاتووە.

(٧) هیلالئاسا: وەك مانگی یەكشەوە. فیکر: بیر. خەم: چەماوە. ئەبرۆ: برۆ. ئەفلاتوون: فەیلەسووفی زانای یۆنانی. بالین: سەرین. بیمار: نەخۆش.

واتە: برۆی دڵبەر لەپاڵ چاویدا لە بیرکردنەوەدایە و وەك مانگی یەكشەوە چەماوەتەوە، لە شاگردی ئەفلاتوونی فەیلەسووفیش دەچێ، بەسەر نەخۆشی سەر لە بان سەرینەوەیە بۆ چارەسەری دەردی.

(٨) شاهید: شایەت، گەواه. صیدق: ڕاستگۆیی. خەصم: خەنیم، نەیار، بەقەد: بەقەدەر، ئەوەندەی. ئیخلاص: دڵسۆزی. بالمضاعف: دووئەوەندە، دووقات. ضید: دژ. ئەغیار: بێگانە.

## حەکیمی کافرە دڵبەر، تەرەححوم زەحمەتە بۆ ئەو
## موسوڵمانان عیلاجی کەن، دەخیل! "سالم" بەئازارە (٩)

واتە: ئەی خودای گەورە، تۆ شایەتی حاڵی کە من چەندە ڕاستگۆم و دڵبەری لەیلا شێوە و سیفەتیشم ئەوەندەی من دڵسۆزی ئەوم، ئەو دوونەوەندە پێچەوانە و نەیار و بێگانەیە.

(٩) حەکیم: پزیشك. تەرەححوم: ڕەحم‌کردن، بەزەیی پێداهاتنەوە. زەحمەت: قورس. عیلاج: چارەسەر. دەخیل: دەستم بە دامێنتان.

واتە: دڵبەر وەك پزیشکێکی بێ‌دین وایە، زەحمەتە بەزەیی پێمدا بێتەوە و چارەسەرم بکا. موسوڵمانینە! دەستم بە دامێنتان، سالم ئێش و ئازاری زۆرە، چاری دەردی بکەن.

## -١١- (*)

**وجوودم ڕاسته خۆی سووتا، وەلێ ئەکثەر خەطای یاره**
**له ئەصلا قەلبی من گۆگردە، شوعلەی ڕوویی ئەو ناره! (١)**
**به مەجنوونی له صیدقا، گەر منیش لەیلاپەرستی کەم**
**سەگی دەرگاهی یاره موونیسم، گەر نەنگە، وەر عاره (٢)**
**حیسابی من لەگەڵ طالیع نەما، گەر سەعدە، وەر شوومە**
**له هەر لا ڕوویی دڵداره، لەوێدا بەختی من یاره (٣)**
**له غەم ئیتر بە سەختی حەببەیێ تەعدا قوبووڵ ناکەم**
**«نیظامولمولك»ی ئیقلیمی دڵم موژگانی دڵداره (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعره لە (مان، ن، حا، عا)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) وجوود: جەستە و بوون. ئەکثەر: بەزۆری. خەطا: خەتا، گوناح. لە ئەصلا: لـە بنەڕەتـدا. قـەلب: دڵ. گۆگرد: مەعدەنێکی بۆنناخۆشی زوو ئاگرگرە. شوعلە: بڵێسە. نار: ئاگر.

واتە: بەڵێ، بەزۆری خەتای یارە کە جەستەم خۆبەخۆ سووتا. دڵی من خـۆی گـۆگردە و بڵێـسەی ئاگری ڕووی ئەو سووتاندی.

(٢) ئەم بەیتە لـە (حا)دا سێیەمە.

بە مەجنوونی: بە ڕەفتاری وەك هیی مەجنوون، شێتی. لـە صیدقا: لە ڕاستگۆییدا. لەیلاپەرستی: کاری لـەیلاپەرستن. موونیس: هاودەم. نەنگ: شووورەیی. وەر: وە ئەگەر. عار: شەرم و عەیب.

واتە: ئەگەر منیش بە ڕاستگۆیی ببمە مەجنوون و کەڵکەڵەی لەیلا بکەویتـە سـەرم و گـیرۆدەی ببم، شەرم و شوورەیی و خەوشیش بێ، لەبەرئەوەی لـە بـەردەرگای یـاردا دەکـەوم، هـەر سـەگی بەردەرگاکەی دەبێتە هاودەمم.

وەر عارە (ن، پ): گەر عارە.

(٣) طالیع: بەخت. سەعد: یار، چاك. شووم: خراپ.

واتە: ئیتر من هیچ هەق و حیسابێکم لەگەڵ بەخت و ئیقباڵ نـەماوە، جـا چـاك بـێ یـا خـراپ، چونکە ڕوخسـاری دڵبەر لـە هەر لایەك بێ، بەختم لەوێ یار دەبێ.

(٤) حەبـە: دەنك. تەعدا: تەعەددا، دەسـتدرێـژی. نیظامولـملـك: ڕێکخەری کاروباری مەملەکەت،

**حەلاوەتبەخشە ئەر بەحثم، خیرەد تەحسینی من ناکا**
**زوبانێ وەصفی لێوی تۆ بکا، ئەڵبەت، شەکەربارە (٥)**
**خۆشا ئەشکێ بە یادی لەعلی تۆ بڕژێتە صەحرایێ**
**هەموو سەنگێکی یاقووتە، هەموو خاکی نەمەکزارە! (٦)**
**جەمالئابادە جێگەی دڵبەر و زادەی جگەر لادە**
**فسوونی ئەو فەریبی ساحیری مەککارەبازارە (٧)**

ناوی سەرۆکوەزیرانی مەلیکشای سێیەم گەورەترین سولتانی سەلجووقییە. ئیقلیم: هەرێم. موژگان: برژانگ.

واتە: بە توندی ڕووبەڕووی خەم و خەفەت دەبمەوە و بچووکترین دەستدرێژیی لێ قوبوول ناکەم، چونکە برژانگی چاوی یار ڕێکخەری کاروباری هەرێمی دڵمە.

(٥) حەلاوەتبەخش: شیرینیبەخش. ئەر: ئەگەر. بەحث: باسوخواس. خیرەد: هۆش و عەقڵ. تەحسین: دەستخۆشیلێکردن. شەکەربار: شەکرلێباریو.

واتە: ئەگەر باسوخواسی من مایەی شیرینی و خۆشی بەخشینە، عەقڵ دەستخۆشیم لێ ناکا. زمانێك وەسفی لێوی یار بکا، هەڵبەت دەبێ شەکری لێ بباری.

ئەر بەحثم (ن): ئەر بەختم. خیرەد (عا): ضەرەر. زوبانێ (حا): زمانێ. سالم وای نەوتووە.

(٦) خۆشا: ئای کە خۆشە. ئەشك: فرمێسك. لەعل: لێو. صەحرا: سارا: سارا و دەشت. سەنگ: بەرد. یاقووت: بەردێکی گرانبەهای ڕەنگسوورە. نەمەکزار: شۆرەکات.

واتە: ئای کە خۆشە فرمێسك بە یادی لێوی تۆوە بڕژێتە سارا و دەشت، ئەوسا هەموو بەردێکی لە سووریدا یاقووت و هەموو خاکەکەیشی بە فرمێسکی سوێری من شۆرەکاتە.

بڕژێتە صەحرایێ (حا، عا): بڕژێنە سەحرایێ.

(٧) جەمالئاباد: ئاوەدانیی جوانی. زادەی جگەر: جگەرگۆشە. فسوون: فڕوفێڵ. فەریب: فریو. ساحیر: جادووگەر. مەککارەبازار: شەیتانبازاڕ.

واتە: جێی دڵبەر ئاوەدانیی جوانییە و جگەرگۆشەکەت بخەرە لاوە، فڕوفێڵی ئەو فریودانی جادووگەری شەیتانبازارە.

جەمال (عا): حەرەم. لادە (عا): لاتە.

**ڕەوانم تازە بوو "سالم"! ((عفاك الله)) لەگەڵ فیکرت**
**سەراسەر شیعری شیرینت، بە لەذذەت، وەك قصەی یارە (٨)**

(٨) ڕەوان: گیان. عفاك الله: خوا لێت ببوورێ. سەراسەر: هەموو. لەذذەت: چێژ و لەزەت.
واتە: سالم خودا لە خۆت و بیر و بۆچوونت ببوورێ، گیان بووژایەوە و تازە بووەوە. شیعری شیرینیشت لە چێژ و لەزەتدا، هەمووی وەك قسەی یارە.
سەراسەر (عا): لە دڵما. بەهێزترە، چونکە لە نێوەی یەکەمدا ((ڕەوانم تازە بوو))ە و ئەمیش هۆیەکەیەتی.

-١٢- (*)

**لیقا و جیلوە و تەجەللای دڵبەرم وەك شوعلەیی نوورە**
**بەسەر روویا شوعاعی ناصییەی «نورٌ علی نور»ە (١)**
**قەرین و قوربی عەیشە یار و من دوورم لە ئاسایش**
**وەلێ صیدق و صەفا هەردەم لە من نەزدیك و لەو دوورە (٢)**
**فەضای خولدی بەرین بێ یار، ئەویش هیجران و ئەندووهە**
**ئەگەر طووبایە، گەر قەصرە، وە گەر غیلمان، وە گەر حوورە (٣)**
**شەوی یەلدا، لە بەزمی دڵبەرا، هەرگیز چرام ناوێ**
**لە تۆی فانۆسی پیراهەن تەنی وەك شەمعی کافوورە (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) لیقا: دیدار و چاوپێکەوتن. جیلوە: خۆنیشاندان. تەجەللا: دەرکەوتن. شوعلە: بڵێسە. نوور: ڕووناکی. شوعاع: تیشك. ناصیبە: تەوێڵ، ناوچاوان. نورٌ علی نور: ڕووناکی بەسەر ڕووناکییەوە.

واتە: دیدار و ورشە و دەرکەوتنی دڵبەرم، وەك بڵێسەی ئەو ڕووناکییەیە کە لە ئاگر بەرز دەبێتەوە. تیشکی بەسەر ڕوخساردا بڵاوی ناوچاوانی، ڕووناکییە بەسەر ڕووناکییەوە.

(٢) قەرین: هاودەم، یار. قورب: نزیکی. عەیش: ژیان و گوزەران. وەلێ: بەڵام. صیدق: ڕاستگۆیی. صەفا: بێگەردی، خاوێنی. هەردەم: هەمیشە. نەزدیك: نزیك.

واتە: یار، هاودەمە و نزیك و تێکەڵی ژیانمە، بەڵام من لە ئاسایش و ئارامیدا نیم. بەڵێ، ڕاستگۆیی و بێگەردی هەمیشە پیشەی من بوون و لەوەوە دوور بوون.

دەبوو (دوورە)ی نیوەبەیتی دووەم، لەبەرئەوەی بۆ دوو شت (صیدق و صەفا) هێنراوەتەوە، (دوورن) بووایە، بەڵام بۆ سەروای شیعرەکە گونجاو نەبووە.

(٣) فەضا: گۆڕەپان، پانتایی. خولدی بەرین: بەهەشتی فراوان. هیجران: دووری. ئەندووه: خەم و خەفەت. طووبا: دارێکە لە بەهەشت. قەصر: کۆشك. غیلمان: کۆی غولام، کوڕوکاڵ. حوور: پەری.

واتە: بەربڵاویی بەهەشتی فراوان، بە داری تووبا و کۆشك و کوڕوکاڵ و پەرییەکانیەوە، بەبێ دڵبەر، هەر دووری و لێکجیایی و خەم و خەفەتە.

(٤) یەلدا: درێژترین شەوی ساڵ. بەزم: شادی. لە تۆی: لە توێی. فانۆس: چرای بە شووشەی

**هەوای لیمۆیی پوستانت لە دڵما وا بەتەئثیرە،**
**هەناسەی سەردم ئەمشەو ((فی المثل)) هەمزادی کافوورە! (٥)**
**سیپەرئەفگەندەوو گەردنکەچم، حاضر لە مەیدانا**
**جەدەلکردن لەگەڵ تۆ، وەك تەلاشی باز و عوصفوورە! (٦)**
**بەبێ مەی، دیدە "سالم!" شێوەیی مەستی ظوهوور ناکا**
**بە غەیرەز چاوی دڵبەر، دایما بێ بادە مەخموورە! (٧)**

بلوورەوە. پیراهەن: کراس. تەن: لەش، جەستە. شەمع: مۆم. کافوور: سپی.

واتە: شەوی یەلدا کە لە کۆڕی شادیی دڵبەردا دەبم، پێویستیم بە چرا نابێ بۆ ڕووناککردنەوەی دەورووبەرم، چونکە لەشی دڵبەر لە تونێی شووشەی بلووری چرای کراسی بەریدا، وەك مۆمی کافوور سپییە و ئەو ناوەی ڕۆشن کردووەتەوە.

(٥) هەوا: حەز، ئارەزوو. پوستان: مەمك. بەتەئثیر: کاریگەر، بەتینوتاو. سەرد: سارد. في المثل: بۆ نموونە. هەمزاد: جمك.

واتە: ئارەزووی بە دەست گرتنی لیمۆی مەمکەکانت وا کاری کردووەتە سەر دڵم، ئەمشەو هەناسەی ساردم -بۆ نموونە- هاوشێوەی کافوور وایە و گەرمە.

(٦) سیپەرئەفگەندە: کینایەیە لە تێشکان و دەست هەڵگرتن لە شەڕ و خۆبەدەستەوەدان. گەردنکەچ: ملکەچ. حاضر: ئامادە. جەدەلکردن: ململانێ و ناحەزیکردن. تەلاش: هەوڵ و کۆشش. عوصفوور: چۆلەکە.

واتە: لە شەڕی بەدەستهێنانی تۆدا شکستم خوارد و تەسلیم بووم، ملکەچ لە مەیدانی شەڕدا ئامادەم. ململانێ و بەربەرەکانیی تۆ وەك شەڕی باز و چۆلەکە وایە، کە دیارە چۆلەکەی تێدا دەدۆڕێ و دەرەقەتی باز نایێ.

(٧) دیدە: چاو. مەستی: سەرخۆشی. ظوهوور ناکا: دەرناکەوێ. غەیرەز: جگە لە. دایما: هەمیشە. بادە: شەراب، مەی. مەخموور: مەست و سەرخۆش.

واتە: سالم، ئەگەرچی چاو -بەگشتی- بەبێ خواردنەوە شێوەی مەستی نیشان نادا، بەڵام چاوی دڵبەری من هەمیشە بەبێ مەیخواردنەوەیش وەك مەست و سەرخۆش وایە.

## -١٣- (*)

حورمەتی دڵ واجیبە، چونکە مەکانی دڵبەرە
مەیشکێنن، ناوی پڕئیکسیری کەعبەی ئەکبەرە (١)
شێـفْتەی گێسووی ئەیازێکم، لە غەم مەحموودْسان
لەشکری غەمزەی لە غەزنەی خاطرا غارەتگەرە (٢)
شیعەوو سوننی لەلای من هەر یەکێکن، چونکە یار
نەسلی ئەولادی "حوسەین" و ئەصڵی فەرعی "عومەر"ە (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لـە (مان، عا، غ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) هەر دوو بەیتی ئەووەڵ لـە (غ)دا هەیە.

حورمەت: ڕێز. واجیب: ئەرك. ئیکسیر: کیمیا. کەعبەی ئەکبەر: کابەی مەزن.

واتە: دڵ، دەبێ ڕێزی لێ بگیرێ، لەبەر خۆی نا، بەڵکوو لەبەرئەوەی لە شـوێنێکدایە کـە نـاو ئەگریجەی دڵبەرە. ئەم دڵە مەشکێنن، چونکە کیمیای کەعبەی مەزن پڕاوپڕیەتی.

(ئیکسیر) لـە (مان)دا بە هەڵە بە (ئیکثیر) نووسراوە.

(٢) شێفتە: پەرێشان. گێسوو: ئەگریجە. ئەیاز: لـە شازادە خۆشەویستەکانی سوڵتان مـەحموودی غەزنەوی و نموونەی چابوکی و هۆشیاری و جـوانی بـووە. مەحموودسـان: وەك مـەحموود. غەزنـە: شاری غەزنە. خاطر: دڵ، خەیاڵ. غارەتگەر: تاڵانچی.

واتە: وەك سوڵتان مەحموودی غەزنەوی پەرێشانی ئەگریجەی ئەیازێکی وەزیر و ڕاوێـژکارم کـە سوپای ناز و غەمزەی لە وڵاتی (غەزنە)ی دڵدا تاڵانکەرە. یانێ ئەو دڵبەرە دڵی بە تاڵان بردووم.

(٣) نەسل: وەچە، نەوە. ئەولاد: منداڵەکان. حوسەین: حەزرەتی حوسەینی کوڕی ئیمام عەلیی کوڕی ئەبووتالیب (خ.ڕ). ئەصڵ: بنچینە. فەرع: لق. عومەر: حەزرەتی عومـەری کـوڕی خـەتتابی دووەم خەلیفەی موسوڵمانان (خ.ڕ).

واتە: لـەبەرئەوەی یارەکەی من نەوەی کوڕانی حوسەینی کوڕی ئیمـام عەلییـە و بـە ئەسـڵیش دەچێتەوە سەر ئیمامی عومەر، ناچارم شیعە و سوننەم لـەلا وەك یەك وەها بن.

(نەسلی) لـە (مان)دا بە (نەصڵی) نووسراوە کە هەڵەیە.

بۆ "موحەممەد" نەعتخوانم، چاکیری "حەمزە" و "عەلی"
خاکی پێی "سەلمانی پاك"یش بۆ سەری من ئەفسەرە (٤)
سا گوزارێ کە، بە سەرما بێ، لە ڕێی ئەهلی عەبا
گەردی پیرۆزی ڕەهت بۆ تاجی فەقرم ئەفسەرە (٥)

(٤) موحەممەد: پێغەمبەری موسوڵمانان (د.خ). نەعتخوانم: ستایشکەرم، وەسف و سەناکەرم. چاکیر: خزمەتکار. حەمزە: مامی پێغەمبەر. عەلی: عەلیی کوڕی ئەبووتالیب (خ.ڕ). سەلمانی پاك: سەلمانی فارسیی یەکێك لە یارانی پێغەمبەر. ئەفسەر: تاج، کڵاوی پادشایی.
واتە: هاوزەمان ستایشگۆی حەزرەتی پێغەمبەر و خزمەتکاری حەمزە و "ئیمامی عەلی"م. خاکی پاکی بەرپێی "سەلمانی فارسی"ش وەك تاجی شاهانە وایە بۆ سەرم.
(٥) گوزار: هاتوچۆ، تێپەڕین. ئەهلی عەبا: خەڵکی عاباپۆش، ئەو ئافرەتانەی پێغەمبەر کە عابایان بە سەردا داوە. ڕەه: ڕێ. فەقر: هەژاری. ئەفسەر: پلەوپایە.
واتە: سا ئیتر لە ڕێی خەڵکی عاباپۆشەوە هاتوچۆ بکە و بە سەرمدا تێپەڕە. گەردی پیرۆزی ڕێی تۆ پلەوپایەیە بۆ تاجی هەژاریی من.

## -١٤- (*)

**تا ڕەقیب حاضرە، گاهی حەذەرە، نەك حەضەرە**
**ئەو سەگە تا لە کەمین بێ، حەضەریشم سەفەرە! (١)**
**گەر لەبن سایەیی طووبا بە صەفا ماوا کەم**
**بێتە دڵ یادی بەدیی ئەو سەگە، جێگەم سەقەرە (٢)**
**باڵشی جێگەم ئەگەر قاقوم و قوو بێ، هەموو شەو**
**دوور لە باڵات، لە بەدەنما وەکوو خار و حەجەرە (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (عا)دا هەیە و ناسناوی "سالم"یشی تێدا نییە. لە سەرووییەوە نووسـیویە: ((از گفتهٔ سالم)). (دیوانی کوردی، بەرگی یەکەم، ل٥٩٢) داویەتە پاڵ "کوردی". لەوێ حەوت بەیتە و دوایەبەیتیشی ناوی "کوردی"ی تێدایە. پارچەکە هێندێ جیاوازیی لەگەڵ ئەمەی بەردەست هەیە، بەڵام تێکڕا بە هیی سالم دەزانرێ. ئەم پارچەیە لـە کەشـکۆڵێکی بـەڕێز محەمـەدڕەحیم ڕەمـەزاندا بـە نـاوی "بیمار"ەوەیە، کە ناسناوی سەرەتای شیعروتنی "سالم" بووە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتـی مەخبوونی مەحزووف.

(١) ڕەقیب: بەدکار. حاضـر: ئامـادە، لــە ئـارادا. گـاه: کـات. حـەذەر: وریـایی، خۆپـارێزی (حەضەر)ی یەکەم: کەمین: بۆسـە. (حەضەر)ی دووەم: لەماڵدابوون.

واتە: تا بەدکار لە مەیداندا بێ، کاتی وریایی و خۆپارێزییە، نەك ئامادەبوون. ئەو بەدکارە سەگە تا بۆسە بنێتەوە، ئامادەبوونیشم وەك سەفەر و دوورکەوتنەوە وایە، چونکە ناهێڵێ بە یار بگەم.

(حەضەریشم) لەو دوو سەرچاوەیەیتردا (حەضەرم هەر)ە.

(٢) طووبا: درەختێکە لـە بەهەشت. صەفا: خۆشی و شادی. مەئوا کەم: نیـشتەجێ بم. بـەدی: خراپی. سەقەر: دۆزەخ.

واتە: ئەگەر سێبەری داری تووبای بەهەشت بە دڵێکی خۆشەوە بکەمە شـوێن و مـاوای خـۆم، هەر خراپەکاریی ئەو بەدکارە سەگەم بکەوێتە یاد، شوێنم لێ دەبێتە دۆزەخ.

گەر لـەبن (دیوانی کوردی): کە دەمی. نیوەی یەکەم لـەنگـە و (طـووبـا) ڕەنگـە و (طـووبـادا) بووبێ کە وا هەڵدەگرێ.

(٣) باڵش: سەرین. قاقوم: گیانەوەرێکی چکۆلـەی وەك سمۆرەی پێستی نەرم و سپی و گرانبەهایە. قوو: باڵندەیەکی جوانی ملدرێژی بێپەردەداری پەرنەرمی ڕەنگ سپی یا ڕەشە. خار: دڕك. حەجەر. بەرد.

واتە: ئەگەر سەرینی هەموو شەوێکی جێی خەوتنم گەرم و نەرم و لـە پەڕی قوو و پێستی قاقوم بێ،

**چین بە چین کەوتۆتە سەر یەك لە دڵا عوقدەیی غەم**
**بێ، بە ماچی دەمەکەت لادە سا ئەم کەسەرە (٤)**
**ئاخ لەپاش ئەم هەموو هیجرانە، بە کوێریی ڕەقیب**
**دەمدی دەستم لە قەدت چەسپە، بە میثلی کەمەرە (٥)**
**بە قصەی خۆش نییەتی وایە قصەم پێ دەرخا**
**صەد دەسی تولەکی دام کردووە، حیزبابەکەرە (٦)**

کە لە باڵای تۆ دوور بم، وەك ئەوە وایە لەسەر دڕك و بەرد بم.

(٤) عوقدە: گرێ. کەسەر: دڵشکاوی.

واتە: گرێوگرووت و خەم و خەفەت چین بە چین لەناو دڵمدا هەڵچنراون. وەرە ئەم دڵشکاوییە بە ماچی دەمت مەهێڵە.

(عوقدەوو)ی (عا) ڕاست نییە. (کەسەرە) بە هەڵە بە (کەثەرە) نووسراوە.

(٥) هیجران: دووری. چەسپ: جێگیر. میثل: وێنە، وەك.

واتە: داخ و خەفەت بۆ ئەوە دەخۆم کە پاش ئەم دوورکەوتنەوەیە، ببینم -بە کوێرایی چاوی بەدکار- دەستم لە ناوقەدی دڵبەر جێگیر بووە و وەك کەمەری لێهاتووە.

وشەی (هەموو) لە (عا)دا کەوتووە، لە نوسخەکەی (دیوانی کوردی)دا هەیە.

(٦) نیەت: نیاز و تەما. تولەك: گیانداری تووكهەڵوەریو. دام کردووە: بەستووەتەوە، خستووەتە داوەوە.

واتە: یار نیازیەتی بە قسەی خۆش نهێنی و ڕازی دڵم پێ دەربخا. ئەم بێعەقڵە سەد دەستی گیانداری تووكهەڵوەریوی بەستووەتەوە.

وایە (کەشکۆڵی محەممەدڕەحیم ڕەمەزان): واتە. (صەد دەسی توولەکی دام کردووە ...) لە (دیوانی کوردی)دا (صەدوسی تووتکی وام پێ کە بە بەردێکە، کەرە) و لای (محەممەدڕەحیم ڕەمەزان)یش (صەدوسی توولکی وام کردووە، حیزبابەکەرە)یە.

ئەم بەیتە لەنگە، هەر ئەوەندە ڕاست کرایەوە.

دواین بەیت لە (دیوانی کوردی)دا ئەمەیە:

خۆشە بۆ تیری موژەی، دڵ بە هەدەف کەی، "کوردی"
کەچی بۆ چارەڕەشی شیری ڕەقیبم لەسەرە

## -١٥- (*)

**له طه‌ره‌ف یاره‌وه نۆبه‌ی نه‌ظه‌ره**
**ئه‌ی دڵ ئاماده به، خوێنت هه‌ده‌ره ! (١)**
**گه‌هی کین زه‌هره، ئه‌گه‌ر هه‌ر نیگه‌هی**
**عوذری مه‌سمووعه، که لێوی شه‌که‌ره (٢)**
**ته‌شتی پڕ خوێنه به دایم سینه‌م**
**تا موژه‌ت بۆ ڕه‌گی دڵ نیشته‌ره (٣)**
**وه‌زنی یه‌ك بۆسه‌وو جورمی سه‌ر و جان**
**له ترازوویی ئه‌وا سه‌ربه‌سه‌ره! (٤)**

(*) ئه‌م پارچه‌شیعره لـه (مان، ن، حا، عا، ه، غ، ج، ق، ڕ، کم، گم)دا هه‌یه.
کێشی عه‌رووز: ڕه‌مه‌لی شه‌شیی مه‌خبوونی مه‌حزووف.
(١) ئه‌م به‌یته لـه (عا)دا نییه.
طه‌ره‌ف: لا. نه‌ظه‌ر: ڕوانین، ته‌ماشا. هه‌ده‌ر: ڕژاو، به فیڕۆچوو.
واته: ئه‌ی دڵ، وریا و ئاماده به. ئیتر نۆره‌ی ئه‌وه‌یه یـار بڕوانـێ و ته‌ماشـا بکـا، بۆیـه خوێنـت ده‌ڕێژێ و به فیڕۆی ده‌دا.
(دڵ) لـه (ق)دا که‌وتووه.
(٢) گه‌ه: کات، ده‌م. کین: ڕق و کـینه. نیگـه‌ه: ته‌ماشـا. عـوذر: بیـانوو، به‌هانـه. مـه‌سموع: بیستراو. شه‌که‌ر: شه‌کر.
واته: ئه‌گه‌ر هه‌ر ته‌ماشایه‌کی یـار لـه کـاتی ڕق و تووڕه‌ییـدا ژه‌هـر بـێ، ئـه‌و عوزرخـوایی و بیانووه‌ی لێ وه‌رگیراوه و بیستراوه، چونکه لێوی وه‌ك شه‌کر وایه.
گه‌هی کین (ق): کار کن؟. زه‌هره (کم، گم): ژه‌هره. نیگـه‌هی (ه، گـم): نیگـه‌هت. هه‌ڵـه‌یـه. لێوی (عا): لێوه. هه‌ڵه‌یه. (ه، ج): لێوت.
(٣) ئه‌م به‌یته لـه (ق)دا نییه.
به‌دایم: هه‌میشه. سینه: سنگ. موژه: برژانگ. نیشته‌ر: نه‌شته‌ر، شفره‌ی ده‌ستی برینگه‌ر.
واته: تا برژانگت نه‌شته‌ر بێ و ڕه‌گ و ده‌ماری دڵ ببڕێ، سنگم به‌رده‌وام وه‌ك ته‌شتێکی پڕ لـه خوێنه.
(ته‌شتی) لـه (مان)دا به شێوه‌ی (طه‌شتی) نووسراوه.
(٤) وه‌زن: کێش. بۆسه: ماچ. جورم: قه‌واره و قورسایی. جان: گیان. سه‌ربه‌سـه‌ر: وه‌ك یه‌ك.

**سەری ئەنگوشتی دەبێتە نەیی قەند**
**دەستی هەر کەس لە میانت کەمەرە! (٥)**
**وەصڵی ئیکسیرە، وەلێ زەحمەتە بێ**
**قامەتی سەروە، وەلێ بێثەمەرە! (٦)**
**بۆ کەسێ صوحبەتی مەعشووقی نەبێ**
**حاصیڵی هەردو جیهان دەردیسەرە (٧)**
**طالیبی وەصڵی کەسێکم بە دوعا،**
**وەصڵی فیردەوس و فیراقی سەقەرە! (٨)**

واتە: ماچێکی یار بەرامبەر بە سەر و گیانی منە. ئەگەر ماچێکم بداتێ، دەبێ بمکوژێ و سەر و گیانمی بدەمێ.

(٥) ئەنگوشت: ئەنگوست، پەنجە. نەی: شمشاڵ، قامیش. قەند: شەکر. میان: ناوقەد.

واتە: هەر کەس بتوانێ دەست بکاتە کەمەرت، سەرپەنجەی دەبێتە قامیشی شەکر و شیرین دەبێ.

ئەنگوشتی (کم): ئەنگوستی. دەبێتە (غ): دەبێتە. هەڵەیە. لە میانت (ه): بە میانت.

(٦) وەصڵ: گەیشتن بە یار. ئیکسیر: کیمیا. وەلێ: بەڵام. بێ: بێت. قامەت: بەژن و باڵا. بێثەمەر: بێبەر.

واتە: ئەگەر بە یار بگەی، وەك ئەوەیە کیمیات هەبێ، بەڵام زەحمەتە بێت. بەژن و باڵایشی وەك سەروە، بەڵام بێبەرە و خێری بۆ کەس نییە.

ئیکسیرە (مان، حا): ئیکثیرە. هەڵەیە. وەلێ زەحمەتە بێ (عا): زەحمەتە. لەنگە. (غ، ڕ): وەصڵی زەحمەتە. (ج): ویصال زەحمەتە بێ. وەلێ بێثەمەرە (غ): دڵی بێثەمەرە. (گم): وەلێ باثەمەرە.

(٧) صوحبەت: تێکەڵی، هاوڕێیەتی. مەعشووق: یار. حاصیل: بەرهەم.

واتە: ئەوی تێکەڵ بە یار نەبێ، لە هەردوو دنیادا تووشی دەردەسەر دەبێ.

(٨) طالیب: داواکەر. فیردەوس: بەهەشت. فیراق: جیایی لە یار. سەقەر: دۆزەخ.

واتە: من بە دوعا دواکاری گەیشتن بە کەسێکم، کە پێی بگەم وەك بەهەشت وایە و دووریشی دۆزەخە.

فیردەوس و (ه، ق، کم، گم): فیردەوسە.

**وەختی خەندە و نیگەه و عیشوەیی یار**
**"سالم" ئەر ضەبـطی نیگەه کا، هونەرە! (٩)**

(٩) نیگەه: تەماشا. عیشوە: ناز و نووز. ئەوا: ئەگەر. ضەبطی کا: ڕێکی بخا.
واتە: ئەگەر سالم بتوانێ کاتەکانی خەندە و تەماشا و ناز و عیشوەی یار ڕێك بخا و پێیان بزانێ، ئەوە هونەری نواندووە.

خەندە و (ق): خەندەی. نیگەه و (عا، ه): نیگەهی. عیشوەیی یار (کم): عیشوە و ناز. نیگەه کا (عا، کم): نەظەر کا. (ضەبطی) کە لـە (حا، عا، ن)دا بە (ظەبطی) نووسراوە، هەڵەیە.

## -١٦- (*)

**خەیاڵی نێشی موژگانت لەناو دڵما وەکوو تیرە**
**بە یادی قەوسی ئەبرۆت، گەردەنم نەزدیکی شەمشیرە (١)**
**ڕومووزی عیشق ئیشکالە، لە حەددی قیل و قال نایێ؛**
**نە کاری کەنز و کەششافە، نە باسی کەشف و تەفسیرە (٢)**
**لە هەر سوو ئەهلی دونیا جوملەگی گەردنکەچی یارن**
**بەسەر موڵکی دڵاندا، ئەم وەکوو شاهی جیهانگیرە (٣)**
**بتی من تۆی و من زوننارى (خانت؟) جگەر لاتە**
**بنازم زوڵف و ڕوخسارت دەڵێی قیندیل و زەنجیرە (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (کم، پ، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) نیش: چزوو. موژگان: برژانگ. قەوس: کەوان. ئەبرۆ: برۆ. نەزدیك: نزیك. شەمشیر: شمشێر.

واتە: کە تیری برژانگەکانت بە خەیاڵمدا دێت، ئازار بە دڵم دەگەیێنێ و برینداری دەکا. کە بیر لە کەوانی برۆیشت دەکەمەوە، وەك ئەوە وایە مل لە چەقۆ بسووم، گەردنم لە شمشێری برۆت نزیك دەبێتەوە.

(٢) ڕومووز: کۆی ڕەمزە، نیشانەکان. ئیشکال: ئاڵۆز، پڕکێشە. حەد: سنوور، ڕادە. قیل‌وقال: قسەوقسەڵۆك. کەنز: گەنجینە. کەششاف: دۆزەرەوە، ئاشکراکەر، پەردەلێهەڵماڵ. کەشف: پەردەلێهەڵماڵین، ئاشکراکردن. تەفسیر: لێکدانەوە.

واتە: نیشانە و نهێنییەکانی عیشق گیروگرفت و کێشەن، بە قسەوقسەڵۆك تەواو ناکرێن، نە مەسەلەی گەنجینە و ئەو کەسەیە کە دەیدۆزێتەوە و ئاشکرای دەکا و نە باس‌وخواسی دۆزینەوە و ئاشکراکردن و لێکدانەوەیشە. دەشێ مەبەستی لە کتێبەکانی (کنز) و (کشّاف) و (تفسیر)یش بێ.

(٣) ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوە هەر لە (پ)دا هەن.

هەر سوو: هەر لا. جوملەگی: سەرپاك.

واتە: خەڵك سەرجەمیان لە هەر لایەکەوە ملکەچی یارن. ئەم، دەڵێی شاهی سەرتاسەری جیهانە، بەسەر موڵکی دڵی هەمووواندا دێت و دەچێ.

(٤) نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە ساغ نەکرایەوە.

**بەبێ ماری فیراق کوشتن، نییە گەنجی ویصال بۆ کەس**
**بە خاصییەت جەفای عاشق، یەقین ئەجزایی ئیکسیرە (٥)**
**چ حاجەت تیری موژگان ڕووبەڕووی دڵ ڕاگری هەردەم؟**
**بەبێ تەمهیدی لەشکر، خودبەخود، تەسلیم و تەسخیرە! (٦)**
**چ موشتاقم لە توندیدا بە لەب کەی ئاشنا حەرفێ!**
**ئەگەر تەڵخیشە هەر بیڵێ، لە لام وەك شەککەر و شیرە! (٧)**
**ڕەفیقان! ئێوە گەر ئاشوفتەیی یارانی ئەکرادن؟**
**بە شۆخی، دڵبەری من خوسرەوی خووبانی کیشمیرە (٨)**

زونار: پشتێنی کەمەری مەسیحییان. بنازم: شانازی بکەم. قیندیل: چرا.

واتە: تۆ ئەو بتەی کە دەتپەرستم ... . با شانازی بکەم کە ئەگریجەت زنجیرمە و ڕوخساریشت چرای ڕووناککەرەوەی ژیانمە.

(٥) فیراق: لێكدابڕان. بە خاصییەت: بەتایبەتی. جەفا: ئازار. یەقین: بێچەندوچۆن، بە قەناعەتەوە. ئەجزا: دەرمان. ئیکسیر: کیمیا.

واتە: تا لێكدابڕان لە ئارادا بێ، کەس گەنجینەی گەیشتن بە یاری بەنسیب نابێ. ئازاری عاشقیش -بێچەندوچۆن- دەرمانی ئیکسیری چارەسەرە.

(٦) حاجەت: پێویستی. هەردەم: هەر کات. تەمهید: ڕێخۆش‌کردن. خودبەخود: خۆبەخۆ. تەسلیم: خۆبەدەستەوەدان. تەسخیر: داگیرکردن و خستنە ژێر دەست.

واتە: پێویست ناکا تیری برژانگەکانت بەردەوام بە دڵی من ڕابگری، چونکە بەبێ ڕێخۆش‌کردن بۆ ئەو لەشکرە، خۆبەخۆ خۆی بەدەستەوە دەدا و دەتوانی داگیر و ڕامی بکەی بۆ خۆت.

(٧) موشتاق: پەرۆش، ئارەزوومەند. لەب: لێو. حەرف: قسە. تەڵخ: تاڵ. شەککەر: شەکر.

واتە: من زۆر پەرۆشی ئەوەم لە کاتی توندوتیژیدا قسەیەك لە دەمت دەرچێ. تەنانەت ئەگەر ئەو قسەیە تاڵیش بێ، بیڵێ، لای من وەك شەکر و شیر شیرینە.

(٨) ڕەفیقان: دۆستان. ئاشوفتە: شێواو. شۆخی: جوانی و قەشەنگی. خوسرەوی خووبان: شای جوانان. کیشمیر: وڵاتێکی سەرووی هیندستانە.

واتە: دۆستان! ئەگەر ئێوە شێواوی یارانی کوردزمانن، دڵبەری من لە جوانی و قەشەنگیدا وەك شای جوانانی وڵاتی کیشمیر وایە.

**موجەڕڕەد بە ڕەفیق! بێ، تەوسەنی نەفست بەجێبێڵە**
**لە ڕێی عیشقا هەموو پێچێکی سەد شەیطان جڵەوگیرە! (٩)**
**لە دونیادا خوداوەند حەرفی موفسید قەت قوبووڵ ناکا**
**ڕەقیب هێندەی درۆ کرد، سەیری ڕووی کەن، هەروەکوو قیرە! (١٠)**
**ڕەقیب نایەڵێ قەت یارم لەگەڵ من لەحظەیێ جووت بێ**
**لە شێوەی فیتنەجۆییدا، خوداوەندا! چەنێ پیرە؟! (١١)**
**ڕەفیق خۆتان بچن بۆ سەیری صەحرا، کەوتووە "سالم"**
**سەفەر مومکین نییە لەم ئاسْتانە، خاکی دڵگیرە (١٢)**

(٩) موجەڕڕەد بە: خۆتی لێ دابماڵە. ڕەفیق: دۆست. بێ: وەرە. تەوسەن: ئەسپی سەرکێشی ڕامنەکراو. جڵەوگیر: کۆسپی سەر ڕێ.

واتە: ئەی دۆست، خۆت لە هەموو شتێك دابماڵە و وەرە. ئەسپی سەرکێشی نەفسی خۆت بەجێ بهێڵە: هەموو پێچێکی نەفس لە ڕێی عیشقدا سەد شەیتانی تێدا بووە بە کۆسپ و ڕێت پێدەگرن، یا جڵەوی ئەسپی نەفست دەگرن.

(سەد)، دەبێ (صەد) بووبێ و گۆڕرابێ.

(١٠) خوداوەند: خوا. موفسید: خراپەکار. ڕەقیب: بەدکار، ناحەز.

واتە: خودا هەرگیز لە دنیادا قسەی پیاوی خراپەکەر وەرناگرێ و پەسەندی ناکا. بەدکار ئەوەندەی درۆ کردووە، سەیری سەروچاوی کەن ئەوەندە ڕەش بووە وەك قیر ڕەش داگەڕاوە.

(١١) لەحظەیێ: ساتێك. فیتنەجۆیی: ئاژاوەگێڕی.

واتە: بەدکار لە ئاژاوەگێڕیدا زۆر دنیادیتە و شارەزایە، ڕێم لێ دەبەستێ و ناهێڵێ –ئەگەر بۆ تاوێکیش بووە– بە یارەکەم بگەم و پێکەوە بین.

نایەڵێ (پ، گم): ناهێڵێ. خۆی لە بنەڕەتدا (نایێڵێ) بووە و گۆڕراوە. چەنێ پیرە (کم): چ بێ پیرە. یانێ چ بێدینە کە بۆ ئەم جێیە دەست دەدا و گونجاوترە.

(١٢) صەحرا: سارا و بیابان. ئاستانە: بەردەرگا.

واتە: ئەی دۆست، ئێوە خۆتان بچن بۆ تەماشای سارا و سەیران، واز لە "سالم" بێنن، کەڵکی سەیرانی پێوە نەماوە، لەبەرئەوەی خاکی ئەم بەردەرگای یارە دڵگیرە و ئەوی لێ کەوتووە، ئیتر ناشێ بتوانێ سەفەرێکی وا بکا.

## (*) -١٧-

**لە ڕەمزی سیڕڕی عیشقا، ئەهلی دڵ بێدار و باهۆشە**
**دڵی بێدڵ لە خوابی غەفڵەتا هەمزادی خەرگۆشە! (١)**
**موریدی تازەعاشق ئیبتیدا سارەنگ ئاوازن!**
**خیلافی پیری دەریادڵ، کە وەك سیمورغ خامۆشە! (٢)**
**لە نارا تا بە کەی ناگاتە حاڵی پوختەگی خامت!**
**لە کوورەی عیشقتا دایم دڵم وەك دیگ پڕجۆشە! (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، غ، ج، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) ڕەمز: نیشانە. سیڕ: نهێنی، ڕاز. ئەهلی دڵ: دڵـداران. بـاهۆش: هۆشـیار. خـواب: خـەو. غەفڵەت: بێئاگایی. هەمزاد: جمك، دووانە. خەرگۆش: کەروێشك.

واتە: دڵداران ئاگایان لە ڕاز و نیازە پەنامەکییەکانی عیشق هەیە و هۆشیارن. دڵی مرۆڤی بێدڵ لە خەوی بێئاگاییدا جمکی کەروێشکە، بە شێوە چاوی کراوەتەوە، کەچی -لە ڕاستیدا- نوستووە.

دڵی (کم): وەلێ.

(٢) مورید: شوێنکەوتووی پیرانی تەریقەت. سارەنگ: باڵندەیەکی پـچووکی دەنگخۆشـی پـەڕ ڕەش و خـاڵ سـپییە. خـیلاف: پێـچەوانە. دەریـادڵ: دڵفـراوان. سـیمورغ: عـەنقا، باڵندەیـەکی ئەفسانەییی زۆر گەورەیە، گوایە هێلانەکەی لە قولەی قافە. خامۆش: بێدەنگ و ئارام.

واتە: موریدانی تازەڕێگرتووی تەریقەت و باوەڕهێناو بە ڕابەران، سەرەتا وەك باڵندەی سارەنگی بە قەوارە بچووك پڕ لە ئـاواز و بـەجموجووڵن، پێـچەوانەی پـیری دڵفـراوان کـە وەك باڵـندەی سیمورغی بە جورم گەورە بێدەنگە.

سیمورغ (گم): سیمورغی.

(٣) نار: ئاگر. پوختەگی: کوڵاوی، پێگەیشتن. خام: خاو و کاڵ و نـەکوڵاو. دایـم: هەمیـشە. دیگ: مەنجەڵ. پڕ جۆشە: لەکوڵە.

واتە: نازانم ئەم عاشقە کاڵ و خاوەی تۆ، تا کەی لەناو ئاگری عیشقی تۆدا ناگاتە حـاڵی کـوڵان و پێگەیشتن، ئەگەرچی دڵم لەناو کوورەی خۆشەویستیی تۆدا هەمیشە وەك مەنجەڵ لەکوڵ و بەجۆشە.

پوختەگی (کم، گم): پوختەکەی.

**پەرێشانمووییی موشکینت موسەلسەل هاتە بەر ئەبرۆ**
**بە قەصدی قەلبی دڵ، چاوت وەکوو تورکی زرەهپۆشە (٤)**
**لە وەصلا بۆسە شیرینە، لە هیجرا تەڵخە ئەحواڵم**
**لە چاوی عیشقی یارا قیسمەتم هەم زەهرە، هەم نۆشە (٥)**
**هەتا دەمرم بە دووری تەرکی میهری ئاشنا ناکەم**
**دڵم تا صوبحْدەم هەر شەو لەگەڵ یادت هەمئاغۆشە (٦)**
**کە چوو بێدەوڵەتی، وەختی فەرەح، یادی فەقر ناکەم**
**لە وەصلا میحنەتی هیجرت لە خاطرما فەرامۆشە! (٧)**

(٤) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (عا، غ، ج)دا پاش و پێشن.

پەرێشانموو: موو ئاڵۆزکاو. موشکین: میسکدار، بۆنی میسك پێوە. موسەلسەل: بە زنجیرە. ئەبرۆ: برۆ. قەصد: مەبەست. قەلب: ناوەڕاست، ناوجەرگە، ناخ. تورك: جوان. زرەهپۆش: زرێپۆش، زرێدار.

واتە: مووی بۆنی میسك پێوەی شێواوی تۆ، چین بە چین وەك زنجیر گەیشتە بەر برۆت. چاوت بۆئەوەی بگاتە ناوجەرگەی دڵم، وەك جوانێکی زرێپۆش وایە.

بەر (ج): سەر. قەلبی دڵ (ج، کم، گم): قەتڵی من.

(٥) وەصڵ: گەیشتن بە یار. بۆسە: ماچ. هیجر: دووری. تەڵخ: تاڵ. قیسمەت: بەش. نۆش: نۆش، هەنگوین، شیرین.

واتە: ماچ لە کاتی بەیارگەیشتندا شیرینە، کاتی دووریش حاڵم شڕ و ژیانم تاڵە. بەشی من لە چاوی عاشقی یاردا، یا ژەهرە یا نۆشی وەك هەنگوینە.

چاوی (عا، ج، کم، گم): جامی. زەهرە (کم): ژەهر و. (گم): ژەهرە.

(٦) میهر: خۆشەویستی. صوبحدەم: بەرەبەیان. هەمئاغۆشە: هاوباوەشە.

واتە: من تا دەمرم بەهۆی دوورییەوە واز لە خۆشەویستیی ئاشنای خۆم ناهێنم. دڵم هەموو شەوێك تا بەیانی یادی تۆی لەباوەشدایە.

هەر شەو (ج): هەر دەم.

(٧) فەرەح: شادی. فەقر: هەژاری. میحنەت: مەینەت. خاطر: دڵ، خەیاڵ و بیر. فەرامۆش: پشتگوێخراو.

واتە: کاتێك زەمانی بێدەسەڵاتی لەسەرم ڕابورد و کەوتمە شادییەوە، بیر لە لاتوپووتیی جارانم

**موشەخخەص طوڕڕەیی جانانە فەرعی ماری ضەحاکە**
**بە قەصدی مەغزی من، "سالم!"، سەری دایم لەسەر دۆشە (٨)**

ناکەمەوە. کاتێ گەیشتن بە تۆ مەینەتی دووریت لە دڵدا فەرامۆش دەکەم.

خاطرما (کم): خەترما. هەڵەی چاپە.

(٨) موشەخخەص: دەستنیشانکراو. طوڕڕە: ئەگریجە. جانانە: یار. فەرع: لق. ضەحاك: زوحاك. مەغز: مێشك. دۆش: شان.

واتە: بێگومان پێچولوولی ئەگریجەی یار لە جۆری مارەکەی سەرشانی زوحاکە. مەبەستی ئەو ماری ئەگریجەیە مێشکی منە، بۆیە هەمیشە سەری لەسەر شانیەتی.

وشەی (من) لە (عا)دا کەوتووە.

(*) -١٨-

**کەس نەڵێ پێم: ئەی فلانی! هەجوی سەنگهەڵکێش مەکە**

**ئاشپەزی هەجوم، بە وەڵلاه، دەیجنم وەك کوولەکە! (١)**

**دوور لە دینم، میثلی نەمروود بۆ منارەی هەجوییات**

**خاك و زێت پێ قەد دەکەم، ئەی سەنگشکێن، وەك چۆلەکە (٢)**

**نەوعی کوردیی هەجویاتێ توربەڕێژی یادگار**

**خاکی هەجوی تێدەکەم، دەیئاخنم وەك توورەکە (٣)**

**سا کە دڵ دێنێ، دەبێ عەرض کەم لە عەرصەی مەحفەلا**

**هەڵسە بێن یاران! لە دەورم ڕۆبنیشن، کۆمەکە! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لـە (عا)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) هەجوو: داشۆرین. سەنگهەڵکێش: بەردهەڵکەن. ئاشپەز: چێشتکەر. بە وەڵلاه: بە خودا قەسەم.

واتە: هیچ کەسێك پێم نەڵێ- فلانی مەکەوە هەجوی کابرای سەنگهەڵکێشی فـشەکەر، مـن خۆم ئامادەکەری هەجوم، بە خودا وەك کوولـەکە دەیجنم.

(٢) نەمروود: لـە وەچەی حامی کوڕی نووحە، سەرکێش و ملهوڕ بووە بەرامبـەر بـە ئیـبراهیم خەلیل. هەجویات: داشۆرینی هەمەجۆر.

واتە: من وەك نەمروود بێباوەڕ نیم، بەڵام بە وێنەی ئەو هـەجوم بەقـەد منارەیەکـە، ئەوەنـدەی چۆلـەکەیەك بچووکت دەکەمەوە.

(٣) توربەڕێژ: توورەکەڕێژ.

واتە: هەجوی من کۆن و هەمەجۆر و وەك توورەکەڕێژ وایە، ئەوەندە زۆر دەبێ، توورەکـەی لێ دەئاخنم.

(٤) دڵ دێنێ: دڵ بڕوایی دەدا. عەرض کەم: بیلێم، نیشانی بدەم. عەرصە: مەیـدان. مەحفـەل: جێی کۆبوونەوە و بەزمگێڕان. کۆمەك: یارمەتی.

واتە: دڵـم دێنێ لـە مەیدانی کۆبوونەوەدا بلێم- وەرن یاران لـە دەورم کۆببنەوە، یارمەتیم بدەن، کاری هەرەوەزییـە.

**با به شەرطێ مەنعی کەن، گەر حەملەزەن بێ بەزمی جەنگ**
**کەڵبەتیژی پەتپسێنە، سەنگکرۆژەی کۆپەکە (٥)**
**گەر بە قار و قین و جەنگ هات، پێی بڵێن: خۆی لابدا**
**وەر نە شڵپەژنی شەقم ئاوازی هەروەك فیشەکە (٦)**
**پشتی پێم سمتی لە یاریدا وەها خاراندووە**
**گەر بە کیفی خەنجەری کەی، جووتێ پێستی هۆشەکە (٧)**
**شینکەوایە، شڕعەبایە، فووتەخەنجەر، بۆزەڕیش**
**ئیسمی سەنگهەڵکێشە، توند و تیژە، وەك شوانی لەکە! (٨)**
**مێخ بە دەستە، مێخ بە پشتە، مێخڕفێنە، مێخدەرێن**
**مێخ بە پێشە، مێخ بە پاشە، مێخشکێنە، تولەکە (٩)**

(٥) شەرط: مەرج. مەنع: نەهێشتن، قەدەغە. حەملەزەن: هێرشبەر، پەلاماردەر. پەتپسێن: بێشەرم. سەنگکرۆژ: بەردخۆر، کینایەیە لە ئازایی. کۆپەك: مەیموون، بە تورکیش واتە سەگ.

واتە: ئەگەر ئەو بێشەرمە ناشیرینە پەلاماردەر و قارەمانە، با بێتە مەیدانی جەنگ.

(٦) قار: قەهر، تووڕەیی. شڵپەژن: دەنگی وەك شڵپەی ئاو.

واتە: ئەگەر بە تووڕەیی و ڕقەوە هاتە مەیدانی جەنگ، با خۆی لابدا، دەنا شەقی من وەك فیشەك لەسەرێ و خێرایە.

(٧) خاراندووە: ڕاهێناوە، قاڵ کردووە. هۆشەك: جۆرێکە لە پشیلە کێوی.

واتە: ئەوەندە بە پشتەپێ شەقم تێهەڵداوە، سمتی نەرم بووە و هێندەی پێستی دوو پشیلە کێویە، بە کەڵکی ئەوە دێ بیکەیتە کیفی خەنجەر.

(٨) شینکەوا: کەوا شین. شڕعەبا: عابا شڕ. فووتە (؟): پەشتەماڵ. بۆزەڕیش: ڕیشی ماش و برنجی. ئیسم: ناو. لەك: کوردی لەك.

واتە: کابرا ناوی سەنگهەڵکێشە، کەوای شین و عابای شڕ و ڕیشی ماش و برنجی و توندوتیژیشە و لە شوانی داماوی لەك دەچێ.

(٩) مێخ: بزمار، دارێکی نەستووری نووكدرێژە، دەکوترێ بە دیواردا و بوخچە و جلی پێدا هەڵدەواسرێ، کینایەیە لە دەعبای نێرینە. مێخڕفێن: مێخدز. مێخدەرێن: بزماردەرهێن. تولەك: تازە لاوی بێموو، گیانداری تووکهەڵوەریو.

واتە: کابرای تازە لاو یا مووهەڵوەریو، دەعباکەی بە هەموو بارێکدا هەڵدەسووڕێنێ، جارێ بە

کلکی جوانووی ڕووتە وەك سنگ، سنگی خۆش میثلی مەکەك
سنگ بە سنگ کەن، ئاڵوگۆڕ کەن، چونکە هەردوو وەك یەکە (١٠)
بەزمی ساردی ئاوی ڕێ، میخێ بە بن مێخیا کوتین
گەر جەوەندەی پیا بکەی، ساردی دەکا وەك تەرزەکە (١١)
مستێ ئاڵەت بێنم و بیڕێژمە بن دووی جوانوەکەی
گەر جەوەندەی پیا بکەی، ساردی دەکا وەك تەرزەکە (١٢)
هێندە حەیوانە، ئەگەر دوو ڕۆژ لە سەحرا پووش بخوا
«بعد ازان» ئادەم نییە، یا سابرێنە، یا شەکە! (١٣)
چونکە بابی قاترانە، کەر دەبێ قەدری ببێ
با بچم دادرۆم هەوسار و پاڵوو و کووژەکە (١٤)

دەستیەوەیە، جارێ بە پشتیەوەیە، یا دەیدزێتەوە و دەریدەهێنێ، یانیش دەیکوتێ بە پێش و پاشدا و بە دەستیەوە دەشکێ.

(١٠) جوانوو: بێچووە ئەسپ و ماین. «سنگ»ی دووەم: پواز، کینایەیە لە دەعبای پیاو. میثل: وەك. مەکەك: نێزەی بچووك.

واتە: کلکی جوانووی کابرا وەك سنگ ڕووتە، دەعباکەی خۆیشی وەك نێزەی بچووکە. سنگ بە سنگەوە بنێن و بیگۆڕنەوە، چونکە کارەکە لە هەردوو باردا وەك یەکە.

(١١) مێخ: کینایەیە لە دەعبای پیاو. بن‌مێخ: پاشەوە.

واتە: ئەگەر بیکەینە بەزم و دەعبا بە بن‌دەعباکەی ئەودا دابکوتین، ئەوەندە بای لێ دەبێتەوە، ئاوی جەوەندەیش وەك تەرزە سارد دەکا.

(١٢) ئاڵەت: بیبەری ڕەش. دوو: کلك. طەرزە: تەرزە، بە هەڵە نووسراوە.

نیوەبەیتی دووەمی بەیتی پێشوو لێرە دووبارە کراوەتەوە، بۆیە مانای بەیتەکە ڕوون نییە. دەبێ ڕوونووسکەرەوە ئەم هەڵەیەی کردبێ. ڕاست نەکرایەوە، چونکە ئەم پارچەشیعرە هەر لە نوسخەی «عا»دا هەیە.

(١٣) بعد ازان: پاش ئەوە. ئادەم: مرۆڤ. سابرێن: بزنی نێر. شەك: بەرخی دووبەهاردیو.

واتە: ئەگەر دوو ڕۆژ لە بیاباندا بێ و پووش بخوا، پاشان لە بنیادەم ناچێ و دەڵێی سابرێن یا شەکە.

(١٤) قاتران: کۆی قاتر، ئێستر. هەوسار: پەتی بەستن و ڕاکێشانی چوارپێ. پاڵوو: گوریس یا کەژووی بن‌کلکی وڵاخ. کووژەکە: موورووی شینی چاوەزار.

گەر کەسێ بێ بیکڕێ، وەصیەت دەکەم ئەم ئیشەکە
وەستەکە، سستەکە، لە ڕێ تێیهەڵدە، باری لێ مەکە (١٥)
ئەلقابی سەنگ، ئیسمی ئەحمەد، کونیەتی هەڵکەندنە
وەك عەرەب سێ ناوە خۆ ئەم شێتە قەددەمخوشکەکە (١٦)
گەر لە بێشە عاقڵیی کرد، گوێی حەماقەت طاق و جووت
هەر کەسێ نەزدیکە لێی هەڵدایە، یاڵدا فیکە کە (١٧)
سەنگشکێن! عەفوْت دەکەم، لاکین بە شەرتێ «بعد ازین»
ئەحمەقانە قەد بە هیچ نەوع مەدح و ذەممی کەس مەکە (١٨)

واتە: کەر لەبەرئەوەی باوکی ئێسترە، دەبێ ڕێزی لێ بگیرێ. با منیش هەوسار و پاڵوو و کوژەکەی لێ دابدرووم.

(١٥) ئیشەك: کەر (تورکییە). وەستەك: وەستاو. سستەك: سست و خاو.

واتە: ئەگەر یەکێك ئەم کەرەم لێ بکڕێ، وەسێتم ئەوەیە کە زۆر دەوەستێ و بە کەڵکی بارەبەری نایێ و گێر دەخۆی بە دەستیەوە، دەبێ تێیهەڵدەی.

نیوەی دووەم لەنگە و (سستەکە) ئەگەر (سستە) بێ، ڕێك دەبێتەوە.

(١٦) ئەلقاب: کۆی لەقەب، ناسناو. سەنگ: بەرد. کونیەت: سەرناو. قەدەمخوشکەك: بێخێر، شووم.

واتە: سەنگ ناسناوێکیەتی، ناوی ئەحمەدە، سەرناوی هەڵکەندنە. ئەم شێتی بێخێرە، وەك عەرەب سێ ناوی هەڵگرتووە.

(ئەلقابی)، لەبەر کێش، بە (ئەلقەبی) دەخوێنرێتەوە.

(١٧) حەماقەت: کەرێتی، بێعەقڵی. طاق: تاق، تاك. نەزدیك: نزیك. یاڵدا: دەی، یەڵلا. فیکە کە: فیکە لێبدە.

واتە: ئەگەر عاقڵانە جووڵایەوە و لە بێشەدا گوێی کەرێتیی تاق و جووت کرد، ئەوی لێیەوە نزیکە با لێی دا و فیکە بکا.

(١٨) عەفوت دەکەم: لێت دەبوورم. لاکین: بەڵام. شەرت: مەرج. بعد ازین: پاش ئەمە. ئەحمەقانە: نەزانانە. نەوع: جۆر. مەدح: ستایش. ذەم: زەم، ناوهێنانی کەسێك بە خراپە.

واتە: ئەی کابرای بەردشکێن، بە مەرجێك لێت خۆش دەبم کە ئەوەودوا نەزانانە نە ستایش نە زەمی کەس بکەی.

-١٩- (*)

**به تەدبیری مەعیشەت هەر کەسێ مەشغوولی کارێکە**
**منی بێمایە کارم، موتتەصیل، سەودایی یارێکە (١)**
**لە جەمعا لێم نەشێوێ، گەر حیسابی موو بە مووی زوڵفت**
**بە تا تا بیژمێرم، عەطری هەر تاییێکی بارێکە (٢)**
**بە حوکمی جاذیبەی تۆ بوو، گەڕانی من بە دونیادا**
**بەڵێ، «حبل المتین»ی میهری تۆش مەحکەمەهارێکە (٣)**
**بە ڕاحەت موشکیلە ژێر سەر بنێم، من دەستی ئاسایش**
**سەری زوڵفێکە دەستگیرم، کە هەر موویێکی مارێکە! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، حا، نم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) تەدبیر: تەگبیر، ڕێوشوێن بۆ دانان. مەعیشەت: ژیان و گوزەران. مەشغووڵ: خەریك. بێمایە: نابووت، هیچبەدەستەوەنەبوو. موتتەصیل: بەردەوام. سەودا: پەرۆشی.

واتە: هەر کەسێك بە کارێکەوە خەریکە، تا ڕێوشوێن بۆ گوزەرانی خۆی دابنێ. بەڵام منی نابووتی هیچبەدەستەوەنەبوو کارم بەردەوام خولیا و پەرۆشییە بۆ دڵبەرێك.

(٢) جەمع: کۆکردنەوە. تاتا: تاڵتاڵ. عەتر: بۆن. تا: نیوەی بارێك، کینایەیە لە ئەگریجەی لایەکی ڕوو.

واتە: ئەگەر یەك بە یەکی مووی ئەگریجەی تۆم بۆ حسێب بکرێ و کۆکردنەوەیم لێ تێكنەچێ، تاڵ بە تاڵیش بیژمێرم، بۆنوبەرامەی هەر لایەکی ئەگریجەی دڵبەر کە خۆی نیوەتایەکە، زۆر لەوە زیاترە و بارێك دەردەچێ.

بارێکە (حا، نم): تاریکە. هەڵەیە.

(٣) جاذیە: هێزی ڕاکێشان. حبل المتین: پەتی توند و قایم. میهر: خۆشەویستی. مەحکەم: قایم. مەهار: دارێکە دەکرێتە لووتی حوشتر و پەتی پێوە دەبەسترێ بۆ ڕاکێشانی.

واتە: من هێزی ڕاکێشانی تۆ بەکێشی کردم بەرەو لای تۆ و هەموو دنیای گێڕام. بەڵێ، پەتی توند و تۆکمەی خۆشەویستیی تۆیش مەهارێکی قایمە، من بەدوای تۆدا ڕادەکێشێ.

تۆش (نم): تۆ. حبل المتین (حا): حبل المطین. هەڵەیە.

(٤) ڕاحەت: ئاسوودەیی. موشکیل: زەحمەت، گیروگرفت و کێشە. دەستگیر: ئەو کەس یا شتەی

**له دڵما بازه بۆ حوسنی حەقیقەت دیدەیی باطین**
**مەڵێن عیشقی مەجازم هەر لەسەر بۆس و کەنارێکه! (٥)**
**ئەگەر -فەرضەن- له قاڵبدا به قووەت تابی فیلم بێ**
**کەمەندی ئوستوواری گەردنم لەو طوڕڕه تارێکه (٦)**
**له دەورانی مەحەببەتدا به عەهدێکت وەفا ناکەی؟!**
**خیلافی عەهدی تۆ "سالم" لەسەر شەرط و قەرارێکه (٧)**

دەست دەگرێ بۆ چاوساغی یا به زۆر پەلکێش کردن.

واته: زەحمەته بتوانم به ئاسوودەیی دەستی دڵنیایی و ئـارامی بێنمـه ژێـر سـەرم و خـەمم نـەبێ، چونکه سەرەتاڵی ئەگریجەیەك، که هەر موویەکی مارێکه بۆ خۆی، دەستی گرتووم و بەری نادا.

(٥) باز: کراوە. حوسن: جوانی. حەقیقەت: ڕاستی. دیدەیی باطین: چـاوی نـاوەوەبین. عیـشقی مەجاز: عیشقی کاتی و ناڕاستەقینه. بۆس: ماچ. کەنار: باوەش.

واته: چاوی ناوەوەبین لەناو دڵمدا کراوەیه بۆ بینینی جوانیی ڕاسـتەقینه، بۆیـه مـەڵێن عیـشقی مەجازیم هەر خەریکی ماچ و باوەشی نازدارانه.

لـەسەر (نم): له بۆ.

(٦) فەرضەن: گریمان، وامان دانا. قاڵـب: جەستە. قووەت: هێز. تاب: تین و تاو، توانایی. کەمەنـد: پەتی درێژ و ئەستوور بۆ بەستنەوە. ئوستوار: قایم و توند. طوڕڕە: ئەگریجە. تارێکە: تاڵێکە.

واته: ئەگەر گریمان هێزی فیل لـه جەستەمدا بێ، کەمەندی قایمی ملم تاڵێکی ئەو ئەگریجەیەی دڵبەرە.

فیلم بێ (نم): قیبلەم بێ. هەڵەیه.

(٧) دەوران: ڕۆژگار، سەردەم. مەحەببەت: خۆشـەویستی. عەهد: پەیمان. خـیلاف: پێـچەوانه. شەرط: مەرج. قەرار: بڕیار.

واته: ڕۆژگارێك که خۆشەویستی دەکەی، وەفـاداری بەرامبـەر بـە پـەیمانێکت نـانوێنی. سـالم، بـه پێچەوانەی پەیمانی تۆوە، پابەندی مەرج و بڕیارەکانیەتی و هەرگیز نەگۆڕاوە، تۆ بەهانەی پێدەگرێ.

-٢٠- (*)

لەدەست ڕەنگرێزی دەوران، ڕەنگی چیهرەم زەعفەرانێکە
حەدیقەی دڵ، لەبەر بارانی غەم، وەضعی خەزانێکە (١)
لە طەبعی ماهی گەردوون و بوخاری بەحری ئەندووهم
مەتاعی سینەیی چاکم وەکوو جامەی کەتانێکە (٢)
کەمەنداری فەلەك، بۆ بەختی من، صەییادی خوونڕێژە
لە دڵما خاری میحنەتها یەکایەك وەك سینانێکە (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (م، پ)دا هەیە. لە (پ)دا نووسراوە: «سالم لە نەرد و پۆکەری ئێران ئەدوێ».

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) ڕەنگرێز: ڕەنگرێژ. دەوران: چەرخی ڕۆژگار. چیهرە: چارە، ڕوخسار. زەعفەران: گیایەکی قنجی گەڵادرێژی سەوز و گوڵ زەرد یا سووری بۆنخۆشە. حەدیقە: باخ. وەضع: حاڵوبار. خەزان: گەڵاڕێزان.

واتە: ڕەنگی ڕوخسارم بەدەست چەرخی ڕۆژگاری ڕەنگرێژەوە وەك زعفەران زەرد بووە. باخی دڵ هەر بارانی خەم و خەفەتی بەسەردا دەبارێ، بۆیە دەڵێی لە گەڵاڕێزاندایە.

(٢) طەبع: تەبیعەت، مۆرك. ماه: مانگ. بوخار: هەڵم و هاڵاو. بەحر: دەریا. ئەندووە: خەم و خەفەت. مەتاع: کاڵا، کەلوپەل. سینەی چاك: سنگی دادڕاوی دوولەت. جامە: کراس. کەتان: قوماشێکی تەنکە.

واتە: ڕووپۆشی سنگی دادڕاوی دوولەتم، بە هۆی تەبیعەت و خوڵقی مانگی ئاسمان و هەڵم و هاڵاوی دەریای خەفەتمەوە، وەك کراسی کەتان هەڵپرووزاو و سووتاوە.

جامەی (پ): خامی.

(٣) کەمەندار: کەماندار، کەوانبەدەست. فەلەك: ڕۆژگار. صەییاد: ڕاوچی. خوونڕێژ: خوێنڕێژ. خار: دڕك. میحنەتها: کۆی میحنەت، مەینەت. یەکایەك: یەك بە یەك. سینان: سەرەنێزە.

واتە: چەرخی ڕۆژگار لە بەختی ڕەشی مندا، وەك ڕاوچیی خوێنڕێژ و دڕکی مەینەتیش، لە دڵمدا وەك سەرەنێزە وایە.

کەمەنداری (پ): کەمانداری. خوونڕێزە (پ): خوێنڕێژە. میحنەتها یەکایەك وەك (پ): میحنەت سەراسەر وێنەی.

**به دڵ سۆزی فەلەك، ئیتر ئەرەستوو بێ، دەوام ناکا**
**قوبووڵی مەرهەمی چۆن بێ کە زەخمی من نیهانێکە (٤)**
**دڵئازارم نومایانن، بەهانەم وەضعی گەردوونە**
**فیغانی خۆم و دڵ، یاران! لەدەست پیر و جەوانێکە (٥)**
**جەوان بووم گەر لە غەم پیر و جەوان، پیریم چ نەزدیکە**
**لەدەست وەصفی قومازیان، داد و شەکوەم داستانێکە (٦)**
**قەڵەم بوو کیلکی کاتب، خودبەخود مەشغووڵی نووسینە**
**لە کەشفی سیڕڕی مەستوورا عەجایەب دووزوبانێکە؟ (٧)**

(٤) ئەرەستو: فەیلەسووفێکی یۆنانییە. زەخم: برین. نیهان: نهێنی.

واتە: ئەگەر بەزەیی و سۆزی ئاسمان ئەرەستوویش بێ، درێژەی نابێ. برینی من شاراوەیە، ئیتر چۆن مەڵحەم بۆ چارەسەر قوبووڵ دەکا.

بەدڵ سۆزی (پ): بە دڵسۆزی. ئەرەستو (پ): ئەرەسطو.

(٥) دڵئازار: بێزارکەری دڵ، یاری ستەمکار. نومایان: ئاشکرا و بەرچاو. فیغان: گریان و ناڵە.

واتە: ئەوانەی وا بوونەتە هۆی بێزاریی دڵم، ئاشکرا و بە بەرچاوەوەن، بیانوویشم حاڵوباری رۆژگارە. یاران، گریان و ناڵەی خۆم و دڵم بەدەست بێزارکەرانی نەوجوان و رۆژگاری پیرەوەن.

(٦) ئەم بەیتە لە (پ)دا حەوتەمە.

نەزدیك: نزیك. شەکوە: شکات. داستان: بەسەرهات.

واتە: خۆم نەوجوان بووم، بەڵام خەفەت پیری کردم و پیربوونم بەم نەوجوانییە نزیکە. داد و سکاڵام لەدەست جۆری قومار و قۆڵبڕینیان، بۆ خۆی داستانێکە!

شەکوەم (پ): شەکوام.

(٧) کیلك: پەنجە. کاتب: بنووس. خودبەخود: خۆبەخۆ. مەشغووڵ: خەریك. کەشف: پەردەلێلادان. سیڕ: نهێنی. مەستوور: شاراوە. عەجایەب: سەیر. دووزوبان: بێباری قسەهێن و قسەبەر.

واتە: قەڵەم لە پەنجەی بنووسدا خۆبەخۆ سەرقاڵی نووسینە، لە خستنەڕووی ڕاز و نهێنیی شاراوەدا، دووزمانێکی بێباری سەیرە.

بوو (پ): بێ. خودبەخود (پ): خۆبەحۆ. مەستوورا (پ): پەنهانا.

**لەباتیی شوغڵ و تەسبیح و نوماز و سوننەت و مەسجید**
**لە بەحثی نەرد و ئاس و گەنجەفە، هەردەم بەیانێکە (٨)**
**لە غەوغای بێنە «دووشەش»یان، لە هەر سوو شەش‌جیهەت پڕبوو**
**لە دەنگی «مۆرە! ها دەی، زوو کە! ها»، ئاخرزەمانێکە (٩)**
**گوشادی وا فلان مۆرە مەیێنە، با بدۆڕێنی**
**حەریف تۆ بێنە دەی داشێ، بە تەنها وا لە خانێکە (١٠)**
**قڕانی بەستە، کەو و بڕنوو بڵێ سا دەی، حەریف زووکە**
**چ سەهلە مۆرە گەر بێنی، لە ڕێی پێنج‌وسێیانێکە (١١)**

(٨) شوغڵ: کار. نوماز: نوێژ. سوونەت: وتە و کردار و بڕیاری پێغەمبەری ئیسلام. مەسجید: مزگەوت. بەحث: باس‌وخواس. نەرد: یاریی تاوڵە. ئاس: کاغەزێکی قومارە یەك خاڵ و چوار جۆر نەخشی قوماری تێدایە، لە زۆرترینی یارییەکاندا بەرزترین کاغەزی دەستی براوەیە. گەنجەفە: پەڕەی قومار، ناوی دوو جۆر قومارە بە کاغەز. بەیان: ڕوونکردنەوە.

واتە: لەباتیی ئەوەی خەریکی کار و ویردخوێندنەوە و نوێژ و مزگەوت و سوننەتەکانی پێغەمبەر (د.خ) بێ، لە باس‌وخواسی یاریی نەرد و ئاس و گەنجەفەدایە و هەموو کاتێك ڕوونیان دەکاتەوە و قسەی لەسەریان هەیە.

سوننەت و (پ): هاتۆچۆی.

(٩) غەوغا: هەرا و هوریا. دووشەش: پوولی دوو شەش‌خاڵی. هەر سوو: هەر لا. جیهەت: لا. مۆرە: زاری تەختەنەرد.

واتە: دەڵێی ئاخرزەمانە و کەس بە کەس نییە، هەر یەکە لە هەموو لایەکەوە خەریکی خۆیەتی تا بەختی یار بێ و دووشەش بێنێ و بیباتەوە.

غەوغای (پ): نەڕڕەی. لە هەر سوو (پ): لە چوارلا.

(١٠) گوشادی: لە حاڵەتی بەهێزیدای. حەریف: هاوقومار. داش: پیادەی دامە. خان: خانەی چوارگۆشەیی دامە.

واتە: ئەگەر فلان مۆرە نەهێنی، ڕزگارت دەبێ و نادۆڕێنی. ئەی هاوپیشە، داشێك بهێنە کە لە خانێکی جیاوازدایە.

(١١) گوشاد: دەست‌کراوە، داشێك کە داشی‌تری بەسەرەوە نەبێ. هاوکایە ئەگەر ئاسێك بێنێ و ئەو خانەیە بگرێتەوە، داشەکە دەکوژێ. قڕان: کوشتنی داش. بەستە: بەسە بۆ تۆ. کەو: داشێکە

**حەریفی نەوجەوان ئەسبابی پیریی چەندە هەرزان کرد**
**نگین و کەوش و شانە و خەنجەری ڕەهنی قڕانێکە! (١٢)**
**حەکیمیش وا لە خزمەت لۆتییا، جۆیایە بۆ بێنی**
**لە صەفحەی گەنجەفە و ئاسا حەکیمی لەوحەخوانێکە (١٣)**
**لە بیمی هەیئەتی ڕوستەم، وەکوو توورانییان پڕبیم**
**طەلایەداری ڕەهـ "حاجی حوسەین"یش دیدەبانێکە (١٤)**
**فلانیش لەوحەخوانە وا لە پەهلوومان، تەماشا کە**
**لەبەر تەصویری ئاسا، نەقشی لووتی تیرەشانێکە (١٥)**

سەرەکەی نەگیرابێ و پێی دەڵێن گوشاد. بڕنوو: لێدان و هەستانەوەی داش، دەیکوژی یا سەری داشێکی خۆتی پێ دەگریەوە.

واتە: ئەی هاوقومار، تۆ کوشتنی داشت بەسە. بڵێ با کەو و بڕنوو بێ، تکایە پەلە بکە. دەتوانی بە پێنج‌وسیانێك بیبەیتەوە.

(١٢) نەوجەوان: تازەپێگەیو. ئەسباب: ئامراز و پێویستی. نگین: بەخت. ڕەهن: بارمتە.

واتە: هاوپیشەی لاو نگین و کەوش و شانە و خەنجەری وەك کەرەستەی لای پیرانی هەرزانفرۆش کرد و بە قڕانێك ڕەهنی کرد. یانێ نرخی ڕابوردووی ئەوانی نەزانی.

(١٣) حەکیم: پزیشك. لۆتی: بەزمگێڕ بە زوڕنا و دەهۆڵەوە. جۆیا: بەدواداگەڕاو. صەفحە: ڕووپەڕ. لەوح: لاپەڕەی گەورە و پانە، لێرە ڕەنگە ئەو پەڕەیە بێ کە ئەنجامی یاریی تێدا نووسراوە و لەوحەخوانیش ئەو کەسە بێ کە خوێندوویەتیەوە.

واتە: حەکیمیش هەر لە خزمەتی لۆتیدایە و بەدوای بۆنیدا دەگەڕێ. شارەزایە و دەزانێ چۆن گەنجەفە و ئاس بخوێنێتەوە.

بێنی (پ): بیبی؟ لەوحەخوانێکە (پ): لەوح‌خوانێکە.

(١٤) بیم: ترس. هەیئەت: پەیکەر و شێوە. ڕۆستەم: کوڕی زاڵ. توورانییان: تورکان. طەلایەدار: فەرماندەی پێشەنگی لەشکر. ڕەهـ: ڕێ.

واتە: وەك چۆن توورانییان لە ڕۆستەمی پاڵەوان ترساون، حاجی حسەینی فەرماندەری چاودێرێی ڕێیش بۆ خۆی پاسەوانێکە.

لە بیمی هەیئەتی (پ): لە ترسی هەیبەتی. ڕەهـ (پ): ڕێ.

(١٥) پەهلوو: تەنیشت، پەنا. تەصویر: وێنە. نەقش: نەخش. تیرەشان: لوتکەکانی زنجیرەی

**وەرەق چەند ڕەونەقی صافە، لە عەکسی چیهرە دەنوێنێ**
**لە قیطعەی قرمزی لووتی، دەڵێی پۆزەی بەرانێکە (١٦)**
**یەکیخست وا حەکیم ئەوراق و لۆتی غافڵە، یاران!**
**سێ ئاسی وا لە مستایە، دو شاهی پشتیوانێکە (١٧)**
**کەوا و ئارەقچن و فێستی کەچەڵ، قەبڵا بە نۆ شایی**
**قەمە و قەمچی و ئەساسی حەربی، کوللەن تۆپی ئانێکە (١٨)**

بەیەکەوەبەستراوی شاخ.

واتە: بڕوانە فلانیش وا لە تەنیشتمدا شینگێڕە، نەخشی لووتی لە بەر وێنەی ئاسدا کە زۆر پەرۆشیەتی، وشك بووە و دەڵێی تیرەشانی زنجیرەشاخێکە.

لەوحەخوانە (پ): لەوحخوانە. پەهلوومان (پ): پەهلوویان.

(١٦) وەرەق: کاغەز. ڕەونەق: شەوق. صاف: ڕوون. عەکس: شەوقدانەوە. چیهرە: چارە. قیطعە: پارچە. قرمز: سوور. پۆزە: دەمولووت.

واتە: کاغەزی قومار درەوشاوە و بێگەردە، ڕوخساری تێدا دەردەکەوێ. لووتی ڕەنگسووری ئەویش هەر لە دەموقەپۆزی بەران دەچێ.

دەنوێنێ (پ): ئەنوێنێ.

(١٧) غافڵ: بێئاگا. مست: چنگ. شاهی: هەرە کەمترین پارەی سەردەمی قاجاریی ئێران.

واتە: یاران! وا حەکیمی شارەزا هەموو کاغەزەکانی قوماری یەکخست، کەچی لۆتی بێئاگایە و هێشتا سێ ئاسی لە دەستدایە و دوو شاهیشی بۆ پشتیوانیی خۆی داناوە.

(١٨) ئەم بەیتە هەر لە (پ)دا هەیە.

کەوا: بالاپۆشی ئاودامانی پیاوان، سالم هەر بە شێوەی (قەبا) وتوویە. ئارەقچن: تەقیلە، کلاوی لە پەڕۆ و دەزوو. فێس: تەقیلەی درێژی سوور. قەبلا: خەملێندرا، مەزەندە کرا. شایی: شاهی، کەمترین پارەی سەردەمی قاجاری. ئەساسی حەرب: کەلوپەلی جەنگ. کوللەن: سەرجەم. تۆپ: هەمووی، یا تۆپی شەڕ. ئانێکە: عانەیەکە، ساتێکە.

واتە: کەوا و ئارەقچن و فێستی سەری کەچەڵیان بە سێ شایی قەبلاند. قەمە و قەمچی و کەرەستە و کەلوپەلی جەنگیشی، هەر هەمووی گوللەتۆپێکە دەتەقێنرێ و دەبڕێتەوە، یان هەمووی تۆپێکە و عانەیەك دەکا.

## -٢١- (*)

**لە حوسنی دڵبەران، گەرچی (سەنەندوج) گوڵستانێکە**
**بەبێ دڵبەر لە بەرچاوم چ وێرانەمەکانێکە؟! (١)**
**صەبا وەك پەیکی شیرین‌دەو خەبەر کە شەهسەواری من**
**لە دووریی تیری باڵای، قامەتم کۆنەکەمانێکە! (٢)**
**موسەخخەر بوو جیهان، یەکسەر، لە سیحری عیشوەیی چاوی**
**بە کێشی خۆی لە شۆخیدا، ئەویش صاحێبقڕانێکە (٣)**
**جەوابی دامەوە دڵبەر: لە شەرعا کەوتە سەر شاهید**
**زەمانی بۆسەیە بۆ من، لەبی لەعلی ضەمانێکە (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (پ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) حوسن: جوانی. سەنەندوج: سنە. گوڵستان: باخ و گوڵزار. مەکان: شوێن.

واتە: ئەگەرچی (سنە)، لەبەر جوانیی دڵبەرانی، ڕازاوەتەوە و باخ و باخات و گوڵزارێکە بۆ خۆی، مادەم دڵبەری منی تێدا نییە، وەك شوێنێکی وێرانە دەیبینم.

(٢) صەبا: بای فێنکی لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە هاتوو. پەیك: تەتەر، نامەبەر. شیرین‌دەو: ڕەوت‌شیرین. خەبەر کە: لە خەو هەڵستێنە، ئاگادار بکەرەوە. شەهسەوار: شاسوار، سوارچاك. قامەت: بەژن و باڵا. کەمان: کەوان.

واتە: ئەی بای فێنکی سەبا، وەك تەتەرێکی ڕەوت شیرین و جوان، شاسواری من ئاگادار بکەرەوە و لە خەوی هەستێنە. بەژن و باڵام لەتاو دووری لە تیری باڵای یارەوە، وەك کەوانێکی کۆنی لێهاتووە و چەماوەتەوە.

(٣) موسەخخەر بوو: خرایە ژێردەست، داگیرکرا. سیحر: جادوو. عیشوە: ناز. کێش: قورسایی. صاحێبقڕان: پارەدار، ناسناوی بنەماڵەیەك بووە لە سلێمانی.

واتە: جیهان، بە جادووی نازونووزی چاوی دڵبەر، یەکسەر خرایە ژێر دەست و داگیر کرا. دڵبەر لە شۆخ و شەنگیدا ئەوەندەی قورسایی خۆی سەنگین و مایەدار و گرانبەهایە.

(٤) جەواب: وەڵام. شەرع: پێڕەوی ئیسلامەتی. شاهید: شایەت. بۆسە: ماچ. لەبی لەعل: لێوی سوور. ضەمان: زامن‌کردن، بە پێی شەرع ئەوە بەندە بە شایەت.

**قیاسی قەددی باریکی لەگەڵ موژگانی مۆر ناکەم**
**لە لای ئەربابی هۆش و مەعریفەت، سیڕڕی نیهانێکە (٥)**
**وەکو تێدەفْکرم ئەم ظوڵمە ناپرسن، بڵا مات بم**
**لە شوعلەی پەرتەوی دووهەفتەماهی، دڵ کەتانێکە (٦)**
**لە دڵ پەیکانی کول نابێ، عەجەب سیحرێکە بۆ تیژی**
**لە پەهلووی صەف موژەی بۆ یەکتری هەر یەك فەسانێکە (٧)**
**لە وەختی ئاشْتیی ئەودا جیهان فیردەوسی ئەعلایە**
**لە حینی خەشمییا بۆ عاشقی ئاخرزەمانێکە (٨)**

واتە: دڵبەر وەڵامی دامەوە و وتی: بەپێی شەرع ئەوە بەستە بە شایەت. ئەمە ڕۆژگاری ماچوموورچە، لێوی سووری ئەو بۆ من جۆرە زامنکردن و دڵنیاییەکە.

(٥) قیاس: پێوانە، بەراورد. موژگان: کۆی موژە، برژانگ. مۆرناکەم: شایەتی بۆ نادەم و پشتی ناگرم. ئەرباب: خاوەن. سیر: ڕاز و نهێنی. نیهان: شاردرانەوە.

واتە: پشتگیریی ئەوە ناکەم و شایەتیی بۆ نادەم کە قەدی دڵبەر ئەوەندەی مووی برژانگی باریکە. ئەمە لە لای کەسانی خاوەن هۆش و ماریفەت ڕاز و نهێنییەکی شاردراوەیە.

(٦) تێدەفکرم: بیردەکەمەوە. ظوڵم: زۆرداری، ستەم. بڵا: با. مات: بێدەنگ و کڕ. شوعلە: گڕ، بڵێسە. پەرتەو: پرشنگی ڕووناکی. دووهەفتەماه: مانگی چواردە.

واتە: وەك بیر دەکەمەوە، لەم ستەم و زۆردارییە ناپرسرێ. بۆیە وا باشترە بۆ خۆم مات و بێدەنگ بم. گڕی پرشنگی ڕووناکیی ڕوخساری وەك مانگی چواردەی، کەتانی دڵی سووتاندووم.

بڵا (پ): بەڵام. هەڵەیە.

(٧) پەیکان: سەرەتیر. عەجەب: سەیر. سیحر: جادوو. پەهلوو: تەنیشت، پەنا. صەف: ڕیز. موژە: برژانگ. فەسان: هەسان.

واتە: سەرەتیری برژانگی دڵبەر کە بەر دڵ دەکەوێ، کول نابێ. ئەمە جادوویەکی سەیرە کە ئەم سەرەتیرانە چۆن وا تیژ دەکرێنەوە. ڕیزی برژانگەکانی بە تەنیشت یەکترەوە، هەر یەکەیان هەسانێکە بۆ تیژکردنەوەی ئەویتر.

(٨) فیردەوسی ئەعلا: بەهەشتی باڵا. حین: دەم، کات. خەشم: ڕق و تووڕەیی.

واتە: جیهان لە کاتی ئارامی و ئاشتیی دڵبەردا، بەهەشتی باڵایە و ڕازاوەیە، بەڵام لە کاتی ڕق و تووڕەیی ئەودا، وەك دوادوایییەکانی ژیانی عاشق وایە و کۆتایی بە تەمەنی دەهێنێ.

**سزای خۆی دی قەڵەم "سالم!"، ئەتۆیش سەر دامەنێ وەك ئەو**
**زەمانە تیغە، غەم میقطەع، چ تەقریر و بەیانێکە؟! (٩)**

(٩) میقطەع: بڕندە.

واتە: "سالم" قەڵەم ئەوەندەی نووسی، بە سزای خۆی گەیشت. بۆیە تۆیش کارێك مەکە لەم ڕێیەدا سەرت تێدابچێ. ڕۆژگار وەك تیغ و خەم و خەفەتیش سەرەخۆرە و بڕندەیە. ئەمە چ ڕاپۆرت و ڕوونکردنەوەیەکە!

## (*) -٢٢-

**من له ئه‌سپی بۆز ئه‌پرسم: بۆچی ئه‌عضات كه‌م‌ڕه‌گه**
**ئه‌و به ئاخ‌وداخ ئه‌ڵێ: داخی عه‌زیز ئاغای سه‌گه (١)**
**چاوم بێ‌نووره، ده‌ستم طـۆپاڵه، به‌رمه‌م كۆنه‌ڕێش**
**سه‌ربه‌سه‌ر ئه‌عضام له برسا تێك‌چووه، ڕانم شه‌گه (٢)**
**تووره‌كه‌ی پڕئێسـْكم كرده سه‌ری، ئه‌و پێی وتم:**
**ئه‌سپی سه‌گ با پێشه‌خۆر بێ، جۆ له به‌ر ئه‌سپی به‌گه (٣)**
**باوجوودی بێ‌جلی و بێ‌كاووجۆیی، دائیما**
**دێته سه‌ر پشتی، ده‌مرقێنێ وه‌كوو بزنی ته‌گه (٤)**

(*) هه‌ر "پیره‌مێرد" ئه‌م پارچه‌شیعره‌ی له ڕۆژنامه‌ی (ژین، ژ١٠١٣، ١٩٥٠/٦/١)دا بڵاوكردووه‌ته‌وه و نووسیویه: ((ساڵم و مه‌لا موئمین: عه‌زیز ئاغایێك بووه له هه‌ڵه‌بجه، تووڕه بووه، ساڵم و موئمین هه‌جوی ئه‌سپه‌كه‌یان كردووه)).

(١) بۆز: سپی و ڕه‌شی تێكه‌ڵ. ئه‌عضا: كۆی (عضو)، ئه‌ندامه‌كان. كه‌م‌ڕه‌گ: ده‌ماری كه‌م بێ.

واته: له ئه‌سپی بۆز ده‌پرسم بۆچی ئه‌ندامه‌كانت ده‌ماریان كه‌م تێدایه؟ ئه‌ویش ده‌ڵێ: له داخی عه‌زیز ئاغا وام لێ به‌سه‌رهاتووه.

(ئه‌پرسم) و (ئه‌ڵێ)، ده‌بێ (ده‌پرسم) و (ده‌ڵێ) بووبن.

(٢) نوور: ڕووناكی، بینایی. طـۆپاڵ: گۆج. به‌رمه‌م: ده‌گونجێ به‌ر سنگ و مه‌مك بێ. كۆنه‌ڕێش: كۆنه‌برین. سه‌ربه‌سه‌ر: تێكڕا و هه‌موو. شه‌گه: له خرتكه چووه.

واته: چاوم بینایی نه‌ماوه، ده‌ستم گۆج بووه، به‌ر سنگ و مه‌مكم كۆنه‌برینه. هه‌موو ئه‌ندامێكی له‌شم وا تێك‌شكاوه، ڕانیشم له خرتكه چووه.

(٣) پێشه‌خۆر: ئێسكخۆر.

واته: تووره‌كه‌ی پڕ له ئێسقانم به سه‌ریدا كرد، كه‌چی پێی وتم: با ئه‌سپ ئێسكخۆر بێ و جۆیش بخرێته به‌رده‌م ئه‌سپی به‌گ.

(٤) باوجوودی: سه‌رباری. ته‌گه: سابرێن.

واته: ئه‌م ئه‌سپه سه‌رباری ئه‌وه‌ی كه بێ‌به‌رگ و كا و جۆیه، هه‌میشه دێته سه‌ر پشتی و وه‌ك بزنی سابرێن مرقه‌مرقیه‌تی.

**کەوتمە کەند و تێکشکام و کوێر و شەل بووم، ئێستەکە**
**سەگ بە بنگوێما دەڵێ: زوو بمرە، نامەردی مەکە (٥)**
**سەگ تەمای لاقی ئەکات و سەگ سواری پشتییە**
**بۆزی سەگ چۆن دەرپەڕێ، یا ڕەب، لەدەست ئەم دوو سەگە (٦)**
**بۆز لە دەشتی شارەزوورا هێندە بێتین و لەڕە**
**خاڵ سواری گەردنی بێ، وەك سەگی سەر دیرەگە (٧)**
**بۆز ئەڵێ: میرم، خودا عومرت درێژ کا، توو خودا**
**ئاڵوگۆڕم کە، نەجاتم بێ لەدەست ئەم دوو سەگە (٨)**

(٥) کەند: چاڵ.

واتە: ئەگەرچی کەوتوومەتە ناو چاڵ و لەشم بەسەر یەکدا شکا و کوێر و شەلیش بووم، کەچی سەگ بە گوێمدا دەدا کە نامەردی نەکەم و زوو بمرم.

(ئەکات)، دەبێ (دەکات) بووبێ و دەستکاری کرابێ.

(٦) واتە: سەگ چاوی بڕیوەتە قاچوقولی و سواری پشتیشی بووە. ئیتر خودایە سەگ چۆن لەدەست ئەم دوو سەگە دەرچێ و ڕزگاری ببێ؟!

(٧) دیرەگ: کۆڵەکە، ئەستووندەك.

واتە: ئەم ئەسپە بۆزە لە دەشتی شارەزووردا ئەوەندە بێهێز و لەڕ و لاوازە، هیچی پێ ناکرێ، خاڵیش بە گەردنیەوە بێ، دەڵێی سەگی سەر کۆڵەکەیە!

(٨) واتە: ئەسپەبۆز دەڵێ– گەورەم، خودا تەمەن درێژت بکا. توو خودا بمگۆڕەوە و لەم دوو سەگە ڕزگارم بکە.

(ئەڵێ)، دەبێ (دەڵێ) بووبێ.

## -٢٣- (*)

**گریەیی دایم لە ئەشکا چاوی کردمە بەلبەلە**
**دڵ لە ناڵینی فیراقت، موتتەصیل، وەك بولبولە (١)**
**مەیلی گەشتی گوڵسْتان و دامەنی صەحرام نییە**
**دامەنم هەر سوو لە ئەشکی ئاڵی دیدەم گوڵگوڵە (٢)**
**وەك سەمەندەر کەوتە ئاتەش، تاقە خاڵی لەوحی ڕووی**
**بۆ میزاجی دڵ، لە تیژیدا، میثالی فلفلە (٣)**
**گەر بەبێ گێسوویی ئاشوفتەت مەکانم بێ، ئیرەم**
**پێچ و تابی خاطرم زیاتر لە پێچی سونبولە! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (پ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) گریە: گریان. ئەشك: فرمێسك. بەلبەلە: شڵەژاوی. فیراق: جیایی. موتتەصیل: بەردەوام.

واتە: گریانی بەردەوام چاومی لەناو فرمێسکدا شڵەژاندووە. دڵیش کە بە هۆی جیابوونەوەی تۆوە ناڵەناڵیەتی، یەکبینە دەڵێی بولبولە دەخوێنێ.

(٢) مەیل: ئارەزوو. گوڵستان: باخچەی گوڵان. دامەن: بنار، داوێن. صەحرا: سارا. هەر سوو: هەر لا. گوڵ گوڵە: پارچەپارچەی هەر یەك لە ڕەنگێکە.

واتە: ئارەزووی گەشتی باخ و دامێنی سارا و بیابان ناکەم، چونکە هێندە فرمێسکی سوور و ئاڵم ڕشتووە، هەموو لایەکی دامێنم سوور بووە و هەر پارچەیەکی لە ڕەنگێك و گوڵ گوڵییە.

(٣) سەمەندەر: پەلەوەرێکی ئەفسانەییە، دەڵێن لە ئاگردا دەژی و هێلکە دادەنێ. ئاتەش: ئاگر. لەوح: تەخت. میزاج: زەوق و تاقەت. میثال: وەك. فلفل: بیبەر.

واتە: تاقە خاڵێکی سەر تەختی ڕوخساری دڵبەر، وەك سەمەندەر کەوتووەتە ناو ئاگر. ئەو خاڵە ئەوەندە تیژ و توونە، دەڵێی بیبەرە و دڵی تێكداوم.

(٤) گێسوو: ئەگریجە. ئاشوفتە: شێواو و ئاڵۆزکاو. مەکان: شوێن. ئیرەم: بەهەشتی شەدداد. تاب: تاو و تین. خاطر: خەیاڵ، دڵ. سونبول: کینایەیە لە ئەگریجەی دڵبەر.

واتە: ئەگەر بەهەشت بەبێ ئەگریجەی ئاڵۆزکاوی تۆ ببێتە شوێنم، شێوان و ئاڵۆزکانی خەیاڵم زیاتر لە پێچولوولی ئەگریجەی تۆوە دەبێ.

**صاحێبی غەدر و فسوونە، مادەری مەککاری دەهر**
**«بعد ازین» نابێ بە فەرزەندێکی وەك تۆ حامیلە (٥)**
**شینە یا شادی لە کولبەی سینەتا، "سالم!" بڵێ**
**دێتە گوێم دایم بە ڕۆژ و شەو نەفیر و غولغولە (٦)**

(٥) فسوون: فڕوفێڵ و ساختەکاری. مادەر: دایك. مەککار: مەکرباز. دەهر: ڕۆژگار. بعد ازین: پاش ئەمە. فەرزەند: ڕۆڵە. حامیلە: دووگیان.

واتە: دایکی مەکربازی ڕۆژگار هەر خەریکی غەدر و فڕوفێڵە، ئیتر ئەوەبەدوا ناتوانێ بە ڕۆڵەیەکی وەك تۆ دووگیان بێ.

(٦) کولبە: کەلاوە. نەفیر: ناڵە و هاوار و زاری. غولغولە: هاتوهاوار و بانگەبانگ.

واتە: سالم، کەلاوەی سنگت کە دڵێکی برینداری تێدایە، شین و شەپۆڕ یا شادی و خۆشیی تێدایە؟ لە کاتێکدا من هەمیشە و بە ڕۆژ و شەو دەنگی ناڵە و هاوار و بانگەبانگم دێتە گوێ.

(*) -٢٤-

**یار ئەگەر ئەمری بە مردن بێ، نەمردن موشکیلە!**
**بێنە، بۆ هەرچی بڵێ، بۆ من نەبردن موشکیلە! (١)**
**ڕوویی دڵ تا سوویی قیبلەی ئەبرۆیی جانانە بێ**
**ڕووبەڕووی میحراب و مەسجید سوجدەبردن موشکیلە! (٢)**
**نەقشی طـوٗفان دێتە بەر چاوم لە نەوحەی ڕۆژ و شەو**
**سەددی تەندوورەی تەنووری دیدە بۆ من موشکیلە! (٣)**
**تیری دڵدۆزی موژەت صەف‌صەف هەتا جونبوش بکەن**
**زەخمی پەیکانها لە دڵ، یەك‌یەك ژماردن موشکیلە! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتی مەحزووف.

(١) موشکیل: کێشە، گیروگرفت.

واتە: یار بڵێ بمرە، داوای هەر شتێك بکا و بڵێ بۆمی بهێنە، نەبردنی ئەو شتە بۆ من گیروگرفت و کێشەیە.

(٢) سوویی: بەرەو. ئەبرۆ: برۆ. جانانە: دڵبەر. میحراب: شوێنی پێشنوێژ لە مزگەوتدا، مەبەست برۆیە. مەسجید: مزگەوت. سوجدەبردن: کڕنووش‌بردن.

واتە: تا ڕووی دڵم بەرەو قیبلەی برۆی دڵبەر بێ، کڕنووش‌بردن بەرامبەر بە میحرابی مزگەوت کێشەیە.

(٣) نەقش: نەخش و نیگار. طوٗفان: لافاو. نەوحە: شیوەن و گریان. سەد: بەربەست، بەنداو. تەندوورە: زارکی دۆلاش، گێژ و خول. تەنوور: فڕن. دیدە: چاو.

واتە: شین و شەپۆڕی ڕۆژ و شەو دیمەنی لافاوهەستانم دێنێتە بەرچاو. بەربێ‌گرتن و بەربەست‌کردنی گێژوخولی ناو تەنووری چاوەکانم گیروگرفتە بۆ من.

نەوحەی (کم): لەوحەی. تەندوورەی (حا): تەنوورەی.

(٤) دڵدۆز: دڵبریندارکەر، پەرێشانکەر، کوشندە و کاریگەر. موژە: برژانگ. صەف‌صەف: ڕیز ڕیز. جونبوش: جووڵە و تەکاندان. زەخم: برین. پەیکانها: سەرەتیرەکان.

واتە: تا تیری دڵبریندارکەر و کوشندەی برژانگت ڕیز بە ڕیز بکەونە جووڵە، ژماردنی یەك بە یەکی برینی سەرەتیرەکان لە دڵدا بۆ من گیروگرفتە.

**بارە سایەی سونبولی گێسوو لەسەر غونچەی لەبت**
**بۆ منی پڕبارْلەب، ئەو لێوە گەزتن موشکیلە! (٥)**
**بۆ کەسێ وەك من لە هیجرا مەیلی تەنهایی بکا،**
**ڕۆژ لەگەڵ تەنهاییی ئەحمەق ڕابواردن موشکیلە (٦)**
**وادییی هیجرت بە پێی من زەحمەتە پایانی بێ**
**کەندنی خەندەق بە ضەربی نووکی سووزن موشکیلە (٧)**
**زاڵی دەهری دوون لەگەڵ هیچ شەوهەرێ ناباتە سەر**
**دۆسْتیی "سالم" لەگەڵ پڕئاشناژن موشکیلە (٨)**

پەیکانها (ن): پەیکانیا. هەڵەیە.

(٥) بار: قەتماغەی سەرلێو. سایە: سێبەر. سونبولی گێسوو: ئەگریجەی وەك سونبول. لەب: لێو. پڕبارلەب: لێو زۆر بەبار.

واتە: لێوەکانت هێندە ناسکن، سێبەری سونبولی پرچت دەبێ بە بار و تۆز بەسەریانەوە. بۆیە منی لێوبەبار و بارگران ناتوانم ئەو لێوانەت بگەزم، ئەوە گیروگرفتە بۆم.

بارە (کم، گم): باری. پڕبارلەب (کم، گم): پڕ بار لەبی.

(٦) هیجر: دووری. مەیل: ئارەزوو. (تەنهایی)ی یەکەم: تەنیایی. (تەنهایی) دووەم: کۆی تەن، کەسان. ئەحمەق: نەزان، سادەلەوح.

واتە: یەکێکی وەکوو من کە لە دووریدا ئارەزووی تەنیایی بکا و بچێتە کونجێکەوە، کات ڕابواردنی ڕۆژم لەگەڵ کەسانێکی نەزان و دەبەنگ گیروگرفتە.

بکا (حا): نەکا. (کم، گم): بکات.

(٧) وادی: شیو. دۆڵ. پایان: کۆتایی. خەندەق: خەندەك، چاڵ. ضەرب: زەبر. سووزن: سووژن.

واتە: ئەستەمە بتوانم شیو و دۆڵی دووریی تۆ بە پێی خۆم ببڕم و کۆتاییان پێ بهێنم. خەندەكلێدان بە زەبری نووکی سووژن زەحمەت و گیروگرفتە.

بە پێی (حا): بەبێ. زەحمەتە (حا، کم، گم): موشکیلە. سووزن (کم، گم): سووژن.

(٨) زاڵ: پیرژەن. دەهر: ڕۆژگار، دنیا. دوون: ئابەخ. هیچوپووچ. شەوهەر: مێرد. پڕئاشناژن: ژنی فرەدۆست.

واتە: پیرەژنی ڕۆژگاری ئابەخ و هیچوپووچ ناتوانێ تاسەر ژیان لەگەڵ هیچ مێردێك بەسەربەرێ. دۆستایەتیگرتنی "سالم"یش لەگەڵ ژنێك کە زۆر دۆست و ئاشنای هەبن، بۆ خۆی گیروگرفتە.

## (*) -٢٥-

دیسان لە بەزمی هیجران زەهری جەفام لە جامە
صوبحم لە میحنەتی یار هەمڕەنگی وەختی شامە
بادی صەبا! دەخیلە، واصیل کە ئەم پەیامە
«از خون دل نوشتم نزديك دوست نامه
إني رأيتُ دهراً من هجرك القيامه» (١)

لەوساوە غەم لە خاطر کردوویە ئیستیقامەت
ڕابورد لە کولبەیی دڵ ئاسایش و سەلامەت
ئالوودە بووم لە ئەندووە تا ساحەیی قیامەت
«دارم من از فراقش در ديده صد علامت
ليست دموع عيني هذا لنا العلامه» (٢)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (م)دا هەیە. پێنجخشتەکیی "سالم"ە لەسەر غەزەلێکی "خواجە حافظ شیرازی".

کێشی عەرووز: موزاریعی هەشتیی ئەخرەب.

(١) هیجران: دوورکەوتنەوە. جەفا: ئازار. جام: پیاڵە. صوبح: بەیانی. میحنەت: مەینەت. هەمڕەنگ: هاوڕەنگ. شام: شەو. صەبا: بای لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە هاتوو. دەخیل: دەستم بە دامێنت.

واتە: دیسان، لەبەر دوورکەوتنەوەی دڵبەر، ژەهری ئێش و ئازارم لە پیاڵەدایە و دەینۆشم. بەیانیی ڕووناکم لەبەر مەینەتی دووری لە یار هاوشێوەی شەو ڕەش و تاریکە. ئەی بای سەبا، دەستم بە دامێنت ئەم پەیامەم بگەیێنە. نامەم بە خوێنی دڵ نووسی بۆ دۆست. من سەردەمانێك پاش دووریی تۆ، قیامەتم بە چاوی خۆم دیوە.

(٢) خاطر: دڵ. ئیستیقامەت: ڕاستبوونەوە. کولبە: کەلاوە. ئالوودە: تێکەڵ. ئەندووە: خەم و خەفەت. ساحە: مەیدان، گۆڕەپان. قیامەت: زیندووبوونەوەی ئەو دنیا بۆ لێپرسینەوە.

واتە: ئەوەتی خەم لە دڵدا ڕاست بووەتەوە، ئاسایش و ئارامی و سەلامەتی لە کەلاوەی دڵدا نەماون. تا دەگەمە گۆڕەپانی قیامەت، تێکەڵی خەم و خەفەت بووم. سەد نیشانەم بەهۆی جیابوونەوەیەوە لە چاودا بۆ پەیدا بووە. ئەم فرمێسکانەی چاوەکانم بۆ ئێمە نیشانە نین.

**باز بەرقی حوسنی دڵبەر سووتاندی مەزرەعە و کاشت**
**یاران عیلاجی من کەن، نەمماوە هۆش و پونداشت**
**دوێنێ لە طەرفی صەحرا ڕابورد لە مەوسیمی چاشت**
**«باد صبا زود ماهم طرف نقاب برداشت**
**کالشمس في الضحايا تطلع من الغمامە» (٣)**

**هەرگیز لە باغی عومرم غونچەی موراد نەشکوفت**
**سووتا لە بەرقی میحنەت شاخی موورادی من موفت**
**دوێنێ بە میثلی زوڵفی، دڵبەر لە جوابم ئاشوفت**
**«گفتم: ز عشق رويت اندر ملامتم، گفت**
**والله مارأينا حبّاً بلا ملامە» (٤)**

**هەرگیز لە مەطبەخی بەخت ئاشی موراد نەبوو دەم**
**دونیا لەگەڵ منی زار وەك دوشمنە هەموو دەم**
**جەوری زەمانە بۆ من یەكذەڕڕە قەت نەبوو کەم**

(٣) باز: دیسان. بەرق: برووسکە. حوسن: جوانی. مەزرەعە: دێەر و مەزرا. کاشت: کشتوکاڵ. عیلاج: چارەسەر. پونداشت: بیر و خەیاڵ. طەرف: تەنیشت. صەحرا: سارا و دەشت. مەوسیم: وەرز. چاشت: چێشتەنگاو.

واتە: دووبارە برووسکەی جوانیی دڵبەر دێەر و مەزرای گیانمی سووتاند. یاران، چارەسەرێکم بکەن، هۆش و بیر و خەیاڵم نەماون. دوێنێ دڵبەر کاتی چێشتەنگاو لە لای ساراوە تێپەڕی. بای سەبا زوو ئێمەی بەرەو پەچەی دڵبەر هەڵگرت، کە وەك خۆر بوو لە خۆرنشیندا لەناو هەورەوە دەربکەوێ.

(٤) موراد: مەبەست و ئاوات. نەشکوفت: نەپشکووت. میحنەت: مەینەت. شاخ: لق و پۆپ. موفت: خۆڕایی. میثل: وەك. ئاشوفت: شێوا.

واتە: خونچەی ئاوات هەرگیز لە باخی تەمەندا نەپشکووت. چەخماخەی مەینەت لق‌وپۆپی ئاوات و مرازی منی بەخۆڕایی سووتاند. دڵبەر، دوێنێ وەکوو ئەگریجەی خۆی، لە وەڵامەکەی من دڵگیر بوو و پەشۆکا. وتم- لەتاو عیشقی ڕووی تۆ سەرزەنشت دەکرێم، وتی- بە خودا هیچ خۆشەویستییەکمان نەدیوە سەرزەنشتی تێدا نەبێ.

((هرچند آزمودم از وی نَبوَد سودم
مَنْ جرّبَ المجرَّب حلّتْ به الندامه)) (٥)

حەققەن لە بەزمی مەستان هەر تۆی حەریفی دێرین
سا دەی وەرە لە ڕووی ناز، ئەی زوڵفی بۆعەنبەرین!
لە بەزمی خاصی "سالم" بونیاد کە جەشن و ئایین
((حافظ" چو طالب آمد، جامی ز جام زرّین
حتی یذوق منه کأساً من الکرامه)) (٦)

(((ز عشق رویت اندر ملامتم، گفت)))، لای "حافظ" ((ملامت آید گر، گرد دوست گردم))ە.

(٥) مەطبەخ: چێشتخانە. ئاش: چێشت. نەبوو دەم: دەمی نەکێشا. زار: داماو. جەور: ستەم. ذەڕڕە: گەرد.

واتە: چێشتی مراز و ئاواتم هەر لە چێشتخانەی بەختدایە، دەمی نەکێشاوە. دنیا هەموو کاتێك لەگەڵ منی داماو دوژمنە. زەمانە ئەوەندەی گەردێك ستەمی لەسەر من کەم نەبووەتەوە. هەرچەندە فێر بووم، سوودم لەو نەدیوە. ئەوی شتی تاقیکراوە تاقی بکاتەوە، پەشیمانیی بەنسیب دەبێ.

((آزمودم))، لای "حافظ" ((کازمودم))ە.

(٦) حەققەن: بە ڕاستی. بەزم: شادی. مەستان: سەرخۆشان. حەریف: هاودەم. بۆعەنبەرین: بۆن وەك عەنبەر خۆش. خاص: تایبەت. بنیاد کە: بنیات بنێ. جەشن: جەژن. ئایین: ڕازاندنەوە و ئارایشتدان.

واتە: ئەوی ڕاستی بێ، هەر تۆی لە خۆشی و شادیی سەرخۆشاندا هاودەمی دێرینی. ئەی دڵبەری ئەگریجە بۆندار بە بۆنی عەنبەر، بە نازەوە جەژن و ڕازاندنەوە و ئارایشت لە بەزم و شادیی تایبەتیی "سالم"دا دابمەزرێنە. حافظ، لەبەرئەوەی داواکار هات، مەیگێڕ جامێك مەی بێنە، تا پەرداخێك لە شەرابی مایەی شەرەفمەندی بنۆشێ.

(((ز جام زرین)))، لای "حافظ" ((بجان شیرین))ە.

## (*) -٢٦-

**ئەو کەسە دایم لە دڵدا مەیلی بۆ ئازارمە**
**ڕۆژ و شەب بۆ تەندروستیی ئەو، دوعا ئیشعارمە (١)**
**جۆشی گریەم ئەشکی ئاڵی وا بە دامەن ڕیتووە**
**دەشتی (ڕەی) تا دێتە بەر چاوم، هەموو گوڵزارمە (٢)**
**سەطحی (قەزبین) و (کەرەج) تا بەندی جولگەی (ئیشتیهار)**
**شۆرەزاری هەرچی بێ، فرمێسکی دیدەی تارمە (٣)**
**تا لە (گەیلان) بارش و تا تەم (دەماوەند) داگرێ**
**ڕێژشی ئەشك و هەناسەی سینەیی ئەفگارمە (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لـە (مان، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) مەیل: ئارەزوو. شەب: شەو. ئیشعار: ئاگادارکردنەوە، بەئاگاهێنانەوە. خەبەردارکردن.

واتە: ئەو دڵبەرە کە هەمیشە ئارەزووی ئازاردانی منی هەیە، کەچـی مـن شـەو و ڕۆژ دوعـای تەندروستیی بۆ دەکەم و ئەو دوعایە مایەی بەئاگاهێنانەوەمە.

کەسە (گم): کەسەی. بۆ (گم): ئەو.

(٢) جۆش: کوڵ، قوڵپەقوڵپ. گریە: گریان. ئەشك: فرمێسك. دامەن: داوێن. ڕیتووە: ڕشتووە. ڕەی: شارێکی کۆنی باشووری (تاران)ە.

واتە: جۆش و کوڵی گریانی من وا فرمێسکی سووری ڕژاندووەتە دامێن، دەشت و دەر تا چـاو بڕ دەکا، هەمووی بووە بە گوڵ و گوڵزار.

دەشتی ڕەی (کم، گم): دەشت و دەر.

(٣) سەطح: ڕوو. قەزبین: قەزوین، دەریاچەی خەزەر. کەرەج: شارێکی سەرووی تارانە. بەند: بەنداو. جولگە: دەشت، زەویی ڕووتەختی پان. ئیشتیهار: ئیشتیهار (ف): ئیشتیهارد، شارێکی سەر بە شارستانی کەرەجە لە ئوستانی ئەلبورز و لە دەشتدایە. شۆرەزار: شۆرەکات. تار: تاریك، کوێر.

واتە: ڕووی خاکی (قەزوین) و (کەرەج) تا دەگاتە بەنداوی زەویی پان و بەرینی (ئیشتیهار)، هەر ئەرزێکی شۆرەکاتی هەبێ، ئەوە بـە خـوێی فرمێـسکی سـوور و سـوێری ناوچـاوی منـە بـووە بـە شۆرەخاك و ڕووەکی لێ نارِوێ.

(٤) گەیلان: هەرێمێکی باشـووری دەریای خەزەرە لە ئێران. بارش: بارین. دەماوەند: بەرزترین

**موڵکی ڕەی ‹نەجد› و منم "مەجنوون" و "لەیلا" دڵبەرم**
**بێـستوون ‹ئەلبورز› و من "فەرهاد" و "شیرین" یارمە (٥)**
**صیدقی پاکی بێتە ڕێم، با موددەعی بگرێ کەمین**
**بۆ طەوافی کەعبەیی کۆی تۆ، خودا سەتتارمە (٦)**
**یارْ "سالم!" کوا لە هیجرا، ڕۆژ و شەو، جوز یادی یار؟**
**مەیلی تەنهایی دەکەم، تا یادی دڵبەر یارمە (٧)**

لوتکەی زنجیرەی ئەلبورز. ڕێژش: داوەریـن. ئەشـك: فرمێـسك. سـینە: سـنگ. ئـەفگار: ئـازاردیو، دەردەدار، بریندار.

واتە: تا لـە وڵاتی (گەیلان) باران بباریّ و تەم سەری کێـوی ‹دەماوەنـد› داگـریّ، منـیش فرمێـسك دەڕێژم و هەناسەی سارد لـە سنگی بریندار و دەردەدارمەوە هەڵدەکێشم. یا: بارانی (گەیلان) فرمێـسکی چاو و تەمومژی سەر ‹دەماوەند› ئاه و هەناسەی سینەی برینداری منن.

بارش (کم، گم): بارەش.

(٥) نەجد: ناوچەیەکی وڵاتی سوعوودییەیە. مەجنوون و لـەیلا، شـیرین و فـەرهاد: قارەمانـانی دوو بەسەرهاتی دڵدارین.

واتە: وڵاتی ‹ڕەی› کە ناوە بۆ ‹تاران›، بۆ من بووەتە وڵاتی ‹نەجد› لـە عەرەبستانی حیجازدا. من بووم بە مەجنوون و دڵـبەریشم لـەیلایە. هەروایش کێوی ‹بێـستوون›ی نزیکـی کرماشـان، بـووە بـە کێوی ‹ئەلبورز›، خۆم بووم بە فەرهاد و یاریشم شیرینە.

(٦) صـیدق: ڕاسـتگۆیی. مـوددەعی: بـەدکار. کـەمین: بۆسـە. طـەواف: بەدەورداگـەڕان و سووڕانەوە. کۆ: بەردەرگا. سەتتار: داپۆش، سیفەتێکی خودایە.

واتە: با بەدکار بۆسەم بۆ بنێتەوە و بیەوێ بمکوژێ. من چونکە ڕاستگۆیی و پاکیی خۆم دێنـەوە ڕێم، تووشی زیان نابم. من مادەم بۆ زیارەتی کابەی دڵبەر دەچم، خودای گەورە دەمخاتـە ژێـر بـاڵی ڕەحمەتی خۆی و دەمپارێزێ.

(٧) هیجر: دووری. جوز: جگە لـە. ‹یار›ی سێیەم: یاریدەدەر، هاوکار.

واتە: سالم جگە لـە تۆ و یادی تۆ، کاتی دووری ڕۆژ و شەو دۆستێکی‌تری نییە. بۆیە ئـارەزووی تەنیایی دەکەم تا یادی دڵبەر یاریدەدەر و هاوکارم بێ.

یار (کم): یاری.

(*) -٢٧-

**شۆرەزاری خاکی (ڕەی) ئەمجارە دامەنگیرمە**
**ڕوو لە هەر وادی دەکەم، خاری وەکوو زەنجیرمە (١)**
**ئیبتیدا بۆ (ڕەی) کە هاتم، فیکری عەقڵیم لێ نەکرد**
**حەبسی تارانم گوناهی کاری بێتەدبیرمە! (٢)**
**بۆ فەلەك با چەند صەباحێکیش بنێرم تیری ئاه**
**کاری شێواوم خەطای ناڵینی بێتەئثیرمە (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان)دا هەیە. (کم، گم) هەر جووتەبەیتی یەکەم و دووەمیان تێدایە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) شۆرەزار: شۆرەکات، خاکی سوێراو. ڕەی: شارێکی کۆنی خوارووی ڕۆژهەڵاتی تارانە. دامەنگیر: داوێنگرتوو. وادی: دۆڵ، شیو. خار: دڕك.

واتە: ئەمجارە خاکی شۆرەکاتی وڵاتی (ڕەی) داوێنگیرم بووە. ڕوو دەکەمە هەر لایەکیش دڕکەکانی وەك زنجیر دەمبەستنەوە.

دەکەم (کم): ئەکەم.

(٢) ئەم دوو بەیتە لە (کم، گم)دا خراونەتە سەر قەسیدەی: ((ئۆف خودا ئەم جەژنە بۆ حاڵی غەریبان ماتەمە ...))، ئیتر لە ((بۆ فەلەك ...)) بەدواوە تا کۆتایی لە (کم، گم)دا نییە. ئەم پارچەشیعرەی دوایی شەش بەیتییە. دیارە هەڵەیان کردووە، چونکە قافیە و ڕەویەکەیان جیاوازن. ڕاستییەکەی، دوو پارچەشیعری جیان.

ئیبتیدا: سەرەتا. فیکری عەقڵی: بیری ژیرانە. حەبس: بەندی، زیندانی. بێتەدبیر: بێتەگبیر، بێڕێوشوێن.

واتە: سەرەتا کە هاتمە (ڕەی)، ژیرانە بیرم لێ نەکردەوە. مانەوە و قەتیسبوون یا بەندکرانی ناو (تاران)یشم، تاوانی بێتەگبیریی خۆمە.

حەبسی (کم): حەپسی.

(٣) فەلەك: چەرخی ڕۆژگار. صەباح: بەیانی. بێتەئثیر: بێزەبر، بێکاریگەری.

واتە: با چەند بەیانییەکیش تیری هەناسەی سارد بۆ ئاسمان بنێرم، چونکە کاری بێسەروبەر و پەرێشانی من تاوانی ناڵە و هاواری بێهوودەی خۆمە، کە هیچ کاریگەرییەکی نەبووە. با ئەمجارە تیری ئاهی تێبگرم.

وا لەناو سینەی قەفەسما مورغی دەستئامووزی یار
بەم غەمە موستەوجیبم، صەیدی حەرەم نەخچیرمە (٤)
مونحەریف نابم لە ڕێی عیشق، ئەر شەوی یەلدا بڕۆم
زوڵفی وەك یەلدایی دڵدارم هەتا دەستگیرمە! (٥)
کەی بە صەیحەی من دەگا جەزبەی موریدی خانەقاه
پیری ئەو شێخی موسیننە و من جەوانێ پیرمە! (٦)
جوابی نامەی دڵبەرم بۆیێ دەقیقە و خوونچەکان
نووکی خوونئالوودی موژگان خامەیی تەحریرمە! (٧)

(٤) سینە: سنگ. مورغ: باڵندە. دەستئاموز: دەستەمۆ، دەستپەروەردە. موستەوجیب: شایستە. صەیدی حەرەم: گیانلەبەری پانتاییی دەوری حەرەم (کەعبە) کە کوشتن و ڕاوی تێدا قەدەغە و حەرامە. نەخچیر: نێچیر.

واتە: لەبەرئەوەی دڵم باڵندەی دەستەمۆی یارە و من لەناو قەفەری سنگمدا بەندم کردووە و ناهێڵم بڕواتەوە بۆ لای یار، من شایستەی ئەم خەم و مەینەتەم، چونکە تاوانێکی کەم نییە مرۆڤ باڵندەی حەرەم ڕاو بکا و بیخاتە قەفەزەوە!

(٥) مونحەریف: لەڕێلاداو. ئەر: ئەگەر. (یەلدا)ی یەکەم: درێژترین شەوی ساڵ. (یەلدا)ی دووەم: ڕەش و تاریك. دەستگیر: شێخی تەریقەت، ئەوی دەست دەگرێ بۆ هاوکاری و ڕێنیشاندان.

واتە: ئەگەر شەوی ئەنگوستەچاو و درێژی یەلدایش بەرێدا بڕۆم، لە ڕێی عیشق لانادەم، چونکە ئەگریجەی درێژ و ڕەشی یارم بە دەستمەوەیە و ڕێنیشاندەرمە، یا شێخی تەریقەت و ڕابەرمە.

(٦) صەیحە: هاوار. جەذبە: حاڵلێهاتن. حاڵەتی دەست بۆ ڕاکێشان و بەرەو لای خودا بردنی خوداپەرستی بێئاگا لە خۆی. مورید: تۆبەکاری سەر دەستی شێخ. پیر: ڕابەر. موسین: بەساڵداچوو.

واتە: کوا حاڵلێهاتنی موریدی خانەقا وەك هاتوهاواری من وایە؟ ئەو شێخێکی پیری بەساڵداچوو پیریەتی، منیش نەوجوانێك.

(جەذبە) بە (جەزبە) نووسراوە، کە هەڵەیە.

(٧) جواب: وەڵام. بۆیێ: لەبەرئەوە. دەقیق: ورد. خوونچەکان: خوێن لێداچۆڕاو. خوونئالوود: تێکەڵ بە خوێن، خوێناوی. موژگان: برژانگ. خامە: قەڵەم. تەحریر: نووسین.

واتە: وەڵامی نامەی دڵبەرەکەم، لەبەرئەوە وردە وردە خوێنی لێ دادەچۆڕێ کە قەڵەمی نووسینم نووکی خوێناویی برژانگی یارە.

## صادیقی بۆ ئەهلی ئەییامە، "سالم" ... سوودی کرد
## سەر نەچوو کارم لە صیدقا، نۆبەتی تەزویرمە (٨)

(٨) صادیقی: ڕاستگۆیی. ئەهلی ئەیام: خەڵکی ڕۆژ و سەردەم. سوودی کرد: سوود و قازانجی وەرگرت. نۆبەت: نۆرە. تەزویر: ساختەکاری.

واتە: ڕاستگۆیی بۆ خەڵکی ئەم ڕۆژگارەیە، سالم ... سوودی لێ بینی؟ کاروبارم لە ڕاستگۆییدا سەری‌نەگرت، بۆیە نۆرەی ساختەکاریمە.

نیوەبەیتی یەکەم لەنگە، بەپێی مەبەستی بەیتەکە، دەبێ (چ) یا (کوا) یا (کەی) یان شتێکی لەو بابەتە لە نێوان "سالم" و ((سوودی کرد))دا هەبێ، تا ماناکەی تەواو بکا و لەنگییەکەی نەهێڵێ.

(تەزویرمە)، بە هەڵە بە شێوەی (تەذویرمە) نووسراوە.

-٢٨- (*)

**لە نووری لامیعی تەشتێکی ڕاگرت و وتی: ڕوومە**
**بە دۆشا ئەژدەهای پڕنێشی ڕاکێشا، وتی: موومە! (١)**
**تکام کرد: قەتلی من ناحەق، نییە واجیب، وتی: فەرضە!**
**وتم: بۆ ئاگرت بەردایە عومری من؟ وتی: خوومە! (٢)**
**وتم: تەنها منم پابەندی عیشقی تۆ، وتی: گوم بە!**
**هەزارێکی وەکوو تۆ کوشتەیی شەمشێری ئەبروومە (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، هـ، غ، ج، نم، گم)دا هەیە. (دیوانی کوردی، بەرگی دووەم، ل٥٧-٥٨) بە ناوی "کوردی"یەوە بڵاوی کردووەتەوە، گوایە "سالم"یش شیعری ((سەوادی قیرگوونشەبها لە نوسخەی عەنبەرینمووتە ** سەراسەر ڕەونەقی دونیا لە عەکسی ئاینەی ڕووتە))ی پاش ئەو شیعرەی کوردی نووسیوە. بەڵگەی بێئەملاوئەولا کە شیعرەکە هیی "سالم"ە، ئەوەیە کە لە نوسخە بەتایبەتی بۆ نووسراوەکەی سالم خۆیدا (مان) هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) نوور: ڕووناکی. لامیع: درەوشاوە. دۆش: شان. ئەژدەها: کوڵەوەیباب، ماری گەورە. نێش: چزوو.

واتە: دڵبەر تەشتێکی لە ڕووناکی درەوشاوەی خۆی بە دەستەوە گرت و وتی ئەمە ڕووی منە. پرچی درێژی چزووداری وەك مار بە شاندا بەدوای خۆیدا ڕاکێشا و وتی ئەمە مووی منە!

نووری (عا): پووزی. تەشتێکی (ج): تەشتێکە. دۆشا (هـ): دۆشدا. (گم): دوو شەم. ڕاکێشا (نم، گم): ڕاگرت و. وتی (گم): کوتی. (تەشتێکی) لە (مان)دا بە شێوەی (طەشتێکی) نووسراوە.

(٢) قەتڵ: کوشتن. واجیب: ئەرك، پێویستی. فەرض: ناچاری، پێویستیی سەپێنراو. خوو: نەریت، کردەوە.

واتە: داوام لە یار کرد نەمکوژێ و پێم وت ناهەقییە کوشتنی منت کردەوە بە ئەرکی سەرشانی خۆت، وتی- ئەوە فەرزە و دەبێ بیکەم. وتم- بۆچی ڕەنجی تەمەنی منت بەبادا و ئاگرت تێبەردا؟ وتی- ئەمە ڕەوشت و نەریتی منە.

نییە واجیب (هـ): مەکە واجیب. (گم): بەس بکە جانا.

(٣) ئەم بەیتە لە (گم)دا نییە.

**وتم: گەردەنکەچی عیشقت منم تەنها، وتی: شێتی!**
**صەدی وەك تۆ لە هەر سوو بەستەیی زەنجیری گێسوومە! (٤)**
**وتم: با بەس لە خوانی لوطفی تۆ نەومیدی جاوید بم؟**
**وتی: مردووت مرێ! عاشق هەمیشە زار و مەحروومە! (٥)**
**وتم: زەخمی دڵم کاریگەرە، توند بوو، وتی: لاچۆ**
**بە من چی؟ تیرەبارانی نیگاهی چاوی جادوومە! (٦)**

پابەند: پێوەبەستراو. ئەبروو: برۆ.

واتە: پێموت هەر من پابەندی خۆشەویستیی تۆم، دەریکردم و وتی: هەزاری وەك تۆ کوژراوی شمشێری برۆکانمە.

گوم بە (ج، نم): شێتی.

(٤) هەر سوو: هەر لا. گێسوو: ئەگریجە.

واتە: کە وتم هەر من ملکەچی خۆشەویستیی تۆم، بە شێتی دانام و وتی: سەد کەسی وەك تۆ لە هەموو لایەکەوە بە زنجیری ئەگریجەی من بەستراونەتەوە.

وتم (گم): کوتم. تەنها (غ، ج، نم): فەردەن. شێتی (ج، نم): گوم بە. صەدی (گم): سەدی.

(٥) خوان: سفرە. نەومید: نائومێد. جاوید: هەمیشەیی. زار: داماو. مەحرووم: بێبەش کراو.

واتە: کە پێموت با ئەوەندە و تاسەر لە لوتف‌نواندنی تۆ نائومێد نەبم، وتی- عاشق هەمیشە داماو و بێبەش بووە.

لوطفی (گم): وەصڵی. نەومیدی جاوید بم (ه، نم، گم): نەومید و بێبەش بم. هەمیشە (گم): بەدایم.

(٦) ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی لە (غ)دا نین.

زەخم: برین. نیگاه: تەماشا. جادوو: سیحرباز.

واتە: گەیشتن بە تۆ، ئەگەر لە سێبەری دڕکی موغەیلانیشدا بێ، کە مرۆڤ ناتوانێ لە بنیدا دابنیشێ، وەك دانیشتن لە بەهەشتدا وایە. بەڵام لە کاتی دووریمدا لێتەوە، دانیشتن لەناو گوڵ و گوڵزاریشدا وەك ڕاکشانە لەناو سندووقی تابووتدا، کە مرۆڤ مردووە و بۆ سەرقەبرانی دەبەن.

زەخمی دڵم کاریگەرە (ه): زەخمی دڵم بەس کارییە. (گم): ڕەخمێ دڵم بەس کارییە. (لاچۆ)یش نییە. تیرەبارانی (عا): تیربارانی. چاوی (عا): جاوی. هەڵەی نووسینە.

وتم: زارم لە غەم، ڕوانیی، وتی: قانوون مەشێوێنە
وەفا بۆ دڵبەران، هەی بێخەبەر! یەکبارە مەعدوومە! (٧)
وتم: "سالم" دزە، دەستی بوڵەند کرد، ئاینەی ڕاگرت
وتی: کێشکچیی ئەم باغە بە دایم خاڵی هیندوومە! (٨)

(٧) یەکبارە: یەکجاری. مەعدووم: نەبوو.

واتە: بە هۆی زوڵفی درێژ و چاڵی چەناگەتەوە، دڵی عاشق ناتوانێ بگاتە ڕوخسارت و تێر تەماشای بکا. لە لایەکەوە ئەڵقەکانی ڕەشماری زوڵفت ڕێی لێ دەگرن و لە لایەکیترەوە چاڵی هارووت و مارووت، کە مەبەست چاڵی چەناگەیەتی، ناهێڵێ بێتە پێشەوە.

هەی (نم): ئەی.

(٨) ئاینە: ئاوێنە. کێشکچی: ئێشکچی. دایم: هەمیشە. هیندوو: ڕەش.

واتە: کە پێموت سالم دزە و دزیی لە باخی ڕوخسارت کردووە، دەستی بەرز کردەوە و ئاوێنەی ڕاگرت، وتی- ئێشکچیی ئەم باخە هەمیشە خاڵی ڕەشم بووە، بۆیە بڕوا ناکەم وابێ.

بڵند کرد (نم): درێژ کرد. ڕاگرت (ج): ڕاکرد. هەڵەیە. کێشکچی (نم): ئێشکچی. (بە)ی (بە دایم لە (مان)دا کەوتووە.

-٢٩- (*)

**ئۆف خودا، ئەم جەژنە بۆ حاڵی غەریبان ماتەمە**
**باوجوودی ذەوقی مەردوم، خاطری من پڕغەمە! (١)**
**ڕەسمی عیدیم سێبی غەبغەب بوو لە جەژنی پارْساڵ**
**حەسرەتا! لەم جەژنەدا عیدانەوو عیدیم هەمە (٢)**
**جەژنی ئەمڕۆ فەصڵی صەحرا و ذەوقە یاران! ئەی عەجەب**
**دڵ لە صەحرای سینەما مەشغووڵی شین و ماتەمە؟! (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، غ، ج، کم، گم)دا هەیە. وەك وترا، لە (کم، گم)دا دوو بەیتی پارچەشیعری پێشووی خراوەتە سەر.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) باوجوود: سەرباری ئەوە. ذەوق: کەیف و خۆشی. مەردوم: خەڵك. خاطر: دڵ.

سالم لە کاتی وتنی ئەم پارچەشیعرەدا ئاوارە بووە. وتوویە: ئۆف خودایە، ئەم جەژنە بۆ حاڵوباری ئاوارە و غەریبان شین و گریانی کۆستکەوتنە. هەرچەندە خەڵك لە شادی و خۆشیدان، من دڵم پڕە لە خەم و خەفەت.

ذەوقی (عا): زەوقی.

(٢) عیدی: عیدانە، جەژنانە، پارە یا دیاریی جەژن. سێب: سێو. غەبغەب: نەرمایی ژێر چەناگە و مل. حەسرەتا: حەیف، بەداخەوە. عیدانە: جەژنانە. عید: جەژن. هەم: خەم.

واتە: پار، سێوی غەبغەبەی ملی یارم بە دیاریی جەژنانە وەردەگرت. بەداخەوە ئەم جەژنە جەژنکردن و جەژنانەکەم خەفەتە.

ڕەنگە ساڵێکی پاش ڕووخانی میرایەتیی بابان و ئاوارەیی و چوونە ئێران ئەم شیعرەی وتبێ.

عیدیم (غ، ج، کم، گم): عیدم. (عیدم) لە (مان، عا)دا (عیدیم) بوو کە لەگەڵ (عیدانە) یەك شتن، بۆیە وا نووسرایەوە. عیدیم هەمە (عا، کم، گم): عیدم هەمە.

(٣) ئەم بەیتە لە (عا)دا نییە.

فەصڵ: وەرز. صەحرا: دەشت و دەر. ئەی عەجەب: سەیرە. سینەما: سنگمدا. مەشغووڵ: خەریك.

واتە: یاران، جەژنی ئەمڕۆ وەرزی چوونە سارا و دەشت و شادی و ڕابواردنە. سەیرە! دڵ لە سارای سینەمدا خەریکی گریان و شینگێڕانە.

**گەر مەلالی حەسرەتی ئەم جەژنە ظاهیر کەم لە دڵ**
**ساحەتی غەبرایی دەوران بۆ مەلالی من کەمە! (٤)**
**دڵ لە غەم مەذبووحْوار و دیدە جەشنئارایی ڕوو**
**ئاریّ، ئاریّ جەژن و قوربانی لە هەر سوو باهەمە (٥)**
**صوبحی عیدی مەردومە، فەصڵی نەهار و شەهد و سوور**
**"سالم!" ئێستە، من حەقیقەت، صوبحی فەقر و فاقەمە! (٦)**

(٤) مەلال: بێزاری، دڵتەنگی. حەسرەت: داخ. ظاهیر کەم: بخەمە ڕوو، نیشان بدەم. ساحەت: مەیدان، گۆڕەپان. غەبرا: تۆزاوی، ڕەنگخاکی. دەوران: دنیا، ڕۆژگار.

واتە: ئەگەر خەم و بێزاریی ناو دڵم دەربڕم و بیخەمە ڕوو، گۆڕەپان و دەشتی تۆزگرتووی ڕۆژگار بۆ بێزاریی من کەمە و نایگریّ.

ظاهیر (عا): زاهیر. ساحەتی (عا): ساقی. دەوران (عا): دنیا.

(٥) مەذبووحوار: وەك سەربڕراو. دیدە: چاو. جەشنئارا: جەژنڕازێنەوە. ئاریّ: بەڵێ. هەر سوو: هەر لایەك. باهەم: پێکەوە.

واتە: دڵی من لەبەر خەم وەك حەیوانی سەربڕراو وایە کە بە داردا کرابێ. چاویش ڕێکخەر و ڕازێنەوەی ڕوخساری دڵبەرە. بەڵێ، ئەم وەرزە جەژنە بۆ هێندێ کەس و جەژنی قوربانە و کاتی قوربانیدانە، لە هەموو لایەکیشەوە شین و ماتەمە بۆ غەریبان.

مەذبووحوار و (کم، گم): مەذبووحی دار و. جەشنئارایی (کم، گم): جەژن ئارای. جەژن و قوربانی لە هەر سوو باهەمە (کم): جەژن و قوربانە و لە هەرسوو ماتەمە. (گم): جەژنی قوربانە لە هەر سوو ماتەمە.

(٦) صوبح: بەیانی. نەهار: ڕۆژ. شەهد: هەنگوین. سوور: شایی. حەقیقەت: بەڕاستی. فەقر: هەژاری. فاقە: نەداری، دەسکورتی.

واتە: بەیانیی جەژنی خەڵکە و وەرزی ڕۆژی شیرینی و شاییە. سالم، منیش ئێستا بە ڕاستی بەیانیی هەژاری و دەسکورتی و لاتولەوارییمە.

نەهار و (کم): نەهاری. نەهار و شەهد و (گم): بەهاری زەرد و. سوور (عا): شوور. فەقر و فاقەمە (غ): قەفر و قاقەمە.

## -٣٠- (*)

**له حەملەی ڕایی هیندی غەم، شەهی شادی گوریزانە**
**سەراسەر لەم ڕەهە ئیقلیمی دڵ پامالّی فیلانە (١)**
**بە هەوری غەم لە ڕەعدی گریە سا چەخماخە دە، ئەی دڵ!**
**لە لای دەریادڵان ئەشکم هەموو بارانی نیسانە (٢)**
**دەروونسەودایی دڵ دەردێ، هەتیوئاسا لەدەست حاجیب**
**بیروون سوو مەردومی دیدەم بە حەسرەت ئەشکڕێزانە (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (غ، کم، گم)دا هەیە. ناسناوی "سالم"یش نییە.
کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) حەملە: هەڵمەت، گەلەکۆمە. ڕایی: ڕێی. هیند: وڵاتی هیندستان. شەه: شا، پادشا. گـوریزان: هەلاّتوو. ئیقلیم: هەرێم، پامالّ: پێخوست، ژێرپێخراو، بەپێوە ڕۆیشتوو. فیلان: کۆی فیل.
واتە: پادشای شادی لەو هێرشانەدا کە لە ڕێگەی هیندستانی خەم و مەینەتدا کرانـە سـەرمان، هەلاّتنی بۆ مایەوە. مەملەکەتی دڵ پەڕاوپەڕ لەم ڕێیەدا پامالّی فیلەکان بوو.
((هیندی غەم)) (اضافەی مشبە بە)یە بۆ لای (مشبە). یانێ: خەم ئەوەندەی وڵاتی هیندستان ڕەشە و زۆرە، فیلیش لەو وڵاتە زۆرە. ئەمە پێی دەوترێ (ترشیح التشبیە). فیلانە (غ): پیلانە.

(٢) ڕەعد: چەخماخە، هەورەتریشقە. گریە: گریان. دەریادڵان: دڵفراوانان. ئەشك: فرمێسك.
واتە: ئەی دڵ، بەم هەوری خەم و خەفەتە لەناو هەورە تریشقەی گریانمدا چەخماخە بدە. با گریانم زیاتر وەك خوڕەخوڕی باران تاو بسێنێ و فرمێسکم برژێتە خوار، چونکە فرمێسکەکانی من لای ئەوانەی وا دڵیان وەك دەریا گەورە و فراوانە، هێندەی تکەی بارانی نیسانە و گرانبەهایە؛ کە دڵۆپە بارانی نیسان دەچێتەوە ناو دەریا، گەوهەری لێ پەیدا دەبێ.

(٣) دەروون: لەناوەوە. هەتیوئاسا: وەك هەتیو. حاجیب: دەرگاوان. بیروون سوو: ڕوو لە دەرەوە. مەردوم: گلێنە. دیدە: چاو. ئەشكڕێزان: فرمێسكڕێژ.
واتە: لە ناوەوە سەودا و عیشق و سۆزی دڵ دەردێ، وەك هەتیو وایە بەدەست ئەو دەرگاوانەوە کە ناهێڵێ بچێتە ناو ئەگریجەی یار. لە دەریشەوە گلێنەی چاوم بە داخ و خەفەتەوە فرمێسك دەڕژێنێ، لەبەر دووریی لە دڵبەر.

**میانزەنبووری من قەت شەهدی بێتەڵخی بە کەس نادا**
**بە قەد صافیی عەسەل دایم لەگەڵ ئەم شانە نێشانە (٤)**
**ڕەفیقت دڵ قوبووڵ ناکا، ڕەقیب لێم لادە توو دینت**
**حەبیبی من لەگەڵ تۆ وەك ئەنیسی کرم و شیلانە (٥)**
**دو سەنگین سەنگی باوەزنن، غەم و پیری دو تا حاضر**
**خەریکی کەشمەکەش، دڵ دووسەرە لەم وەزنە وەززانە (٦)**

دورروونسەودایی (غ): دەرون سو تۆف. لەنگە.

(٤) میان: ناوقەد. زەنبوور: زەردەواڵە. شەهد: هەنگوین، شیرینی. بێتەڵخ: تاڵ نەبێ. صافی: ڕوون و بێگەردی. عەسەل: هەنگوین. نێشانە: کۆی نێش، ئازار و ئێش.

واتە: دڵبەری ناوقەد وەك ناوقەدی زەردەواڵە باریك، هەرگیز هەنگوینی بێتاڵی ناداتە کەس. ئەوەندەی سافی و بێگەردیی هەنگوینەکە، هەمیشە ئێش و ئازار لەگەڵ شانەی هەنگوین دەدا بە ئێمە.

قەت (غ، کم): قەد.

(٥) ڕەفیق: دۆست. ڕەقیب: بەدکار، ناحەز. حەبیب: خۆشەویست. ئەنیس: هۆگر، هاودەم.

واتە: ئەی بەدکار، توو دینت لێم لادە و وازم لێ بێنە، دڵ دۆستایەتیی تۆی قوبووڵ نییە. ئەو دڵبەرەی من کە بووە بە دۆستی تۆ، دۆستایەتییەکەی لەگەڵ تۆ وەك هاودەمیی کرم و دارشیلان وایە کە پێکەوە ناگونجێن و کرم دارشیلان کرمێ دەکا، لەبەرئەوە تۆی ناوێ.

ڕەفیقت (غ): ڕەفیقیت. دروستترە. توو دینت (غ): تۆ و دینت. حەبیبی (غ): جەلیسی.

(٦) سەنگین: قورس. کەشمەکەش: کێشمەکێش. وەزن: کێش، ئەندازەگرتن، بەراوردکردن. وەززان: کەسێك کە شت دەکێشێ و بەراورد دەکا.

واتە: خەم و پیری دوو سەنگی قورسی بەکێشن و هەردووکیان هەن. دڵ کەوتووەتە کێشمەکێش و لە هەردوو سەرەوە خەریکی کێشانیانە، تا بەراوردیان بکا و بزانێ کامیان قورسترە.

-٣١- (*)

((ألاَ ياَ أيّها الساقي!)) به موفليس وەختی ئیحسانه
((أَدِرْ كأساً وناوِلْهَا))، عەطا شێوەی کەریمانه (١)
عەرووسی بیکری مەغروورم لە مەهدی جامی بلloورا
قەراری بەستنی مەهری لە عەقدا نەقدی ئیمانه (٢)
دڵی پڕحەسرەتم ئەمشەو لە عیشرەت خاڵییه، سا دەی!
مەیێڵە بمکوژێ حەسرەت، بە عیشرەت پڕ کە پەیمانه (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لـە (مان، ھ، ج، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) الا يا ايها الساقي: ئاگادار بە ئەی مەیگێڕ. موفلیس: لات، نابووت. ئیحسان: چـاکەکردن. أدِرْ كأساً وناولها: پیاڵـەیەك بگێڕە و بیدە. عەطا: بەخشش. کەریمان: بەخشندان.

واتە: مەیگێڕ، ئاگادار بە ئێستا کاتی چاکەکردنە لـەگەڵ مەینۆشـانی نـابووت و گیرفـانخـاڵیی مەیخانە. پیاڵە بگێـڕە و کـەرەمی بکـە، بـا بخورێتـەوە. کـەرەمکـردن و بەخـشش شـێوە و خـووی بەخشندەی دڵفراوانە.

عەرەبیی هەردوو نیوەبەیتەکە هیی "حافظ شیرازی"یە.

(٢) عەرووس: بووك. بیکر: دەستلێنەدراو، بوخچەی نەکراوە. مەغروور: لـەخۆبایی. مەهـد: بێشکە. جام: شووشە. قەرار: بڕیار. مەهر: مارەیی. عەقد: پەیمانبەستن. نەقد: دراو. ئیمان: باوەڕ.

واتە: بووکی دەستلێنەدراوی لـەخۆبایـی مـن لـەناو بێـشکەی جـامی بلووریندایـە. بڕیـاری مارەکردنی ئەو کچە، لـە هونەری عیشقدا نەخت و دراوی ئیمانە. مەبەسـت لـەو عەرووسە شـەرابی ناو پیاڵە، لـە مارەبڕینی ئەوەیە ئەو جامە بەدەستەوە بگری و لێو بخەیتە سەر لێوی. ئیتر ئەم عەقدە بە ئیمان دەژمێررێ.

بلـلوورا (ھ): بلوورە. بەستنی (ج): بەستی. هەڵەیە. لـە عەقدا (کم، گم): لـە عیشقا.

(٣) حەسرەت: داخ و خەفەت. خاڵی: بەتاڵ. عیشرەت: پێکەوە ڕابواردن و ژیان بەسـەربردن، هاونشینی. پەیمانە: پیاڵـەی شەراب.

واتە: دڵی پڕ لـە داخ و کەسەرم، ئەمشەو خۆشی و شادیی تێدا نییە. بۆیە مەهێڵـە داخ و خەفـەت بمکوژێ، هاونشینم بە و بە ڕوویەکی خۆشەوە چاکەم لـەگەڵ بکە و پێکم بۆ پڕ بکە.

**له بێشەوقیی سولووکی تۆ، بە جارێ مەقصەدم گوم کرد**
**بە شوعلەی شەوقی مەی بمبەن هەتا دەرگایی مەیخانە (٤)**
**لە ڕووتا موئمین و تەرسا لە وەصفت هەردوو صیددیقین**
**چەلیپای زوڵف و نووری طەڵعەتت جێی کوفر و ئیمانە (٥)**
**بەهاری ئەصڵ ئەگەر حوسنت نییە، ئاخر بڵێ بۆچی**
**بەرابەر تۆ سروشکم، موتتەصیل، وەك تاوی بارانە؟ (٦)**

(لە حەسرەت)ی نوسخەی (مان) هەڵەی نووسینە و (لە عیشرەت)ی نوسخەکانیتر ڕاستە. مەیڵە (کم): مەیەڵە. پڕکە پەیمانە (کم، گم): وەختی ئیمانە.

(٤) بێشەوقی: بێزەوقی، وشكوبرنگی. سولووك: ڕەفتار و کردار. مەقصەد: مەبەست. شوعلە: گڕ. شەوق: ڕووناکی، درەوشانەوە.

واتە: لەبەرئەوەی ڕەفتار و کرداری تۆ هیچ شەوق و درەوشانەوەیەکی نەبوو، بە یەکجاری مەرامی خۆمم ون کرد. جا تکایە بە ڕووناکیی گڕی مەی تا بەردەرگای مەیخانەم بەرن.

لە بێشەوقیی سولووکی تۆ، بە جارێ مەقصەدم (هـ): لەبێ شەوقی سولووکی تۆ بە من ڕێی مەقصەدی. (بە مارێ) لە (مان، ڕ)دا هەڵەی نووسینە و (بە جارێ)ی نوسخەکانیتر ڕاستە.

(٥) موئمین: موسوڵمانی باوەڕدار. تەرسا: مەسیحی. صیددیق: بەندەی تایبەتی خوداوەند. چەلیپا: خاچ. زوڵف: ئەگریجە. نوور: ڕووناکی. طەڵعەت: ڕوخسار.

واتە: موسوڵمان و گاور لە ڕووی تۆدا و بەرامبەر بە تۆ، هەردووکیان ڕاستگۆیانە وەسف و ستایشی تۆ دەکەن و خۆشیان دەوێی، چونکە خاچی ئەگریجەی یەکتربڕت دروشمی خاچهەڵگران و ڕووناکیی ڕوخساریشت وەك نووری ئیمان وایە. کە وایە هەردوو لا خۆشیان دەوێی و وەسفت دەکەن.

تەرسا (هـ): کافر. زوڵف و (کم، گم): زوڵفی. هەڵەیە.

(٦) ئەصڵ: ڕاستەقینە، حوسن: جوانی. سروشك: فرمێسك. موتتەصیل: یەکبینە، بەردەوام.

واتە: ئەگەر بەهاری ڕاستەقینە و بەفەڕ لە جیلوەی جوانیی تۆوە و جوانیی تۆ ڕەنگوڕووی بە وەرزی بەهار نەداوە، بۆچی ئەو فرمێسکەی وا بەرامبەر بە تۆ دەیڕێژم یەکبینەیە و وەك تاوە بارانی بەهار وایە. بە کورتی بەهۆی عیشقی تۆوە فرمێسکی سوور دەڕێژم، جوانیی تۆیش کارێکی کردووە عیشقی من لە دیمەنی بەهاردا دەربکەوێ.

تۆ (کم، گم): تۆی.

**له حەلقەی بەزمی دڵدارا بە عیشرەت مەجلیسێ گیرا**
**بە تەنها دیم لەناو ئەو جەمعەدا "سالم" پەرێشانە! (٧)**

(٧) بەزم: شادی. مەجلیس: کۆڕ و کۆبوونەوە. جەمع: کۆمەڵ.

واتە: کۆڕ و کۆبوونەوەیەك لە ئەڵقەی بەزم و شادیی دڵبەردا بە خۆشی و شادییەوە بەسترا. تەنیا "سالم"م لەناو ئەو کۆڕەدا بینی پەرێشان و شێواو بوو.

دڵدارا (کم، گم): دڵدارم. مەجلیسی گێڕا (ڕ): پڕکە پەیمانە. لەناو ئەو جەمعەدا (کم، گم): لەناوی ئەو دڵی.

## -٣٢- (*)

موژگان و ئەبرۆیی تۆ: ئەم تیر و ئەو کەمانە
سینە و دڵی فکارم: ئەم صەیدە، ئەو نیشانە (١)
بۆ دڵ لە دیدەیی یار، دووری خیلافی عەهدە
ناکا خومارْدیدە تەرکی شەرابْخانە (٢)
ئەگریجەکانی کوڵمت یاتاغی مورغی دڵمە
بولبول لە پەهلوویی گوڵ بەستوویە ئاشیانە (٣)
هەستانی تۆ بوو هەستا ئاگر لە کولبەیی دڵ!
دانیشە، دا بنیشێ شوعلەی خەرابْخانە (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە بەشی (غزلهای جدیدە)ی (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: موزاریعی هەشتیی ئەخرەب.

(١) موژگان: برژانگ. ئەبرۆ: برۆ. کەمان: کەوان. سینە: سنگ. فگار: بریندار. صەید: نێچیر.

واتە: برژانگ و برۆت، هەردوو وەك تیر و کەوان وەهان. سنگم نێچیر و دڵی برینداریشم نیشانی تیری دڵبەرە.

(٢) دیدە: چاو. خیلاف: پێچەوانە، سەرپێچی. عەهد: پەیمان. خومار دیدە: چاوی مەست و خومار. تەرك: وازلێهێنان. شەرابخانە: مەیخانە.

واتە: دڵ نابێ لە چاوی دڵبەر دوور بێ، چونکە ئەوە پێچەوانەی پەیمان و بەڵێنە. چاوەکانی مەست و خومارن و دەست لە مەیخانە هەڵناگرن، بەردەوام سەراسیمەیان کردووم.

(٣) یاتاغ: مەنزڵ و ماوا. مورغ: پەلەوەر: تەنیشت، پەنا. ئاشیانە: هێلانە.

واتە: ئەو ئەگریجانەت کە بەسەر کوڵمتدا پەخش بوون، مەنزڵ و ماوای پەلەوەری دڵی منن. بولبولی دڵم هێلانەی بە تەنیشت گوڵی ڕووتەوە پێکەوە ناوە.

(٤) هەستان: ڕاوەستان، لەسەر پێ ڕاوەستان. هەستا: بەرزبووەوە. کولبە: کەلاوە. دا: تا. بنیشێ: دامرکێتەوە. شوعلە: گڕ و بڵێسە. خەرابخانە: وێرانە، کاولە.

واتە: کە تۆ هەستایتە سەر پێ، ئاگر لە کەلاوەی دڵم بەرز بووەوە و سووتاندی. دابنیشە، تا گڕ و بڵێسەی وێرانەی دڵ دامرکێتەوە.

**بێخود لە وادییی عیشق، لافی صەلابەتم دا!**
**نەمزانی شێرگیرە، ئەو چاوە ئاهووانە! (٥)**
**گرتم بە دەست و بەستم تا مەیلی تۆ بەکامە**
**تەسبیحی صۆفییانە، زوننارى کافرانە (٦)**
**گەه دڵ لە سەیری دەیرە، گاهێ موقیمی مەسجید**
**مەقصوودی ئەصڵیی من تۆی، ئێرە و ئەوێ بەهانە (٧)**
**جەذبەی تەبەسسومی تۆ "سالم" بە گریە دێنێ**
**وەك غونچە واکە گاهێ، ئاهیستە، ئەو لەبانە (٨)**

(٥) بێخود: بێهۆش. وادی: دۆڵ، شیو. صەلابەت. توندوتۆڵی. شێرگیر: ئەوی شێر بگرێ، کینایەیە لە ئازایی و چاونەترسی. ئاهوو: ئاسك.

واتە: لە شیو و دۆڵی عیشقدا لافی توندوتۆڵی و خۆڕاگریم لێ دەدا، نەمدەزانی چاوی وەك هی ئاسکت بێدەسەڵات نیە و دەتوانێ شێریش بگرێ و بەیدەستی بکا!

(٦) مەیل: ئارەزوو. بەکامە: ئاواتەخوازە. تەسبیح: تەزبێح، سوبحانەڵڵاکردن. زوننار: پشتێنی کەمەری مەسیحی.

واتە: تا ئارەزووی تۆ جێی ئاواتەخوازیم بێ، تەزبێحی سۆفییانەم بەدەستەوە گرتووە و زوننارى مەسیحییانەم لەپشت بەستووە و هەموو ڕێگەیەك بۆ قەناعەتپێکردنی تۆ تاقی دەکەمەوە.

(٧) گەه: کات، جار. دەیر: شوێنی خوداپەرستیی مەسیحی. موقیم: نیشتەجێ. مەسجید: مزگەوت. مەقصوود: مەبەست. ئەصڵی: بنچینەیی. بەهانە: بیانوو.

واتە: جارێك یا کاتێك دەڕوانمە دەیری مەسیحییان و جارێك یا کاتێکیش نیشتەجێی مزگەوت دەبم. مەبەستی بنچینەیی و بەردەوام، لێرە و لەوێ، هەر تۆی و ئەو دوو جێیە و کردەوەی خۆمم بۆ ڕازیکردنی تۆ کردووە بە بیانوو.

(٨) جەذبە: هێزی ڕاکێشان، حاڵلێهاتن. تەبەسسووم: بزەگرتن، هاتنە خەندە. گریە: گریان. وا کە: بکەرەوە. ئاهیستە: بە هێواشی، لەسەرخۆ. ئەو لەبانە: ئەو لێوانە.

واتە: بزەگرتنی تۆ "سالم"ی ڕاکێشاوە و حاڵی لێ هێناوە و خستوویەتە گریان. جارێك ئەو لێوانە وەك خونچە بە شێنەیی بکەرەوە.

(داکە) هەڵەی نووسینە و (واکە) ڕاستە.

## -٣٣- (*)

**چەشمەیی نەهری ڕەوان، دیدەیی گریانی منە**
**موژە، تا مەددی بەصەر، نیلوفەڕستانی منە (١)**
**بۆ بترسم لە شەبەیخوونی عەدوو، گاهی کەمین؟**
**کە هەناسەی سەحەری خەنجەری بوڕڕانی منە! (٢)**
**مەرگ و صیحەت لە بەدەنما بە جەدەل دێن و دەچن**
**وا لە ئازاری فیراقا شەوی بوحرانی منە (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، عا، غ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) چەشمە: کانی، سەرچاوە. نەهر: ڕووبار. ڕەوان: لەبەررۆیشتوو، جاری. دیدە: چاو. موژە: برژانگ. مەددی بەصەر: چاو برِکردن. نیلوفەڕستان: جاڕی گوڵە نیلووفەڕ، کە گیایەکی وەك لاولاوە، گوڵەکانی ئاوی و سپی و ڕەنگیتریشن.

واتە: چاوی بە فرمێسك و پڕ لە گریانی من، سەرچاوەی ڕووبارێکی ڕەوانە. برژانگەکانیشم تا چاو برِ بکا، بوون بە جاڕێکی پڕ لە گوڵی نیلووفەر کە بنی لەناو ئاودا و گوڵەکەی بەدەرەوەیە. سالم برژانگی خۆی بە گوڵی نیلووفەڕ شوبهاندووە.

(مەددی بەصەر) تەورییەی تێدایە. مانا دیارەکەی ئەوەیە کە تا چاو لە دنیادا کار دەکا، بووە بە شوێنی نیلووفەڕ. مانا دوورەکەی ئەوەیە کە برژانگەکانم بە ئەندازەی قووڵیی چاوم کە سەرچاوەی ڕووبارە، ئەمبەر و ئەوبەر بووە بە نیلووفەڕ.

(٢) ئەم بەیتە لە (ن)دا چوارەمە.

شەبەیخوون: شەوهەڵکوتانە سەر دوژمن، غافڵگیرکردن. گاه: کات. کەمین: بۆسە. سەحەری: بەرەبەیان. بوڕڕان: برِندە.

واتە: مادام خەنجەرێکی تیژم لە هەناسەی بەرەبەیانی خۆم بۆ خۆم دروست کردووە، بۆچی کە بۆسەم نابێتەوە، بترسم دوژمن ناخافڵ لە شەودا هەڵبکوتێتە سەرم و پەلامارم بدا؟!

بوڕڕانی (کم): بەرانی. لە (عا)دا نوختەی (بێ)یەکە کەوتووە.

(٣) ئەم بەیتە لە (ن)دا سێیەمە.

صیحەت: تەندروستی. بەدەن: جەستە. جەدەل: ململانێ و دوژمنایەتی، کێشمەکێش. فیراق: لێكجیایی. بوحران: تەنگوچەڵەمە، قەیران.

**تا موعەللیمە لە عیشقا دڵی باهۆش و خیرەد**
**داوی زوڵفی سیەهت دەرسی دەبوستانی منە (٤)**
**هەر طەرەف تیری نیگاهت لە دڵم بەسکی چەقی**
**تا بە پەهلوو، هەمە جا، سینە نەیستانی منە (٥)**
**غەم دەڵێی قەرضی بە من داوە، سەری وەعدەیەتی**
**ڕوو لە هەر گۆشە دەکەم، دەستوگەریبانی منە (٦)**
**جێ‌تەماشامە لە تیری نیگەهت، سینەیی ڕێش**
**زەخمی ئالوودە بە خوێنم گوڵی خەندانی منە ! (٧)**

واتە: مەرگ، بە هۆی ئـازار و ناســـاغیی دووریـی دڵبــەرەوە، لـێم نزیـك بووەتــەوە و لـەگـەڵ تەندروستیی من کەوتوونەتە ململانێ و کێشمەکێش. بۆیە لـە هۆش خۆم دەچم و لـە شـەوی بوحرانـدام کە نزیك بووەتەوە لـە مردن، تاوێك هۆشیار و تاوێکی‌تر بێ‌هۆشم و حاڵێکی وام بەسەردا هاتووە.

(٤) ئەم بەیتە لـە (ن)دا دووەمە.

موعەللـیم: دەرس‌دادەر، مامۆستا. باهۆش و خیرەد: هۆشیار و ژیـر. سـیـەه: ڕەش. دەبوسـتان: قوتابخانەی سەرەتایی.

واتە: تا دڵی خاوەنی عەقڵ و هۆش مامۆستای دەرسی عیشقی من بێ، دەبێ دەرسـی قوتابخانـەی هەر باسی ئەگریجەی ڕەشی تۆ بێ کە بووە بە داو بۆ دڵی عاشقانی بێ‌چارە.

موعەللـیمە (کم): موعەللـیمە. سیەهت (عا): سیەهیت.

(٥) طەرەف: لا. نیگاه: تەماشا. بەسکی: زۆر، ئەوەندە. پەهلوو: تەنیشت. هەمـە جـا: هـەموو جێیەك. سینە: سنگ. نەیستان: جاڕی نەی، قامیشەڵان.

واتە: ئەوەندە تیری نیگای تۆ لـەملاوئەولاوە بە دڵمدا چەقی تا تەنیشتم، سنگم بووە بە بێـشـەی قامیشەڵان، چونکە تیرەکان لـە بنەڕەتدا لـە قامیشن.

(٦) سەر: نۆرە. وەعدە: وادە. گەریبان: یەخە. دەستوگەریبان: دەستەویەخە.

واتە: ڕوو لـە هەر شوێنێك دەکەم، خەم و خەفەت دەستەویەخەمە و بەرۆکم پێ‌دەگرێ، دەڵێی قەرزێکی پێ‌داوم و وادەیەکی بۆ داناوە و بەسەر وەختی وادەکەیدا دێت.

دەکەم (کم): ئەکەم.

(٧) ڕێش: بریندار. زەخم: برین. ئالوودە: تێکەڵ. خەندان: دەم‌بەخەندە.

واتە: سنگی بریندارم بەهۆی تیری نیگای تۆوە بووە بە جێی تەماشام، چونکە برینی تێکەڵ‌بەخوێنم وا

عادەتم کردووە ئەزبەسکی بە چۆڵیی و کەنار
جوغدی وێرانە لە هەر گۆشە ثەناخوانی منە (٨)
وا دەزانم کە لە فیردەوسی جەمالا بە فەریب
دانەیی خاڵی لەبت باعیثی عیصیانی منە (٩)
لە زەمین تا بە فەلەك نیسبەتی بەد دوورە لە تۆ
شاهیدی عیصمەتی تۆ پاکییی دامانی منە (١٠)
چ بڵێم حاڵەتی دڵ چۆنە لە هیجرا "سالم!"؟
صەحنی گوڵزاری (سەنەندوج) وەکو زیندانی منە (١١)

سەرنجڕاکێشن، بوونەتە گوڵی دەمبەپێکەنینی من.

زەخمی (کم، گم): زەخم.

(٨) ئەزبەسکی: ئەوەندە زۆر. جوغد: کوندەپەپوو. ثەناخوان: ستایشخوێن، ستایشگۆ.

واتە: هێندە خووم بە چۆڵەوانی و گۆشە و کەنارەوە گرتووە، بوومەتە دۆست و هاودەمی کوندەپەپوو، کە لە هەر شوێنێکدا بۆی هەڵکەوێ دەکەوێتە وەسف و ستایشم.

کردووە (کم): گرتووە.

(٩) ئەم بەیتە هەر لە (عا)دا هەیە.

فیردەوس: بەهەشت. جەماڵ: جوانی. فەریب: فریو. لەب: لێو. باعیث: مایە، هۆ. عیصیان: یاخیبوون، عاسیبوون.

واتە: پێم وایە خاڵی لێوت لە بەهەشتی جوانیی تۆدا فریوی داوم و سەوداسەری تۆی کردووم، بۆیە بووەتە مایەی عاسیبوونم و لە پێناوی عیشقی تۆدا یاخی بووم.

(١٠) فەلەك: ئاسمان. شاهید: شایەت، گەواه. عیصمەت: پەرێزپاکی، خاوێنی و بێگەردی. دامان: داوێن.

واتە: هەر لە زەوییەوە تا ئاسمان دوورە بتوانرێ خراپە بدرێتە پاڵ تۆ. شایەت و بەڵگەی پاکی و خاوێنیی تۆ داوێنپاکیی منە. ئەگەر تۆ خراپ بوویتایە، منیش فێری خووی خراپ و داوێنپیسی دەبووم.

(١١) هیجر: دووری. صەحن: مەیدان. سەنەندوج: شاری سنە.

واتە: سالم، بڵێم حاڵ و باری دڵ لە کاتی دووریدا چۆنە، لە حاڵێکدام گوڵزاری باخی (سنە) بووە بە زیندان بۆم.

چ (کم): چی.

## -٣٤- (*)

عەینی فەووارەیی خوێن، دیدەیی بێخاوی منە
مەنزڵی میحنەتی دونیا، دڵی بەدناوی منە (١)
بەرقی عیشق ئافەتە بۆ خەرمەنی ئەربابی هونەر
هەر طەرەف مەددی نەظەر خەرمەنی سووتاوی منە (٢)
لە ڕوخت دەرخە چرا، بەڵکە ببینم بەری پێ
خاڵی گۆشەی لەبی تۆ، مەردومەکی چاوی منە (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، غ، ج، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) عەین: کانی، سەرچاوە. فەووارە: فوارە بەخوێنکەر، خوێنپرژێن. دیدە: چاو. بێخاو: بێخەو. مەنزڵ: مەڵبەند. میحنەت: مەینەت. بەدناو: ناوزڕاو، ناوخراپ.

واتە: سەرچاوەی خوێنپژێن چاوە بێخەوەکانی منە. جێ و مەڵبەندی مەینەتی دنیایش، دڵە بەدناوەکەی منە.

بێخاوی (غ): بێئاوی. بەدناوی (ج): بەدڵ ناوی. هەڵەیە.

(٢) بەرق: برووسکە. ئافەت: پەتا. خەرمەن: خەرمان. ئەرباب: خاوەنان. طەرەف: لا. مەددی نەظەر: چاوبڕکردن، ئەوەندەی چاو بڕ بکا.

واتە: برووسکەی عیشق دەرد و پەتایە بۆ خەرمانی خەڵکانی هونەرپیشە. بڕوانن تا چاو بڕبکا، لە هەموو لایەکەوە هەر خەرمانی بە هۆی عیشقەوە سووتاوی منە.

بەرقی عیشق ئافەتە (غ): بەرقی اقبە. هەڵەیە. خەرمەنی (عا، ڕ، کم، گم): حاصڵی. جوانە و دووبارە نەبووەتەوە.

(٣) ڕوخ: ڕوو، ڕوخسار. لەب: لێو. مەردومەك. گلێنەی چاو.

واتە: چرایەك لە ڕوخسارتەوە دەربخە، بەڵکوو بەرپێی خۆم ببینم؛ چونکە کە ڕووت دەرکەوت، وەك چرا لە لایەکەوە دەوروبەر ڕووناك دەکاتەوە، لە لایەکیترەوە خاڵی گۆنایشت دەردەکەوێ کە بیبیلەی چاوی منە. کە ئەوم بینی، چاوم دەبینێ. شێوەی ((لە ڕوخت دەرخە)) لە یاسای ئەهلی (عیلمی بەیان)دا پێی دەوترێ (تەجرید)، کە بەوە دەڵێن وێنەیەکی ئەو زاتە لە زاتێکی خاوەنی ئەو سیفەتەوە دەربکەوێ، وەك دەڵێن: رأيت من الحبيب قمراً، رأيت من الاستاذ بحراً.

**له بیابانی غەما بەسکی بە تیفت تیشنەم**
**بەرقی ئاتەشزەنی ئەو لەذذەتی بەرفاوی منە (٤)**
**شادە "سالم" کە لە نەشئەی بوتی عەییاری وتی:**
**باوجوودی هونەری، فەضڵی سەگی ڕاوی منە (٥)**

بەڵکە (ڕ): بەڵکی. (کم، گم): بەڵکو. پێ (کم، گم): پێم.

(٤) بەسکی: زۆر. تیشنە: تینوو. ئاتەشزەن: ئاگرکەرەوە. لەذذەت: لەزەت، چێژ. بەرفاو: بەفراو.

واتە: لە بیابانی خەم و مەینەتدا زۆر تینووی تیغی برۆی تۆم، تا لە ئازاری ئەم ژیانە ڕزگار بـبم. لە هەر لایەکەوە ڕووی تۆ دەربکەوێ، برووسکەی ئاگرپرژێنی تۆ لەزەتی بەفراوی هەیـە و فێـنکم دەکاتەوە و ئارامیم پێ دەبەخشێ.

لەذذەتی (حا، عا) لەززەتی. بەرفاوی (کم، گم): بەفراوی. (ئـەو) بـەپێی نیوەبـەیتی یەکـەم، دەبوو (تۆ) بێ.

(٥) ئەم بەیتە لە (مان، ن، حا، عا)دا نییە.

نەشئە: مەستی، سەرخۆشی. بوت: بت. عەییار: بەناز و مـەکر. بـاوجووی: سـەرباری بـوونی. فەضــڵ: چاکە.

واتە: سالم زۆر شادمانە کە بتـە مەکربازەکـەی بـە مەسـتییەوە وتـی: ئەگەرچـی سـالم چـاکە و هونەری هەیە، بەڵام سەگی ڕاوی منە.

کە لە نەشئەی (غ): کە لە شەنی. (ڕ): لە شەهندی. هەڵەیە. هونەری فەضــڵی (غ، ڕ): هونەر و فەضــڵی.

## -٣٥- (*)

تا لە جێ‌پەیکانی تیرت حیصنی دڵ پڕڕەوزەنە
شەوقی میهری ڕووت بە ڕەوزەندا کە دێ، جێی ڕەوشەنە (١)
بەسکی تەن پڕ بوو لە زەخمی خوونفشانی تیری تۆ
جوملە ئەندامم، لەبەر مەددی نەظەرما، گوڵشەنە (٢)
خوێنی دڵ دەتکێ لە جێ‌تیری نیگاهت، گاهی صوڵح
چاوی تۆ، ئەلحەق، لە پەردەی دۆسْتیدا دوشمەنە! (٣)
کەی، بە گەنجی ڕومەتت، دەستی خەیاڵی دڵ دەگا؟!
پاسەبانی ماری زوڵفت تا موحیطی گەردەنە (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) جێ‌پەیکان: شوێنی سەرەئاسنی تیر. حیصن: قەلاّ. ڕەوزەن: کون. شەوق: درەوشانەوە، ڕووناکی. میهر: خۆر. ڕەوشەن: ڕووناك، ڕۆشن.

واتە: قەلاّی دڵ تا کون‌کونبوونی بە سەرەتیری تۆ بێ، شەوق و ڕووناکیی خۆری ڕوخسارت کە لەو کونانەوە دەردەکەوێ، شوێنەکەی ڕۆشنە. دڵم جێ‌وڕێی خۆتە، تا ڕۆشن بێ، سوودی خۆتی تێدایە.

لە جێ (ن): بە جی. (کم): لە جێی. پەیکانی (ن): پەیکایی. هەڵەیە. پڕ ڕەوزەنە (کم): پەروینرەنە. (گم): بەر ویژەنە. جێی (ن): می. هەڵەیە.

(٢) بەسکی: زۆر. تەن: جەستە. زەخم: برین. خوونفشان: خوێن‌پرژێن. جوملە: سەرتاسەر. مەددی نەظەر: تا چاو پڕ بکا.

واتە: لەبەرئەوەی لەشم پڕ بووە لە برینی خوێن‌پرژێنی جێی تیری تۆ، هەموو ئەندامم تا چاوم بڕ بکا بەو خوێنە بووە بە باخی پڕ لە گوڵاڵەسوورە.

(٣) گاه: کات. صوڵح: ئاشتی. الحق: بەڕاستی.

واتە: کاتی ئاشتبوونەوەت لەگەڵم، کە بۆم دەڕوانی، خوێن بە تیری تەماشات لە دڵم دەتکێ. وا بەڕاستی بۆم دەرکەوت کە تۆ لە پەردەی دۆستیدا دوژمنی منی.

خوێنی (حا): خوونی. جێ (کم): جێی. دوشمەنە (کم، گم): دوژمنە.

(٤) گەنج: گەنجینە. پاسەبان: پاسەوان. موحیط: دەوروبەر. گەردەن: گەردن، مل.

چونکە پڕپەیکانی تیری غەمزە بوو، ڕووسەختەدڵ
ڕووی کەمان وەرگێڕە بۆ دیدەم، کە ئەو ڕووبین‌تەنە (٥)
دەفعەیێ، ئەی کاشکی، دەمدا لەسەر سینەی ڕەقیب
تیری ئاهی دڵ، کە هەروەك خەنجەری (ذي الجوشن)ە (٦)
کەی تەماشای ئاینەی مەطڵەب دەکەم "سالم!" بە خەو؟
دیدەیی تاریکی پڕئەشکم لەگەڵ خەو دوشمەنە! (٧)

واتە: کەی بە خــەیاڵیش دەســتم دەگــاتە گەنــجینەی ڕوخســاری تۆ، لە کـاتێکدا مـاری ئەگریجەکانت تا دەوری گەردنت پاسەوانیی دەکا.

دڵ (حا، کم، گم): من.

(٥) غـەمزە: چـاوداگرتن. ڕووسـەختە: سـەربەرز و ڕووسـوور، بێشـەرم. کـەمان: کـەوان. ڕووبین‌تەن: لەش‌پۆلا.

واتە: لەبەرئەوەی ئەم دڵە بێشەرم و عارەی من پڕ بوو لە سەرەتیری غەمزەی تۆ و باکی تـیر و سەرەتیر نەما، تۆ ڕووی تیر و کەوانەکەت بۆ لای چاوەکانم، کـە پـاش دڵ لــە هـەموو ئەنـدامێکم خۆشەویستترە، وەربگێڕە، ئەو لە پۆلا دروست کراوە، با نۆرەی بێ.

بوو (گم): بۆ. ڕووسەختە (کم، گم): ڕووسەختمە. هەڵەیە. ئەو (گـم): دڵ. ڕووبـین‌تەنـە (کـم): ڕووبین‌تەنە.

(٦) دەفعە: جار، کەڕەت. کاشکی: خۆزگە. سینە: سنگ. ڕەقیب: بەدکار. ذي الجوشن: زرێـدار، جەوشەن بەرگێکی تایبەتیی جەنگ بووە لە ئەڵقەی ئاسن دروست کـراوە و کـاتی شـەڕ لەبـەرکراوە. ئەوس کوڕی ئەعوەر لە یارانی پێغەمبـەر کـە چـووە لای کیـسرا ئەنووشـیروان و جەوشـەنێکی لێ وەرگرت و لەبەری کرد، گوایە ئەمە ئەو "ئەبی شەمر"ەیە کە ئیمامی حوسێنی کوشتووە.

واتە: خۆزگە جارێك لە جاران بۆم ڕێدەکەوت تیری ئاهی ساردی دڵی خۆم، کە وەك خەنجـەری ((ذي الجوشـن)) وایە، لەسەر سنگی بەدکاری نامەرد بدەم، بەڵکوو لــە هاتوچـۆ و کـردەوە و قـسەی ڕزگار بوومایە.

(٧) ئاینە: ئاوێنە. مەطـڵەب: خواست، داواکاری. دیدە: چاو. ئەشك: فرمێسك.

واتە: سالم، کەی دەتوانم بڕوانمە دڵبەری خۆم کە ئاوێنـەی خواسـت و داوامـە. ئـەم چـاوە تاریکـە لێڵاییداهاتووانەی من دوژمنی نوستن و خەویان لێ ناکەوێ، تا یار لە خەودا ببینم.

هەردوو (خەو) (کم): خو. (گم): خۆ. دوشمەنە (کم): دوژمنە.

-٣٦- (*)

**توركی چاوی دڵبەرم، وەختی نیگەهـ، تیرئەفگەنە**

**عاشق، ئەر -فەرضەن- فەرامورز بێ، لە ظوڵما بەهمەنە! (١)**

**ڕووبەڕووی دڵ، دڵبەرم کێشاویە شەمشێری برۆ**

**حەلقەحەلقەی سیلسیلەی زوڵفی بە میثلی جەوشەنە (٢)**

**وەك نیظامی پڕنیظامم بۆ نیظامی نەظمی شەوق**

**دڵ لە ذیکری گەنجی فیکرا، وەختی وەصفت، مەخزەنە (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لـە (مان، حا، عا، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) تورك: جوانی. نیگەهـ: تەماشا. تیرئەفگەن: تیرهاوێژ. ئەر: ئەگەر. فەرضە: گریمان، وا دانرا. فەراموورز: کوڕی ڕۆستەم. ظوڵم: ستەم و زۆر. بەهمەن: کوڕی ئەسـفەندیاری کـوڕی گوشتاسـبی پادشای کەیانی، ڕۆستەم پەروەردەی کرد و کە بوو بە پادشا فەراموورزی کوشت.

واتە: چاوی جوانی دڵبەرم لـە کاتی تەماشاکردنی عاشقاندا تیرئەندازە و تیریان بۆ دەهاوێژێ. جا عاشقی داماو با وەك فەلاموورزی پاڵەوانیش ئازا و گورزوەشێن بێ، مادام دڵبەر ستەم و خراپەکاریی وەك هی "بەهمەن" وایە کە فەلاموورزی کوشت و بۆ عیبرەت کردی بە داردا، ئەویش هەمان شـت بە عاشقی بەدبەخت دەکا.

عاشق ئەر فەرضەن فەراموورز بێ (حا، کم، گم): عاشقی زار ئەر فەراموورزە. (عـا): عاشـق ئـەو فەرضەن فەراموورز بێ.

(٢) حەلقەحەلقە: ئەڵقەئەڵقە. سیلـسیلە: زنجـیرە: میثـل: وەك. جەوشـەن: زرێ، بـەرگی لـە ئاسن دروستکراو بۆ کاتی جەنگ.

واتە: دڵبەرم شمشێری برۆی ڕووبەڕووی من هەڵکێشاوە بـۆ کوشـتنم. ئەڵقـە ئەڵقـەی چـینچـینی ئەگریجەیشی، وەك بەرگی جەنگیی جەوشەن وایە و دەڵێی خۆی بۆ شەڕم ئامـادە کـردووە، ئـیتر چـۆن ڕزگار دەبم لـە دەستی.

حەلقە حەلقەی (عا، کم، گم): حەلقە حەلقە.

(٣) ئەم بەیتە لـە (حا، کم، گم)دا نییە.

نیظامی: نیزامی، سەرباز. پڕنیظام: زۆر ڕێکوپێك. نیظام: ڕێکوپێك‌کردن. نـەظـم: کــاروبــار. شەوق: ئارەزوو و پـەرۆشی. ذیکر: ناوهێنان و باس‌کردن. گەنج: گەنجینە. مەخزەن: کۆگا.

جێی موقیمی بۆ نییە یەك‌دەم لە صەفحەی ڕۆژگار
عاشقی بێ‌کەس، وەکوو ماری سییەه، بێ‌مەسکەنە! (٤)
ڕۆحی عاشق کەی نەجاتی دێ لەبەر تیری نەظەر،
گەر لە ئەسبابی مەتانەتدا وەکوو ڕووبین‌تەنە؟ (٥)
زێوەری ئەو دۆشە بێ، یا ڕەب، بە طەوقی گەردنم
گەردەنت چێ، یا ئیلاهی، مەحکەمیی ئەو دامەنە! (٦)

واتە: وەك سەربازی نیزامیی زۆر ڕێکوپێك و بەنیزامم بۆ پارێزگاریی کاروباری ئارەزوو و خۆشەویستی. دڵ کاتێك وەسفت دەکا و دەکەوێتە باسی گەنجینەی بیرکردنەوە لە یار وەکو کۆگا وایە و باس‌وخواسێکی زۆری سەبارەت بە تۆ تێدایە.

شەوق (عا): عیشق.

(٤) موقیم: نیشتەجێ بوون. دەم: هەناسە، تاو. صەفحە: ڕووپەڕ. سییەه: ڕەش. بێ‌مەسکەن: بێ‌جێ‌وڕێ.

واتە: عاشقی بێ‌کەس لە ڕووی ڕۆژگاردا هیچ نیشتەجێیەکی تەنانەت بۆ هەناسەیەکیش نییە، چونکە وەك ڕەشمار بێ جێ‌وڕێ و ماوایە.

ڕۆزگار (عا): سەرزەمین. (کم، گم): ڕۆژگار.

(٥) نەظەر: ڕوانین. ئەسباب: ئامراز و کەلوپەل. مەتانەت: توندوتۆڵی. ڕووبین‌تەن: لەش‌پۆڵا.

واتە: گیانی عاشق، ئەگەرچی لەڕووی توندوتۆڵییەوە وەك جەستەیەکی پۆڵایین وایە، بەڵام مەحاڵە لە تیری تەماشای دڵبەر ڕزگاری بێ و بەرگەی بگرێ.

(٦) زێوەر: ئارایشت، هۆی ڕازاندنەوە و جوانکردن. دۆش: شان. یا ڕەب: خودایە. طەوق: تەوق، کۆت. گەردەنت چێ: بچێتە گەردنت. یا ئیلاهی: خودایە. مەحکەمی: قایمی. دامەن: داوێن.

واتە: خودایە، ئەو ئەگریجانەت کە هاتوونەتە سەر شانت و ڕازاندوویانەتەوە و ئارایشتیان داوە، ببنە تەوقی ملم و لێم نەبنەوە. ئەو دەستانەیشم کە هەمیشە بە داوێنی تۆوە بەستراون بۆ پاڕانەوە و سکاڵاکردن، بچنە گەردنتەوە. بەکورتی؛ خودایە دەست بکەمە ملت، ئەگریجەکانت لە ملمەوە بپێچرێن و دەستەکانیشم بە توندی بکەمە ملت.

بە طەوقی (حا): لە طەوقی. (کم): تووتی.

**خەرمەنی حوسنە عوزاری دڵبەرم، ئەمما دریغ**
**لوطف و ڕەحمی دانەدانە، جەور و ظوڵمی مەن مەنە! (٧)**

(٨) خەرمەن: خەرمان. حوسن: جوانی. عوزار: دەموچاو، ڕوخسار. دریغ: حەیف. دانە دانە: یەك یەك، کەم کەم. لوطف: سۆز. ڕەحم: بەزەیی. جەور: بەدکاری. ظوڵم: ستەم. مەن مەن: مەن یەکەیەکی کێشانەیە بەرامبەر بە ٣ کگم، کۆمەڵ کۆمەڵ، زۆر زۆر.

واتە: ڕوخساری یارم خەرمانی جوانییە، بەڵام بەداخەوە لوتف و بەزەیی و میهرەبانیی یەك یەك و کەم و ستەم و زۆریشی کۆمەڵ کۆمەڵ و زۆرە.

مەن مەنە (کم): خەرمەنی. هەڵەیە. (گم): خەرمەنە. (عوذاری) شێوەنووسی (عوزاری)ی نوسخەی (مان)ە.

## (*) -٣٧-

**لە تەئثیری عوزاری، یاری من گوڵگوونە، ڕەنگینە**
**بە حوسن و خوڵقی ئەو، ڕووی سەرزەمین پڕ زێب و ئایینە (١)**
**لە شەوقی لەعلی تۆیە ئەشکی ئاڵم دێتە ڕووی دامەن**
**یەکایەك ڕەونەقی قەطرەی، هەموو لەو ڕەنگە ڕەنگینە (٢)**
**ئەزەل کۆهی غەمە جێگەم، نەوەك بالینی ئاسایش**
**لە شەهدم چی، بەجوز تەڵخی، لە دڵما شۆری شیرینە! (٣)**
**ڕوخ و ڕۆژ و لیباس و ئەشك و دیدە و دڵ لە هیجرانت**
**سیاه و ئەحمەر و ئەصفەر، سفید و دەرهەم و شینە! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) تەئثیر: کاریگەری، تین‌وتاو. عوذار: ڕوومەت، ڕوخسار. گوڵگوون: ڕەنگ وەك گوڵ. حوسن: جوانی. خوڵق: نەزاکەت و ڕەفتاری جوان نواندن. زێب: جوانی. ئایین: ئارایشت، ڕازانەوە.

واتە: ڕوومەتی یاری من هێندە بەتین‌وتاوە کارێکی کردووە وەك گوڵ سوور و ڕەنگاوڕەنگە، بە جوانی و خۆش‌خوڵقی نواندنیش ڕووی سەر زەویی پڕکردووە لە جوانی و ڕازاندوویەتەوە.

(٢) شەوق: درەوشانەوە، ورشە. لەعل: لێو. ئەشك: فرمێسك. دامەن: داوێن. یەکایەك: یەکاویەك، وەکوو یەك. ڕەونەق: گەشانەوە. قەطرە: دڵۆپە.

واتە: فرمێسکی خوێنینم بەهۆی درەوشانەوەی لێوی تۆوەیە دەڕژێ و دەگاتە داوێنی کراسەکەم. گەشانەوە و شەوقدانەوەی دڵۆپی فرمێسك، هەمووی لەبەر ڕەنگی لێوی تۆیە کە ڕەنگین بووە.

(٣) ئەزەل: لە ئەووەڵەوە. کۆه: کێو. بالین: سەرین. ئاسایش: دڵنیایی. شەهد: هەنگوین. بەجوز: جگە لە. تەڵخی: تاڵی. شۆر: خورۆشان و ئاشووب.

واتە: هەر لە ئەووەڵەوە کێوی خەم بووە بە جێ‌وڕێم و سەرم نەکردووەتە سەر سەرینی ئاسایش و ئارامی. ئیتر لە تاڵاو زیاتر چیم داوە لە هەنگوین و شیرینی! چونکە دڵم ئاشووبی "شیرین"ی دڵبەریی تێدایە.

(٤) ڕوخ: ڕوخسار. لیباس: جل‌وبەرگ. ئەشك: فرمێسك. دیدە: چاو. هیجران: دووری. سیاه: ڕەش. ئەحمەر: سوور. ئەصفەر: زەرد. سفید: سپی. دەرهەم: شێواو، خورۆشاو.

**له وادیی گەرمی هیجرتدا بەجۆش دێ حەسرەتی گریەم**
**سروشکی شۆری دیدەم، ئاوەکەی لای پردی (نارین)ە (٥)**
**لەپێش تەشریفی قابیض، جان دەبێ مەئمووری فەرمانت**
**نیگاهی زەهرئالوودت بە ئەمری دیدە تەعیینە (٦)**
**خودایا! با لەپاش جەور و جەفا، وەختی تەرەححوم بێ**
**لە سینەی "سالم"ا خاری جەفا وەك ضەربی زۆپینە (٧)**

واتە: لە دووریی تۆ ڕوخسارم زەرد، ڕۆژم ڕەش، بەرگم شین، فرمێسکم سوور، چاوم سپی و دڵم شێواو و خورۆشاوە.

(٥) وادی: شیو، دۆڵ. حەسرەت: داخ. گریە: گریان. سروشك: فرمێسك. نارین: ناوی ئاوێکی لای چیای (حەمرین)ە.

واتە: ئاخ‌وداخی گریانم لە شیو و دۆڵی گەرمی دووریی تۆدا بەجۆش و بەکوڵە. فرمێسکی خرۆشانی چاوم ئەوەندەی ئاوی لای پردی نارین زۆرە.

(٦) تەشریف: هاتن. قابیض: گیانکێش، ئیزرائیل. جان: گیان. مەئمووری فەرمان: فەرمانبەردار، فەرمان جێبەجێ‌کەر. نیگاه: تەماشا. زەهرئالوود: ژەهراوی. ئەمر: فەرمان. تەعیین: دامەزراندن، دەست‌نیشان‌کردن.

واتە: پێش ئەوەی فریشتەی گیان‌کێشان تەشریف بهێنێ، گیان دەبێتە فەرمان جێبەجێ‌کەرت. چاوەکانت فەرمانیان داوە بە تەماشای ژەهراوی تێم بڕوانی.

(٧) جەور: ستەم. جەفا: ئێش و ئازار. تەرەححوم: ڕەحم‌کردن، بەزەیی پێداهاتنەوە. سینە: سنگ. خار: دڕك. ضەرب: لێدان، زەبر. زووپین: نێزەی کورت کە جاران لە شەڕدا بەکارهاتووە.

واتە: خودایە، با پاش ستەم و ئێش و ئازار نواندن ،کاتی ڕەحم پێ‌کردن بێ. دڕك‌ودالی ئێش و ئازار لە سنگی "سالم"دا وەك زەبر و لێدانی نێزەی کورتی زۆپین وایە.

## -٣٨- (*)

**وەرە ساقی! بە زەردەشتی خەواریق تازە بنوێنە**
**لە ئاوی خوشك و صافا، ئاگری تەڕ، شوعلە دەربێنە (١)**
**ئەگەر کافر نەبا سوجدەت لە شوعلەی ناری پڕقینت،**
**بە زیندوو یەك بە یەك وەك میللەتی هیندوو بسووتێنە (٢)**
**لە دەوری ناری ڕوو، زوڵفت مەجووسانی سەرەفگەندەن**
**لە تابی بەرقی مەی ئەو کافرانە جوملە هەڵسێنە (٣)**
**عەزیزی زیرْدەستی وا بە خەڵوەت تەربیەت دەکرێ**
**لە مەجلیسدا، بە مەحضی سەرکەشی، بەس طوڕڕە بشکێنە (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتی تەواو.

(١) زەردەشتی: لەسەر دینی زەردەشتی. خەواریق: شتی بەعەقڵدانەهاتوو. خوشك: وشك. ئاگری تەڕ: ئاگری داری تەڕ. شوعلە: گڕ و بڵێسە.

واتە: مەیگێڕ، وەرە لەسەر ڕێ و ئایینی دینی زەردەشتی کە ئاگرپەرستی نەریتێکیەتی، شتی پەیپێنەبراوی بەعەقڵدانەهاتووی تازە نیشان بدە، ئاگرێکی بە کڵپە و بۆچرووکی وەك هی داری تەڕ و گڕ و بڵێسە لە ئاوێکی ڕوونی وشکەوەبوو دەربهێنە.

(٢) سوجدە: کڕنووش. نار: ئاگر. بەرقین: شەوقدار. بە زیندوو: بە زیندوویی. هیندوو: هیندی.

واتە: ئەگەر کافر کڕنووشت بۆ نەبا، یەك بە یەکیان بە گڕی ئاگری شەوقدارت، بە زیندوویی، وەك میللەتی هیندی بسووتێنە.

(٣) نار: ئاگر. مەجووس: ئاگرپەرست. سەرئەفگەندە: سەرشۆڕ، شەرمەزار. تاب: تین‌وتاو. بەرق: برووسکە. مەی: شەراب. جوملە: تێکڕا، هەموو.

واتە: ئەگریجەت بە دەوری ئاگری ڕووتدا وەك ئاگرپەرستی سەرشۆڕە. ئەو کافرانە بە تین‌وتاوی برووسکەی مانگی ڕووت، تێکڕا هەستێنە.

(٤) عەزیز: ئازیز و خۆشەویست، حەزرەتی یووسف. زیردەست: ژێردەستە. خەڵوەت: مانەوە بە تەنیایی. تەربیەت: پەروەردە. مەحضی سەرکەشی: هەر سەرکێشی و هیچی‌تر نا. طوڕڕە: ئەگریجە.

واتە: ئازیز یا حەزرەتی یووسفی ژێردەستە وا بە خەڵوەت و مانەوە پەروەردە دەکرێ. بەس سەرکێشی

**به قەولت نەفسی ئەممارەم، دلّا! بۆ طوورِە دەمکێشیّ**
**کە من مەغلووبی ئەممارەم، بە ئەم مارەم مەترسێنە (٥)**
**بەهاری دڵگوشا وەك حوسنی تۆ نایێتە ڕووی دونیا**
**هەوای باغی بەهەشتت گەر هەیە، بڕوانە ئایینە! (٦)**
**گەواهە ئەشکی ئالوودەم بەسەر ڕوخسارەیی زەردا**
**لەتاو ئەندووهی هیجرانت، دڵی "سالم" هەمووی خوێنە (٧)**

بنوێنە و ئەگریجە لـە کۆڕ و مەجلیسی عاشقاندا با و لـوول بدە و توورِەیی نیـشان بدە.

(٥) قەول: قسە. نـەفس: دەروون. ئـەمّارە: فەرمانـدەر، فـەرمان بەسـەردادەر. دلّا: ئـەی دڵ. مەغلووب: دۆڕاو، بەزیو.

واتە: ئەی دڵ، بە قسەی تۆ دەروونی فەرماندەرم فەرمانم پیّ دەدا و بەرەو ئەگریجە ڕامدەکێشیّ. من لـە کاتێکدا دۆڕاوێکی لارەملی فەرمانپیّدراوم، بە ماری ئەگریجەت مەمترسێنە.

(٦) دڵگوشا: دڵکەرەوە، دڵبووژێنەوە. حوسن: جوانی. هەوا: ئارەزوو. ئایینە: ئاوێنە.

واتە: بەهاریش کە دڵ دەکاتەوە و دەیبووژێنێتەوە، بە جوانیی تۆ ناگا و ناتوانیّ وا بێتـە ئـاراوە. تۆ ئەگەر ئارەزووی باخی بەهەشتت هەیە، بڕوانە ئاوێنە، تا ڕووی خۆت ببینی کە باخی بەهەشتە!

(٧) گەواه: شایەت. ئەشکی ئالوودە: فرمێسکی تێکەڵ بە خوێن. ئەندووە: خـەم و خەفـەت. هیجران: دووری.

واتە: فرمێسکی خوێنینم کە بەسەر ڕوخساری زەردهەڵگەڕاومدا دێتە خواریّ، شایەت و بەڵگەیـە، چونکە دڵی "سالم" بە عەزرەتی خەم و خەفەتی دووریتەوە سەرپاك خوێناوییە.

(*) -٣٩-

**به هەر موویێ لە ڕوو زوڵفت بەداوە**
**گوزاری مورغی دڵ -ئەصڵەن- نەماوە (١)**
**لە ڕەعدی گریە ئەشکم بوو بە سەیلاب**
**لە کولبەی دیدە مەردوم غەرقی ئاوە (٢)**
**گوزاری غەم بەسەر مندایە هەر سوو**
**دەری شادی بە ڕووما داخراوە (٣)**
**لە بەدبەختیی منا کولبەی هەتیویم**
**بە زستان سێبەر و هاوین هەتاوە!! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، غ، ج، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەحزووف.

(١) گوزار: هاتوچۆ. مورغ: باڵندە. ئەصڵەن: لە بنچینەوە.

واتە: ئەگریجەت هەر موویەکی خۆی لەسەر ڕوخساری یار کردووە بە داو. بۆیە هەر لە بنەڕەتەوە هیچ هاتوچۆیەك بۆ باڵندەی دڵ نەماوەتەوە تا بتوانێ لێت نزیك ببێتەوە.

لە ڕوو (عا، غ): بە ڕوو. (ج): لە هەر موویێ بە ڕوو. (کم، گم): لە میهری مووی برۆ. مورغی (ج): مەزرەعی. هەڵەیە. (گـذار) شێوەنووسی (گوزار)ە لە نوسخەی (مان)دا.

(٢) ڕەعد: هەورەتریشقە. ئەشك: فرمێسك. سەیلاب: لافاو. کولبە: کەلاوە. دیدە: چاو. مەردوم: گلێنە.

واتە: فرمێسکم بە زەبری هەورەتریشقەی گریانم هەستاوە و لافاوێکی پێكهێناوە. بۆیە ئەو لافاوە تەلاری چاومی ڕووخاندووە و کردوویە بە کەلاوە و گلێنەیشی نوقمی ئاو کردووە و خنکاندوویە.

گریە ئەشکم بوو بە سەیلاب (عا): گریە دێ سێڵاوی ئەشکم. (غ): گریە و سەیلابی ئەشکم. (ج، کم، گم): گریە دێ سەیلابی ئەشکم. (دیدەی) لە (مان)دا هەڵەی نووسینە و نیوەکەی لەنگ کردووە.

(٣) هەر سوو: هەر لا. دەر: دەرگە.

واتە: خەم لە هەموو لایەکەوە هاتوچۆم بەسەردا دەکا. دەرگای شادیم بەڕوودا داخراوە.

مندایە (عا): مندابە. هەڵەیە. هەر سوو (کم، گم): هەر شەو.

(٤) واتە: ماڵە وێرانەکەم کە لە ماڵی هەتیو دەچێ، هیچی لەسەر نییە. زستانان کە مرۆڤ پێویستی بە خۆرەتاوە، ئەو سێبەرە و هاوینان کە پێویستی بە سێبەرە، ئەو خۆرەتاوە.

**گوڵی ڕووت عەکسی وا داوە لە دیدەم**
**هەموو قەطرەی سروشکم وەك گوڵاوە! (٥)**
**هەتا دەمرم لە سەودای زوڵفی تۆدام،**
**ئەگەرچی سەربەسەر فیکرێکی خاوە! (٦)**
**ڕەقیب دەستی ڕەفیقیی نایە دەستم**
**حەقیقەت پەنجەیی "سالم" گلاوە! (٧)**

هەتیوم (غ، ج، کم، گم): هەتیوی. بە زستان سێبەر و (غ): زمستان سێبەر و. (ج): بە زستان سایەوو. (کم، گم): زمستان سایە و.

(٥) واتە: گوڵی ڕووت وا شەوقی لەناو چاوەکانمدا داوەتەوە، هەموو دڵۆپەیەکی فرمێسکم لە بۆنی گوڵی ڕووتەوە وەك گوڵاو بۆنخۆشە.

(٦) سەودا: مامەڵە. سەربەسەر: وەك یەك.

واتە: تا مردن مامەڵەی عیشقی تۆ دەکەم، ئەگەرچی ئەم کارە هەمووی خەیاڵێکی خاوە و بێسوودە.

فیکرێکی (ج، کم، گم): سەودایی.

(٧) واتە: بەدکار دەستی هاوڕێیەتیی نایە ناو دەستم. جا لەبەرئەوەی دەستی بەدکار گلاوە، کەواتە —لە ڕاستیدا— دەستی "سالم"یش گلاو بووە، چونکە دەستی لە دەستی گلاوی بەدکار کەوتووە.

ڕەفیقیی (ج): ڕەقیبیی. نایە (عا): نابە. هەڵەیە. نایە دەستم (گم): دایە دەستم.

## -٤٠- (١)

## (تهنيه‌ای مرخّص شدن عبدالله پاشای بابان
## از قسطنتين وآمدنش به عراق بغداد)

تیروەش دەی مەه گوزەشت و عەهدی نەیسان هاتەوە
بولبولی بێدڵ، لە دەوری گوڵ، بە ئەفغان هاتەوە (١)
سەختگیریی کرد، ئەگەر سەرما، وەکوو ئەفراسیاب
بادی نەورۆزی بە میثلی پووری دەستان هاتەوە (٢)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، عا)دا هەیە. پیرۆزباییە بە بۆنەی ڕێپێدانی عەبدوڵڵا پاشای بابان و هاتنەوەیەوە لە (قوستەنتەنییە)وە بۆ عیراق- بەغدا. (عا)یش نووسیویە: ((در ذکر آمدن بندگان عبدالله پاشای بابان از دربار همایون به سوی عراق و روم و نظم سرحدّات بین روم و ایران)). واتە: هاتووەتەوە بۆ ڕێکخستنەوەی سنوورەکانی نێوان وڵاتی ڕۆم و ئێران.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) تیروەش: وەك تیر. دەی: مانگی یەکەمی زستان لە ساڵی هەتاویی ئێرانیدا، بەفرانبار. مەه: مانگ. گوزەشت: بەسەرچوو، تێپەڕی. عەهد: سەردەم. نەیسان: چوارەم مانگی زایین کە بەهار و خۆشییە، وشەکە سریانی و حەوتەم مانگی مانگەکانی سریانییە. بێدڵ: دڵتەنگ، خەمبار. ئەفعان: هاوار و ناڵە.

واتە: مانگی (دەی) وەك تیر بە خێرایی تێپەڕی و سەردەمی بەهار و خۆشیی مانگی نیسان دەستی پێ کرد. بولبولی شەیدایش بە ناڵە و هاوار دەوری گوڵی دا.

دەوری (عا): دەورەی.

(٢) سەختگیریی کرد: سەختیی نوواند. ئەفراسیاب: کوڕی پشەنگ و پادشای توووران بووە و لەگەڵ شاهان و پاڵەوانانی ئێران شەڕی کردووە، بە تاوانبار و پاداشتی مەرگ و جادووگەر ناسراوە. باد: با. مثل: وەك. پوور: کوڕ. دەستان: ناسناوی زاڵی باوکی ڕۆستەم. پووری دەستان: ڕۆستەمی کوڕی زاڵ.

واتە: ئەگەر سەرماوسۆڵە وەك ئەفراسیاب و تورکەکانی ژێردەستی سەختیی نوواند و توند بوو، ئەوا بای نەورۆزی ئەو سەرمایە ڕادەماڵێ، وەك چۆن ڕۆستەمی کوڕی زاڵ و پاڵەوانان ڕاپەڕین، تا ئێران لە هێرشی تورکانی ئەفراسیاب کە پەلاماری شارەکانی ئێرانیان دەدا، بپارێزن.

**لەشکری گوڵ جوملە خەندانن، دەڵێن: سەرما شکا**
**تا "سولەیمان"ی صەبا بۆ دێوی زستان هاتەوە (٣)**
**باغە پەژموردەی خەزان و خوڕڕەمیی ئەوقاتی حووت**
**ماهی نەورۆزی بە عەکسی ماهی ئابان هاتەوە (٤)**
**بای شەماڵ هێنایە جونبوش قامەتی سەروی سەهی**
**بۆ خیابانی چەمەن، قومری بە ناڵان هاتەوە (٥)**
**سارە دڵدادەی شکۆفەی شاخساری طەرفی باغ**
**بێخود و ڕەققاص و سەرمەست و غەزەلخوان هاتەوە (٦)**

(٣) جوملـە: گـشت، تێکـڕا. خەنـدان: دەمبەپێکـەنین. سـولەیمان: حـەزرەتی سـولـەیمان کـە بچووکترین کوڕی داودە و خودا مرۆۋ و دێو و باڵندەی خستە ژێـر ڕکێفـی. صـەبا: بـای فێنـك و خۆشی لـە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە هاتوو.

واتە: سوپای گوڵ لـە خۆشییاندا هەموو دەمبەخەندەن، لەبەرئەوەی هێزی سەرما نـەما و شـکا. وا بای سەبایش هاتەوە و زستانی پێچایەوە، وەك بڵێی حەزرەتی سولـەیمانە هاتووە و دێـوی زسـتانی ڕکێف کردووە.

(٤) پەژموردە: سیس و ژاکاو. خەزان: پایز، گەڵاڕێزان. خوڕڕەمی: شادمانی. ئەوقاتی حـووت: دواینمانگی زستانی ساڵی هەتاوی، ڕەشەمە. ماه: مانگ. عەکس: پێچەوانە. ئابان: ناوەڕاسـتی پـایز بەپێی ساڵی هەتاوی، خەزەڵوەر.

واتە: باخ و باخـات، بـە دەسـت گـەڵاڕێزانی پـایز و لێزمـە و تـەڕ و تووشـی دوارۆژەکـانی زستانەوە، سیس و ژاکاوە. مانگی نـەورۆزی سـەرەتای بـەهار، بـە پێـچەوانەی مـانگی ناوەڕاسـتی وەرزی پایزەوە، هاتەوە.

(٥) جونبوش: جووڵـە. قامەت: بەژن و باڵا. سەهی: ڕێك و قـنج. خیابـان: ڕاسـتەڕێ، جـادە. چەمەن: چیمەن، مێرگوزار. ناڵان: ناڵـەناڵ.

واتە: باڵای ڕێکی سەرو کە جاران لـە جووڵـە کەوتبوو، بای شەماڵ هێنایەوە جووڵـە و خۆشـی. ئەمە کارێکی کرد قومری بە ناڵـەناڵ بێتەوە سەر جادە و شەقامی ناو چیمەن و مێرگوزار.

(٦) سار: پەڕندەیەکی ڕەشی دەنگخۆشـە. دڵدادە: دڵداو بـە دۆسـت. شـکۆفە: خونـچە. شاخـسار: لقوپۆپی چڕ و زۆر. طـەرف: کـەنار. بێخـود: بـێهۆش. ڕەققـاص: سـەماکەر، بـە سـەما و خۆبادانـەوە. سەرمەست: سـەرخۆش. غەزەلخوان: غەزەلخوێن، بە شیعری عاشقانە خوێندنەوە.

بۆ شکۆفەی طیفڵواری یەکشەبەی شاخی درەخت
ڕەحمەتی ئێزەد لەگەڵ هەر قەطرە باران هاتەوە (٧)
ڕووبەڕووی طیفلی نەباتاتی چەمەن، موشتاقْوار
دایەیی ئەبری بەهاری ئەشكڕێزان هاتەوە (٨)
دەنگی صەد ڕەنگی کوڵنگ و قاز و سۆنە و بۆرْچین
سازوەش هەر سوو لە گوێی سەبزە و شەتاوان هاتەوە (٩)
سەیری گوڵشەن کەن، لە چیهرەی گوڵ شەوی ئوردیبیهیشت
هەر طەرەف بۆ مەجلیسی بولبول، چراغان هاتەوە (١٠)

واتە: باڵندەی عاشقی خونچەی سەر لقوپۆپی دار و درەختی کەناری باخیش، بە خۆشی بەهارەوە، بێهۆش و سەرخۆش و سەماکەرە و گۆرانیی عاشقانە دەچڕێ.

(٧) طیفلوار: وەك منداڵ. یەكشەبە: یەكشەوە. شاخ: لق. ئێزەد: یەزدان، خودا. قەطرە: دڵۆپە.

واتە: ڕەحمەت و بەزەیی یەزدان لەگەڵ هەر دڵۆپەیەکی باران بەسەر خونچەی وەك منداڵ ساوای تەمەن یەكشەوی لقی درەختدا باری.

(٨) طیفل: منداڵ. نەباتات: کۆی نەبات، ڕووەك. موشتاقوار: وەك پەرۆش و سەوداسەر. دایە: دایەن. ئەبر: هەور. ئەشكڕێزان: بەفرمێسكڕشتنەوە.

واتە: هەوری بەهار وەك دایەنێکی منداڵ لێزەوتکراو بە پەرۆشی و تامەزرۆیی و فرمێسكڕشتنەوە ڕووی کردە ڕووەکەکانی چیمەن و مێرگوزارەکان کە وەك منداڵی ئەو وان.

(٩) کولنگ: قولنگ. سۆنە: مراویی نێر. بۆرچین: مراویی مێ. ساز: ئامادە، دڵخۆش، دەنگی وەك هی ئامێری ساز. وەش: وەك. هەر سوو: هەر لا. سەبزە: سەوزە. شەتاو: ئاوی زۆری بەفری تواوە.

واتە: دەنگی سەد جۆری قاز و قولنگ و مراوی، وەك دەنگی ئامێری ساز، لە هەموو لایەکی گوێ سەوزایی و شەتاوەکانەوە بەرز بووەوە.

(١٠) چیهرە: چارە، ڕوخسار. ئوردیبیهشت: مانگی دووەمی ساڵی هەتاوی، بانەمەڕ، دووەم مانگی جەنگەی بەهار. طەرەف: لا. مەجلیس: کۆڕ. چراغان: چراخان.

واتە: شەوێکی مانگی گوڵان بڕواننە ڕوخساری گوڵی ناو گوڵزار و باخ، دەبینن وا گەشاونەتەوە و ئەو ناوەیان کردووە بە چراخان و کۆڕی بولبولیان ڕازاندووەتەوە.

نوختەکانی (شەوی) لە (ن)دا کەوتوون.

**سەبزە وەك مەخمەڵ لە هەر جا، فەرشە بۆ صەحنی چەمەن**
**مەوسیمی عەیش و طەرەب بۆ مەیپەرستان هاتەوە (١١)**
**بۆ دەماغم عەهدی گوڵئەفسوردەگیی سەردی نەما**
**تا لە گوڵشەندا بە سەرما بۆیی ڕەیحان هاتەوە (١٢)**
**پێی وتم دوێشەو لە کونجی میحنەتا، واضیح، سرووش:**
**وا چراغی دوودْمانی ئەهلی بابان هاتەوە (١٣)**
**چیهرەیی مەقصەد هوەیدا بوو لە هەر جا صوبحْوار**
**موژدە، ئەی یەعقووبی دڵ! یووسف بە کەنعان هاتەوە (١٤)**

(١١) مەخمەڵ: قەدیفە، پارچە کووتاڵێکی جوانی کوڵکنە. هەر جا: هەر شوێنێك. فەرشە: ڕاخراوە، وەك فەرش وایە. صەحن: تەخت. مەوسیم: وەرز. عەیش: ڕابواردن. طەرەب: گۆرانی و شادی. مەیپەرستان: مەینۆشان.

واتە: سەوزایی لە هەموو شوێنێکدا وەك کووتاڵی قەدیفە بەسەر ئەرزەوە، وەك فەرش وایە یا لە تەختی چیمەندا ڕاخراوە. بەو پێیە، وەرزی ڕابوردن و گۆرانی و شادی هاتووەتە پێش بۆ مەینۆشان تا بچنە ئەو شوێنانە.

(٢٣) دەماغ: لووت. گوڵئەفسوردەگی: سیس‌بوونی گوڵ. گوڵشەن: باخ و گوڵزار. بۆ: بۆن. ڕەیحان: ڕێحانە.

واتە: ئەو سەردەمە پێچرایەوە کە گوڵی بەهۆی سەرماوسۆڵەوە تێدا سیس و ژاکاو بوو. ئیتر بۆن‌وبەرامەی ڕێحانەی ناو باخ و گوڵزار بەسەرمدا هاتەوە، تا بۆنی بکەم.

(١٣) کونج: گۆشە. میحنەت: مەینەت. واضیح: ڕوون و ئاشکرا. سرووش: فریشتەی هەواڵهێن، جوبرائیل. چراغ: چرا. دوودمان: بنەماڵە، خانەدان. ئەهل: خەڵك.

واتە: دوێنێ‌شەو کە لە گۆشەی مەینەتدا بووم، جوبرائیل بە ڕوونی پێی وتم: چرای خانەدانی بابان هاتەوە.

(١٤) مەقصەد: مەبەست. هوەیدا: ئاشکرا. صوبحوار: وەك بەیانی. یەعقووب: حەزرەتی یەعقووب (خ.ڕ) کوڕی ئیسحاق پێغەمبەر. یووسف: حەزرەتی یووسفی کوڕی یەعقووب (خ. ڕ). کەنعان: وڵاتی کەنعان کە ناوی کۆنی فەلەستینە.

واتە: دەستی مەبەست لە هەموو لایەکەوە وەك دەرکەوتنی بەیانی کەوتە ڕوو و ئاشکرا بوو، مژدە بێ ئەی دڵ، بە مراز گەیشتی و شادی ڕووی تێ‌کردی، وەك چۆن کاتی خۆی حەزرەتی یووسف پاش

**ئاشکارا هەر طەرەف هودهود لە پەروازا دەڵێ:**
**ڕووبەڕووی موڵکی سەبا تەختی سولەیمان هاتەوە (١٥)**
**بەرقْوەش بۆ موڵکی مەورووثی لە (قوسطەنطین)ەوە**
**حاکمی مەنفی بە ئەمری صەدر و سوڵطان هاتەوە (١٦)**
**ئاصەفی ثانی مورەخخەص بوو، بە ئەمری پادشاه**
**بۆ نیظامی موڵکی بەینی ڕۆم و ئێران هاتەوە (١٧)**
**من وتم: چۆن بوو لە (ئاغ دنکن نەجاتی؟ دڵ وتی:**
**شاهی کەیخوسرەو بە جەیحوونا، بە ئێران هاتەوە (١٨)**

ئەو هەموو نارەحەتیە، دەرووی خێری لێ کرایەوە و سەرکەوت.

(١٥) ئاشکارا: ئاشکرا. هودهود: پەپووەسلێمانە. پەرواز: فڕین. موڵکی سەبا: دەوڵەتی (سەبەء) لە یەمەن. تەخت: عەرشی پادشایەتی. سولەیمان: حەزرەتی سولەیمان پێغەمبەر وەك لە قورئاندا باسی هاتووە، سولەیمان پاشای بابانی باوکی عەبدوڵلا پاشا کە ئەم شیعرەی بۆ وتراوە.

واتە: پەپووەسلێمانە لە هەموو لایەکەوە لە فڕیندایە و ئاشکرا دەڵێ: ڕۆژی هاتنەوە سەر تەختی سولەیمان پاشایە لە موڵکی باباندا.

سەبا (عا): صەبا. هەڵەیە. (سەبا) مەبەست (سەبەء)ە.

(١٦) بەرقوەش: وەك برووسکە. مەورووث: بە میرات بۆبەجێماو. قوسطەنطین: ئەستەموول. مەنفی: دوورخراوە. ئەمر: فەرمان. صەدر: وەزیر. دەبێ مەبەستی سەروەزیران (صەدری ئەعظەم) بێ. سوڵتان: سوڵتانی عوسمانی.

واتە: عەبدوڵلا پاشای میری دوورخراوەی بابان بە فەرمانی سەروەزیران و سوڵتان کە ئەو دەمە سوڵتان عەبدولمەجید بووە، وەك برووسکە بە خێرایی لە ئەستەموولەوە هاتەوە بۆ مەملەکەتی میراتیی خۆی.

(١٧) ئاصەفی ثانی: ئاصەف وەزیری دەستەڕاستی حەزرەتی سولەیمان بوو، ئاصەفی ثانی مەبەست عەبدوڵلا پاشایە. مورەخخەص: ڕێپێدراو. پادشاه: سوڵتان. نیظام: نیزام، ڕێکوپێکی و دامەزراوی. موڵکی ڕۆم: دەوڵەتی عوسمانی.

واتە: عەبدوڵلا پاشا کە وەك ئاصەفی ڕاوێژکاری زیرەك و زانا وایە، بە فەرمانی سوڵتان هاتەوە، تا ئاسایش و ئارامی و نیزامی ناوچەی نێوان هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێران بپارێزێ و ڕێك بخا.

(١٨) ئاغدەنگز: ئاق دەنیز، دەریای سپیی ناوەڕاست. نەجات: ڕزگار. شاه: شا، پادشا. کەیخوسرەو:

**فیتنەخێزە ڕاهی قوسطەنـطنین بە میثلی هەفتخوان**
**ئەم بە هەر خوانێ وەکوو ڕووبینتەن ئاسان هاتەوە (۱۹)**
**نۆکەرانی بێڕەمەق کرد خیسسەتی طەبعی مونیب**
**بۆ تەنی موردەی خەلایق یەك بە یەك جان هاتەوە (۲۰)**
**شەهد و تەڵخە لوطف و قەهری بۆ قەراری نیك و بەد**
**شاهی نەحلئاسا بە یادی نۆش و نێشان هاتەوە (۲۱)**

کوڕی سیاوەشی کوڕی کەیقوبادی پادشای کیانی. جەیحوون: ئەمودەریا، ناوە کۆنەکەی (ئۆکسووس)ە، سەرچاوەی ئەم ڕووبارە چیاکانی پامیری هیندستانە و دەڕژێتە دەریاچەی ئاراڵ لە تورکستان.

واتە: بە دڵم وت: عەبدوڵڵا پاشا چۆن ڕزگاری بوو و توانی لە دەریای سپی ناوەڕاست بپەڕێتەوە؟ وتی: کەیخوسرەو بە ڕووباری جەیحووندا هاتەوە ناو ئێران.

(لە) لە (عا)دا کەوتووە. وتی (ن): گوتی.

(۱۹) فیتنەخێز: بە ئاشووب و گۆبەند. ڕاه: ڕێگە. میثل: وەك. هەفتخوان: داستانێکی شانامەیە و بریتییە لە بەسەرهاتەکانی ڕۆستەم لە ڕێگەی مازەندەران، کاتێك چووە بۆ ڕزگارکردنی کەیکاوس لە بەندی. لەوێ تووشی حەوت شەڕ بووە کە پێکەوە بە هەفتخوانی ڕۆستەم ناسراوە. ڕووبینتەن: لەشپۆڵا.

واتە: ڕێگەی ئەستەموول وەك هیی مازەنداران بە ئاشووب و گێچەڵە. بەڵام عەبدوڵڵا پاشا بە شەڕێك، نەك حەوت، وەك یەکێکی لەشپۆڵا بە ئاسانی لێی هاتەدەرێ و هاتەوە.

(۲۰) بێڕەمەق: بێنان. خیسسەت: نزمی، بوودەڵەیی. طەبع: تەبیعەت. مونیب: بێبار، پەشیمان. تەن: لەش. موردە: مردوو. خەلایق: خەڵکان، ئادەمیزاد. جان: گیان.

واتە: نزمی و بوودەڵەیی تەبیعەتی بارگۆڕی نۆکەران، بێ نان و بژیوی کردن. جەستەی مردووی خەڵك یەکە بە یەکە گیانی تێگەڕایەوە.

خیسسەتی (عا): خیصتی. هەڵەیە.

(۲۱) شەهد: شیرین. تەڵخ: تاڵ. لوطف و قەهر: نەرمونیانی و توندی، میهرەبانی و تووڕەیی. نیك و بەد: چاك و خراپ. شاهی نەحلئاسا: وەك شاهەنگ. نۆش و نێشان: نۆشین و پێوەدان.

واتە: پادشا نەرمی و توندیی لە بڕیاردانی چاك و خراپدا، شیرین و تاڵە. وەك شاهەنگ بۆ بیرخستنەوەی نۆشینی مایەی خۆشی و پێوەدانی مایەی ناخۆشی هاتەوە.

**خۆش‌نوما شەمشێری ئەو بوو وەك هیلالی شامی عید**
**ماهی نەو دەرکەوت و عیدی ڕۆژەداران هاتەوە (٢٢)**
**بۆ قیصاصی موستەحەق و قەبض و بەسطی موددەعی**
**شێری مەردی گوردی پیل‌ئەفگەن، بە مەیدان هاتەوە (٢٣)**
**خۆشە ئەمجا بۆ تەرەددود بازیان و شەهرەزوور**
**عادیلی نادرڕەوش بۆ جانی دوزدان هاتەوە (٢٤)**
**بێن بەهەم با دەنگی گریەی مولحید و خەندەی مورید**
**بۆ نەمانی کوفر و ظوڵمەت، بەدری ئیمان هاتەوە (٢٥)**

(٢٢) خۆش‌نوما: دیمەنجوان. هیلال: مانگی یەکشەوە. شامی عید: ئێوارەی جەژن. ماهی نەو: مانگی نوێ. ڕۆزەداران: ڕۆژووەوانان.

واتە: شمشێری پادشا وەك مانگی یەکشەوەی ئێوارەی جەژن کە نیشانەی هاتنی ڕۆژێکی خۆشە، بە دیمەنێکی جوانەوە دەرکەوت. ئیتر مانگی نوێ دەستی پێ کرد و کەوتە ڕوو، جەژنی ڕەمەزان بۆ ڕۆژووەوانان هاتەوە.

(٢٣) قیصاص: پاداشت‌سەندنەوە. موستەحەق: خاوەن‌ماف، شایستە. قەبض: گرتن، وەرگرتن. بەسط: بەردان، پانکردنەوە. موددەعی: داواکەر. گورد: دلێر و پاڵەوان. پیل‌ئەفگەن: فیل بەئەرزدادەر، فیل‌بەزێن.

واتە: شێری مەرد و دلێر و فیل‌بەزێن بۆ مافدانەوەی کەسانی شایستەی هەق و گرتن و بەردانی داواکراو، هاتەوە مەیدان.

(٢٤) تەرەددود: هاتوچۆ. بازیان و شەهرەزوور: دوو ناوچەی موڵکی بابان بوون. عادیل: بەداد. نادرڕەوش: کردەوە وەك نادر شا. دوزدان: کۆی دوزد، دزان.

واتە: ئیتر بازیان و شارەزوور بۆ سەردان و هاتوچۆ خۆشن، چونکە وڵات نیزام و ئارامییان تێ‌کەوتووە و پادشای بەدادی ڕەفتار وەك هی نادرشای ئەفشار هاتەوە بۆ گیانی دز و چەتە و ڕێگران.

(٢٥) بەهەم: پێکەوە. مولحید: خوانەناس. ظوڵمەت: تاریکی: بەدر: مانگی چواردە.

واتە: با دەنگی گریانی خودانەناسان و بزە و پێکەنینی موریدان پێکەوە دەربکەون، چونکە مانگی چواردەی گەشاوەی ئیمان و باوەڕ بۆ ڕەواندنەوەی کوفر و تاریکی هاتەوە.

**شەبنشینانی خەفەت با ئەڕڕەئاسا بێنە ڕەقص**
**وا لە بورجی دەوڵەتا خورشیدی ڕەخشان هاتەوە (٢٦)**
**چونکە دیهقان نۆکەر و بەگ چەرچییە و ئاغا بەقاڵ**
**بۆ نیظامی نۆکەر و بەققال و دیهقان هاتەوە (٢٧)**
**بچنە سەر صەنعاتی ئەووەڵ، کەفشدۆز و پینەچی**
**حاکمی مەرکەزشناسی ئەهلی دیوان هاتەوە (٢٨)**
**دیم لە بابانا ڕەعییەت ظاڵم و نۆکەر فەقیر**
**مونعەکیس بوو قەضیە، وا بابی فەقیران هاتەوە (٢٩)**

(٢٦) شەبنشینان: شەونشینان، ئەوانەی وا شەو پێکەوە دادەنیشن و ڕۆژ دەکەنەوە. ئەڕڕەئاسا: وەك گەرد و تەپوتۆز. ڕەقص: سەما. خورشید: خۆر. ڕەخشان: درەوشاوە، پرشنگدار.

واتە: با شەونشینانی بە خەفەتەوە ڕۆژ کردووەوە وەك گەرد و تەپوتۆز کە لە ڕووناکیدا دەردەکەوێ، بێنە جووڵە و سەما، چونکە خۆری پرشنگدار لە بورجی دەوڵەت و حوکمداریدا دەرکەوتەوە.

(٢٧) دیهقان: جووتیاری خاوەنزەوی. چەرچی: دەستفرۆش، فرۆشیاری گەڕۆك. بەقاڵ: دووکانداری ئازووخەفرۆش، وشکەفرۆش. نیظام: ڕێکوپێکی و دامەزراوی.

واتە: لەبەرئەوەی هەلومەرج گۆڕا و جووتیار بوو بە نۆکەر، بەگ بە چەرچی و ئاغایش بە بەقاڵ، پادشا هاتەوە تا جۆری ئەم کاروبارانە ڕێك بخاتەوە.

ئاغا (ن): ئاغە و. (حوچیە) لە (مان) و (جوچیە) لە (ن)دا هەڵەی نووسینن، (چەرچییە) ڕاستە.

(٢٨) صەنعاتی ئەووەڵ: پیشەی یەکەمجار. کەفشدۆز: کەوشدروو. پینەچی: وەستای چاککردنەوەی پێڵاو. مەرکەزشوناس: شارەزای کاروباری حوکم. ئەهلی دیوان: کەسانی شیاوی بارەگای دەوڵەتی.

واتە: کەوشدروو و پینەچی کە خەریکی کاریترن، با بچنەوە سەر کاری یەکەمجاریان، چونکە حاکمی شارەزای کاروباری حوکم و شیاوی بارەگای دەوڵەتی هاتەوە مەیدان.

(٢٩) ڕەعییەت: دانیشتووانی میرنشینی بابان بەگشتی. ظاڵم: زۆردار. مونعەکیس بوو: پێچەوانە بووەوە، گۆڕا. قەضیە: مەسەلەکە، حاڵوبارەکە.

واتە: دوایی دیم خەڵکی دانیشتووی مەملەکەتی بابان بوونەتە زۆردار و نۆکەریش هەژار و بێدەسەڵات کەوتوون. ئێستا مەسەلەکە پێچەوانە بووەتەوە، چونکە باوکی هەژاران هاتەوە.

**شەقوەشێن ئامادە بن بۆ کاسبی شوورانشین**
**پشتی لەشکر، صەدری مەجلیس، میری میران هاتەوە (٣٠)**
**گریە کا، تا دەنگی دەردێ، با کەریم ئاغای نەنێ**
**حاکمی مەعزوولکەردەی ئەو بە شادان هاتەوە (٣١)**
**تەپڵی بدڕێنێ، عەلەم ون کا جەنابی کاکئەمین**
**قابیلی بەیداغ و تەپڵ و لەشکر و سان هاتەوە (٣٢)**
**خۆی بە پەت ئەمجا بتاسێنێ، مودیری پەتلەمل!**
**صاحێبی چەتر و لیواوو طەوق و فەرمان هاتەوە (٣٣)**

وا (ن): و. هەڵەی نووسینە.

(٣٠) شەقوەشێن: بەردەستانی بنەماڵەی دەسەڵاتدار بۆ تەمێکردنی نەیارانیان کە تێیانهەڵداون. کاسب: کاسبکاری ناو بازاڕ. شوورانشین: ئەوانەی وا لە ئەنجومەنی پرس و ڕاوێژدا دانیشتوون. پشت: پشتیوان، پاڵپشت. صەدر: سەرۆك. مەجلیس: ئەنجومەن. میری میران: پلەیەکی دەوڵەتیی پێش وەرگرتنی پلەی (پادشا) بووە لە دەوڵەتی عوسمانیدا.

واتە: با پێری شەقوەشێن ئامادە بێ بۆ تێهەڵدانی کاسبکارانی بەشداری ئەنجومەنی پرس و ڕاوێژ، چونکە پشتیوانی لەشکر و سەرۆکی ئەنجومەن و میری میران هاتەوە.

(٣١) کەریم ئاغای نەنێ و کاکئەمین و مودیری پەتلەمل: هاوکار و نۆکەری داگیرکەرانی عوسمانی بوون. مەعزوولکەردە: لێخراو، لەسەرکارلابراو. شادان: خۆشحاڵ و شادمان.

واتە: با کەریم ئاغای نەنێ تا دەتوانێ بگری و قوڕ بپێوێ، حاکمە لەسەرکارلابراوەکەی بە خۆشحاڵییەوە هاتەوە سەر کار.

(٣٢) عەلەم: ئاڵا. قابیل: شایان. بەیداغ: بەیداخ. سان: پشکنینی سوپا وا کە فەرماندە بە بەردەمی سەربارانی ڕیزبەستوودا تێپەڕێ و بیانبینێ.

واتە: با کاکەمین تەپڵ و ئاڵاکەی خۆی بخاتە لاوە، چونکە کەسی شیاوی بەیداخ و تەپڵ و لەشکر و سان هاتەوە.

(٣٣) چەتر: لە کۆندا بەسەر سەری پادشایانەوە یا لە نزیکی تەختی شاهانەوە دادەنرا، وەك نیشانەیەکی سەڵتەنەت و پادشایەتی. لیوا: ئاڵا. طەوق و فەرمان: تەوق و ئەڵقەی حوکمداری کە دەوڵەت بە فەرمانی سوڵتان بەخشیویە و کراوەتە مل.

واتە: با مودیری پەتلەمل خۆی بخنکێنێ و گۆڕی گوم بێ، چونکە خاوەنی چەتر و ئاڵا و تەوق و

**خرس‌خوو کەهیایی ماضی بوو لە دەشتی شەهرەزوور**
**پێی بڵێن: خۆی ڕاگرێ، وا شێری غەڕڕان هاتەوە (٣٤)**
**چونکە شێوەی زاغی بوو، سەرکاری کەهیا موددەتێ**
**بۆ شکاری ئەو لەسەردا بازی تەڕلان هاتەوە (٣٥)**
**سەنگەری عەهدی عەزیز بەگ کەڵکی کەهیا ناگرێ،**
**صاحێبی شەمشێر و دیرع و خوود و خەفتان هاتەوە (٣٦)**
**ڕەنگە ئەمجا بێتە (گاڕان)، سەرحەدی موڵکی (سنە)**
**ڕموەشێنی مەعرەکەی دەشتی (مەریوان) هاتەوە (٣٧)**

فەرمانی سوڵتانی هاتەوە ئارا.

ئەمجا (ن): ئەمجار.

(٣٤) خرس‌خوو: خوو وەك هی ورچ. کەهیا: سەرکار و کوێخای والی. ماضی: پێشوو. غەڕڕان: کۆی (أغرّ)ە، پیاوی کارچاکی گەورە و شەرافەتمەند و ناودار.

واتە: کەهیای پێشووی خوو وەك هی ورچ، یا کەهیای خوو وەك هی ورچی –بەپێی نوسخەی (عا)– یاخی، کە لە دەشتی شارەزووردا بوو، ئاگاداری بکەنەوە خۆی لە بەردەم شێری مەرد و ناوداردا ڕابگرێ.

خرس‌خوو (ن): حرس‌وخوو. هەڵەیە. ماضی (عا): یاخی.

(٣٥) زاغ: قەلەڕەش. سەرکار: وەکیل، دەمڕاست. موددەت: ماوە. شکار: ڕاو. تەڕلان: بازی لە ڕاودا چابوك و ئازا.

واتە: چونکە ماوەیەك بوو وەکیل و سەرکاری کەهیا وەك قەلەڕەش شووم و هۆی نەگبەتی و ماڵوێرانی بوو، وا بازی تەڕلان لە سەرەوە هات بۆ ڕاوکردنی ئەو.

موددەتێ (عا): پیش ازین.

(٣٦) عەزیز بەگ: عەزیز بەگی بابان. دیرع: زرێ، قەڵغان. خوودە: تاسکڵاوی ئاسنین بۆ کاتی جەنگ. خەفتان: کراسی زرێپۆش کە لەژێر کەلوپەلی جەنگەوە لەبەر کراوە.

واتە: ئەو سەنگەرانەی زەمانی عەزیز بەگ کە کەهیا خستبوونیە ژێر دەستی خۆی، کەڵکیان نابێ، چونکە پادشای خاوەنی شمشێر و زرێ و تاسکڵاوی ئاسنین و کراسی زرێداری جەنگ هاتەوە.

(٣٧) سەرحەد: سنوور. موڵکی سنە: میرایەتی ئەردەڵان کە پایتەختەکەی سنە بووە. مەعرەکە: شەڕ. گاڕان: ملەیەکی نزیکی ڕۆژهەڵاتی شاری (مەریوان)ی ئێستا.

کەڕڕ و فەڕڕ با کەم بکا (والی) بە فەوجی (چێش کەرۆ)!
پووشتبەندی لەشکری وەندات و جافان هاتەوە (٣٨)
طایری دەوڵەت، ((بحمد الله))، بە ئەمری شەهرەزوور
موستەعیدد و خوڕڕەم و یازان و تازان هاتەوە (٣٩)
کەوتە ناو کەففەی کەرەم، دووبارە خەرجی شەهرەزوور
طالیعی دەروێش و موفلیس بوو کە قائان هاتەوە (٤٠)
من بە شەك دەموت: نەجاتی کەی دەبێ پاشا لە ڕۆم؟
دڵ وتی: "سالم!" یەقینت بێ، بە قورئان هاتەوە (٤١)

واتە: ڕەنگە ئەمجارە سنووری مەملەکەتی ئەردەڵان بگاتە (گاران)، چونکە ڕموەشێنی شەڕی دەشتی مەریوان پەیدا بووەوە.

(٣٨) کەڕڕ و فەڕ: لێدان و هەڵاتن، پەلاماردان و کشانەوە. چێش کەرۆ: چی ئەکا. ئەمە ڕستەیەکی هەورامییانەیە بۆ گاڵتەپێکردن وتراوە و بەڵگەیە کە فەوجێکی سەربازانی والیی ئەردەڵان هەورامی بوون. پوشتبەند: پشتیوان، پاڵپشت، پشتبەستوو. وەندات: وەندییەکان. جافان: جافەکان.

واتە: با والیی ئەردەڵان کەم فەوجی هەورامییەکان بەکاربهێنێ بۆ لێدان و کشانەوە، لەبەرئەوەی ئەوەی بۆ ناکرێ و پشتیوانانی لەشکری وەندییەکان و جافەکان هاتنەوە پێش.

جافان (عا): جاخان. هەڵەی نووسینە.

(٣٩) طایری دەوڵەت: مەلی بەخت کە بەسەر هەر کەسێکەوە بنیشێتەوە دەبێتە دەوڵەتدار و پادشا. بحمد الله: سوپاس بۆ خودا. موستەعید: ئامادە. خوڕڕەم: شادمان. یازان: دەستبەکار، سازوتەیار. تازان: تێژڕۆ، هەڵمەتبەر.

واتە: مەلی دەوڵەتداری، سوپاس بۆ خودا، بۆ فەرمانی شارەزوور ئامادە و شادمان و سازوتەیار و بە هەڵمەتەوە هاتەوە.

(٤٠) کەففە: تای ترازوو. کەرەم: بەخشندەیی. خەرج: داهات. طالیع: بەخت. موفلیس: نابووت. قائان: ناسناوی پادشاکانی مەغوول.

واتە: داهاتی شارەزوور کەوتە ناو تای ترازووی بەخشندەیی و لێی بەخشرا. بەختی دەروێش و نابووتەکان بوو کە خان و پادشا هاتنەوە.

ناو کەففەی (ن): نا گوفتەی. هەڵەی نووسینە.

(٤١) شەك: گومان. نەجات: ڕزگار. ڕۆم: دەوڵەتی عوسمانی. یەقینت بێ: دڵنیا بە، گومانت نەبێ.

**ئەهلی دانش، ((حاتەمی بەخشش)) بە ئەبجەد کەن حیساب**
**با نەڵێن: کانی کەرەم کەی بوو بە بابان هاتەوە؟! (٤٢)**

واتە: بە گومانەوە لە دڵم پرسی کەی عەبدوڵڵا پاشا لـە دەسـت حـوکمی عوسمـانی ڕزگـاری دەبێ؟ وتی سالم دڵنیا بە و سوێند بە قورئان وا هاتەوە.

دەموت (ن): دەمگوت.

(٤٢) ئەم بەیتە لە (مان، ن)دا نییە.

ئەهلی دانش: زانایان. حاتەمی بەخشش: حاتەمی تەیی بەخشندەیی. بە ئەبجەد کەن حیساب: بـەپێی پیتەکانی ئەبجەد حسێب بکەن. کانی کەرەم: کانگای بەخشندەیی.

واتە: با زانایان ((حاتەمی بەخشش)) بە پیتەکانی ئەبجەد حسێب بکەن، تـا دوایـی سـەریان لێ تێکنەچێ و نەزانن کەی ئـەم کانگـای بەخـشندەییە هاتـەوە بـۆ مـوڵکی بابـان. ئـەوە دەکاتـە (١٢٧٠)ی کۆچی، (١٨٥٣-١٨٥٤)ی زایینی.

-٤١- (*)

**دوژمنی خوونخواری شەو بۆ قەلبی مەحزوون هاتەوە**
**تیپی غەم، دیسان، لە هەر سەر بۆ شەبەیخوون هاتەوە! (١)**
**تێكشكا، دوێشەو لە طـۆفانی غەما، كەشتیی هۆش**
**بۆ تەنیش ئەمشەو، لە ئەشكی دیدە، جەیحوون هاتەوە! (٢)**
**چەندْ ڕۆژێ بوو لەدەس جەوری فەلەك ئاسوودە بووم**
**بۆ موصیبەت، باز، بەسەرما كەیدی گەردوون هاتەوە (٣)**
**شیشەیی دڵ بەس لە كونجی سینەدا پۆشیدە بوو**
**باز بەسەریا غەم وەكوو سەنگی فەلاخوون هاتەوە (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (كم، گم)دا هەیە.

كێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) خوونخوار: خوێنخۆر. قەلب: دڵ. مەحزوون: خەمبار. هەر سوو: هەر لا. شەبەیخوون: پەلاماری ناخافڵی شەو.

واتە: دوژمنی خوێنخۆری من لە شەودا هاتەوە سەر دڵی خەمبارم. سوپای خەم لە هەر لایەكەوە هاتەوە مەیدان، تا شەو لەپڕدا پەلامارم بدا.

(دوژمنی)، دەبێ (دوشمنی) بووبێ و گۆڕرابێ.

(٢) طـۆفان: زریان و با و بۆران. تەن: جەستە. ئەشكی دیدە: فرمێسكی چاو. جەیحوون: ڕووبار، ڕووبارێكی خوارووی ڕۆژاوای توركستانە.

واتە: دوێنێشەو عەقڵ و هۆشم كە وەك كەشتی لە زریان و با و بۆرانی خەم ڕزگارم دەكا، تێكشكا و هۆشم نەما. ئەمشەو ڕووبارێكی وەك (جەیحوون)یش لە فرمێسكی چاوم پێكهات، بەسەر لەشمدا ڕژا و نوقمی كردم.

(٣) جەور: ستەم. فەلەك: ڕۆژگار. موصیبەت: نەهامەتی. باز: دیسان. كەید: فێڵ.

واتە: چەند ڕۆژێك بوو خەمی زۆر و ستەمی ڕۆژگارم نەبوو، دڵم ئاسوودە بوو. كەچی فڕوفێڵی گەردوون دووبارە هاتەوە سەرم، تا دوچاری نەهامەتیم بكا.

(٤) شیشە: شووشە. بەس: زۆر. كونج: گۆشە. سینە: سنگ. پۆشیدە: داپۆشراو. سەنگ: بەرد. فەلاخوون: قۆچەقانی، قەڵماسنگ.

واتە: شووشەی دڵەكەم لەمێژ بوو لە گۆشەی سنگمدا بوو. كەچی خەم و خەفەت دیسان وەك

**مەنزڵی مەقصوودی عاشق وەك فەرامۆشخانەیە**
**دڵ کە چوو ناپوختە بوو، لەوسەر بە مەجنوون هاتەوە! (٥)**
**ئەشکی گوڵگوون ڕەونەقی هێنا، موبارەك کۆهکەن!**
**سواری شیرینت لە خانەی زینی گوڵگوون هاتەوە (٦)**
**داروەو بۆ صەعبی عیللەت دیدەنی دیداری یار**
**موژدە بێ بیماری غەمگین، وا فەلاتوون هاتەوە (٧)**
**خۆم گەلێ پاراست لە نەزدیکیی ڕەقیب، دادی نەدا**
**ناگەهان بۆ من وەکوو هەمزادی طاعوون هاتەوە! (٨)**

بەردی قۆچەقانی لە حەواوە بە سەریدا دابارییەوە و شکاندی.

(٥) مەنزڵ: مەڵبەند، شوێن. مەقصوود: مەبەست. فەرامۆشخانە: شوێنی فەرامۆشکردن. ناپوختە: کرچوکاڵ، نەزان. مەجنوون: شێت.

واتە: مەڵبەندی جێی مەبەستی عاشق کە لای یارە، وەك فەرامۆشخانەیە، عاشقی تێدا پشتگوێ دەخرێ. دڵ کە چووە لای دڵبەر کرچوکاڵ و نەزان بوو، لەباتی ئەوەی تێگەیشتن و زانیاری پەیدا بکا، بە شێتی گەڕایەوە.

فەرامۆشخانەیە (گم): فەرامۆشی نەیە.

(٦) گوڵگوون: شێوە گوڵ. ڕەونەق: شەوقدانەوە و ڕووناکی. موبارەك: پیرۆز. کۆهکەن: کێوهەڵکەن.

ئەم بەیتە ماناکەی نارۆشنە و ڕەنگە لە چاپکردندا هەڵەی تێدا کرابێ، هەر ئەوەندەی لێ وەرگیرا کە: ئەی فەرهادی کێوهەڵکەن، لەبەرئەوەی فرمێسکی شێوە گوڵی تۆ شەوقی دایەوە و درەوشایەوە، پیرۆز بێ وا گریانی تۆ کاری خۆی کرد و شیرین بەسەر زینی شێوە گوڵەوە هاتەوە.

(٧) داروو: دەرمان. صەعبی: قورسی، سەختی. عیللەت: دەرد، نەخۆشی. دیدەن: بینین. بیمار: دەردەدار. فەلاتوون: ئەفلاتوونی حەکیم.

واتە: چاوپێکەوتنی چارەی نازداری یار، دەرمانە بۆ نەخۆشی و دەردی گران و قورس. کە وابێ، ئەی دڵی نەخۆش، مژدە بێ وا ئەفلاتوونی حەکیم هاتەوە بۆ لات وەك دڵبەرەکەت بێ.

(صەعبیی)، لەبەر تێكنەچوونی کێش بە (صەعبی) نووسراوە. (فەلاتوون)یش دەبێ (فەلاطوون) بووبێ و گۆڕرابێ.

(٨) پارازت: پاراست. نەزدیکی: نزیکی. ڕەقیب: بەدکار. ناگەهان: کوتوپڕ. هەمزاد: پێکەوە

**ئەی عەجەب "سالم" لە صەحرا ڕوو لە ئابادی دەکا؟!**
**یاری شاری موژدە بێ! چۆڵگەردی هاموون هاتەوە (٩)**

لەدایكبوو، جمك. طاعوون: نەخۆشیی ڕشانەوە.

واتە: ماوەیەکی درێژ خۆم لە قەرەکەوتنی بەدکار پاراست و سوودی نەبوو. ئەوەتا لە ناکاودا وەك برینی لەگەڵ تاعوون پەیدابوو، هاتەوە بۆ سەرم. (هەمزادی طاعوون) برینێکە لەگەڵ تاعوون پەیدا دەبێ. ئەگەر مرۆڤ لە تاعوون ڕزگاری بوو، وا دەبێ ئەو برینە دەیکوژێ وەك مەهەکی زۆر دەردی خراپی لە وێنەی ئاوڵە و سووریژە و .. تاد.

پاراست (گم): پارازت.

(٩) ئەی عەجەب: سەیرە. صەحرا: سارا و بیابان. ئابادی: ئاوەدانی. چۆڵگەرد: چۆڵگەڕ. هاموون: دەشتی پان و بەرین.

واتە: سەیرە، سالم کە وێڵ بووە، ئێستا لە ساراوە ڕوو لە ئاوەدانی دەکا. جا ئەی یاری شارستانی، مژدە بێ وا چۆڵگەڕی دەشت و سارا هاتەوە.

دەکا (کم): ئەکا.

-٤٢- (*)

بەس نییە پەروانە وەك عاشق ئەبەد ناخولێتەوە
نیمەچەرخێکە دەسووتێ و حاڵەتی دەبڕێتەوە!! (١)
گەر لە حەوضی کەوثەرا ئاوی حەیات بۆم دەس بدا
ژهرەمارێکە، بەبێ تۆ، قەت بە من ناخورێتەوە! (٢)
سەربەسەر عومرم تەلەف بوو، حەسرەتا، بێ عیشقی یار
چوو لەدەست، یاران، بە غەفڵەت، ئێستە بۆم نایێتەوە (٣)
وەك یەهوود دونیا گرێی وا دا لە ڕشتەی طالیعم
حەضرەتی "ئیدریس" بە ناخون سەعی کا، ناکرێتەوە! (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لـە (کم، پ، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) ئەبەد: هەرگیز. نیمەچەرخ: نیوەسووڕ.

واتە: پەروانە هەرگیز وەك عاشق هەموو کاتێك ناسووڕێتەوە، هەر نیوەسووڕێك دەکا بە دەوری مۆمدا و دەسووتێ.

بەس نییە (کم): بەسی نییە. هەڵەیە. دەبڕێتەوە (کم): ئەبڕێتەوە.

(٢) حەوضی کەوثەر: حەوزی ئاوێکی بەهەشت. ئاوی حەیات: ئاوی ژیان.

واتە: ئەگەر ئاوی ژیانم لـە حەوزی کەوسەر دەست بکەوێ، بەبێ تۆی دڵبەر وەك ژەهری مـار وایە و پێم ناخورێتەوە.

حەوضی (گم): حەوزی.

(٣) ئەم بەیتە هەر لـە (پ)دا هەیە.

تەلـەف بوو: لـەناوچوو. غەفڵەت: بێئاگایی.

واتە: بە داخەوە تەمەنم سەرلـەبەر بەبێ بەدەستهێنانی خۆشەویستیی یار بڕایەوە و تێداچوو، بـە بێئاگایی لـەدەستم چوو و ئێستا بۆم ناگەڕێنرێتەوە.

(٤) یەهوود: جوولـەکە. طالیع: بەخت. ئیدریس: لـە نەوەی شیثی کوڕی ئادەم و پێغەمبەر بووە، جوولـەکە پێی وایە بە زیندوویی چووەتە بەهەشتەوە. ناخوون: نینۆك.

واتە: ئەم دنیایە گرێیەکی وەك گرێکوێرەی جوولـەکەی لـە بەختم داوە، حەزرەتی ئیدریسیش (خ. ڕ)، کە -دەڵێن- هەموو زانستێکی زانیوە، بە نینۆك بۆی ناکرێتەوە!

**ڕۆژی ئەووەڵ ثەبتی دڵ بوو حەرفی عیشقت، «بعد ازین»**
**قەت بە سەیلابی حەوادیث لێی مەحوو نابێتەوە (٥)**
**تا ڕەقیب بێت و بچێ لەم ڕێیە، تا دونیا هەیە**
**دەرکی غەم بۆ "سالم"ی بێچارە داناخرێتەوە (٦)**

(٥) ثەبت: جێگیر، چەسپیو. بعد ازین: پاش ئەمە. سەیلاب: لافاو، سێڵاو. حەوادیث: ڕووداو. مەحو نابێتەوە: ناسڕێتەوە.

واتە: حەرفی عیشقی تۆ لە ڕۆژی یەکەمەوە لە دڵدا چەسپی و جێگیر بوو. ئیتر پاش ئەوە بە لافاوی ڕووداوەکانیش ناسڕدرێتەوە و ون نابێ.

(٦) ڕەقیب: بەدکار.

واتە: تا بەدکار بەم ڕێگەیەی عیشقدا هاتوچۆ بکا، تا دنیا دنیایە دەرگای خەم و خەفەت لە سالم داناخرێ.

## -٤٣- (*)

**بیستم ئاغەسوورە مەدحی واشەگێڕی کردووە**

**... ... ... دەژنەوێ ... ... ... ... یا مردووە (١)**

**ئاڵەزاقە و جوڕڕە بۆ کۆللارە پشتە و سنگ بچووك**

**لاقدرێژە، چنگمریشکە و کەمفڕە، چاومردووە (٢)**

**هەر لە عەمدەن خۆی لە داو داوە، کە صەییاد بیگرێ**

**چونکە تۆڕە، مورغی باغە، خۆی لەوان گوم کردووە (٣)**

**گاڵتەی مورغانی کێوە، هەر کە فیکەی لێ دەکەی**

**ئێستە لەو ترسە لەسەر دەستکێشە، خۆی مات کردووە (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (غ)دا هەیە، هەجووی "ئاغەسوورە" ناوێکە، کە نەزانراوە کێیە؟ کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) ئاغەسوورە: دەبێ ئاغایەکی سوورڤل بووبێ. واشەگێڕ: بازەوان، ئاگاداری واشەی ڕاو. واشە: باشوو، باڵندەیەکی ڕاوکەری لە باز بچووکترە.

واتە: بیستم ئاغاسوورە کەوتووەتە ستایشی کابرای واشەگێڕ. نیوەی دووەمی بەیتەکە، لەبەرئەوەی لە وێنەگرتنەوەی دەستنووسەکەدا ڕوون نییە، ساغ نەکرایەوە.

(٢) ئاڵەزاقە: قەلەڕەشە. جوڕڕە: بازی نێر، چۆلەکەیەکی بچووکی ڕەنگبۆری ئامالزەردە. کۆللارە: کوڕکوڕە، باڵندەی جووجك و مریشكفڕێن. پشتە: نێری دوودەکی. چاومردوو: کینایەیە لە سستی و گێژی و ناوریایی.

واتە: قەلەڕەشە و بازی نێر لەبەر ڕەحمەتی کۆللارەدان؛ سنگیان بچووك، لاقیان درێژ، چنگ و پێیان وەك هی مریشك، کەم تین‌وتوانی فڕینیان هەیە و چاو داخراو و خەواڵوون.

(٣) عەمدەن: ئەنقەست. تۆڕ: سرك و ڕامنەکراو.

واتە: هەر بە ئەنقەست خۆی بە داوەوە کردووە، تا ڕاوچی بیگرێ. لەبەرئەوەی ڕامنەکراوە و مەلی ناو باخە، خۆی لەوان شاردووەتەوە.

(٤) دەستکێش: چاساغی کوێر.

واتە: بووە بە گاڵتەجاڕی مەلانی کێو، هەر فیکەی لێ بکەی، خۆ مات دەکا و ترسی ئەوەی هەیە ببێتە چاوساغی کوێر.

گەر بچێتە مێرگەوە، قازلاخ بە جوڕ تووڕەی دەکا
بۆ جێگاگۆڕکێ لە صەحرا، هەر بە شەو ڕابوردووە (٥)
صینفی مورغیش گەر وەکوو ئینسان جودا بێ میللەتی
ئاشیانەی گەر لە خانەی ڕۆستەمە، جینسی جووە (٦)
میخەکە وەك پارچەبەند بۆ هەردو پێ ئامادەیە
بۆ کونی لووتی، خەفەقان، خۆی موهەییا کردووە (٧)
ڕەنگە هەر کەس چاوی بەم سنگ و سەر و کلکە کەوێ
پێی بڵێ: لەعنەت لە بابی ئەو کەسە تۆی گرتووە (٨)
ئەحمەدی کاکم دەڵێ: قالە وەرە، وا واشەکەت
باقڵی من هێلکە دەکا و وەك مریشك پس کەوتووە (٩)

(٥) مێرگ: چیمەن و گیاجاڕ. قازلاخ: کـلاوکوڕە، سۆفیەقیتە، باڵدارێکی لە شێوەی ڕیشۆڵەی کەمێ گەورەتری سنگ‌دەرپەڕیوی دەنووك‌درێژ و ڕەنگی پەڕ هاوشێوەی چۆلەکەی نوختەدار و دەنگخۆشە. جڕ: جڕت بۆ گاڵتەپێ‌کردن. جێگاگۆڕکێ: لە جێیەکەوە چوونە جێیەکی‌تر.

واتە: ئەگەر بچێتە ناو مێرگ و گیاجاڕ، کلاوکوڕە بە جڕت تووڕەی دەکا. لە تاواندا بە شەو لە جێیەکی دەشتەوە دەچێتە جێیەکی تر، تا نەیبینن.

(٦) صینف: پۆل. ئاشیانە: هێلانە. ڕۆستەم: پاڵەوان. جوو: جوولەکە.

واتە: ئەگەر مەلانیش وەك مرۆڤ میللەتیان جیاجیا بێ، هێلانەکەی لە خانووی ڕۆستەمی پاڵەوانی ئازایشدا بێ، دەترسێ و هەر دەڵێی لە ڕەگەزی جوولەکەیە، کە وا باوە ترسنۆکە.

(٧) میخەکە: ڕەقاییەك لە پەنجەی پێ دەردەچێ. پارچەبەند: پارچەقوماشی بەستن. خەفەقان: دڵەکوتە و شڵەژان. موهەییا: ساز و ئامادە.

واتە: میخەکە ئامادەیە لە هەردوو پێی پەیدا بێ و وەك پارچەقوماشی بەستن بیبەستێتەوە. بە شڵەژانەوە خۆی ساز کردووە لە کونی لووتیشی دەربێ و هەناسەسواری بکا.

(٨) واتە: هەر کەسێك ببینێ وا دڵبەندی دەبێ، نەفرەت لەو کەسە دەکا کە گرتوویە و ئازادی ناکا.

(٩) قالە: کورتکراوەی ناوی "قادر"ە. باقڵ: بە عەقڵ، پێم وایە. پس: فس، ژێرکەوتنی مریشك بۆ کەڵەشێر.

**واشەخێو و واشە وا، کاکم بەم دەرپڕاکییە**
**((بعدازین)) دایم بەبێ هیچ لەو تەلانە قووقووە (١٠)**

واتە: ئەحمەدی کاکم دەڵێ– قادر، واشەکەت خەریکە هێلکە دەکا، فس بووە و کەوتووەتە ژێرەوە.

(١٠) واشەخێو: خاوەنی واشە. تەلان: پلە و لێژاییی لاپاڵی شاخ. قووقوو: دەنگی خوێندنی کەڵەشێر. بەم دەرڕاکییە: بەم تێگەیشتن و پەیپێبردنەوە.

واتە: ئەمە حاڵوباری خاوەنی واشە و واشە خۆیەتی. کاکەی ناغاسوورەیشم ئەم سەلیقە و تێگەیشتنەی هەن. ئیتر هەمیشەیش لەو تەلانە دەنگی قووقووی کەڵەشێرە.

## (*) -٤٤-

...

دادەپۆشێ سەر و گوێ، زین لە نەشیب

چونکە بێ گەردەنە، کۆڵە بەدەوە! (١)

دوشمنی تۆیە، ئەگەر ڕۆیینی توند

بۆزە هەتکە، بڕۆ، سا وەختی هەوە (٢)

مەنزڵ و باغی ‹وەکیڵ› صەد قەدەمە

شەوە، سا بۆزە بڕۆ، گاهی خەوە (٣)

سەعەی نووح ماێن و ئەسپێکی گەیشت

نەڕی دوومادەیە، گەر مابێ ئەوە (٤)

گەر لە ‹دۆشان› بگەمە شاری ‹سنە›

دەیفرۆشم بە خودا تا قەڵەوە (٥)

(*) ئەم پارچەشیعرە ناتەواوە داشۆرینبابەتە هەر لە (غ)دا هەیە. نازانرێ چەند بەیتی لە سەرەتاوە فەوتاوە، چونکە پەڕەی پێش ئەم لاپەڕەیەی دەستنووسەکە کەوتووە. دیارە بە ناوهێنانی شاری ‹سنە›، دەبێ بۆ یەکێکی خەڵکی نەوێی وتبێ. لەبەرئەوەی پارچەکە تەواو نییە و نەزانراوە چەند بەیتی پێشەوەی نوقسانە، پێویست نەبینرا لێك بدرێتەوە و هەر دەقەکەی نووسرایەوە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشی مەخبوونی مەحزووف.

-٤٥- (*)

نەظمی دا بۆ ڕەزمی من، هەردەم کە زوڵفی پڕ گرەهـ
هەم کەمەندیٚ دێتە بازوو، هەم بە بەریا دیٚ زرەهـ (١)
ئەم دەڵێم وەك قەددی تۆیە، ئەو دەڵێم وەك ڕوویی تۆ
گەر لەبەر سەروا قەبا بیٚ، وەر لەسەر مەهـ بیٚ کولەهـ (٢)
بۆ خەرابی موڵکی دڵ، وا دیارە لەشکر تیپی بەست
چاوی ئەو سەرهەنگی تورکە و صەففی موژگانی سوپەهـ (٣)
جوز بەدی نەمدی لە دوشمن، هەرچی نیکیم پیٚنوواند
چا بوو پێم زانی، بە صەد شوشتن سپی نابیٚ، شەبەهـ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور.

(١) نەظمی دا: ڕێکیخست. ڕەزم: شەڕ و جەنگ. هەردەم: هەمیشە. گرەهـ: گریٚ. کەمەند: پەتی درێژ و ئەستوور بۆ بەستنەوە. زرەهـ: زریٚ.

واتە: کە دڵبەر هەمیشە ئەگریجەی پڕ گریٚوگوڵی ڕێك دەخا و تاووتوێی دەکا بۆ شەڕی من، کەمەندێکیش بۆ کەمەندکێش‌کردنم دەخاتە قۆڵی و زرێی جەنگیش دەپۆشیٚ.

(٢) قەد: کەمەر. قەبا: کەوا. وەر: وە ئەگەر. مەهـ: مانگ. کولەهـ: کڵاو.

واتە: ئەگەر سەرو کەوا لەبەر بکا، دەڵێم وەك قەدی تۆ باریك و ڕێکە. ئەگەر مانگیش کڵاو لەسەر بنیٚ، دەڵێم وەك ڕووی تۆ تریفەدارە.

(٣) خەراب: وێرانە. سەرهەنگ: پلەیەکی سوپاییە. صەف: ڕیز. موژگان: برژانگ. سوپەهـ: سوپا.

واتە: لەشکری دڵبەر تیپی بەستووە بۆ وێرانکردنی موڵکی دڵ، ئەوەتا چاوی سەرهەنگی تورکە و ڕیزی برژانگەکانیشی سەربازی سوپایە.

(طــیپی) شێوەنووسی (تیپی)ی نوسخەی (مان)ە.

(٤) جوز: جگە لە. بەدی: خراپی. نیکی: باشی و چاکی. شەبەهـ: مسی زەرد یا شەوە.

واتە: هەرچی کارێکی چاك و باش هەبوو دەرهەق بە دوژمن نوواندم، لە خراپی بترازیٚ، هیچم لیٚ نەدی. بەڵام ئێستایش چاك بوو کە پێم زانی و بەئاگا هاتمەوە، مسی زەرد بە سەد جار شتن سپی

**وا دەزانم "سالم"ی بێکەس لە ظوڵمی بێحەدت**
**عاقیبەت بگرێ بە صەد زاری زەمامی پادشەه (٥)**

نابێتەوە و هەر زەردە.

(نیکی) بەرامبەر بە (بەدی)یە، بۆیە (نیکیم) ڕاستە، نەك شێوەی (نیکم)ی نوسخەکە.

(٥) ظوڵم: ستەم و زۆرداری. بێحەد: لەڕادەبەدەر، بێسنوور. عاقیبەت: سەرەنجام. زاری: ناڵە و گریان. زەمام: جڵەو. پادشاه: پادشا، شا.

واتە: پێم وایە "سالم"ی بێکەس لە ئاکامی ئەم هەموو زوڵم و ستەمە لەڕادەبەدەرەتدا بتوانێ سەرەنجام بە صەد گریان و ناڵە جڵەوی پادشا بگرێ و نەهێڵێ لەوە زیاتر بێدادی و ستەمکاری بکا.

## -٤٦- (*)

ڕووی لەناو طوڕڕە چرایە و لە شەبایە
نەیشەکەرقامەتە، قەندی لە لەبایە (١)
کەمە بۆ وەصفت ئەگەر بێم و بڵێم:
حووری جەننەت لە لیباسی قەصەبایە (٢)
ڕووبەڕوویی غەمزەیی تۆ مەنسووخن
سیحرەهایێ کە لە دیدەی عەرەبایە (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، ه، غ، ج، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشیی مەخبوون.

(١) طوڕڕە: ئەگریجە. لە شەبایە: لە شەودایە. نەیشەکەر: قامیشی شەکر. قامەت: بەژن. قەند: شەکر. لە لەبایە: لە لێودایە.

واتە: ڕوخساری دڵبەر لەناو پێچولوولی مووی ڕەشی ئەگریجەدا، وەك چرایەکە لە شەوێکی تاریکدا هەڵکرابێ. دڵبەرم بالآی وەك قامیشی شەکر وایە، بە وێنەی ئەویش قەند و شیرینیی لە لێودایە.

شەبایە (کم، گم): شەوایە. لەگەڵ دوا وشەی ئاخری بەیتەکانیتر ڕێك ناکەوێ. چرایە و (ه): چرایە. قامەتە (حا): قامەتی. (غ): قامەت. قەندی (ڕ): قەند.

(٢) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (ه)دا نین.

حوور: پەری. جەننەت: بەهەشت. لیباس: جلوبەرگ. قەصەب: قامیش.

واتە: وەسف و سەنایەکی کەمی تۆم کردووە، ئەگەر بڵێم: دڵبەرم پەریی بەهەشتە، بەلآم ئێستا وا لە بەرگی قامیشی شەکردا.

وەصفت (ڕ): وەصف.

(٣) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا شەشەمە.

مەنسووخ: پووچەڵکراوە. سیحرەها: کۆی سیحرە، جادوو. دیدە: چاو.

واتە: هەر جادوویەك بەرامبەر بە غەمزە و نازی تۆ لە چاوی عەرەبدا هەبێ، هەمووی سڕاوەتەوە.

مەنسووخن (کم، گم): مەنسووخە. (عەرەبایە) لە (گم)دا نییە و چەند نوختەیەکی لە شوێندا دانراوە.

قرمزیپۆشە بە خوێن موژگانت
بۆ دڵی من لە لیباسی غەضەبایە (٤)
بەسکی دڵگەرمە شەهیدی غەمی عیشقت
تا حەشر سەنگی مەزاری لە تەبایە (٥)
ئاسمان زیددە لەگەڵ مەردومی ڕاست
ئاسیابێکە کە چەرخی بە چەپایە (٦)
سەبەبە بۆسە بدەی مەیلی دڵت
مەیی دەوڵەت لە پێیالەی سەبەبایە (٧)

(٤) ئەم بەیتە لـە (کم، گم)دا پێنجەمە.

قرمزی: سوور. موژگان: برژانگ. غەضەب: تووڕەیی.

واتە: برژانگەکانت بەهۆی خـوێنڕشـتنەوە پۆشـاکی سـووریان لەبەردایـە، وەکـوو جـەللادی خوێنخۆر کینە و تووڕەیی بەرامبەر بە من دەنوێنن.

بە خوێن (ڕ): بە خوون. غەضەبایە (ه): قەصەبایە. (ڕ): عەضەبایە. هەڵەی نووسینە.

(٥) ئەم بەیتە لـە (کم، گم)دا سێیەمە.

بەسکی: ئەوەندە، زۆر. حەشر: ڕۆژی قیامەت. سەنگ: کێل. مەزار: گۆڕ. تەب: تا.

واتە: لـەبەرئەوەی شـەهیدانی عیشقی تۆ زۆر دڵیان گەرمـە بـە گـەرمای خۆشـەویـستی، کێڵـی گۆڕەکەیان تا ڕۆژی حەشر گەرمە، مرۆڤ ناتوانێ دەستی لێ بدا.

(غەمی) لە (کم، گم)دا کەوتووە. (ضیددە) لـە (مان)دا بە هەڵە بە (زیددە) نووسراوە.

(٦) ئەم بەیتە لـە (کم، گم)دا چوارەمە.

ضیددە: دژە، پێچەوانەیە. ئاسیاب: ئاش. چەرخ: سووڕانەوە.

واتە: چەرخی ئاسمان لـەگەڵ مرۆڤی سەرڕاستدا ناجۆرە، وەك ئاشێك وایـە سـووڕانەوەکەی بـە پێچەوانە و بە لای چەپدا بێ و بە قازانجی ئەو نەبێ.

ضیددە (ن، ڕ): زیددە.

(٧) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لـە (ه)دا نین.

سەبەب: هۆ. بۆسە: ماچ. مەیل: ئارەزوو.

واتە: ئەگەر ئارەزووی دڵی تۆ ماچێك ببەخشێ، هۆیەك لـە ئارادایە. مـەیی سـامان و دارایـی وا لـەناو پیاڵەی هۆیەکی دیاریکراودا.

**مانیعی ڕێیی مەگەسن بۆ پەڕواز**
**خارەهایێ کە لە ڕێگەی ڕوطەبایە (٨)**
**ئەووەڵ و عاقیبەتی "سالم"ە عیشق**
**ئاخری عومری لە ئەووەڵ طەڵەبایە (٩)**

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لەنگە و وشەیەکی وەك (بە) پێویستە، تا ڕاستی بکاتەوە.

(٨) مانیع: ڕێگر. مەگەس: مێش. پەرواز: فڕین. خارەها: کۆی خار، دڕك. ڕوطەب: خورما.

واتە: ئەو دڕكوداڵەی وا لەسەر ڕێی خورمای شیرین، ڕێ لە مێش دەگرێ کە بفڕێ و بگاتە خورما. یانێ: بەدکاران دەوری دڵبەریان داوە و ناهێڵن عاشق پێی بگا.

ڕێی مەگەس (ڕ): ڕێی مەگەسن. (کم، گم): ڕوویی مەگەس. ڕێگەی (غ، ج، ڕ، کم): ڕاهی.

(٩) ئەم بەیتە لە (حا)دا نییە.

ئەووەڵ: سەرەتا. عاقیبەت: سەرەنجام. طەڵەب: داوا.

واتە: سەرەتا و کۆتاییی ژیانی "سالم" هەر عیشقە. ئێستایش کە ئاخروئۆخری تەمەنیەتی، کاتی خۆی لە هەووەڵدا چیی داوا کردووە، هەر هەمان داوای هەیە.

ئەووەڵ (هـ): ئیبتیدا.

(*) -٤٧-

**تەماشا گۆی زەنەخدانت، دەڵێی نارنجی بەغدایە**
**نیگاهی چاوی فەتتانت، وەکوو ئاهوویی سەحرایە (١)**
**وەکوو صەنعان لە عیشقت شێفْتە و مەجذووب و مەحزوونم**
**قەسەم بەو زوڵفە شەبڕەنگەت، کە وەك زونناری تەرسایە (٢)**
**مەکەن مەنعم وەکوو "وامیق"، ئەگەر ئاشوفتەوو زارم**
**جگەرگاهم شیکافی ناوەکی موژگانی "عەذرا"یە (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (عا، نم)دا هەیە. لە (عا)دا پاش ئەم پارچەیە نووسراوە: ((تمت شد کلام سالم از دست حقیر علی اکبر ساکن شهر سنندج در تاریخ ١٤ شهر ربیع الاول سنه ١٣٢١)). واتە نووسینەوەی شیعرەکانی سالم بە دەستی ناچیز عەلی ئەکبەری دانیشتووی شاری سنە لە ڕۆژی ١٤ی ڕەبیعول ئەووەلی ١٣٢١دا تەواو بوو.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) ئەم بەیتە و سێ بەیتی پاشەوەی لە (نم)دا نین.

گۆی زەنەخدان: چەناگەی خڕ. نارنج: میوەیەکە لە بابەتی پرتەقاڵ... بەغدا: شاری بەغدا. نیگاه: تەماشا. فەتتان: فیتنەگێڕ، مایەی شەیداکردن. ئاهوو: ئاسك. صەحرا: بیابان و سارا.

واتە: بڕوانە چەناگەی خڕت وەك نارنجی بەغدا وایە. نیگای چاوی فیتنەگێڕت وەك هیی ئاسکی سارا و بیابان جوانە.

تەماشا (عا): تەماشای. دەڵێی (نم): ئەڵێی.

(٢) صەنعان: شێخی صەنعان. شێفتە: پەرێشان. مەجذووب: کەمەندکێشکراو، ڕاکێشراو. مەحزوون: خەفەتبار. قەسەم: سوێند. شەبڕەنگ: شەوڕەنگ، وەك شەو تاریك و ڕەش. زونار: پشتێنێکە بەو خاچەوە بەستراوە کە مەسیحییەکان دەیکەنە مل. تەرسا: کچە مەسیحی.

واتە: سوێند بەو ئەگریجە ڕەشە وەك شەو تاریکەت کە لە وێنەی زونناری کچە مەسیحیدایە، وەك شێخی سەنعان لەبەر عیشقی تۆ پەرێشان و کەمەندکێش و خەفەتبارم.

(مەجذووبم) لە (عا)دا بە هەڵە بە (مەجزووبم) نووسراوە.

(٣) مەنع: قەدەغەکردن، ڕێلێگرتن. وامیق: عاشقی عەزرا کە داستانێکی کۆنی دڵدارییان هەیە. زار: دەستەپاچە، بێهێز. جگەرگاه: شوێنی جگەر. شکان: درز، قڵیش. ناوەك: تیر. موژگان: برژانگ. عەذرا: دڵداری وامیق.

**ئیشارەی چاوی مەخموور و نیگاهی ناوەکئەندازت**
**بە میثلی غەمزەیی مەجنوونکوشی ئیمایی لەیلایە (٤)**
**موذابی شەککەری لێوت، شیفایی دەردی بیماران**
**تەبەسسومکردنی لێوت، ڕوبایەندەی دڵ و چاوە (٥)**
**بە صوورەتخانەی ڕوخسارت، بە ئەبرۆیی قەڵەمکارت**
**دەڵێی صەفحە و سوطووری مەصحەفی یاسین و طاهایە (٦)**
**یەقین ئەمڕۆ وەکوو یووسف نیقابت داوەتە لاوە**
**کە بەم ڕەنگە لە هەر سوو شۆڕش و فەریاد و غەوغایە (٧)**

واتە: ئەگەر وەك وامیق پەرێشان و دەستەپاچە بم، ڕێم لێ مەگرن. شوێنی جگەرم درز و قڵیشی تیری برژانگی عەزرایە.

(٤) ئیشارە: نیگا، تیلە. مەخموور: مەست. نیگاه: تەماشا. ناوەکئەنداز: تیرهاوێژ. میثل: وەك. مەجنوونکوش: مەجنوونکوژ. ئیما: ئیشارەت، هێما. لەیلا: دڵخوازی مەجنوون کە داستانێکی دڵداری لە بارەیانەوە هەیە.

واتە: تیلەی چاوی مەست و تەماشای تیرهاوێژی تۆ، وەك ئیشارەتی غەمزە و نازی مەجنوونکوژی لەیلا وایە.

(٥) موذاب: توێنراوە. شەککەر: شەکر. شیفا: مایەی چاکبوونەوە. بیمار: نەخۆش. تەبەسسومکردن: خەندە و بزە کردن. ڕوبایەندەی دڵ و چاو: دڵ و چاو فڕێن.

واتە: ئەوی شەکر و شیرینیی لێوت دەتوێنێتەوە، مایەی چاکبوونەوەی دەردی نەخۆشانە. کە لێوت بزە دەیگرێ، دڵ و چاو دەفڕێنێ بۆ خۆی.

(٦) لەم بەیتە بەدواوە لە (عا)دا نییە.

صوورەتخانە: شوێنی وێنە. ئەبرۆ: برۆ. قەڵەمکار: قەڵەمکێش، بە قەڵەم دروستکراو. صەفحە: لاپەڕە. سوطوور: دێڕەکان. مەصحەف: قورئان.

واتە: تۆ بە شوێنی وێنەی ڕوخسار و بڕۆی قەڵەمکێشت، لە کتێبێك دەچی کە لاپەڕە و دێڕەکانی هەردوو سوورەتی (یاسین) و (تاها)ی قورئانی پیرۆزیان تێدا نووسرابێتەوە.

(بە صوورەتخانەی ڕوخسارت)، لەبەر کێش وا باشتر بوو (بە صوورەتخانەیی ڕوخسار) بێ.

(٧) یەقین: بێچەندوچۆن. یووسف: حەزرەتی یووسف (خ. ڕ). نیقاب: ڕووبەند، پەچە. هەر سوو: هەر لا. فەریاد: بانگ و هاوار. غەوغا: هەرا و زەنا.

**سەراپای قامەتی بەس دڵبەر و ڕەعناوو مەوزوونە**
**بە مەحبووبیی و مەوزوونی دەڵێی سەروی دڵارایە (٨)**
**فیدایی شەککەری لێوت شیفایی دەردی بیمارە**
**دەهانی قەندی قینت پڕ لە مرواریدی دەریایە (٩)**

واتە: بێگومان ئـەمڕۆ وەك حـەزرەتی یووسـف، کـە لـە جوانیـدا ناسـراوە، ڕووبەنـدت لاداوە و ڕوخسارت دەرکەوتووە، بۆیە لە هەموو لایەکەوە جۆش و خورۆش و بانگ و هەرایە.

(٨) قامەت: بەژن و بالاّ. بەس: زۆر، ئەوەندە. مەحبووبی: خۆشەویستی. مەوزوونی: سـەنگینی و دامەزراوی. دڵارایە: خۆشـەویسـت و دڵخواز و دڵبووژێنەوەیە.

واتە: بەژن و باڵای لە سەرەوە تا پێ هێندە دڵکێش و ڕێك و دامەزراوە، بـەو خۆشـەویسـتی و دامەزراوییـەیەوە وەك داری سـەروی مایەی دڵبووژانەوە وەهایە.

(٩) فیدا: قوربان. شەککەر: شەکر. مرواريد: مرواری. دەهان: دەم. قەند: شەکر.

واتە: بە قوربانی شەکر و شیرینی لێوت بم کە هۆی چـاکبوونەوەی دەردی "بیمـار" خـۆی یـا نەخۆشە. دەمی ئەو شەکرە پڕ لـە ڕق و کینەیـەت وەك دەریـا مرواریيـەکی زۆری تێدایـە. ڕەنگـە مەبەست لە شەکری پڕقین شیرینییەکی پڕ لە سوێراو بێ. دەریایش دەگرێتەوە کە ئاوەکەی سوێرە.

(*) -٤٨-

دڵ، لەبەر ئیمایی چاوت، مەستی قەڕابەی مەیە
هەر نەظەر بۆ من موکەڕڕەر نەشئە ئەندەر نەشئەیە (١)
ئاوی وا دا مەزرەعەی ڕووت، دەستی دیهقانی ئەزەل
جورمی ماهی چارْدە لەو جەبهەدا وەك خۆشەیە (٢)
ئەی فیدای موژگانی خوونڕێژت! نەظەر کە سوویی من
زەخمی ناسۆرم بە یادی ئاوی تیرت تیشنەیە (٣)
مەشقی ئەبرۆی تۆ دەکا قەددم لە عیشقی قامەتت
ڕەنگی ڕووم بۆ سێوی بەروانە وەکوو ڕەنگی بەیە (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لـە (پ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتی مەحزووف.

(١) ئیما: ئیشارەت. مەست: سەرخۆش. قەڕابە: کووپەی مەی. مەی: شەراب. نـەظـەر: ڕوانـین. موکەڕڕەر: دووبارە. نەشئە: حاڵەتی مەستی و سەرخۆشی. ئەندەر: لـەناو.

واتە: دڵ بە نیگا و ئیشارەتی چاوەکانت، وەك ئەوە وایە سـەرخۆشی کووپەی مەی بووبێ. هـەر ڕوانینێکی دڵبەر بۆ من، دووبارە نەشئەیە لـەناو نەشئەدا.

(٢) مەزرەعە: مەزرا، دێمەر. دیهقان: جووتیار. ئەزەل: بێسەرەتا. جورم: قەوارە و بارسـتایی. مـاهی چاردە: مانگی چواردە. جەبهە: ڕوو. خۆشـە: هێشوو، بەری ڕووەك کە پێکەوەیە و بەلاسکی گیا یا لقی درەختدا شۆڕ دەبێتەوە، کینایەیە لە پچووکی.

واتە: دەستی جووتیاری ڕۆژگار وا ئاوی دێمەری ڕوخسارتی داوە، مانگی چواردە بـە ڕووتـەوە بەو گەورەیـیـەی خۆیەوە ئەوەندەی هێشووی بەری ڕووەکی بەردار چکۆلـەیە.

(٣) موژگان: برژانگ. خوونڕێژ: خوێنڕێژ. سوو: سووچ، لا، بەرەو. زەخم: برین. تیشنە: تینوو.

واتە: بە قوربانی تیری برژانگی خوێنڕێژت بم، ڕوو بکەرە لای من و تەماشام کە. برینـی پـڕ لـە ئازارم یادی تیری برژانگت دەکا و تینووی ئاوی ئەو تیرەیە.

(٤) ئەبرۆ: برۆ. قەد، قامەت: بەژن و باڵا. بەروانە: بەروانکە، سینەپۆش. بەی: بەهێ.

واتە: باڵام بە خۆشەویستیی بەژن و باڵای تۆوە مەشقی برۆت دەکا، تا کەوانەیی بـێ و بـچەمێتەوە. ڕەنگی ڕوخسارم بۆ سێوی مەمکانت کە هەموو سینەتی داپۆشیوە، وەك بەهێ زەرد بووە.

**ئۆف لە ماری حەلقەیی زوڵفی سیای پڕ سیلسیلەت**
**دڵ لە نێشا ڕۆژ و شەو حاڵی وەکوو کوشتەی حەیە (٥)**
**گوێی دەگرت، ئەی کاشکی، یەكدەم لە ئاهەنگی دڵم**
**وا لە فیرقەت بەزمی خاصت ناڵەیی زارم نەیە (٦)**
**ڕیشی پەشمی وشکەصۆفی باعیثی قەبضیی دڵە**
**ڕێی مەدە بۆ مەجلیست ئەو بێدڵە ئەفسوردەیە (٧)**
**گوێگرن یاران لە بازاڕ و مەحەللە و چارْسوو**
**داسْتانی حاڵی "سالم" هەر طەرەف ئەفسانەیە (٨)**

(٥) سیا: ڕەش. پڕ سیلسیلە: پڕ لە پێچولوول. نێش: چزوو. کوشتە: کوژراو. حەی: مار.
واتە: داخ بە دەست ماری ئەگریجەی ڕەشی پڕ لە پێچولوولی ئەڵقە ئەڵقەتەوە! دڵ ئەوەندە ئەو مارە پێوەی داوە، ڕۆژ و شەو وەك کوژراو و مارانگاز وایە.
(٦) کاشکی: خۆزگە. دەم: تاو، هەناسە. فیرقەت: لێكدابڕان. بەزم: شادی. خاص: تایبەت. زار: بە گریان و ئازار. نەی: شمشاڵ.
واتە: خۆزگە دڵبەر، ئەگەر بۆ تاوێك یا هەناسەیەکیش بووە، گوێی لە ئاواز و دەنگی دڵم دەگرت. وەك تۆ لە شادییەکی تایبەتدای، من ناڵەناڵی پڕ گریانم لەبەر لێكدابڕان وەك شمشاڵ خەمگین و کاریگەرە.
(٧) پەشم: خوری، پیس، چڵکن. وشکەصۆفی: سۆفیی بێزەوق و دڵمردوو. باعیث: مایە، هۆ. قەبضیی دڵ: دڵگرانی، دڵگوشران. مەجلیس: کۆڕ و کۆبوونەوە. ئەفسوورده: پەرێشان و شێواو.
واتە: کە ڕیشی چڵکنی سۆفیی دڵمردووی بێزەوق دەبینم، ئەوە دەبێتە مایەی دڵگوشرانم. مەهێڵە ئەو بێدڵە پەشێوحاڵە بێتە ناو کۆڕی دانیشتنی تۆ و وەزعت لێ تێكبدا.
(٨) مەحەللە: گەڕەك. چار سوو: چوار لا. طەرەف: لا.
واتە: یاران لە بازاڕ و گەڕەك و هەر چوارلادا گوێ هەڵخەن، دەبیستن داستانی حاڵی شێری سالم لە هەموو لایەکدا بووە بە ئەفسانە و دەگێڕرێتەوە.

## -٤٩- (*)

**هەر طەرەف شەمعی ڕوخی جانانەیە**
**گەردی ئەو، دڵ دایما پەروانەیە (١)**
**دەست لە تۆ هەڵناگرم، تا نەمکوژن**
**حەرفی ناصیح سەربەسەر ئەفسانەیە (٢)**
**موو بە موو ئەسبابە بۆ من، قەیدی تۆ**
**سیلسیلە بۆ گەردنی دێوانەیە (٣)**
**صەیدی صەیدم، گەرچی صەییادم مودام**
**ئاهویی نەخچیری تۆ شێرانەیە (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، غ، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشیی مەحزووف.

(١) طەرەف: لا. شەمع: مۆم. ڕوخ: ڕوو. جانانە: دڵبەر. گەردی: بە دەوری. دایما: هەمیشە. پەروانە: پەپوولە.

واتە: مۆمی ڕوخساری دڵبەر لە هەر لایەکدا بێ، هەمیشە پەپوولە بە دەوریدا دەسووڕێتەوە.

دڵ دایما (گم): دائیم وەکو. (ئەو) لە (غ)دا و (دڵ) لە (کم)دا کەوتووە و لەنگی کردووە.

(٢) حەرف: قسە. ناصیح: ئامۆژگاریکەر. سەربەسەر: یەك بە یەك.

واتە: تا نەمکوژن وازت لێ ناهێنم. قسە و ئامۆژگاریی کابرای ئامۆژگاریکەر، یەك بە یەك بێبایەخ و پووچە.

دەست (کم، گم): دەس.

(٣) ئەسباب: ئامراز. قەید: کۆت. سیلسیلە: زنجیر. دێوانە: شێت و شەیدا.

واتە: هەموو مووەکانی تۆ یەك بە یەك ئامرازی زنجیرکردنی منن، زنجیرن بۆ ملی شێتی وەك من.

قەیدی (ڕ): زوڵفی.

(٤) ئەم بەیتە لە (عا)دا نییە.

(صەید)ی یەکەم: نێچیر ڕاوکردن. (صەید)ی دووەم: نێچیرکراو. صەییاد: ڕاوچی. مودام: هەمیشە. ئاهوو: ئاسك. نەخچیر: نێچیر. شێرانە: وەك شێر.

واتە: من نێچیری نێچیری تۆم، ئەگەرچی خۆم هەمیشە ڕاوچیم، چونکە ئەو ئاسکەی کە نێچیری تۆ بێ، وەك شێر وایە.

بەس موصیبەت وا لە ڕێی مورغی دڵا
تا لەناو موو خاڵی ڕووی تۆ دانەیە (٥)
هەر بە یادی بۆسە، مەستم گاهی قورب
کۆیی ئەو بۆ من دەڵێی مەیخانەیە (٦)
مەشقی غیرەت مووجیبی جەوهەر نییە
شوغڵی ژن لەم عەهدەدا مەردانەیە (٧)
خاکی کۆی تۆ تا مەقامی "سالم"ە
((في الحقيقة)) مەنزڵی شاهانەیە (٨)

(٥) بەس: زۆر. موصیبەت: بەڵا و نەهامەتی. مورغ: پەلەوەر. دانە: دەنکەگەنم.

واتە: زۆر بەڵا و نەهامەتی لە ڕێگەی باڵندەی دڵدا هەیە، تا خاڵی ڕوخسارت لەناو ئەڵقەی مووی ئەگریجەتدا وەك دانە دیار بێ. یانێ: باڵندەی دڵ بەرەو ئەو دانەیە دەچێ و بە داوی ئەگریجەتەوە دەبێ.

موصیبەت (عا): موسیبەت. (ڕ): بێت. لەنگە. (خاڵی ڕووی تۆ دانەیە) لە (کم)دا بە هەڵگەڕاوەیی دانراوە، لە (گم)دا چەند نوختەیەك خراوەتە جێی.

(٦) بۆسە: ماچ. گاه: کات. قورب: نزیکی. کۆ: بەردەرگا. مەیخانە: جێی مەی خواردنەوە.

واتە: لە کاتی نزیکیدا هەر بە یاد و تاسەی ماچی لێو مەست دەبم. بەردەرگای یار بۆ من وەك مەیخانە وایە و سەرخۆشم دەکا.

ئەو (عا، کم، گم): تۆ.

(٧) ئەم بەیتە لە (عا)دا نییە.

مەشق: ڕاهێنان و خۆتاقیکردنەوە. غیرەت: مەردایەتی. مووجیب: پێویستکەر. جەوهەر: گەوهەر و ناوەڕۆك. شوغڵ: کار. عەهد: سەردەم.

واتە: خۆڕاهێنان لەسەر غیرەت و مەردایەتی لەم چەرخەدا، بە گەوهەر و هونەر نازانرێ. کاری هیچوپووچ بە مەردایەتی حسێب دەکرێ.

شوغڵی (غ، گم): کاری. ژن (گم): زەن.

(٨) مەقام: شوێن و پایە. في الحقيقة: ئەوی ڕاستی بێ. مەنزڵ: مەڵبەند.

واتە: تا خاکی بەردەرگای تۆ جێوڕێی سالم بێ، ئەوی ڕاستی بێ، بە مەنزڵێکی پاشایانە دادەنرێ.

تا (کم): با. ئەم (تا)یە لە (عا)دا نییە. (تۆ) لە (ڕ)دا کەوتووە.

-٥٠- (*)

چاوی مەستت کە غەضەبناکە، چ مەطلّووبی هەیە؟!
قرمزیقەهرە، مەگەر عاشقی مەغضووبی هەیە؟! (١)
دیم کە دونبالەیی ئەو چاوە لە ئەووەڵ نیگەهت
وتم: ئەختەر کە بە دونبالە بێ، ئاشووبی هەیە! (٢)
ماڵی عوششاقی لە بەرگەشتەگییا کردوە خەراب
تیپی موژگانی، کە وا هەیئەتی مەغلووبی هەیە (٣)
طەڵەبی بۆسە دەکەم، صەبر دەی، دەڵێ صەبرت بێ
لەم هەموو صەبرە، دڵم طاقەتی ئەییووبی هەیە (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە بەشی (غزلهای جدیدە)ی (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) مەست: سەرخۆش. غەضەبناك: تووڕە. مەطـلّووب: داواکراو. قرمزیقەهر: تـووڕەیی و غەزەب سوور. مەغضـووب: غەزەبلێگیراو، ئەوی لێی تووڕە بوون.

واتە: چاوی مەست و خومارت کە تووڕەیی و غـەزەبی لێ دەبـارێ، داوای چـی دەکـا؟ ئـاخۆ تووڕەییەکەی سوورە و دەکێشێتەوە بۆ خوێنڕشتن، لەبەرئەوەی عاشقێکی غـەزەبلێگـیراوی وەك منی لـە بەردەستدایە؟!

(٢) دونبالـە: قنچك، شێوە كلك. ئەووەڵ: یەکەم. نیگەه: تەماشا. ئەختەر: ئەستێرە. بە دونبالـە بێ: کلکی هەبێ. ئاشووب: بەڵا و ئاژاوە.

واتە: کە لـە یەکەم تەماشادا قنچکی چاوی دڵبەرم بینی، وتم ئەستێرە کە کلکی هـەبێ و بکـشێ، نیشانەی ئاشووب و بەڵایە.

(٣) عوششـاق: کۆی عاشق، دڵداران. بەرگەشتەگی: هەڵگەڕانەوە. خـەراب: وێـران، کـاول. موژگان: برژانگ. هەیئە: شکڵ و شێوە. مەغلووب: دۆڕاو، بەزیو.

واتە: تیپی برژانگەکانی دڵبەر کـە هەڵگەڕاونەتـەوە و یـاخی بـوون، مـاڵی دڵـدارانیان وێـران کردووە و شێوەی دۆڕاویان پێ وەرگرتووە.

(تیپی) بە شێوەی (طـیپی) نووسراوە.

(٤) طەڵـەب: داوا. بۆسە: ماچ. صەبر: ئارام و ئـۆقرە. طـاقـەت: وزە و دەربـڕدن. ئـەییووب: حەزرەتی ئەیووب کە زۆر پشوودرێژ بووە.

**لە دەهەن پوستە، لە ڕوخ سێب و لەسەر سینە ئەنار!**

**سەروی مەوزوونی قەدت، سێبەری مەڕغووبی هەیە! (٥)**

**شەهـ گەداییێکە ئەگەر بەدگیلە جفتی لە کەنار!**

**شەهـ گەداییێکە کە هەمصوحبەتی مەحبووبی هەیە (٦)**

**هەوەسی بۆسە دەکا "سالم" و دڵ مانیعییە**

**خۆی کە بێشەرمە، وەلێکین دڵی مەحجووبی هەیە (٧)**

واتە: من داوای ماچ دەکەم و بە سەبر و ئارامگرتن دەڵێم دەی، کەچی دەڵێ ئارام بگرە. دڵــم زۆر ئارامی گرتووە و لـەم هەموو ئارامگرتنەدا ئەوەندەی حەزرەتی نەییووب ددانی بە خۆیدا گرتووە.

(لـەم) بە (لـە) نووسراوە، کە هەڵەی نووسینە.

(٥) دەهەن: دەم. پوستە: فندق، بستە، کینایەیە لـە لێوی یـار. ڕوخ: ڕوخـسار. سـێب: سـێو. سینە: سنگ. ئـەنار: هـەنار. مـەوزوون: ڕێـك و ترازووکـراو. قـەد: بـاڵا. مـەرغووب: پەسـەند، ئارەزووکراو.

واتە: دار سەروی ڕێك و قنج و ترازووکراوی باڵات سێ بەری پەسەندی گرتووە: دەمت بستە (فندق) واتە لێو، ڕوخسارت سێو و سنگت هەنار.

(٦) شەهـ: شا، پادشا. گەدا: هەژار. بەدگیل: بەدفەساڵ، ڕوخسارناشیرین. جفـت: هـاوجووت. کەنار: باوەش. هەمصوحبەت: هاودەم، دۆست. مەحبووب: خۆشەویست.

واتە: شا هەژارێکە، ئەگەر بەدفەساڵیش بێ، هاوجووتی خۆی لــە باوەشـدایە. شـا هەژارێکـە، دۆستی هاودەمی خۆشـەویستی هەیە.

(٧) هەوەس: ئارەزوو. مانیعییە: ڕێگریەتی. وەلێکین: بەڵام. مەحجووب: شەرمن.

واتە: سالم حەزی لـە ماچی دڵـبەرە، دڵ ناهێڵێ و ڕێگریەتی. خۆی ئەگەرچـی بێشـەرمە، بـەڵام دڵێکی شەرمنی هەیە.

(*) -٥١-

**حاڵەتی عاشق گەلێ ئەوقاتی دڵگیری هەیە**
**صوبحْدەم بۆ ئەهلی دڵ، ئەنواعی تەئثیری هەیە (١)**
**ضەربی سوجدەی ئاسْتانەت باز ڕەواجی دا بە ڕووم**
**خاکی دەرگات بۆ جەبینم حوکمی ئیکسیری هەیە (٢)**
**حاجیبت گەر بمکوژێ، ناڕۆم، بە زوڵفی تۆ قەسەم**
**لەم دەرە پێی خاطرم ئەڵبەتتە زەنجیری هەیە! (٣)**
**فیتنەجۆیە تورکی چاوت، مەیلی خوێنڕێژی دەکا:**
**ڕووبەڕووم دایم لە ڕووما تیر و شەمشیری هەیە (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) ئەوقات: کۆی وەقت. کات. صوبحدەم: کاتی بەیانی. ئەهلی دڵ: دڵداران. ئەنواع: جۆرەها. تەئثیر: کاریگەری، تینوتاو.

واتە: حاڵ و باری عاشق زۆر کاتی مایەی دڵگیراوی و ناڕەحەتیی هەیە، وەك ئەوەی کە دەمی دڵداران -لەوانە دڵی عاشق- ساغە و نزیکە لە ڕووناکیی خێر و بەرەکەت کە لە بەیانیاندا هەیە. شنەی بای بەیانی بۆنی گوڵ و گوڵزار لەگەڵ خۆیدا دێنێ و دڵی عاشق تازە دەکاتەوە، دەنگی باڵندەکانیش -بەتایبەتی بولبول- لە بەرەبەیاندا جۆش و خورۆش دەخاتە ناو گوڵزار.

(٢) ضەرب: وێنە و شێوە. سوجدە: کڕنووشبردن. ئاستانە: بەردەرگا. باز: دیسان. جەبین: تەوێڵ، ناوچاوان. حوکم: کاریگەری. ئیکسیر: کیمیا.

واتە: شێوەی کڕنووشبردنم لە بەردەم دەرگاتدا، دیسان بەها و نرخێکی دایەوە بە ڕوخسارم، چونکە ئەو خۆڵە بۆرە ڕووسپیی مەیدانی حیسابی کردم و خاکی بەردەرگات بۆ تەوێڵم حوکمی ئیکسیری هەیە کە خۆڵ دەکاتە زێڕ. بۆیە ئەو خۆڵەیش کە من سەری دەنێمە بان، بەها و گەورەییم پێدەبەخشێ.

(٣) حاجیب: برۆ. قەسەم: سوێند. دەر: دەرگا. خاطر: دڵ.

واتە: ئەگەر دەرگاوانی بەردەرگاکەت بیشمکوژێ، بە ئەگریجەکانت سوێند دەخۆم کە ئەوێ بەجێناهێڵم و ناڕۆم، چونکە دڵم لەم دەوروبەرەدا پێوەند و زنجیر کراوە.

(٤) فیتنەجۆ: ئاژاوەگێڕ. تورکی چاو: جوانیی چاو. مەیل: ئارەزوو.

**عەینی جەهلە ڕوویی دڵ گەر سوویی تەرساخوو نەکەم،**
**شێخی صەنعانیش لە ڕێگەی عیشقدا پیری هەیە (٥)**
**زاهید ئەر لافی فەصاحەت لێ بدا، باوەڕ مەکەن؛**
**بەدسروشتێکە، بە فەن صەد دام و تەزویری هەیە! (٦)**
**ئەی ڕفیقان، بێنەوە نوکتەی عەجایەب بشنەون:**
**"سالم"ی مەجنوون لە عیشقا مەیلی تەدبیری هەیە! (٧)**

واتە: چاوی جوانت ئاژاوەگێڕە، ئارەزووی خوێنڕشتن دەکا. بەردەوام تیری برژانگ و شمشێری بڕۆی بەرامبەر و لە ڕوومدا ئامادە کردووە.

دەکا (کم): ئەکا. ڕووما (کم): ڕووتا. جوانە.

(٥) عەینی: خۆی. جەهل: نەزانی. سوویی: بەرەو. تەرساخوو: خوو وەك مەسیحی.

واتە: هەر نەزانی خۆیەتی ئەگەر ڕووی دڵم نەکەمە دڵبەری ڕەوشتمەسیحی، چونکە تەنانەت شێخی سەنعانیش پێویستە پیرێکی ڕابەری لە ڕێگەی عیشقدا هەبێ.

تەرساخوو (کم): ترسا خو. (گم): تەرسا خۆ.

(٦) زاهید: تەرکیدنیاکردوو. ئەر: ئەگەر. فەصاحەت: ڕەوانبێژی. بەدسروشت: تەبیعەتخراپ. فەن: هونەر. دام: داو. تەزویر: ساختەکاری.

واتە: ئەگەر زاهیدی تەرکیدنیاکردوو لافی دینداری لێ بدا، بڕوای پێمەکەن، چونکە بەدڕەفتارە و هونەری لە داونانەوە و ساختەکاریدا هەیە.

(٧) نوکتە: قسەی نەستەق. عەجایەب: سەیر. بشنەون: ببیستن. مەجنوون: شێت. مەیل: ئارەزوو. تەدبیر: تەگبیر، ڕێوشوێن دانان.

واتە: گەلی برادەران، نوکتەی سەیر و سەمەرە ببیستن. "سالم"ی شێت و شەیدا ئارەزوویەتی لە عیشقدا تەگبیرتان بۆ بکا و ڕێوشوێنی ڕاست و دروستتان بۆ دابنێ.

نوکتە (گم): نیکتە.

## -٥٢- (*)

**چونکە ئەو گۆیی زەنەخدانی هەیە**
**قامەتم شێوەیی چەوگانی هەیە (١)**
**دڵ لە زوڵفایە بە ئوممێدی لەبی،**
**هەوەسی چەشمەیی حەیوانی هەیە (٢)**
**تەڕ بکا حەلقی منی تیشنە بە تیغ**
**ڕاستە یار ئەر سەری ئیحسانی هەیە (٣)**
**باغ و مەعدەنمە لەب و پوستانی**
**لەعلی ڕوممانیی و ڕوممانی هەیە! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لـە (مان، ن، حا، عا، غ، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) زەنەخدان: چەناگە. قامەت: بەژن و باڵا. چەوگان: گۆچان.

واتـە: لـەبەرئـەوەی یـار چـەناگەی وەك گـۆ وەهایـە، بـەژنی مـن شـێوەی گۆچـانی هەیـە و چەماوەتەوە. گۆ بە گۆچان لێی دەردێ، بەڵام ئەم شیعرە بۆ جێ و پایەی عیشق گونجاو نییە، چونکە گۆچان لە گۆ دەدرێ و دووری دەخاتەوە.

چونکە (کم): چونکی.

(٢) لـەب: لێو. هەوەس: ئارەزوو. سەرچەشمە: سەرچاوە. چەشمەیی حەیوان: سەرچاوەی ئاوی ژیان.

واتە: دڵ لـەناو تاریکستانی ئەگریجەی دڵبەردایە، هیوا و ئارەزووی گەیشتنە بە لێوی کە کانیی ئاوی ژیانە.

لـەبی (ق): لـەبت. هەوەسی (ڕ): هەوەشی. هەڵەی نووسینە.

(٣) حەلق: قوڕگ، گەروو. تیشنە: تینوو. ئەر: ئەگەر. ئیحسان: چاکە و بەخشندەیی.

واتە: ئەگەر ڕاستە یار حەزی لـە چاکەکردنە، با گەرووی منی تینوو بە خوێنی تیغی برۆی تەڕ بکا.

حەلقی منی (ڕ): خەلقی لـە متی. هەڵەیە.

(٤) مەعدەن: کان. پوستان: مەمك. لـەعلی ڕوممانی: لێوی وەك هەنار سوور. ڕوممان: هەنار، مەمك.

واتە: لێو و مەمکەکانی دڵبەر، باخ و کانیی منن؛ لێـوی وەك هـەنار سـوور و مـەمکی وەك هـەنار تورت و قوتە.

وا لە دڵیا، صەنەمم، مەیلی ڕەقیب
حەیفە وەسواسەیی شەیطانی هەیە (٥)
بە زوبان صەعبە بڵێ دەردی دڵی
هەر کەسێ دیدەیی گریانی هەیە (٦)
لە عورووجایە گڕی ناری دڵم
تا قەبات جونبوشی دامانی هەیە! (٧)
وا کە لەب بۆ سوخەن، ئەی بەحری خیرەد!
دا بڵێین: لەعلی دوڕئەفشانی هەیە (٨)

ڕوممانیی و (کم، گم): ڕۆمانی و.

(٥) نیوەی دووەمی بەیتی پاشەوە لە (حا)دا خراوەتە سەر یەکەم نیوەی ئەم بەیتە و دوو نیوەکەیتر کەوتوون.

صەنەم: بت. مەیل: حەز، ئارەزوو. ڕەقیب: بەدکار. وەسواسە: دڵەڕاوکە. شەیطان: شەیتان.

واتە: دڵبەری بتم دڵی بە بەدکاردا چووە، حەیف کە گیرۆدەی دڵەڕاوکەی شەیتان بووە!

شەیطانی (گم): شەیتانی.

(٦) ئەم بەیتە لە (ن)دا دەیەمە.

صەعبە: قورسە. دیدە: چاو.

واتە: ئەوی بگری و فرمێسك بڕێژێ، بە زمان قسەی بۆ ناکرێ. لەبەرئەوە زەحمەتە بتوانێ دەردی دڵی خۆی دەربڕێ.

صەعبە (کم، گم): قورسە. هەر کەسێ (ڕ): هەر کەس.

(٧) ئەم بەیتە لە (ن)دا نۆیەمە.

عورووج: سەرکەوتن. نار: ئاگر. قەبا: کەوا. جونبوش: جووڵە. دامان: داوێن.

واتە: تا داوێنی کەوات لەرینەوە و جووڵانی هەبێ، گڕی ئاگری دڵم بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان.

لە عورووجایە (کم، گم): لە عورووجا. گڕی (کم، گم): کزەیی. (ق): گڕەی. قەبات (کم، گم): قەبای. جونبوشی دامانی (غ): جونبوش و دامانی.

(٨) ئەم بەیتە لە (ن)دا هەشتەمە.

وا کە: بیکەرەوە. سوخەن: قسە. بەحری خیرەد: دەریای هۆش. دا: تا. لەعلی دوڕئەفشان: لێوی ئاڵ.

وەکو فیرعەونە حەبیبم بە ستەم
تا ڕەقیبی وەکوو هامانی هەیە (٩)
ڕەشکی چیهرە و لەبی تۆیانە مودام
تا فەلەك شەمس و زەمین کانی هەیە (١٠)
ئەو کەسە دەردی بە دڵ دا لە موژە
هەر لە شەهدی لەبی دەرمانی هەیە! (١١)
شێرمەردانە عەلی، بێ بە سەگی
هەر کەسێ هیممەتی مەروانی هەیە (١٢)

واتە: دەم هەڵبهێنەوە و بدوێ، ئەی دەریای عەقڵ و هۆش! با ددانەکانت دەربکەون و خەڵك بڵێن ئەو دەریایە لەعلی شەوقدار، یانێ لێوی ئاڵ و گەشاوەی هەیە.

دوڕئەفشانی (کم، گم): درەوشانی.

(٩) ئەم بەیتە لە (عا)دا نییە و لە (ن)دا حەوتەمە.

حەبیب: خۆشەویست. هامان: وەزیری فیرعەون.

واتە: دڵبەرم تا بەدکارێکی وەك هامان وەزیر و ڕاوێژکەری بێ، ئەویش لە ستەمدا وەك فیرعەون وا دەبێ.

(١٠) ئەم بەیتە لە (ن)دا شەشەمە.

ڕەشك: حەسوودی. چیهرە: چارە، ڕوخسار. مودام: هەمیشە. فەلەك: ئاسمان. شەمس: خۆر. کان: کان، مەعدەن.

واتە: تا ئاسمان خۆر و زەوی کانی مەعدەن یا کانیاوی تێدا بێ، هەمیشە ئەویان حەسوودی بە چارە و ڕوخسار و ئەمیان بە لێوی تۆ دەبا!

ڕەشکی (ڕ): ئەشکی. چیهرە (کم، گم): چارە.

(١١) موژە: برژانگ. شەهد: هەنگوین.

واتە: ئەو کەسەی وا دڵی بە تیری برژانگ بریندار و دەردەدار کرد، هەنگوینی لێوی دەرمانی دەردە.

ئەو کەسە (کم، گم): ئەو کەسەی. بە دڵ دا لە موژە (کم، گم): لە دڵدا ئەمەرە. لە موژە (حا، عا): لە موژەی. (ن، ق): بە موژە. لە شەهدی (عا، غ): شەهیدی.

(١٢) شێرمەردانە: مەردانە وەك شێر. عەلی: عەلی کوڕی ئەبوو تالیب (خ. ڕ). هیممەت:

**لیٚده وەك موورِه به ئەنگوشتی غەضەب**
**هەر کەسێ کینەیی عوثمانی هەیە (١٣)**
**نیگەهێ، ئەی شەهی مەردانی جیهان!**
**"سالم"ی غەمزەده دیوانی هەیە (١٤)**

ورە و کارامەیی.

واتە: حەزرەتی عەلی (خ. ڕ) شێر و یاریدەدەری مەردانە. ئەوی هیممەت و دڵ و دەروونی گڵاوی "مەروان"ی هەبێ، ڕیسوا بێ و ببێتە سەگی ئەو زاتە.

شێرمەردانە (عا، کم، گم): شێری مەردانە. سەگی (کم، گم): سکی.

(١٣) ئەم بەیتە لە (غ)دا دوا بەیت و لە (ڕ)دا چواردەیەم و لە (حا)یشدا لەگەڵ دوا بەیتدا پاش و پێشن.

موورِه: کەسی زۆر ڕژد، ئەبوو موورِه کە ئیبلیسە، چەکوش. ئەنگوشت: پەنجە. غەضەب: تووڕەیی. کینە: ڕق. عوثمان: عوسمانی کوڕی عەففان (خ. ڕ).

واتە: بە پەنجەی تووڕەیی وەك چەکوش بدە بە سەری هەر کەسێکدا کە ڕق و کینەی حەزرەتی عوسمانی کوڕی عەففانی لە دڵدا بێ.

موورِه بە ئەنگوشتی (کم، گم): موردە بە ئەنگوستی.

(١٤) ئەم بەیتە و ئەوی پێشوو لە (عا)دا پاش و پێشن.

نیگەهـ: تەماشا. شەهـ: شا، پادشا. غەمزەدە: خەمبار.

واتە: ئەی پادشای مەردانی جیهان بە چاوی بەزەیی تێم بڕوانە، چونکە "سالم"ی خەملێداو جێوڕێ و دیوەخان یا دیوانی شیعری هەیە.

-٥٣- (*)

دڵ لە زوڵفا بە سیاحەت هەوەسی (چین)ی هەیە
بە (سەمەرقەند)ی لەبا، نییەتی (ماچین)ی هەیە (١)
بێ بە (کیشمیر)ی ڕوخا، دەوڵەتی (ماچین)ی کە دی
بۆ (خەتا)ی طوڕڕە، دەڵێن: نافەیی موشکینی هەیە (٢)
دێ لە ڕێگەی (حەبەش)ی زوڵفەوە بۆ (میصر)ی ڕوخت
ظوڵمەتی کوفری هەمووی دی، هەوەسی دینی هەیە! (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان)دا هەیە و لە خانەی (غزلهای جدیده)دایە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) سیاحەت: گەشت و سەیران. هەوەس: حەز. چین: چینی ئەگریجە، وڵاتی چین. سەمەرقەند: شەکری بەرهەمهێنراو، وڵاتی سەمەرقەند. لەب: لێو. نییەت: نیاز. ماچین: ماچ و مووچ، وڵاتی ماچین.

واتە: دڵ ئارەزووی گەشت و سەیرانی ناو چینچینی ئەگریجە یا چوونە وڵاتی چینی هەیە. مرخی لە شەکری بەرهەمهێنراوی لێو خۆش کردووە، بۆیە نیازی ماچی هەیە، یا دەیەوێ بە وڵاتی سەمەرقەندی لێودا بگاتە وڵاتی ماچین.

(سەمەرقەند) لە هەڵە بە (ثەمەرقەند) نووسراوە.

(٢) بێ: بێت. کیشمیر: وڵاتی کیشمیر. ڕوخ: ڕوخسار. خەتا: خەتا و گوناه، وڵاتی خەتا. نافە: ناوك. میشکین: میسکدار.

واتە: ئەگەر دەستی بە ڕووی دڵبەر بگا و ماچی بە نسیب بێ، یا بێتە وڵاتی ئاوەدانی (کیشمیر) و ماچین ببینێ، لە ڕەشایی ئەگریجەدا ناوکی میسکداری دەست دەکەوێ، یا کە بگاتە وڵاتی (خەتا) ناوکی میسکداری ئاسکی ئەوێی دەبێ.

(٣) حەبەش: ڕەشایی، وڵاتی حەبەشەی ڕەشپێستان. میصر: ڕووناکایی، وڵاتی میسر. ظوڵمەت: تاریکایی.

واتە: لە ڕێی ڕەشایی ئەگریجەتەوە دێتە ڕووناکایی ڕوخسارت، وەك بڵێی لە حەبەشەوە دێتە میسر، پاش ئەوەی تاریکایی کوفر دەبینێ، ئارەزووی ڕووناکی و دینداریی دەجووڵێ.

به صەفا دێت و دەکا هەروەلە بۆ (مەروە)یی عیشق
خاری ئەو ڕاهە لە پا نەرمییی نەسرینی هەیە (٤)
بە دوعایی وەصڵ ئەبەد حەلقەیی زوڵفت دەگرێ
گەر بزانێ لەبی تۆ نییەتی ((ئامین))ی هەیە! (٥)
دڵی "سالم" بە ئەبەد سونبولی زوڵفە جێگەیی،
کە دەماغی هەمودەم مەیلی ڕەیاحینی هەیە! (٦)

(٤) صەفا: پاکی، شادی. هەروەلە: نەرمەڕاکردن. خار: درِك. ڕاه: ڕێگـە. پـا: پـێ. نەسـرین: گوڵێکی سپی و بچووك و بۆنخۆشە، دەڵێن بۆنی میـسکی هەیە.

واتە: بە پاکی و شادییەوە دێـت و وەك حـەج بکـا بـە نەرمـەڕاکردن دەچـێتە (مـەروە)ی عیـشق. درِکودالّی ئەو ڕێیە کە بە پێیدا دەچێ، وەك گوڵی نەسرین نەرمە و ئازاری نادا.

(٥) وەصڵ: بەیەكگەیشتن. ئەبەد: هەمیشە. ئامین: پەسەندکردن و لێڕازیبوون.

واتە: ئەگەر بزانێ تۆ بە تەمای بڵێی ئامین و داواکەی جێبەجێ دەکـەی، هەمیـشە دەسـت بـە ئەڵقەی ئەگریجەتەوە دەگرێ و لـە دوعا و پاڕانەوەدا دەبێ، تا بە یار بگا.

(٦) سونبول: گیایەکی گەڵادرێژ و گوڵوردی جوانە. دەماغ: لووت. مەیل: ئارەزوو. ڕەیاحین: کۆی ڕەیحان، ڕێحانەی سەوز و بۆنخۆش.

واتە: دڵی سالم بەردەوام ناو سونبولی جوانی ئەگریجەی دڵبـەر جێیەتی، هەموو کاتێك حەز دەکـا بۆنی ڕێحانەی بۆنخۆش بکا.

## -٥٤- (*)

**بۆ منی بێسەروپا، غەیری وەفا، پیشە نییە**
**بۆ دڵی من، صەنەما! جوز ستەم، ئەندیشە نییە (١)**
**تاب و ڕەنگم نییە ئەزبەسکی تکا خوێنی دەروون**
**مەیی ئەحمەر کە نەما، ڕەونەقی ناو شیشە نییە (٢)**
**چ تەکانێکە خودایا! هەرەسی هیجری حەبیب**
**بۆ نیهاڵی ئەمەلم شاخ و بەر و ڕیشە نییە (٣)**
**وام تەراشیوە بە ناخون لە غەمت، سینەیی ڕێش**
**شوهرەتی کۆهکەن و وەصفی دەمی تیشە نییە (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) بێسەروپا: بێسەرووبێ، بێدەسەڵات. غەیری: جگە لە. صەنەما: ئەی بت. جوز: جگە لـە. ئەندیشە: بیر و خەیاڵ.

واتە: جگە لە وەفا، هیچ پیشە و کارێك بۆ منی داماوی بێسەرووبێ نەمایەوە. ئەی بتەکـەم، لـە ستەم و زۆر بەو لاوە، هیچ بیر و ئەندێشەیەك بۆ دڵی من نەمایەوە.

(من) لە (کم)دا کەوتووە.

(٢) تاب: تاو. ئەزبەسکی: ئەوەندە زۆر. مەی: شەراب. ئەحمەر: سوور. ڕەونەق: درەوشانەوە.

واتە: ئەوەندە خوێن لە دەروونم داچۆڕاوە، هیچ تین‌وتاو و ڕەنگێکم نەماوە. بۆیە لەشـم لەبـەر بێخوێنی شەوق و زەوقی نییە، وەك چۆن کاتێك شەرابی سوور لەناو شووشەدا نامێنێ، شووشـەکە بە بەتاڵی ڕەونەقێکی نابێ.

تاب و (کم): ئاب و.

(٣) هیجر: دووری. حەبیب: یار. نیهاڵ: نەمام. ئەمەل: هیوا. شاخ: لق. بەر: بەرهەم.

واتە: خودایە، هەرەسی دووریی دۆست چ گوڕ و تینێکە، لە سەرەوەڕا بەسەر نەمامی هیوامـدا دێتە خوارەوە، لق‌وپۆپ و بەر و ڕەگ و ڕیشەی ناهێڵێ.

(٤) تەراشیوە: داتاشیوە. ناخوون: نینـۆك. ڕێـش: برینـدار. شـوهرەت: ناووبـانگ. کۆهکـەن: کێوهەڵکەن، فەرهاد. تیشە: تەشوێ.

**بەس بسووتێنە لە غەم "سالم"ی میسکین، کە جەفا**
**بۆ وجوودی سەر و پا لە هەموو دەم پیشە نییە (٥)**

واتە: من بە نینۆك سنگی برینداری خۆمم لـە داخی تۆ داتاشیوە. جـا خـەڵك باسـی نینۆکەکـەم ناکەن و هەر دەڵێن سالم ڕووی خۆی داتاشیوە، وەك ئەوەی فـەرهاد بـە دەمـی قـوڵـنگ و تەشـویَ بەردی لـە بێستووندا دەتاشی، کەچی هەر باسی فەرهادی کێوهەڵکەن لـە ئارادایـە و کـەس باسـی دەمی تەشوێکەی ناکا.

وام تراشیوە (کم، گم): دامتراشیوە.

(٥) میسکین: داماو. جەفا: ئازار و ئێش.

واتە: بەس "سالم"ی داماو بە ئاگری خەم و خەفەت بسووتێنە، ئێش و ئازار لـە هەموو دەمێکـدا پیشە نییە بۆ جورمی مرۆڤێك کە هەر قەوارەی سەر و پێی مابێ.

-٥٥- (*)

به ئەبەد جێگەیی من مەنزڵی جانانە نییە
ئاینەخانەیی شەه، مەسکەنی دێوانە نییە (١)
ساقییا! ساغەری من خومرەیە، نەك ڕەطڵی سەبوك
دەرخوری مەستییی من شیشەوو پەیمانە نییە (٢)
سەفەری هات و نەهاتە، هەوەسی کۆیی حەبیب
گەردی ئەو شەمعە، دڵا! طاقەتی پەروانە نییە (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، حا، عا، ج، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) ئەبەد: هەرگیز. مەنزڵ: مەڵبەند و شوێن. جانانە: یار. ئاینەخانە: ئاوێنەخانە. شەه: شا، پادشا. مەسکەن: جێی دانیشتن. دێوانە: شێت و سەوداسەر.

واتە: مەنزڵی دڵبەر هەرگیز نابێ بە شوێن و مـاوای مـن، چـونکە ئـەو ئاوێنەخانـە و کۆشـکە بلووربەندەی پادشا نابێتە جێی شێتێکی وەك من.

(٢) ساقییا: ئەی مەیگێڕ. ساغەر: پیاڵەی شەراب. خومرە: کووپەی شەراب. ڕەطل: جامی بچووکی شەراب. سەبوك: سووك. دەرخور: شایستە، لایق. شیشە: شووشە. پەیمانە: پێك و جامی مەی.

واتە: ئەی مەیگێڕ، ئەو پیاڵەیە کە شەرابی بۆ من تێدەکرێ، کووپەیـە و جـامی بـچووك نییـە، چونکە شووشە و پێك و پێوانەیەکی دیاریکراو شایستەی مەستێکی وەك من نییـە. مـن بـە کووپـە نەبێ، تێر ناخۆمەوە.

دەرخوری مەستییی من (گم): دەرخوری مەستییی مەن. بـە هەڵـە کـراوە بـە فارسـی. (مـن)ی دووەم لە (غ)دا کەوتووە.

(٣) هەوەس: ئـارەزوو. کـۆ: بـەردەرگا. حـەبیب: خۆشەویـست، یـار. گـەرد: دەوراندەور، دەوروخول. شەمع: مۆم. دڵا: ئەی دڵ. طاقەت: وزە، توانایی. پەروانە: پەپوولـە.

واتە: ئارەزووی چاوپێکەوتنی دڵبەر، سەفەری هـات و نـەهات و ڕێگـای مـردن و ژینـە. ئـەم سەفەرە ترسناکە بە هەموو کەسێك ناکرێ. ئەی دڵ، پەپوولـەیەکی بێدەسەڵات لـە وزەیدا نییـە بـە دەوری مۆمێکی وادا بسووڕێتەوە.

کۆیی حەبیب (غ، ج، کم، گم): دیدەنی یار. گەردی (ج): کڕاوی. (کم، گم): گڕی.

**ئاشْنای دوشمن و بێگانەیی خْوێشن، یاران**
**ئاشْنای ئێمە، شوکور، مەیلی بە بێگانە نییە (٤)**
**دەستی قودرەتشکەنی خستە خەمی زوڵفی کەچت**
**هونەری ماشیطەوو تەربییەتی شانە نییە (٥)**
**کوا کەریمێ بە کەرەم سوویی گەدا کا نیگەهێ؟**
**حەسرەتا، لەم طەبەقە هیممەتی مەردانە نییە!! (٦)**
**بە حەیا بێرە حوضوور و بە ئەدەب سوجدە بەرە**
**خەڵوەتی دڵبەرە "سالم!"، ئەمە مەیخانە نییە! (٧)**

(٤) ئاشنا: دۆست. خوێش: خزم و ناسیاو.

واتە: یاران، ئێوە دۆستی دوژمن و بە خزم و نزیکان بێگانەن. بەڵام شوکور بۆ خودا کە دۆستی ئێمە حەز بە چارەی بێگانە ناکا و هەر دۆستی ئێمەیە.

دوشمن (کم، گم): دوژمن. خوێشن (کم) خویشی. هەڵەی چاپە. (گم): خۆشی.

(٥) دەستی قودرەت: خودا. شکەن: شکێن. خەم: چەماوەیی. کەچ: خوار، چەماوە. ماشیطە: شانە. تەربییەت: پەروەردەکردن.

واتە: دەستی توانایی و دەسەڵاتی خودای گەورە، پێچولوولی خستە ناو ئەگریجەی خوار و چەماوەی تۆ. ئەمە نە هونەری ژنە ئارایشتکەرە و نە پەروەردەی دەستی شانەیە.

(٦) کەریم: بەخشندە. کەرەم: بەخشندەیی. سوویی: بەرەو. گەدا: هەژار. نیگەه: تەماشا. حەسرەتا: بەداخەوە. طەبەقە: چین. هیممەت: ورە و کارامەیی.

واتە: کوا بەخشندەیەك بە بەخشندەیی خۆی ئاوڕ لە هەژار و بێچارە بداتەوە و ڕەحمی پێ بکا؟ بەداخەوە، ئەم چینەی ناو کۆمەڵ هیممەتی مەردانە نانوێنێ و هیچی لێ هەڵناوەرێ.

(کا) لە (مان)دا کەوتووە.

(٧) حەیا: شەرم. حوضوور: ئامادەیی، مەیدان. ئەدەب: ئوسووڵ. سوجدە: کڕنووش. خەڵوەت: گۆشەگیری.

واتە: سالم، بە شەرمەوە بێرە حوزوور و بە ئەدەبەوە کڕنووش بۆ دڵبەر بەرە. ئەم شوێنە خەڵوەتخانەی تایبەتی دڵبەرە، مەیخانە نیـە هەموو جۆرە کەسێك سەری پێدا بکا.

## (*) -٥٦-

چونکە ئیقلیمی فیراق ئاب‌وهەوایێکی نییە
باغی پەژموردەیی دڵ نەشئونومایێکی نییە (١)
ڕووم لە میحرابی برۆ صەعبە، لە هیجرا، کەچ بێ
پادشەهـ وەك دڵی من قیبلەنومایێکی نییە (٢)
زەنگی میرئاتی دڵم شاهیدە، ئەییامی فیراق
ئاینەش بێ ڕوخی جانانە صەفایێکی نییە (٣)
نوطقی پەروانە دەبەستێ، بە یەقین، شەوکەتی شەمع
پڕ دڵی دەردە، دەسووتێت و صەدایێکی نییە! (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەرلـە (مان، ن، عا)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) ئیقلیم: هەرێم. فیراق: جیابوونـەوە. ئاب‌وهـەوا: ئاووهـەوا. پـەژموردە: سـیس و ژاکـاو. نەشئونوما: گەشە و نەشە.

واتە: لەبەرئەوەی جیابوونەوە هەرێمێکە ئاووهەوایەکی سازگاری نییە، باخی سیس و ژاکـاوی دڵ نەشونما و گەشە و نەشەیەکی بە خۆیەوە نەدیوە.

(٢) میحراب: جێی پێشنوێژ لـە مزگەوتدا. صـەعبە: قورسـە. هیجـر: دووری. کـەچ: خـوار و چەوت. پادشەهـ: پادشا. قیبلـەنوما: قیبلـەنوێن، ڕێنیشاندەر.

واتە: زەحمەتە کاتی دووریی دڵبەر، ڕووم بە خواری و چـەوتی لــە میحرابـی بـرۆی بـێ، هـیچ پادشایەك قیبلـەنومای وەك دڵی منی نییە.

(٣) زەنگ: ژەنگ، چڵکی سەر ڕووی ئاوێنە. میرئات: ئاوێنە. شاهید: شایەت. ئـەییام: ڕۆژان. ئاینە: ئاوێنە. ڕوخ: ڕوو. جانانە: دڵبەر. صەفا: پاکی و بێگەردی.

واتە: وەك چۆن ئاوێنە بەبێ ڕووی دڵبەر پاك و بێگەرد نییە، ژەنگی ئاوێنـەی دڵـی منیش لـە ڕۆژانی جیابوونەوەدا شایەتی حاڵمە.

ئاینەش (عا): ئاینەیش.

(٤) نوطق: قسە. پەروانە: پەپوولـە. بە یەقین: بێچەندوچۆن. شـەوکەت: شان‌وشـکۆ. شـەمع: مۆم. صەدا: دەنگ.

چونکه بۆ نووری وەفا تالیبە، پەروانەیی عیشق
غەیری شەمعی دڵی من، مەیلی چرایێکی نییە (٥)
صوبحی وەصڵت کەیە، تا کولبەیی من ڕۆشن کا
خۆ چرای عومری عەدوو بادی فەنایێکی نییە (٦)
زاڵی دونیا کە بەبێ عیددە بەسێ شەوهەری دی
لادە لەم فاحیشە، ئەی دڵ، کە حەیایێکی نییە (٧)
لەذذەتی وەصڵە بکا چارە، وەیا شەربەتی مەرگ
بێ یەکێ لەم دووە، دەردم چ دەوایێکی نییە (٨)

واتە: هاتنە قسەی پەروانە بەبێ ئەملاوئەولا شانوشکۆی مۆم ناهێڵێ، بە دڵی پڕ لە زووخاو و دەردەوە دەسووتێ و دەنگێکی لێوە نایێ.

(٥) نوور: ڕووناکی. تالیب: داواکار. مەیل: ئارەزوو.

واتە: لەبەرئەوەی پەروانەی عیشق داواکاری ڕووناکیی وەفای مۆمە، لە مۆمی دڵی بەوەفای من بەو لاوە، ئارەزووی هیچ چرایەکیتری نییە.

عیشق (ن): شەمع.

(٦) صوبح: بەیانی: وەصڵ: بەیەکگەیشتن. کولبە: کەلاوە. عەدوو: دوژمن. باد: با. فەنا: لەناوچوون.

واتە: ئاخۆ کەی بەیانیی بەیارگەیشتن دادێ، تا کەلاوەکەی من ڕووناك بکاتەوە، چونکە دوژمن هێزی بڕاوە و چرای تەمەنی هیچ بایەکی لەناوبردنی پێ نەماوە.

ڕۆشن کا (عا، ن): ڕۆشن کەی. فەنایێکی (ن): فەنایێکە. هەڵەی نووسینە.

(٧) زاڵی دونیا: ڕۆژگاری بێوەفا. عیددە: ئەو ماوەیە کە ژنی تەڵاقدراو یا مێردمردوو مافی شووکردنەوەی تێدا نییە. بەسێ: زۆر، ئەوەندە. شەوهەر: مێرد. فاحیشە: داوێنپیس. حەیا: شەرم.

واتە: ئەی دڵ، ڕۆژگاری بێوەفای هیچوپووچ کە هەر ڕۆژە بارێکی هەیە، جێی متمانە نییە. خۆ لەم ئافرەتە داوێنپیسە بە دوور بگرە، چونکە شەرمی نییە.

(٨) لەذذەت: چێژ و خۆشی. دەوا: دەرمان.

واتە: چارەسەری من یا بەوە دەبێ بە یار بگەم، یان شەربەتی مەرگ بنۆشم. یەکێك لەم دوو چارەسەرەم بدەرێ، دەردی من هیچ دەرمانێکیتری نییە.

**فیکری دەرکردنی بێ حاجیب ئەگەر، ظوڵمە بەسێ**
**"سالم"ی غەمزەدە، جوز ئەو دەرە، جاییێکی نییە (٩)**

(٩) حاجیب: دەرگاوان. ظوڵم: ستەم. بەسێ: زۆر. غەمزەدە: خەمبار. جوز: جگـە لـە. جـا: جێ، شوێن.

واتە: ئەگەر دەرگاوانی دڵبەر بیر لە دەرکردنی "سالم"ی خەملێداو بکاتەوە، زۆر ستەمە بۆی بچێتە سەر، چونکە لەو بەردەرگایە بەدەر شوێنێکی‌تری نییە.

## -٥٧- (*)

کاری ئاشوفتەم، دریّغا، ڕەنگی سامانی نییە
بەختی خوفتەم تا قیامەت فیکری هەڵسانی نییە (١)
سوودی کوا فیکری فەلاطوون بۆ عیلاجم «بعد ازین»؟
دەردی من دەردێکە -ئەصڵەن- قەد چ دەرمانی نییە (٢)
غەرقی فیکرێکم، بە مەللاحی خیرەد نایێمە دەر
هەر طەرەف تێدەفْکرم: ئەم بەحرە پایانی نییە (٣)
وا لە قەبضەی ئیختیاری کافرێکا، کاری من
مروەت و ئینصاف و بەخت و دین و ئیمانی نییە (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، عا)دا هەیە. ناسناوی "سالم"یشی تێدا نییە.
کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) ئاشوفتە: شێواو و پەرێشان. دریّغا: حەیف، بەداخەوە. سامان: ئارام و ئۆقرە. خوفتە: خەوتوو. قیامەت: ڕۆژی زیندووبوونەوە.

واتە: بەداخەوە، کاروباری شێواوم هیچ شێوەیەکی ئارام و ئۆقرەی پێوە دیار نییە، چونکە بەختم تا ڕۆژی قیامەت خەوتووە و بیر لەوە ناکاتەوە بێدار ببێتەوە.

(٢) فەلاطوون: ئەفلاتوونی فەیلەسووف. عیلاج: چارەسەر. بعد ازین: پاش ئەمە. ئەصڵەن: لە بنچینەدا. قەد: قەت، هەرگیز.

واتە: ئیتر پاش ئەوە بیر و بۆچوونی فەیلەسووفێکی وەك ئەفلاتوون چ سوودێکی بۆ چارەسەرم دەبێ. دەردی من لە جۆرێکە کە لە بنەڕەتدا دەرمانی نییە.

(٣) غەرق: نوقم. مەللاح: کەشتییەوان. خیرەد: عەقڵ و هۆش. طەرەف: لا. بەحر: دەریا.

واتە: وا کەوتوومەتە بیرکردنەوە و لە دەریای بیر و خەیاڵێکدا نوقوم بووم، کەشتییەوانی عەقڵ و هۆشیش ناتوانێ بمهێنێتە دەرێ. وا بیر دەکەمەوە کە ئەم دەریایە لە هیچ لایەکەوە کۆتاییی نییە و نابڕێتەوە.

(٤) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (عا)دا پاش و پێشن.
قەبضە: چنگ. ئیختیار: هەڵبژاردن. مروەت: پیاوەتی.

واتە: کاروباری من وا لە چنگی کافرێکی بێبەزەییدا، سەرپشکە چیی دەوێ بیکا. ئەو کافرە پیاوەتی و ئینساف و بەخت و دین و ئیمانی نییە.

فیکری قەبضیی ڕووی ڕەقیبم حەوصەڵەم وا تەنگ دەکا
ڕووبەڕووی تۆ غونچەیی دڵ مەیلی خەندانی نییە (٥)

(٥) قەبضی: گرژی، ترش‌وتاڵی. ڕەقیب: بەدکار. حەوصەڵە: دەربردن و ئارامی. مەیل: ئارەزوو. خەندان: پێکەنین.

واتە: کە بیر لە ڕووگرژی و ترش‌وتاڵی بەدکارم دەکەمەوە، ئارامم لێ دەبڕێ و تەنگەتیلکە دەبم. خونچەی دڵم بەرامبەر بە تۆ ئارەزووی پێکەنین و خەندەی نییە.

مەیلی (عا): ذەوقی.

(*) -٥٨-

**غەیری سەوداوو خەفەت، ئەم سەرە سامانی نییە**

**غەیری تەسلیم و جەفا، ئەم دڵە دەرمانی نییە (١)**

**دڵ لە گێژاوی یەمێکا بە شەنا مەشغووڵە**

**تاوەکوو مەددی بەصەر، ساحیل و پایانی نییە (٢)**

**مەنظەری عاشقی بێچارە عەجەب باغێکە:**

**قەت لە هیچ شاخ و گوڵ و غونچەیێ خەندانی نییە (٣)**

**وەھ لە پێچ و شکەن و نەفحەیی گێسوویی سیات**

**جەننەتیش بەم صیفەتە سونبول و ڕەیحانی نییە! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) غەیری: جگە لە. سەودا: مامەڵە، مشوورخۆری. سامان: هۆی ژیان، ئارام و ئۆقرە. تەسلیم: خۆبەدەستەوەدان. جەفا: ئێش و ئازار.

واتە: سەری من، جگە لە شەیدایی و خەفەتخواردن بۆ دڵبەر هیچ هۆیەکی ژیان و ئارام و ئۆقرەی نیە. ئەم دڵەیش لە خۆبەدەستەوەدان و ئێش و ئازار چەشتن بەولاوە، هیچ دەرمانێکیتر شك نابا.

(٢) یەم: دەریا. شەنا: مەلە. مەشغووڵ: خەریك و سەرقاڵ. مەددی بەصەر: ئەوەندەی چاو بڕ بکا. ساحیل: کەنار. پایان: کۆتایی.

واتە: دڵی من وا لەناو گێژاوی دەریایەکدا، خەریکی مەلەیە. ئەو دەریایەیش تا چاو بڕ بکا کەناری نییە و کۆتاییی نایێ.

یەمێکا (کم): بمبکا. هەڵەی چاپە. (یەمێکا)، ئەگەر (یەمێکایە) بووایە، کێشەکە ڕەوان دەبوو.

(٣) مەنظەر: دیمەن. عەجەب: سەیر. شاخ: لقوپۆپ. خەندان: پێکەنیو.

واتە: دیمەنی عاشقی داماو و دەستەپاچە لە باخێکی سەیر دەچێ، هیچ لقوپۆپ و گوڵ و خونچەیەکی دەمبەپێکەنین و ڕووخۆشی تێدا نەبێ.

(نظەری) لە هەردوو نوسخەکەدا هەڵەی چاپە و دەبێ (مەنظەر)ی بێ. (گم): نظری. (باغێکە) لە (گم) هەر چەند نوختەیەکی بۆ دانراوە. گوڵ و (کم): چڵ.

نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لەنگە، ڕاست نەکرایەوە.

(٤) وەھ: ئای. پێچ و شکەن: پێچ و چین. گێسوو: ئەگریجە. سیا: ڕەش. جەننەت: بەهەشت.

**نەوحە وا خوێنی شەپۆل دا لە تەنوورەیی دیدەم**
**نووح بە هیچ مەرتەبە لەم مەرکەزە طۆفانی نییە (٥)**
**ئەووەڵ و ئاخری دونیا وەکوو دوندان و لەبت**
**تاجیری ڕوویی جیهان لوئلوء و مەرجانی نییە! (٦)**
**قەرنەها شێوەیی نووری ڕوخی گوڵبەرگی تەڕت**
**کە نوقرەی تاجی شەهان گەوهەری ڕەخشانی نییە (٧)**

سونبول گیایەگی گوڵ جوان و خۆشڕەنگە. ڕێحان: ڕیحانە.

واتە: وای لە چین و پێچ و بۆنوبەرامەی ئەگریجەی ڕەشی تۆ، بەهەشتیش بەم شێوەیە سونبول و ڕێحانەی تێدا نییە.

(فخەیی) لە (کم)دا هەڵەی چاپە، (نەفحەیی) ڕاستە بە مانای بۆنوبەرامە. (گم): غونچەیی.

(٥) نەوحە: شین و شەپۆڕ. تەنوورە: گێژاو. دیدە: چاو. نووح: نووحی پێغەمبەر. مەرتەبە: پلە. مەرکەز: ناوەند. طـۆفان: لافاو.

واتە: شین و شەپۆڕ کارێکی کرد خوێن لە زارکی دۆڵاشی چاومەوە، یا لە گێژاوی چاومەوە، شـەپۆل بدا و سەر بکا. حەزرەتی نووح (خ. ڕ) بە هیچ پلە و پایەیەك لافاوی لەم ناوەدا نییە. ڕاستە، لافاوی نـووح بۆ سەرتاسەری جیهان بوو و هی ئەمیش هەر دڵۆپێك ئاوە. کەواتە لافاوی نووح وەك ئـەوەی سـالم نییـە. دیارە سالم مەبەستی باری ڕاستەقینەی مەسەلەکە نەبووە.

(٦) دوندان: ددان. لەب: لێو. تـاجیر: بازرگـان. لوئلـوء: مـرواری. مـەرجان: گەوهـەرێکی ڕەنگسوورە.

واتە: بازرگانی سەر ڕووی زەوی لە سەرەتاوە تا کۆتایی دنیا مرواری و مـەرجانی وەك ددان و لێوی تۆی نییە.

(٧) قەرنەها: چەندین قەرن، سەدە. نوور: ڕوونـاکی. ڕوخ: ڕوخـسار. گـوڵبـەرگ: وەك پـەڕەی گوڵ. نوگرە: هەڵەی چاپە و ڕاست (نوقرە)یە، یانێ زیو. شەهان: پادشایان. ڕەخشان: درەوشاوە.

واتە: چەند سەدەیەکە شێوەی ڕووناکی ڕوخسارت وەك پەڕەی گـوڵ تـەڕە. نـەبیـنراوە زیـوی سەر تاجی پادشایان، گەوهەری درەوشاوەی وەك ڕووی تۆی هەبێ.

کە نوقرەی (کم): کە نوگرەی. (گم): کۆنگرەی. هەڵەن. لەبەر ئەوەی مانای نیوەی یەکەم بە هی نیوەی دووەمەوە بەستراوە، دەشێ (کە نوقرەی) (وەك نوقرەی) یا هەر (نوقرەیی) بـێ. ڕەخـشان (کم): درەخشان. نیوەبەیتەکەی لەنگ کردووە.

**پیری جان‌دادە خەبەر کەن لە جەلالیی یووسف**
**قەت بە ڕەنگێ لە دلا فیکرەتی کەنعانی نییە (٨)**
**"سالم"ی غەمزەدە نازانێ نیثارت چ بکا**
**خۆ لەدەس جەوری غەمت، نەقدی دڵ و جانی نییە (٩)**

(٨) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی هەر لە (کم، گم)دا هەن.

جاندادە: گیانبەخشیو. خەبەر کەن: ئاگادار بکەنەوە. جەلال: گەورەیی. یووسف: کوڕی یەعقووب پێغەمبەر. فیکرەت: بیروڕا، خولیا. کەنعان: ناوی کۆنی فەلەستین یا (أرض موعودة)یە.

واتە: هەواڵ بۆ پیری گیانلەدەستداو بەرن کە حەزرەتی یەعقووبە (خ. ڕ). شانوشکۆ و گەورەیی حەزرەتی یووسف (خ. ڕ) بە جۆرێکە هەرگیز بیری ولاتی کەنعانی لە دڵدا نییە تا بێتەوە بۆ لای.

(٩) غەمزەدە: خەمبار. نیثار: پێشکەش، دیاری. نەقد: دراو.

واتە: سالم نازانێ چ دیارییەکت پێشکەش بکا. خۆ بەهۆی ستەمی خەم و خەفەتی تۆوە، دڵ و گیانیشی نەماوە تا پێشکەشتی بکا.

## -٥٩- (*)

گوڵ لە ڕووی طوڕڕەیی تۆ نەفحەیی یەك موویی نییە
ڕەنگ و ڕووی تۆی هەیە، وەك تۆ نەمەكیڕوویی نییە (١)
وسمە تا جەوهەری پێ داوە بە قەصدی سەری من
تیغی جەللادی قەضا بوڕڕشی ئەبروویی نییە (٢)
دڵ لە بێشەی تەنُما ماتە لەتاو دیدەیی تۆ
شێری پڕصەولەتی من طاقەتی ئاهوویی نییە (٣)
لە كەمالأیە جەمالی مەهی دووهەفتە، بەلێ
ڕووی وەكوو ڕووتە، وەلێ ناقیصە، گێسوویی نییە! (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ن)دا هەیە.

كێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) طوڕڕە: ئەگریجە، نەفحە: بۆنوبەرامە. نەمەكیڕوویی: ڕووترشوتاڵی.

واتە: گوڵ لەچاو ئەگریجەی تۆدا بۆنوبەرامەی تاڵە موویەكی قژی تۆی نییە. هەمان ڕەنگی ڕوخساری تۆی هەیە، بەلاّم وەك تۆ ڕوو ترشوتاڵ نییە.

(نەفخە)ی هەردوو نوسخەكە بۆ ئەم جێیە هەڵەیە و (نەفحە) ڕاستە.

(٢) وسمە: ڕەنگێكە ژنان برۆی پێ ڕەنگ دەكەن. جەوهەر: ڕەنگ بۆ نووسین و بەن و ڕیس ڕەنگكردن. قەصد: مەبەست. قەصدی سەر: سەرخواردن، سەر بەفەتارەدان. قەضا: قەدەر و چارەنووس. بوڕڕش: هێزی برین، برندەیی. ئەبروو: برۆ.

واتە: دڵبەر وا وسمەی لە برۆی داوە و جەوهەری دەرخستووە، تیغی جەللادی قەزا و قەدەر هێزی برینی برۆی ئەوی نییە.

(٣) بێشە: دارستان. تەنما: جەستەمدا. پڕ صەولەت: بە هەڵمەت و پەلاماری زۆر. طاقەت: وزە و حەوسەڵە. ئاهوو: ئاسك.

واتە: دڵی من وەك شێری زۆر بەهەڵمەت و پەلاماردەر وایە، لەتاو چاوەكانی تۆ خۆی لەناو دارستانی جەستەمدا مەلاّس داوە و لێ كەوتووە، تەنانەت توانایی و وزەی ئاسكیشی نییە.

تەنما (ن): تەمەنا.

(٤) كەمال: تەواوی. جەمال: جوانی. مەهی دووهەفتە: مانگی چواردە. وەلێ: بەلاّم. ناقیصە:

کاشْکی لادەبْرا حایلی بەینی من و تۆ
بەختە ئەم کارە بکا، قووەتی بازوویی نییە! (٥)
خۆت مەتۆرێنە لە طوعمەی دڵی ڕەنجیدەیی من
با نەڵێن: بازی نەظەر ڕەغبەتی تەیهوویی نییە (٦)
هەر بەسەر باغی جەمالایە، حەواڵەی نەظەرم
خانەیی دیدەیی من غورفەیی دووڕوویی نییە (٧)
با بە شێوەی ڕوخی تۆ حووری جینان ڕوو دەرخا
وەکو تۆ موویی‌میان تا بە میان موویی نییە!! (٨)

ناتەواوە. گێسوو: ئەگریجە.

واتە: مانگی چواردە جوانییەکی تەواو و بێ‌کەموکووڕیی هەیە و ڕووی وەك ڕووی تۆ وایە، بەلام هێشتا ناتەواوە، چونکە وەك تۆ ئەگریجەی نییە.

(٥) کاشکی: خۆزگە. حایل: لەمپەر. قووەت: هێز. بازوو: قۆڵ و باسك.

واتە: خۆزگە لەمپەر و ناوێنی نێوان من و تۆ هەڵدەگیرا. بەخت دەتوانێ ئەم کارە بەجێ‌بهێنێ، بەلام ئەویش هێزی بازووی نییە.

(٦) طوعمە: چەشە. ڕەنجیدە: نیگەران و تۆراو. بازی نەظەر: بازی ڕوانین. ڕەغبەت: حەز و ئارەزوو. تەیهوو: سوێسکە.

واتە: دڵی تۆراو و نیگەرانی من چەشەیە، خۆتی لێ زویر مەکە، تا خەڵك نەڵێن بازی ڕوانینی تۆ ئارەزووی سوێسکەی نییە.

(٧) حەواڵە: ڕەوانەکراو. غورفە: ژوور. دووڕوو: دوو ڕووکار.

واتە: هەر بەسەر باخی جوانیی تۆدا دەڕوانم. خانووی چاوەکانم ژوورێك نییە لە دوو ڕووکاریەوە بتوانم لێی بڕوانم و یەك ڕووە، یانێ دووڕوویش نیم.

بەسەر (ن): لەسەر.

(٨) ڕوخ: ڕوخسار. حووری جینان: پەریی بەهەشت. موویی‌میان: ناوقەد باریك.

واتە: با پەریی بەهەشت بە هەمان شێوەی ڕوخساری تۆ خۆی نیشان بدا، وەك تۆ نە ناوقەد باریکە و نە مووی پرچی ئەوەندە درێژە، بگاتە کەمەری!

نیوەی یەکەمی بەیتەکە لەنگە. «ڕوو» ئەگەر «ڕووی» بووایە، لەنگ نەدەبوو.

**نیسبەتی قامەتی تۆ ... بدەمە سەروی چەمەن**
**ڕاستە مەوزوونە، وەلێ نەوبەری لیموویی نییە! (٩)**
**لە گوڵی زەخمی جەفا بۆیی فەرەح دێتە دەماغ**
**گوڵشەنی وەك دڵی "سالم" گوڵی خۆشبوویی نییە (١٠)**

(٩) نیسبەتدان: بەراوردکرنی شتێك بە شتێکیتر. قامەت: بەژن و باڵا. چەمەن: چیمەن. مەوزوون: ڕێك و ترازووکراو. نەوبەر: بەری نوێ. لیموو: لیمۆ.

واتە: ئەگەر بەژن و باڵای تۆ لەگەڵ دارسەروی چیمەندا بەراورد بکەم، ڕاستە ڕێك و ترازووکراوە، بەڵام بەرە نوێیەکەی لیمۆیە.

نیوەبەیتی یەکەم لە هەردوو نوسخەکەدا لەنگە، وشەیەکی وەك (با) یا (چۆن) یان (گەر)ی بۆ نێوان (نیسبەتی قامەتی تۆ) و (بدەمە سەروی چەمەن) پێویستە.

(١٠) زەخم: برین. جەفا: ئێش و ئازار. بوو: بۆن. فەرەح: شادی. دەماغ: لووت. گوڵشەن: باخ و گوڵزار. خۆشبوو: بۆنخۆش.

واتە: گوڵی برینی پڕ ئێش و ئازار بۆنوبەرامەی شادیی لێ بەرز دەبێتەوە و دەگاتە لووت. ئەگینا باخ و گوڵزارێکی وەك دڵی "سالم" کەی گوڵی بۆنخۆشی هەیە؟!

## پیتی (ی)

### -١- (*)

**کارییە دەردم لە دڵدا، داد، هەی بێدادی**
**کوا حەکیمی نەبضی من، فەریاد! هەی فەریادی (١)**
**خارەموویێکە لەژێر گورزی غەما، ئەی دڵ! عەجەب**
**سەختڕوویی تا بە کەی، فوولاد! هەی فوولادی (٢)**
**تیشنەلەب با بەس طەڵەب کەم ئاوی تیغت، هەڵسە سا**
**ڕووبەڕوو گەردنکەچم، جەللاد! هەی جەللادی (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ن)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی ئەصڵەم.

(١) کاری: کاریگەر، سەخت. حەکیم: پزیشك. (فەریاد)ی دووەم، هەر بۆ جەختکردنەوەیە لە (فەریاد)ی یەکەم.

واتە: دەردی دڵی من کاریگەر و سەختە، ئای لەو ناهەقی و بێدادییەی وا بەرامبەرم دەکرێ. هەی هاوار! کوا پزیشکێك، بێت ترپەی دڵم بگرێ و سۆراخێکی دەردەکەم بکا تا بە فریام بگا.

(٢) خار: سەخت. خارەموو: پەتکی ئاڵۆزاو و قایم کە دەدرێتە بەر گەڵاکوتك. گورز: کوتەك. سەختڕوویی: ڕووقایمی، سەرسەختی. فوولاد: پۆڵا.

واتە: ئەی دڵ، سەیرە کە تۆ موویەکی سەختی لەژێر زەبری گورزی خەم و خەفەتدا، تا کەی وەك پۆڵا سەختی دەنوێنی و بەرگە دەگری؟

(خارەموویێکی) لە هەردوو نوسخەکەدا بە هەڵە بە (خارەموویێکە) نووسراوە، چونکە مەبەستی دڵە و ڕووی قسەی لەوە.

(٣) تیشنەلەب: لێوتینوو. طەڵەب: تەڵەب، داوا. جەللاد: میرغەزەب، سەربڕ.

واتە: با ئەوەندە بە لێوی تینووەوە داوای ئاوی تیغی برۆی تۆ نەکەم. ئەوەتا بەرامبەر بە تۆ ملکەچم و تۆیش جەللادی، هەستە، چی دەکەی بیکە.

جۆێباری دێ بە گۆشەی چاوْما، ئەشکی ڕەوان
جایی ئەصڵیی تۆیە، بێ، شمشاد! هەی شمشادی (٤)
چونکە ئاهووی دڵ لە کەعبەی ڕوویی تۆ پەروەردەیە
لێی مەدە تیری نیگەه، صەییاد! هەی صەییادی (٥)
"سالم"ت خستە موصیبەت، ئەی دڵی ڕیسوا! بەسە
فیتنەجۆیی تا بە کەی، ئیفساد! هەی ئیفسادی (٦)

(٤) جۆبار: جۆگەی ئاو. ئەشکی ڕەوان: فرمێسکی لەبەرڕۆیشتوو. جا: جێ. شمشاد: شمشاڵ، قەد ڕێك و باریك و بەرز.

واتە: فرمێسکی ڕەوان لە گۆشەی چاومەوە وەك جۆگەی ئاو دێتە خوار، چاوم شوێنی ڕاستەقینەی تۆیە. وەرە، ئەی بەژن ڕێك و باریکی وەك شمشاڵ.

(٥) ئاهوو: ئاسك. کەعبە: قیبلەی موسوڵمانان. صەیاد: ڕاوچی.

واتە: لەبەرئەوەی ئاسکی دڵم لەناو کەعبەی ڕووی تۆدا پەروەردە کراوە، ڕەحمی پێ بکە و تۆی ڕاوچی تیری تەماشاتی تێمەگرە، چونکە ئەو شوێنە پیرۆزە ڕاوی تێدا قەدەغەیە.

(٦) موصیبەت: بەڵا، نەهامەتی. فیتنەجۆیی: ئاژاوەگێڕی. ئیفساد: تێکدان و خراپەکاری.

واتە: ئەی دڵی پەرێشان و ڕیسوا، تۆ "سالم"ت تووشی بەڵا و نەهامەتی کرد. ئیتر بەسە، تا کەی ئاژاوەگێڕی دەکەی؟ ئەمە خراپەکارییە.

## -٢- (*)

**لە یەك سەر بێ مەحەببەت، حاصڵی کوا، غەیری دڵسەردی؟!**
**دەبێ مەعشووق و عاشق هەردو وەك یەك بن لە هەمدەردی (١)**
**ضەعیفی و قووەتی طاقەت، لە عیشقا جەوهەری شەخصە**
**لەوێدا قووەتی بازوو عەیان ناکا جەوانمەردی (٢)**
**لە دیققەت عیرقی فیکرم شل دەکا وەصفی میانی تۆ**
**بە بیکری مایەوە ذیکری، بە من نەکرا لە نامەردی (٣)**
**بە دامادی خیرەد چارەی عەرووسی وەصفی تۆ نابێ**
**لە پەردەی دڵ موعەططەل ما، بە بارێ شەرم و ڕووزەردی! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) یەك سەر: یەك لا. مەحەببەت: خۆشەویستی. حاصڵ: بەرهەم. هەمدەردی: هاودەردی.

واتە: ئەگەر خۆشەویستی لە یەكلاوە بێ، لە دڵساردی زیاتر هیچیتری لێ پەیدا نابێ. دەبێ دڵدار و یار هەردووكیان هاودەردی یەكتر بن، ئەوكاتە خۆشەویستی تام و نرخی دەبێ.

هەردو وەك یەك (ن): هەر وەكوو یەك. هەمدەردی (حا): هامدەردی.

(٢) ضەعیفی: بێهێزی. قووەت: هێز.

واتە: جوامێریی مرۆڤ لە عیشقدا بە هێزی بازوو دەرناكەوێ، چونكە گەوهەری ئەو كەسە نیشانی دەدا تا چ ڕادەیەك تین‌وتوان و هێزی عیشقی لە دڵدا هەیە و دەرد و نەهامەتییەكانی دەردەبا.

شەخصە (حا، کم، گم): فەردە.

(٣) دیققەت: وردی. عیرق: ڕەگ، دەمار. میان: ناوقەد. بیکری: كچێنی و دەستلێنەدراوی. ذیکر: باس‌وخواس.

واتە: نامەرد بووم كە پێم نەكرا وەسفی ناوقەدی باریكی تۆ بكەم، چونكە -ئەوەندە ورد و باریكە- دەماری بیركردنەوەی خاو كردمەوە و ماندووی كردم، بۆیە ئەم باس‌وخواسە هەروا بە دەستلێنەدراوی مایەوە.

لە دیققەت عیرقی (ن): لە وەقتی صەرفی. میانی (حا، کم، گم): دەهانی.

(٤) داماد: زاوا. خیرەد: عەقڵ. عەرووس: بووك. موعەططەل ما: پەكی كەوت.

**له لای من غافڵه "سالم!" ئەوی فەخری به بازوو بێ،**
**ئەگەر مەردە له ڕووی عیشقا، بدا لافی هەماوەردی! (٥)**

واته: زاوای عەقڵم هیچی لەگەڵ بووکی وەسفی تۆ پێنەکرا، بۆیه ڕووزەرد بوو و له پەردەی دڵدا بە شەرمەوە پەکی کەوت.

(٥) غافڵ: بێئاگا. هەماوەردی: دوو کەسی شەڕکردوو هەریەکەیان هەماوەردی ئەویتریانە.

واته: سالم، ئەوی شانازی بە هێزی بازوویەوە بکا، لە لای من گێل و بێئاگایە. ئەگەر مەردە، با بێتە مەیدانی شەڕی عیشقەوە و لافی هاوتایی و باڵادەستی لێ بدا.

ئەوی (کم، گم): ئەوەی. هەماوەردی (حا، کم، گم): جەوانمەردی.

(*) -٣-

**هەتا وا حەلقە بێ موشکینکەمەندی**

**ڕەها نابێ دڵم یەکدەم لە بەندی (١)**

**دەڵێی مورغی هەوایە، هیممەتی من**

**لە لای یەکسانە پەستیی و بوڵەندی (٢)**

**ئەدەب ئەسکی ئوصووڵە، چاکە یەکچەند**

**لەبەرکەم، وەك بەزەه، بەرگی لەوەندی (٣)**

**لە دونیادا نەما ئەسبابی تەمکین**

**تەمامە هەڵگرم، ئادابی ڕەندی (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، حا، عا)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) موشکین: بۆنی میسك پێوە. کەمەند: پەتی سەر بە ئەڵقە. موشکینکەمەند: کەمەندی بۆنی میسك پێوە. ڕەها: بەرەڵا. دەم: هەناسە، سات.

واتە: تا کەمەندی بۆنی میسك پێوەی ئەگریجەی یار ئەڵقە و پێچولوول بێ، دڵم بۆ هەناسەیەکیش، یا تاوێکیش، لە کۆت و بەندی ئەو ڕزگار نابێ.

(٢) مورغ: پەلەوەر. هیممەت: کارایی و پێداگری. پەستی: نزمی. بوڵەندی: بەرزی، هەڵکشان.

واتە: کارایی و هیممەت نواندنی من هێندە بەرزە، دەڵێی باڵندەیە بە ئاسمانەوە، بۆیە بەرزی و نزمیی لە لا وەك یەك وان و بەسەریاندا زاڵە.

(٣) ئەسکی: کۆن. ئوصووڵ: نەریت و ڕێوشوێن. چەند: ماوە، زەمان. بەزەه: مرۆی ناموراد و داماو. لەوەندی: خزمەتکاری، دەروێشی.

واتە: ڕەچاوکردنی ئەدەب و ڕێوڕەسم، نەریتێکی کۆنە و باوی نەماوە. ئیتر وا چاکە ماوەیەك وەك مرۆی نامراد و داماو بەرگی پەڕپووتی خزمەتکاری و دەروێشی بپۆشم.

(٤) ئەسباب: ئامراز و کەلوپەل. تەمکین: جێی قایمکردن، هێز و توانایی پێدان و قوبووڵکردن. تەمامە: بە تەمام، بە نیازم. ڕەندی: مێرخاسی، ڕووخۆشی و قسەخۆشی.

واتە: دنیا هیچ ئامراز و کەلوپەلێکی مایەی هێزو توانایی پێدانی تێدا نەماوە. لەبەرئەوە منیش نیازمە دەست لە ئادابی مێرخاسی و مەردایەتی هەڵگرم، تا ئەوەندە غەدرلێکراو نەبم.

نەما (حا): لە بۆ. تەمکین (عا): تەسکین.

-٤- (*)

دڵ لە حەلقەی چینی زوڵفت، ئەی بەسا زەنجیری دی!
سینەیی ڕێشم لە غەمزەت، بەس نیشانەی تیری دی! (١)
ئەو لە من زیاتر لەدەست عیشقت یەخەی خۆی پارە کرد
ناصیحم وەختێ لە مەشقی عاریضت تەصویری دی (٢)
باڵی موژگانی لە پەروازایە، بازی چاوی یار
خۆش لە جەولانایە، باقڵ، یەکطەرەف نەخچیری دی (٣)
ظەرفی دڵ بوو دوولەت و پوخت و پەزی فیکرم ڕژا
ڕووبەڕووی تۆ وا لە ئەبرۆ بوڕڕشی شەمشیری دی! (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، عا، غ، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتی مەحزووف.

(١) ئەی بەسا: ئای کە زۆر. بەس: هەر، تەنها.

واتە: دڵی من، ئای کە زۆر زنجیری لە ئەڵقەی چینچینی ئەگریجەتەوە تووش هات و پێانەوە بەستراپەوە! سنگی برینداریشم هەر تیری غەمزە و نیگای تۆی بە نسیب بوو.

ڕێشم (عا): زەخم. تیری (ڕ): نیری.

(٢) پارە کرد: پارچە و لەت کرد، دادڕی. ناصیحم: ئامۆژگاریکەرم. عاریض: ڕوو. تەصویر: وێنەکێشان.

واتە: ئامۆژگاریکەریشم کە خەریکی مەشقی تەماشاکردنی ڕووی یار بوو، هەر وێنەکێشانی دی و ماچێکی بۆ نەکرا، بۆیە لە من زیاتر بێزار بوو و لە تاو عیشقی یار یەخەی خۆی دادڕی.

یەخەی (ق): سینەی.

(٣) موژگان: برژانگ. پەرواز: فڕین. جەولان: سووڕانەوە و گەڕان. باقڵ: پێم وایە. یەکطەرەف: لە یەکلاوە. نەخچیر: نێچیر.

واتە: بازی چاوی یار، باڵی برژانگەکانی لە فڕیندان و بە خۆشییەوە دەسووڕێنەوە. پێموایە لە یەکلاوە نێچیری دیوە کە منم.

موژگانی (ڕ): موشکانی. بازی (ڕ): باری. هەڵەیە. خۆش (ڕ): خۆ. نەخچیری (کم، گم): نێچیری. (لە)ی (لە پەروازایە) لە (ن)دا کەوتووە.

(٤) پوخت و پەز: کوڵان و هاتنەجۆش. بوڕڕش: هێزی بڕین.

**ئیحتیرامی ئەهلی دڵ ئەفزوون دەکا، ئەندووهی عیشق**
**قەلبی بێقیمەت لە بۆتەی میحنەتا ئیکسیری دی (٥)**
**قیسمەتی تۆ هەرچی بوو "سالم!"، هەتا هاتی نەما**
**مادەری دونیا لە سستیی طالیعت وا دیری دی (٦)**

واتە: دڵ، کاتێك بەرەو ڕووت ڕاوەستام و هێزی بڕینم لـە شمشێری برۆکانتـدا بینـی، بـوو بـە دوولـەتەوە و شەقی برد و بەرهەمی ئامـادەکراوی بڕیـشم هـەڵڕژا. یـا: دەشـێ نیوەبـەیتی دووەم وا بخوێنرێتەوە: ((ڕووبەڕووی تۆ وا لـە ئەبرۆ بوڕڕشیشم شیری دی))، واتە: کاتێك هێـزی بڕینـی منـیش بەرامبەر بە تۆ شمشێری برۆکانتی دی.

ظەرفی (عا): ضەرفی. (ڕ): صەرفی. هەڵەن. (ق): فیکری. دوولـەت و پوخت (گـم): دەوڵـەت و یوخت. تۆ وا (ق): ئەودا. بوڕڕشی (گم): پێرشی.

(٥) ئەفزوون دەکا: زیاد دەکا. ئەندووه: خەم و خەفەت. قـەلب: دڵ. بۆتـە. ئیکـسیر: کیمیـا، ماددەیەکە گوایە –بە بۆچوونی پێشینان– مس و قەڵایی دەکاتە زێڕ و زیو.

واتە: خەم و خەفەتی عیشق ڕێزی دڵداران لە لای خەڵك زیاد دەکا. دڵی بێبایـەخ هـەر لـەناو بۆتەی مەینەتدا قاڵ دەبێ و ناخۆشییەکانی دەبنە ئیکسیر و دەگۆڕێن بە خۆشی.

دەکا (کم، گم): ئەکا. بۆتەی (ڕ): لویتەی. هەڵەیە. میحنەتا (کم، گم): میحنەتی.

(٦) قیسمەت: بەش. مادەر: دایك. مادەری دونیا: ڕۆژگار و زەمانە. طالیع: بەخت. دێر: درەنگ.

واتە: سالم! بەشی تۆ هەرچییەك بوو، پێ ڕانەگەیشتی و بەشت نەما. ڕۆژگار، لـەبەرئەوەی بەختت سست بوو و زوو نەهاتە دەست، درەنگ ڕوانییە مەسەلەکەی تۆ و هیـچت بـۆ نـەکرا. یـا: دایکـی ڕۆژگار لـەبەر سستیی بەختی تۆ درەنگ تۆی دی و درەنگ لـەدایك بووی، فریانەکەوتی بەشی خۆت وەربگری، بۆیە بەشەکەت خورا.

هەتا هاتی نەما (ڕ): بۆ نەما. لەنگە. مادەری (کم، گم): تا دەری. هەڵەیە. سستیی (غ): سەمتی. وا دیری (ق، کم، گم): دا دیری. هەڵەیە.

(*) -٥-

**ئەمڕۆ بە دڵبەری، شەهی هەر مەرز و کیشوەری**
**سا هەڵسە دەی بنێرە سەرت، تاجی سەروەری (١)**
**چیهرەت بە هەیبەتێکە لەناو شامی طوڕڕەدا**
**دەربێ سەحەر لە بورجی ئوفوق، شەمسی خاوەری (٢)**
**غەیری کولاهەکەت، کە هوما سایەجۆیە لەو،**
**کەس لێ نەدا، موقابیلی تۆ، لافی هەمسەری (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، هـ، ف، غ، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: موزاریعی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) شەه: پادشا. مەرز: سنوور. کیشوەر: وڵات.

واتە: ئەی دڵبەر، تۆ ئەمرۆ بە جوانیی خۆت شای هەموو وڵات و مەملەکەتێکی. دەی فەرموو هەستە، تاجی شاهانە بنێرە سەر سەرت، تا هەموومان بە دڵ و گیان فەرمانبەردارت بین.

بە دڵبەری، شەهی هەر مەرز (کم): بەو دولبەری شەهر هورمز. هەڵەیە. کیشوەری (ڕ): کەوثەری. هەڵەیە. سا هەڵسە دەی بنێرە سەرت، تاجی سەروەری (هـ): شاهی دەبێ بنێتە سەرت تاجی کیشوەری.

(٢) چیهرە: دەموچاو، ڕوخسار. شام: شەو. طوڕڕە: ئەگریجە. سەحەر: بەرەبەیان. ئوفوق: ئاسۆ. شەمس: خۆر. خاوەر: ڕۆژهەڵات.

واتە: ئەگەر خۆری ڕوخسارت بەرەبەیان لە ئاسۆوە دەربکەوێ، دەموچاوت لەناو تاریکاییی پێچولوولی قژتدا سام و هەیبەتێکی دەبێ.

هەیبەتێکە (هـ، غ، کم): هەیئەیێکە. (گم): هەیئەتێکە.

(٣) ئەم بەیتە لە (مان، هـ، ن)دا نییە، لە (ڕ)دا چوارەمە.

کولاه: کڵاو. هوما: باڵندەیەکی ئەفسانەییە، گوایە سێبەری بکەوێتە سەر هەر کەسێك، دەبێ بە پادشا. سایەجۆ: بەدوای سێبەردا گەڕاو.

واتە: جگە لە کڵاوەکەت کە هوما بە ئاواتەوەیە لە سایەیدا بیی بە شت، کەس بەرامبەر بە تۆ لافی هاوسەری لێ نەدا، چونکە هیچ نییە.

غەیری (ف، غ): غەیرەز. کولاهەکەت (کم): کولاهت. بەیتەکە لەنگ دەکا!

**ناکا کەسێ بە سەهلیی و مفتی شکاری تۆ**
**ئاهوویی دیدەمەست و طەبیعەتغەضەنفەری (٤)**
**خۆشڕەنگە خاڵی هیندوویی فەردت لە عاریضا**
**ثابیتقەدەم موقیمە لە نارا سەمەندەری (٥)**
**نەزدیکە بیی بە من لە تەماشای ئاینە**
**ئەزبەسکی دیدەمەست و نیکووڕوو و دڵبەری (٦)**
**سەرسامی ماجەرایی فەلەك بم، ئەگەر ببێ**
**سەودایی عیشقی تۆ لە سەرمدا بە سەرسەری (٧)**

(٤) ئەم بەیتە لە (ف، ڕ)دا شەشەمە.

سەهلی: ئاسانی. ئاهوو: ئاسك، مامز. غەضەنفەر: شێر.

واتە: کەس بە ئاسانی و بە خۆڕایی ڕاوی تۆی پێ ناکرێ، چونکە تۆ ئاسکی چاومەست و شێرتەبیعەتی.

سەهلیی و موفتی (ف): بە موفتی و سەهلی. (کم): سەهلی وەصفی. (غەضەنفەری) لە (مان، ن)دا (غەظەنفەری)یە، کە هەڵەی نووسینە.

(٥) ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی لە (ه)دا نین، لە (ف، ڕ)دا هەشتەم و لە (غ)یشدا شەشەمە.

هیندوو: ڕەش. فەرد: تاقانە. عاریض: ڕوو. پابتقەدەم: پێداکوتاو. موقیم: نیشتەجێ. نار: ئاگر. سەمەندەر: گیاندارێکە دەڵێن –گوایە– لەناو ئاگردا دەژی و ئاگر کاری تێناکا.

واتە: خاڵی ڕەشی تاقانەت لە ڕووتدا خۆشڕەنگە، ناجووڵێ و هەمیشە وەك سەمەندەر لەناو ئاگری ڕووتدا جێی خۆی گرتووە.

(٦) ئەم بەیتە لە (ف، ڕ)دا دەیەم و لە (غ)یشدا هەشتەمە.

نەزدیك: نزیك. ئاینە: ئاوێنە. ئەز بەسکی: ئای کە زۆر. نیکووڕوو: ڕوخسار جوان.

واتە: نزیکە وەك من عاشق بی و لە کاتی تەماشاکردنی ئاوێنەدا بیی بە من، چونکە زۆر چاومەست و ڕوخسارجوان و دڵفڕێنی.

(٧) ئەم بەیتە لە (ف، ڕ)دا نۆیەم و لە (غ)یشدا دەیەمە.

ماجەرا: بەسەرهات. سەرسەری: سەرپێیی.

واتە: ئەگەر ئارەزووی عیشقی تۆ لە سەرمدا ڕاگوزەری و سەرپێیی بێ، خودایە دوچاری دەرد و بەڵای گەردوون بیم.

**دەشکێ، بە میثلی حورمەتی من، قیمەتی نەبات**
**پۆشیدە گەر نەکەی لەبی شەهدت لە موشتەری (٨)**
**یەئجووجی غەم لە عالەمی دڵ با نەگا بە جان**
**سەدْ بەستە بێ تا بە ویصالت سکەندەری (٩)**
**خێڵی موژەت بە قەصدی دڵم حاضرن بە صەف**
**لەشکەرکەشی، هەمیشە وەکوو طووسی نەوزەری (١٠)**

(٨) ئەم بەیتە لە (ف، ڕ)دا پێنجەم و لە (غ)دا نۆیەمە.

نەبات: شیرینی. پۆشیدە: داپۆشراو. لەب: لێو. شەهد: هەنگوین. موشتەری: کڕیار.

واتە: وەك چۆن حورمەتی من شکاوە، قیمەتی نەباتیش ئاوا دەشکێ، ئەگەر لێوی وەك هـەنگوین شیرینت لە کڕیار نەشارێتەوە.

نەبات (کم): لەبت. نەکەی (کم): بەکی. هەڵەی چاپە. (گم): نەبێ. شەهدت (هـ): لەعلت.

(٩) ئەم بەیتە لە (مان، هـ، ن)دا نییە، لە (ف، ڕ)دا یازدەیـەم و لــە (غ)دا حەوتـەم و لــە (کـم، گم)یشدا نۆیەم بەیتە.

یەئجووج: یەکێکە لـەو دوو میللـەتـە کـە ئەسـکەندەر دیـوارێکی بەربەسـتی بـۆ ڕێ گـرتن لـە خراپـەکارییان هەڵـچنی. جـان: گیـان. سـەدد: بەربەسـت. ویـصاڵ: بەیـەك گەیـشتن. سـکەندەر: ئەسکەندەری مەکدۆنی.

واتە: با یەئجووجی زەرەرمەندی خەم کە لەناو دڵدایە، نەگاتە گیانم. تۆ ئەسکەندەر بە و بەربەسـت لە ڕێیدا دابنێ، تا بە تۆ بگەم.

نەکا (کم): نەگا. سەد بەستە بێ تا بە (ف): سەددی بەستە بێ کە. (ڕ): سەددی بەستە بێ.

(١٠) ئەم بەیتە لە (غ)دا پێنجەمە.

قەصد: مەبەست. صەف: ڕیز. لەشکرکەشی: لەشکرکێشی، لەشکرهێنان. تووسی نەوزەر: تووسی کوڕی نەوزەری پاڵەوانی ناسراوی ئێرانی لە سەردەمی کەیقوباد و کەیکاوس و کەیخوسرەودا.

واتە: خێڵی برژانگت بە نیازی کوشـتنم ڕیزیـان بەسـتووە، تـۆ هەمیـشە لەشکرکێـشی وەك تووسی نەوزەری.

قەصدی (کـم): قەصـد. بـە صـەف (هـ): طـەبیـب. لەشکەرکەشـی (هـ): سەرلەشـکری. (ف): لەشکرکەش. (کم، گم): لەشکرکەشن. طووسی (کم): طوولی. هەڵەیە.

**سا شەرحی وەصفی تۆ بە چ وەجهێ بکەم ئەدا؟**
**هەرچی خەیاڵی من هەیە دەیلێم و بەرتەری (١١)**
**بۆ طەییی ڕاهی مەطلەبی تۆ، سەر قەدەم دەکا**
**تۆ شاهی حوسن و "سالم"ی دڵدادە لەشکەری (١٢)**

(١١) ئەم بەیتە لە (ف)دا سێیەمە.

وەجھ: شێوە. ئەدا: جێبەجێ کردن. بەرتەر: زیاتر.

واتە: سا چۆن من بتوانم وەسفی تۆ جێبەجێ بکەم، تۆ لە هەرچییەك کە بە خەیاڵمدا دێت، زیاتری.

دەیلێم و (کم): ئەلێم و.

(١٢) ئەم بەیتە لە (ف، غ، ڕ)دا حەوتەمە.

طەی: پێچانەوە. ڕاھ: ڕێگە. مەطلەب: مەبەستی داواکراو. قەدەم: پێ. حوسن: جوانی. دڵدادە: دڵپێداو.

واتە: سەرم بۆ بڕینی ڕێی مەبەستی تۆ دەکەم بە پێ، چونکە تۆ شای جوانی و "سالم"ی دڵ بە تۆ داو سەربازێکە.

دەکا (کم): ئەکا. (ھ): بکا. حوسن و "سالم"ی دڵدادە (ڕ): حسین و "سالم"ی دڵدادە. هەڵەیە. (کم، گم): حوسنی و "سالم" بێچارە.

## -٦- (*)

**فەصڵی هیجرت ڕۆح دەکێشی، وەختی قوربت دڵبەری!**
**حەسرەتا بۆ خۆم و بەختم، هەردو سەر غارەتگەری! (١)**
**حەلقەیی زوڵفی خەمت میثلی کەمەندی ڕۆستەمە**
**کەچ نموودارە بڕۆت، وەك (ذولفیقار)ی "حەیدەر"ی (٢)**
**جوملە ئەجرامی فەلەك مەحون لە نوکتەی خاڵی ڕووت**
**مەه لە سەیری عاریضت، وەك من بە دایم موشتەری! (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ن، پ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) فەصڵ: وەرز. هیجر: دووری. ڕۆح دەکێشی: گیان دەردێنی. قورب: نزیکی. حەسرەتا: حەیف و داخ. غارەتگەر: تاڵانکەر.

واتە: دوور یا نزیك بی لێمەوە، گیانم دەکێشی یا دڵم دەبەی. حەیف و خەسار بۆ خۆم و بەدبەختیم کە لە هەردوو باردا دوچاری تاڵان و برۆی یارم.

دەکێشیٚ (پ): ئەکێشیٚ. بەختم (پ): بۆ دڵ.

(٢) خەم: چەماوە. میثل: وەك. کەمەند: پەتی درێژ بۆ گرتنەوە و بەستنەوەی ڕاکردوو. ڕۆستەم: کوڕی زاڵ و پاڵەوانی ئێران، مەبەست ئەوەیە کە کەس لە دەستی دەرناچیٚ. کەچ: چەوت، خوار. نموودار: دەرکەوتوو. (ذولفیقار): ئەو شمشێرە ناسراوەیە کە پێغەمبەر لە شەڕی بەدردا بە دەسکەوت گرتی و پاشان کە شمشێرەکەی حەزرەتی عەلی لە شەڕی ئوحوددا شکا، پێغەمبەر ئەم شمشێرەی پیٚ دا و ئەمیش ئازایەتییەکی بیٚوێنەی پیٚ نواند.

واتە: ئەڵقەی ئەگریجەی پڕ لە پێچولوولت وەك کەمەندی ڕۆستەمی زاڵ وایە، کەسی لیٚ دەرباز نابیٚ. برۆت خوار دەنوێنیٚ و وەك شمشێرە دووفاقەکەی ئیمامی عەلی بڕندە و کاریگەرە.

(٣) جوملە: تێکڕا. گشت. ئەجرامی فەلەك: ئەستێرەکانی ئاسمان. مەحو: نەماو، تێداچوو. نوکتە: نوختە. مەه: مانگ. عاریض: ڕوومەت. دایم: هەردەم. موشتەری: کڕیار، پێنجەمین و گەورەترین ئەستێرەی گەڕۆکی کۆمەڵەی خۆر.

واتە: سەرپاکی ئەستێرەکانی ئاسمان، بە هەموو ورشە و ڕووناکییەکیانەوە، لەناو نوختەی خاڵی ڕوخسارتدا ون بوون و نەماون، جوانی و ڕووناکیی ئەویان نییە. مانگیش تۆ بە جوانتر دەزانیٚ، بۆیە هەمیشە وەك من کڕیاری تەماشاکردنی ڕووی تۆیە.

**عەکسی ڕووت نەبوایە گەر، بۆچ ئابرووی بەلقیس دەبوو**
**کەی بە "جەم"یان دا لە شێوەی لێوی تۆ ئەنگوشتەری (٤)**
**مەی لەسەر مەی بۆ دەدەی ساقی مەسینە، کافییە**
**مەست و بێهۆشم لەبەر ئیمایی دیدەعەبهەری! (٥)**
**«وای بر حالم» لەبەر خوونڕێزیی موژگانی یار**
**یەك بە یەك دڵدۆزە وەك پەیکانی طووسی نەوزەری! (٦)**
**شیعری من وەك شاهیدێکە، حوسنی مادەرزادی بێ**
**عاریضی، یەکسەر لە مەکری ماشیطە و زێوەر بەری (٧)**

جوملە (پ): جورمی. هەڵەیە. خالّی (پ): خاکی. هەڵەیە.

(٤) ئەم بەیتە هەر لە (پ)دا هەیە.

بەلقیس: شاژنی سەبەئی هاوسەری سولەیمانی کوڕی داود. جەم: جەمشیدی پادشای کۆنی ئێرانی. ئەنگوشتەری: ئەنگوستیلە.

واتە: ئەگەر تۆ ڕووی خۆت دەرنەخستایە، بۆچی ئابرووی بەلقیسی شاژنی سەبەء دەچوو. کەی ئەنگوستیلەیان لە شێوەی لێوی تۆدا دەدا بە جەمشید. جەمشید و سولەیمان بە حوکمی ئەوەی کە تەخت و نگین و ملکەچیی دێو و پەری و پەلەوەر و و با دراوەتە پاڵیان، بەسەرهاتیان تێکەڵی یەکتری بووە. (دەبوو) وا ڕاست بوو (دەچوو) بووایە.

(٥) مەی: شەراب. ساقی: مەیگێڕ. مەسینە: لوولێنەی لە مس. کافییە: بەسە. ئیما: ئیشارەت. دیدە: چاو. عەبهەر: نێرگز.

واتە: مەیگێڕ، بۆچی بەردەوام شەرابم بۆ تێدەکەی و دەمدەیتێ؟ ئیتر بەسە، چونکە من سەرباری ئەوە، بە ئیشارەتی یاری چاونێرگز سەرخۆش و بێهۆش کەوتووم.

بۆ دەدەی (پ): چۆن نەدەی. مەسینە (ن): سینە. هەڵەی نووسینە. (پ): مەیێنە.

(٦) وای بر حالم: وای بە حاڵم. خوونڕێزی: خوێنڕێژی. موژگان: برژانگ. دڵدووز: دڵکونکەر، دڵسم. پەیکان: سەرە تیر. طووسی نەوزەر: تووسی کوڕی نەوزەری پاڵەوانی ناسراوی ئێرانی.

واتە: ئای بە دەست خوێنڕێژیی تیری برژانگی یارەوە ماڵوێران خۆم! سەرەتیرەکانی برژانگی وەك هیی تووسی نەوزەر یەك بە یەك دڵ دەسمن و کونی دەکەن.

خوونڕێزیی (پ): خوونڕێژیی. وای بر حالم (پ): وای بە حاڵی من. دڵدووزە (پ): خوونڕێزە.

(٧) شاهید: دڵبەر، حوسن: جوانی. مادەرزاد: زگماك. عاریض: ڕوومەت. ماشیطە: شانە. زێوەر:

دەستزەنی ئەشعاری "خاقانی"ی و غەیرم قەد نییە
قالە نیم، بدزم لە هەر سەطرێ کەلامی "ئەنوەری" (٨)
شیعری کەس نانێمە ناو صەفحەی بەیاضم تا ببم
میثلی خەڵقی نیمە -ئەصڵەن- حیلەوو ئەفسوونگەری (٩)
دڵبەری "سالم" ئەگەر بێت و بچێتە مەیکەدە
سەربەسەر بەیعەت دەکەن پێی، بتپەرستی ئازەری! (١٠)

ئارایشت و ڕازاندنەوە. بەری: بێبەری، بە دوور.

واتە: شیعری من لـە دڵـبەرێك دەچـێ جوانییەکـەی خـواکرد و زگمـاك بـێ، ڕوومـەتی هـیچ پێویستییەکی بە جوانکاری و تیوتیوەدانی وەك بەکارهێنانی شانە و ڕازاندنەوە نەبێ.

(٨) ئەم بەیتە هەر لە (پ)دا هەیە.

دەستزەن: لە خۆشیدا دەستبۆبردن. خاقانی و ئەنوەری: دوو شاعیری گەورەی ئێران. سەطـر: دێڕ. کەلام: شیعر، قسە.

واتە: هەرگیز حەز ناکەم دەست وەربدەمە شیعری خاقانی و شاعیرانیتر. لە "قالـە" ناچـم -کـە نەزانرا کێیە- تا لە هەر دێڕێکدا قسەی ئەنوەری بدزم و خۆم بکەم بە خاوەنی.

(٩) صەفحە: ڕووپەڕ. بەیاض: دەفتەری سپی. تا ببم: تا لـە ژیانـدا بم و مابمـەوە. ئەصـڵەن: لـە بنەڕەتدا. حیلـە: فێڵ. ئەفسوونگەری: جادووگەری، سیحربازی.

واتە: من تا لە ژیاندا بم، هێندە شیعری خۆمم لا بەرز و پەسەندە، هیی کەس ناخەمە ناو لاپـەڕەی سپـی دەفتەرم، چونکە هەر لـە بنچینەوە فرۆفێڵ و جادووگەریم نییە و یەکڕوو و بێغەلوغەشم.

(١٠) مەیکەدە: مەیخانە. سەربەسەر: وەك یەك. بەیعەت دەکەن: بـاوەڕی پـێ دەهێـنن. ئـازەری: پێڕەوانی ئازەری باوکی ئیبراهیم خەلیل.

واتە: ئەگەر یارەکەی سالم سەر بە مەیخانەدا بکـا، ئەوەنـدە جـوان و سەرنجڕاکێـشە، ئەوانـەی وا بتەکانی ئازەری باوکی ئیبراهیم خەلیل دەپەرستن، وەك یەك باوەڕی پێدەهێنن و دەچنە سەر دینی.

مەیکەدە (پ): بوتکەدە.

## -٧- (*)

## (زفاف درويش اغا)

موورغی دڵ بۆ سەیری شایی، وا لە سینەمدا فڕی
بۆ صەدای تەپڵی عەرووسی وا دەواڵم هەڵبڕی (١)
ئاغە مەیلی هەمسەری بوو، زۆری هەوڵ دا، عاقیبەت
چارەنووس ئەنگوشتنوما بوو، پەردەیی شەرمی دڕی (٢)
بێوەیێ قورب و جیواری بوو لە نەزدیك خانوەکەی
ظاهیرەن ئاغا بە وەصفی بەرقی ڕووبین دایبڕی (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، عا، ف، غ، کم، گم)دا هەیە. سەرناوەکەی لە (مان، ن)دا زەماوەندی دەروێش ئاغایە. لە(عا)یشدا نووسراوە: (در زفاف درويش آغا انشا شده)، واتە بۆ بووكگواستنەوەی دەروێش ئاغا وتراوە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) مورغ: باڵندە. عەرووسی: بووکێنی. دەواڵ: تیلمەچەرمی تەپڵلێدان و دەهۆڵکوتان.

واتە: وا باڵندەی دڵم لە سنگم هاتە دەر بۆ تەماشای شایی و ئاهەنگ. وا منیش تیلمەچەرمی تەپڵلێدانم بەرز کردەوە تا دەنگدانەوەی تەپڵی بووکێنی ببیستم.

شایی (عا، ن): شادی. لە سینەمدا (غ): لە سینەم. لەنگە.

(٢) ئاغە: ئاغا. مەیل. ئارەزوو. هەمسەر: هاوسەر، ژن. عاقیبەت: سەرەنجام. ئەنگوشتنوما: پەنجەبۆڕاکێشراو.

واتە: ئاغا حەزی لە ژنهێنان بوو، زۆر هەوڵی دا و سەرەنجام چارەنووس پەنجەی بۆ ڕاکێشا و شەرمی نەما.

ئاغە (کم، گم): ئاغا. هەمسەری (کم، گم): هامسەری. زۆری هەوڵ دا (کم، گم): زوو هەوای دا. نیوەی یەکەم لەنگە.

(٣) قورب: نزیکی. جیوار: دراوسێیەتی. نەزدیك: نزیك. ظاهیرەن: بە ڕواڵەت. بەرق: برووسکە. ڕووبین: پۆڵایین.

واتە: بێوەژنێ دراوسێ و نزیکی خانووەکەی بوو، ئاغا خستیە لاوە و وەك برووسکەی پۆڵایین دایبڕی.

**نامزەد طالیب بە پوول بوو، ئاغە هیچی شکنەبرد**
**زەردگۆش‌ئاسا فەریبی دا، بەبێ هیچ گوێی بڕی (٤)**
**هەر وەکوو تەڵقینی کوردی، ئاغە کورتیی کردە کار**
**بێ مەلا و قاضی، لەوێ دەردەم بۆ خۆی مارەی بڕی (٥)**
**نییەتی وا بوو بینای عەیش و نیشاط ئامادە کا**
**پیرەژن، مردووی مرێ، هات گێچەڵی بۆ خۆی کڕی (٦)**
**مەجمەعی جەمعاوەری بوون بۆ شەوئاهەنگی زەفاف**
**تووننشین و توورفرۆش و تەپلە چوارگوێ و گەرگەری (٧)**

قورب و (کم): قرتوت. (گم): فەرتوت. ظاهـیرەن ئاغـا بـە وەصـفی بـەرقی ڕووبـین (ف): ظاهیرەن ئاغا بە وەصفی بوق رویین. (کم، گم): ظاهیر ئاغا بۆ صەفی بۆق ڕووی بینی. هەڵەیـە. هەموو نوسخەکان (بووق)یان نووسیوە، کە مانای کەڕەنا، شـەیپووری ڕاوچـی کـە نێـچیری لـە جێیەکەوە پێ ڕاودەنێ بۆ جێیەکی‌تر، چادری گەورەی هـەن و بـۆ ئێـرە نـاگونجێن. زیـاتر دەبـێ (بەرق) بووبێ، بە تایبەتی کە (ڕووبین)یشی بەدوادا هاتووە.

(٤) نامزەد: نـاوبراو، مەبەسـت بێوەژنەکەیـە. طالیـب: داواکـار. پـوول: پـارە. زەردگـۆش‌ئاسـا: وەك خراپەکار و دووڕوو. فەریبی دا: فریوی دا.

واتە: ئەو ماڵە کە ناویان بۆ هەڵدابوو، پارەیان دەویست، ئاغایش نەیبوو. ئیتر ئاغا بە دووڕوویـی فریوی دان و لە خشتەی بردن.

نامزەد (ف، کم): ئافرەتی. پوول بوو (ن): پوول و. زەردگووش‌ئاسا (ف، کم): ڕێوی ئاسا.

(٥) کورتیی کردە کار: بە کورتی بڕیـەوە. دەردەم: دەسـت‌بەجێ.

واتە: ئاغا قسەی لـە کورتی بڕیـەوە و بەبێ مەلا و قازی مارەی ژنەکەی لـە خۆی بڕی.

ئاغە کورتیی (عا): ئاغە کرنی. هەڵەیە. (ن): کورتیی. لـەنگە. (کم): ئاغا کورت و. کردە کار (غ): کرد لـە کار. لـەوێ دەردەم (کم): لـەوێدا زوو. (بۆ) لـەبەر کێش‌ڕاگرتن، دەبێ بە (بو) بخوێنرێتەوە.

(٦) بینا: ماڵ، جێی تێدا ژیان. عەیش: گوزەران. نـیشاط: چالاکی.

واتە: ئاغا دەیویست ژیانێکی خۆش بۆ خۆی ساز بکا، کەچی پیرێژن گەڕی پێ کرد.

(٧) مەجمەع: کۆڕ. جەمعاوەری: کۆبوونـەوە. زەفـاف: چـوونە پـەردەی زاوایـەتی. توونـشین: توونچی. گەرگەری: ئاوارە و دەربەدەر، ناوی خێڵێکی کوردیشە.

لەقلەق و نێری چراچی بوون و دۆمە چەپڵەژەن
بەستەگۆ بوو "بانەیی"، "ڕەوحە" مەقاماتی چڕی (٨)
هەر کە دەرکەوت مەشعەلی بووك، ئاغە هاتە هاتوچۆ!
وەك نەهەنگ ئەوزاری گرتە مست و تەختی هەڵبڕی (٩)
بێوە بووك بوو هاتە بەر بان، ئاغە تێڵای گرتە مست
باتەقای قامیش لەسەردا دای بە سەریا و لێی‌خوڕی (١٠)

واتــە: توونــچی و تــوورفرۆش و تەپلەلەســەری ئــاوارە، کــۆڕی کۆبوونــەوەی بــوون بــۆ زەماوەندی شەوانەی زاوایەتی.

بوون (ف): بوو. شەوئاهەنگی زەفاف (گم): شەوئاهەنگ و زەفاف.

(٨) لەقلەق: حاجی لەقلەق. نێری: حــەیوانە کێوی، شــاخداری نێر. چراچی: ئەوانەی وا چــرا لــە پێش بووکدا هەڵدەگرن. چەپڵەژەن: چەپڵەلێدەر. بەستەگۆ: بەستەبێژ. "بالــەنێ یــا بالــەنی"ی نوســخەی (مان)، لە (ن)دا "بانەیی"یە. ئەم ناوە لە پارچەشیعری «رزم عزیز بگ بابان.. بەیتی ٤٥»ی پیتــی (ن)یــشدا بەم شێوەیە هەیە. "ڕەوحە" یا "ڕۆحە": ساغ نەبووەوە، دەبێ ناسناوی مەقامبێژێك بێ.

واتە: حاجی لەقلەق و حەیوانەکێوی چرابەدەست بوون و دۆمیش چەپڵەلێدەر بوو، "بانــەیی"ی بەستەبێژ بەستە و "ڕەوحە"ی مەقامبێژیش مەقامیان دەوت.

لەقلەق و نێری (کم، گم): لەق دەنێرێ. هەڵەیــە. چــەپڵەژەن (عــا، غ، کــم): چەپڵەچــی. (ف): چیلەچی. چیلە بە مانای وردەدار و پووش بۆ ئاگرکردنەوە. بەستەگۆ "بالەنی" بوو، "ڕەوحە" (عا، غ): بەستەگۆ بوو بالەنی، ڕەوحە. (ف): بەستەگۆ بالانی بوو، ڕەوحە. (کم): بەستەك و بالانی بــو ڕوحــە و. (گم): بەستك و بالایی بۆ ڕوحە و.

(٩) ئەم بەیتە لە (ف، کم، گم)دا نییە.

مەشعەل: مەشخەڵ. ئەوزار: ئامراز، کینایەیە لە دەعباکەی. مست: پڕبەپڕی لەپی دەست.

واتە: هەر کە مەشخەڵی بووکێ دەرکەوت، ئاغــا کەوتــە خــۆ و جــووڵا، کــەمێك هەڵپــەڕی و دەعباکەیی لە مست نا.

(١٠) باتەقا: بارتەقا، بەقەدەر، بەرانبەر.

لە کوردەواریدا نەریت بووە کە بووك هێنراوەتە ماڵی زاوا، زاوا لـە بەردەرگادا نەرم چــڵاکێکی بە سەردا کێشاوە. ئاغایش پێڕەوی ئەو نەریتەی کردووە.

بێوە بووك بوو (ف): بێوەیی بووك. بەر بان (کم، گم): بەری بان. ئاغە (ف، کم، گم): ئاغا. مست

**سوورنشینان چادری سووریان بەسەر بووکا کێشا**
**پیرەژن، پیری نیهانی، کەوتە ڕەوتی کوڕکوڕی (١١)**
**بووکێ چوو دانیشت و ئاغە زوو لە سەربان هاتە خوار**
**لنگی بووکی وەك چەلیپا، لام ئەلف لا، هەڵبڕی!! (١٢)**
**سووری ئاغە سەیری خۆشە، سووری خۆشی سەڕخرە**
**سوور لە سوورا سەرڕەقیی کرد، تیکی طوممانی دڕی!! (١٣)**
**ئاغە سەیری کرد لەوێدا، داخوا بووکێ چی دەکا؟**
**بەربوکی بەدبەخت صەدای دا: ئاشەوان! ئاشت گەڕی! (١٤)**

(کم، گم): مشت. لەسەردا دای بە سەریا و (کم، گم): لەسەردانی بەسەریا. ناتەواوە.

(١١) ئەم بەیتە لە (مان، عا، ن، غ)دا نییە.

سوورنشینان: خەڵکانی ئامادەی شایی و ئاهەنگ. پیری نیهانی: پیری نهێنی. کوڕکوڕی: شێوە کوڕکوڕ، وەك قەتێ.

واتە: شایکەران تارای سووریان بەسەر بووکێدا دا، پیرێژنیش وەك قەتێ کەوتە جووڵە.

(١٢) ئەم بەیتە لە (غ)دا چواردەیەمە.

چەلیپا: خاچ.

واتە: ئاغا هاتە خوارێ و لنگی بووکێی هەڵبڕی و لێ‌نیشت.

بووکێ (کم، گم): بووك. ئاغە (ف، کم، گم): ئاغا. زوو (ن): زو. هەڵەی نووسینە. چەلیپا (کم): چەلیپای.

(١٣) ئەم بەیتە لە (غ)دا پازدەیەمە.

(سوور)ی یەکەم: شایی و ئاهەنگ. (سوور)ی دووەم: دەعباکەی ئاغا. (سوور)ی سێیەم: هەمان دەعبا. (سوور)ی چوارەم: دەعبای بووکێ. تیك: تەقەڵ، دروومان. طوممان: تەومان، ژێردەرپێ.

واتە: شاییەکەی ئاغا خۆشە، دەعباکەی سەرخرە و هەستا، تەقەڵی درووومانی دەرپێی دڕاند.

ئاغە (کم، گم): ئاغا. خۆشی (ن، کم): خۆیشی. لە سوورا (کم): لە سووردا. طوممانی دڕی (ن، غ): تەومانی دڕی. (کم): تی کوت و نانی بڕی. (گم): تێی کوتا نانی بڕی. هەڵەن.

(١٤) ئەم بەیتە لە (مان، عا، غ)دا نییە.

صەدای دا: بانگی کرد، هاواری لێ کرد.

واتە: ئاغا گوێی لێ بوو بەربووك پێی دەڵێ ئاشت گەڕاوە.

**دەستەکی هاتە تەحەڕڕوک، گینگڵی خوارد وەك حەفی**
**ڕێگەیی دەربەندی بەست و کەف لە زاری دەرپەڕی!! (١٥)**
**هاتە جونبوش سەرپەتی، هەروەك چناری (ماسیدەر)**
**دەستێکی هێنا بە ملیا، کەوتە فیکری کوڕکوڕی (١٦)**
**چۆکی دادا وەك هوزەبر و لەندەهووریی زۆری کرد**
**ماڵی وێرانم، وەکوو جاوی نەشۆراو دایدڕی! (١٧)**
**ئاغا موضطەڕر و موجەڕڕەد بوو کە پیاویش سەڵتوقوڵت**
**شەرطی یەك‌عەهدی لە بەینی هەردولایان هەڵگڕی (١٨)**

داخوا (ف، کم): داخۆ. دەکا (کم): ئەکا.

(١٥) ئەم بەیتە لە (غ)دا دەیەمە، لە (ف)یشدا نییە.

دەستەك: کینایەیە لە دەعبای ئاغا. تەحەڕڕوك: جووڵە. گینگڵی خوارد: پێچی خوارد. حەفی: ماری درێژ. دەربەند: دەعبای بووکێ.

واتە: دەعبای ئاغا هاتە جووڵە و پێچی خوارد، ڕێی ناو دەعبای بووکێی گرت.

دەستەکی (کم): دەستێکی. گینگڵی (کم): گینگەڵی. بەست (کم، گم): گرت. حەفی (کم، گم): هەبی. هەڵیە. دەرپەڕی (عا): دەربڕی. هەڵیە.

(١٦) ئەم بەیتە لە (غ)دا یازدەیەمە، لە (ف)یشدا نییە.

جونبوش: جموجووڵ. سەرپەتی: سەرڕووت. ماسیدەر: ناوی دێیەکی بەری (گەرمك)ی ناوچەی پێنجوێنە، (مەریوان)یش دێیەکی بەو ناوەوە هەیە. کوڕکوڕی: لافلێدان.

واتە: دەعبای ئاغا وەك چناری ماسیدەر بەرز بوو، دەستێکی پێدا هێنا و کەوتە سەر بیری لافلێدان.

ماسیدەر (کم، گم): ماسیەر. فیکری (کم، گم): ڕەوتی.

(١٧) هوزەبر: شێری دڕندە. لەندەهوور: کەتەی زەبەلاح. جاو: شاڵی لە داوە لۆکە.

واتە: ئاغا وەك شێر هاتە سەر چۆك و زۆری زۆرداری کرد، دەعبای بووکێی دادڕی.

وەك هوزەبر و لەندەهووریی (کم): ئاغا هەروەك لەندەهوور و. ماڵی وێرانم (ف): ماڵی وێرانی. جاوی (گم): چاوی.

(١٨) ئەم بەیتە لە (مان، عا، ن، ف، غ)دا نییە.

موضطەڕ: ناچار. موجەڕڕەد: ڕووتوقووت. شەرط: مەرج. یەك‌عەهد: یەكپەیمانی، هاوپەیمانی. هەڵگڕی: نەما.

**نیم نهێبی دا بە مەطرەق، نیم دەقیقەی پێ نەچوو**
**نیم ڕەمەق بوو بووکەکە، دێوئەردەڵان جەرگی بڕی! (١٩)**
**بووکێ بێخود، ئاغە مەست، بەربووك بە ئەنگوشت هاتە خۆی**
**دەستەخوشکی دا بە گان، گۆبەندی گێڕا و دەرپەڕی!! (٢٠)**

واتە: ئاغـا ناچـار و ڕووت بـووەوە و بـووكێش بـە سـەڵتی مایـەوە. ئـیتر مـەرجی هاوپـەیمانی لەنێوانیاندا نەما.

کە پیاویش (کم): کەیبانوویش. (ئاغا) بڕگەیەکی کورتە، بە (ئاغە) دەخوێنرێتەوە.

(١٩) ئەم بەیتە لـە (غ)دا دوازدەیەمە.

نیم: نیو. نهێب: نەعرەتە و هاوار، هەڕەشە یا جووڵاندن بۆ کـارێ، تـرس و بـیم. مـەطـرەق: چەکوش، دەعبای نێرینەی پیاو. ڕەمەق: هەناسـە، گیـان. دێوئـەردەڵان: کینایەیـە لــە بـەهێزی و گەورەیی دەعبای پیاو.

واتە: ئاغا نیوە هاوار و هەڕەشە و ترسێکی نایە بەر دەعباکەی خۆی، هەر نیو دەقیقەیێکی پـێ چـوو. نیوەگیان بوو و دەعباکەی جەرگی بووکێی بڕی.

بووکەکە، دێوئەردەڵان (ف): دەستەکی دیوار پەڕەی. (کم): دەستەکی دیواربڕی.

(٢٠) بێخود: بێهۆش. ئەنگوشت: پەنجە. گۆبەند: کێشە و ئاژاوە. بەزم و شادی.

واتە: بووکێ بێهۆش و ئاغا مەست بوو، بەربووکیش کە ئەو حاڵەی دی، بەربووە خۆی و هەڵات.

بووکێ (ن، گم): بووك. ئاغە (کم): ئاغا. ئەنگوشـت (کم، گم): ئەنگوست.

(*) -٨- (*)

**بەس موشكیلە زاهید! بگەیە عیشقی حەقیقی**
**بۆ شوغڵی طەریقەت، هەیە صەد سیڕڕی ڕەقیقی (١)**
**تا شێوەیی مەرجان نەگْرێ لوئلۆی ئەشكت**
**بەو موزدە جەفا كەی دەكْرِێ، لێوی عەقیقی؟! (٢)**
**بو عوذری گوناهانی گوزەشتەم لە خەجاڵەت**
**كوا نوطقی زوبانم، كە بكەم ذیكری تەریقی (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، ف، غ، كم، گم)دا هەیە.

كێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەبی مەكفووفی مەحزووف.

(١) بەس: زۆر. موشكیلە: كێشەیە، گیروگرفتە. زاهید: تەركیدنیاكردوو. عیشقی حەقیقی: خۆشەویستیی ڕاستەقینە كە خۆشویستنی خودایە. شوغڵ: كاروبار. سیڕ: نهێنی و ڕاز. ڕەقیقی: ناسكی و وردی.

واتە: ئەی تەركیدنیاكردوو، زۆر كێشەیە تۆ بگەیتە پلەی خۆشەویستیی ڕاستەقینە كە خۆشویستنی خودایە، چونكە ئەوە لە ڕێی تەریقەتەوە دەبێ كە كاروبارەكانی سەد ڕاز و نهێنیی ورد وردیان تێدایە، یا سەد ڕازی بەندایەتی و خزمەتكردن هەیە كە تۆ نەتكردوون و نایشیانكەی.

بەس (كم، گم): زۆر. پیتی (ڕ)ی (ڕەقیقی) لە (مان، ن)دا كەوتووە، بەڵام (دەقیقی) گونجاوترە.

(٢) مەرجان: گەوهەرێكی ڕەنگسوورە. لوئلوء: مرواری. ئەشك: فرمێسك. موزد: كرێ. جەفا: مەینەت و ئازار. عەقیقی: وەك عەقیق، مەبەست سوورە.

واتە: تا مرواریی سپیی فرمێسكت سوور نەبێ و نەبێتە خوێن و شێوەی مەرجان نەگرێ، تۆ دەرهەق بەو مەینەت و ئازارەی وا دەیانچێژی، ناگەیتە لێوی سووری دڵبەر، یا لێوی دڵبەر ناگەزی، چونكە كرێی سووربوونی فرمێسكی تۆ كەمە و بایی ئەو مەینەتە نیە كە دەبێ بیچێژی تا بگەی بە لێوی سوور.

نەگرێ (كم): ئەگرێ. (گم): دەگری. بەو موزدە جەفا كەی دەكرێ (ف): بەو موزدە جەفا كەی دەگەزێ. (كم، گم): بۆ موزدی جەفا كەی دەگرێ.

(٣) عوذر: بەهانە. گوزەشتە: ڕابوردوو. خەجاڵەت: شەرمەزاری. نوطق: قسە. ذیكر: باس. تەریقی: تەریقبوونەوە، شەرمگرتن.

واتە: من لە شەرمەزاریی بەهانەهێنانەوە بۆ گوناه و تاوانەكانی ڕابوردووم، كوا زمانم هەیە باسی تەریقی و شەرمگرتنی خۆم بكەم؛ یا: ناتوانم زیكرێ وەك هی ئەهلی تەریقەت بكەم تا بزانم تەریقەت

وا هاته تەلاطوم لە دڵا بەحری مەحەببەت
دەرناچێ لە یادم بە چ دەم، بیمی غەریقی (٤)
بەینی من و بێگانە تەفاوت کە لە میهرا
گەر ڕاستە: لەگەڵ من، صەنەما! یار و ڕەفیقی (٥)
بەم نەوعەیە، گەر وەختی ئەلەم، فیکری غەریبت
"سالم!" ئەمە هەذیانە، نەوەك شیعری سەلیقی! (٦)

بە ڕاستی چییە و چۆنە.

بۆ عوذری گوناهانی (کم، گم): بۆ گوناهانی. لەنگە. (عوذری) کەوتووە. کوا نوطقی زوبانم (ف، کم، گم): کوا قووەتی نوطقم.

(٤) تەلاطوم: شەپۆلدان. بەحر: دەریا. مەحەببەت: خۆشەویستی. دەم: کات. بیم: ترس. غەریقی: خنکاوی.

واتە: وا دەریای خۆشەویستیی دڵ هاتە شەپۆلدان. هیچ کاتێك ترسی خنکانم لەیاد ناچێ.

(طەلاطوم) لە (مان، ن)دا هەڵەیە و (تەلاطوم) ڕاستە. بە چ (کم): بە حی. هەڵەیە.

(٥) تەفاوت: جیاوازی. میهر: خۆشەویستی. صەنەما: بتەکەم. ڕەفیق: هاوڕێ.

واتە: ئەی بتەکەم، لە خۆشەویستیدا جیاوازی لە نێوان من و بێگانەدا بکە، ئەگەر ڕاستە یار و هاوڕێی منی.

لە میهرا (غ): لە میهر. لەنگە.

(٦) ئەلەم: ئازار. فیکر: بیر. غەریب: نامۆ، دوور لە یار. هەذیان: (هَذَیان)ی عەرەبییە، وڕێنە. سەلیقی: سروشتی، ئاسایی.

واتە: سالم ئەگەر بیر و بۆچوونی سەیر و نامۆی تۆ لە کاتی ئازارچەشتندا بەم جۆرە بێ، ئەمە وڕێنەیە، نەك شیعرێکی عادەتی و باوی بە سەلیقەوە نووسراو.

بەم نەوعەیە، گەر (ف): بەم نەوعە، ئەگەر. گەر وەختی ئەلەم، فیکری غەریبت (ن): گەر وەقتی ئەلەم، فیکری ڕەقیبت. (کم، گم): بەم نەوعە کە وەختی ئەمەلە فکری ڕەقیبت. لە (مان، ن)دا نووسراوە (هەزیانە) کە ڕاستییەکەی (هەذەیانە)یە.

-٩- (*)

نەیدەبەست زاریع، ئەزەل، توخمی مەحەببەت، کاشکی
توخمی عیشقی کەم دەکرد، دیهقانی قودرەت، کاشکی! (١)
گەر قەڵەم بەد لێ درا بۆ بەختی من، ڕۆژی ئەزەل
هەر نەبوومایە لە مادەر بۆ موصیبەت، کاشکی! (٢)
تا لە یەك دووری دەکەن ڕۆح و جەسەد، وەختی مەمات
بۆ میانی یار و من نەبوایە فیرقەت، کاشکی (٣)
بۆ دەوایی دەردی صەعبی من، حەکیم ئەمری دەکرد
بۆسەیی لەعلی لەبت تەنخواهی شەربەت، کاشکی! (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ن)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) نەیدەبەست: نەیدەمەیاند. زاریع: وەرزێر، جووتیار. ئەزەل: سەرەتا، لەپێشەوە. توخم: تۆو. مەحەبەت: خۆشەویستی. کاشکی: خۆزگە، هەموو (کاشکی)یەکان لە ڕووی مانـاوە شـوێنیان لـە سەرەتای بەیتەکاندایە. دیهقان: فەلاح. قودرەت: توانایی.

واتە: خۆزگە وەرزێر و جووتیار لە سەرەتای دروستبوونی دنیاوە تۆوێکی کەمی خۆشەویستییان بچاندایە، تا عاشقان وا گرفتار و سەرگەردان نەبوونایە.

(٢) قەڵەم: نەمام، دارۆکەی بێڕیشە بۆ ڕواندن. بەد: خراپ. مادەر: دایك. موصیبەت: بەڵا.

واتە: وەك لە ئەووەڵ ڕۆژەوە قەڵەمی بەختی من بە خراپی لێ درا، خۆزگـە بـۆ ئـەم مەینـەت و بەڵایە لەدایك نەبوومایە.

(٣) جەسەد: جەستە. مەمات: مردن. میان: ناوقەد، نێوان. فیرقەت: لێكجیایی.

واتە: خۆزگە تا ئەو دەمەی مردن کە گیان لە جەستەم دەردەهێنن، دەستی من لە ناوقەدی یـار دوور نەکەوتایەتەوە، یان دووری و لێكجیایی لە نێوان من و ئەودا ڕووی نەدایە.

(٤) دەوا: دەرمان. صەعب: قورس، سەخت. حەکیم: پزیشك. بۆسە: مـاچ. لـەعل: بـەردێکی گرانبەهایە. لەب: لێو. تەنخواه: لەباتی. شەربەت: خۆشاو.

واتە: خۆزگە پزیشك فەرمانی دەدا، لەباتی خۆشـاو، ماچـی لـەعلی لێـوت ببێـە دەرمـانی دەردی سەختی من.

**طوولی مەجنوونیی بیابان، طەبعی وەحشیی داوە پێم**
**ڕێم دەکەوتە کۆیی لەیلا بەعدی غوربەت، کاشکی! (٥)**
**یاری ظالمخەصڵەتم شێوەی جەفایە ماه و ساڵ**
**هەفتەیێ دەیگرتە دڵ ڕەسمی مەحەببەت، کاشکی! (٦)**
**کۆیی تۆ ڕەوضەی بەرینە، صەعبە بۆ "سالم" گوزەر**
**دەرنەدەکرا تا حەشر ئادەم لە جەننەت، کاشکی! (٧)**

(٥) طوول: درێژایی. مەجنوونی: شێتی، حاڵ وەك هی مەجنوون. طەبع: تەبیعەت، مۆرك و شەقڵ، وەحشی: کێوی. کۆ: بەردەرگا، ئاستانە. لەیلا: یاری مەجنوون. بەعد: پاش. غوربەت: غەریبایەتی، نامۆیی.

واتە: ئەوەندە بە شێتی یا وەك مەجنوون لە بیابان و سارادا ماومەتەوە، ئەو درێژاییی مانەوەیە تەبیعەتێکی کێوی و نامۆی لە لا پەیدا کردووم. خۆزگە پاش ئەم غەریبایەتییە ڕێم دەبردەوە بەردەرگای ماڵی لەیلا و پێی دەگەیشتمەوە.

(٦) ظالمخەصڵەت: بە خەسڵەت زۆردار. جەفا: ستەم. ماه: مانگ. ڕەسم: ڕێوڕەسم.

واتە: خۆزگە ئەم یارە بە خەسڵەت ستەمکارەم کە بە درێژاییی مانگ و ساڵ هەر ستەم و ناهەقیم لێ دەکا، تەنیا حەفتەیەك پێڕەویی ڕێوڕەسم و نەریتی خۆشەویستیی دەکرد.

مەحەببەت (ن): مرووەت.

(٧) ڕەوضە: باخچە. بەرین: بەربڵاو. ڕەوضەی بەرین: بەهەشت. گوزەر: تێپەڕین. حەشر: ڕۆژی قیامەت. ئادەم: بابە ئادەم. جەننەت: بەهەشت.

واتە: بەردەرگای ماڵی تۆ وەك بەهەشت وایە، کە هەموو کەسێك پێی تێنانێ و شوێنی گوناهباران نییە، بۆیە زەحمەتە "سالم" بتوانێ پێیدا تێبپەڕێ. خۆزگە ئادەم تا ڕۆژی قیامەت لە بەهەشت دەرنەدەکرا و دەمایەوە، تا ئێمەیش هەر لە بەهەشت بمانایەتەوە.

## -١٠- (*)

**به یادی ڕووی دڵارامی؛ صەفایە، نەشئەیە، ڕامی**
**«بیا ساقی! بدە جامی کزان یابم سرانجامی» (١)**
**لە طورڕەی زوڵفی شەبڕەنگا مەپۆشە ڕوویی خورشیدت**
**«کە در عشقت پس از عمری برون آوردەام شامی» (٢)**
**دەکا شیرین لە خەشما تەڵخگۆییی لێوی شیرینت**
**«دعا گر نیست، خوش‌وقتم ز گفتارت بدشنامی» (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، ج، ڕ، کم، گم)دا هەیە. لە (مان، ن)دا خراوەتە خانەی (ملمعات). فارسییەکەی، لای "حافظ" و "سەعدی" و"جامی" و چەند شاعیریتر نەبوو، دەبێ هیی "سالم" خۆی بێ، بەتایبەتی کە ناسناوی خۆیشی لە دواینبەیتدا داناوە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) واتە: بە یادی ڕوخساری دڵبەرێکی دڵئارامکەرەوە، دەستمۆییەکەی خۆشی و نەشئەیە. ساقی وەرە جامێك مەیم بدەرێ، تا سەرەنجامێکی خێرم لێیەوە دەستبکەوێ.

صەفایە، نەشئەیە، ڕامی (کم): صفا نشئەی رامی. (گم): صەفا.. نەشئەی دامێ.

(٢) طورڕە: ئەگریجە. شەبڕەنگ: شەوڕەنگ، لە ڕەنگی شەو چوو. خورشید: خۆر.

واتە: ڕوخساری شێوەخۆرت لەناو پێچولوولی ئەگریجەی وەك شەو تاریکتدا دامەپۆشە، با ئەگریجەیشت دیار بێ و ڕوخساریشت ڕووناکی بداتەوە. منیش پاش عومرێکی درێژ و ڕەنجکێشان لە عیشقتدا، ئێوارەیەکم ڕۆژ کردووەتەوە، یا ئێوارەیەکی ڕوو لە تاریکیم ڕووناك کردووەتەوە و شارەزاییم هەیە. بەو کارەی تۆ دنیام لێ تێكناچێ.

شەبڕەنگا (ج): خورشید. لەنگە. برون (ن، کم): بروز. پس (ڕ): بس. عمر (گم): چندی.

(٣) خەشم: ڕق و تووڕەیی. تەڵخگۆیی: قسەی تاڵ کردن.

واتە: لێوە شیرینەکەت، لە کاتی تووڕەییتدا، چ قسەیەکی تاڵ و تفت بە دەمتدا دێ، شیرینی دەکا. مادەم وایە، ئەگەر تۆ دوعای خێرت پێ نییە بۆ مـن، ڕازیـم کاتێکی خۆش بە جنێوی ناو گوفتارتەوە بەسەربەرم. یانێ تۆ قسە بکە، ئیتر هەرچییەك دەڵێی باشە.

لێوی (ج، ڕ، کم، گم): لەعلی.

**بلاّ ئاهم دەمێ بێغەم لە دڵدا بێتە دەم ساتێ**
**«کە بی هجر جگرسوزت بە سربردیم ایّامی» (٤)**
**لە پاداشی حوقووقی ڕەنج و خیدمەتهایی دێرینم**
**«چە خواهد شد ز رحمت بر زبان آرد زُ من نامی» (٥)**
**لە سەرگۆشیی مودامی گۆشەوارەت وەختە عاجز بم**
**«نمیدانم کە دارد از کە بر گوش تو پیغامی؟» (٦)**
**صەبا عەططار و جا گوڵزار و ساقی یار و بێئەغیار**
**«بیا "سالم!" غنیمت دان، بکش بر یاد جم جامی» (٧)**

(٤) بلاّ: با.

واتە: لێگەڕێ با ئاهم بێخەم ماوەیەك لە دڵمەوە بێتە ناو دەمم، چونکە ڕۆژانێکمان لەگەڵ دووریی جگەرسووتێن ڕابواردووە، چی دەبێ ئەگەر ساتێکیش ئاسایش و ئارامیمان بۆ دەرکەوێ.

دەمێ بێغەم (ڕ): دەچێ مونعیم. (گم): دەمی بێغەم. دەم (گم): دەر. ساتێ (ن، ج، ڕ): سا بێ. بی هجری (ج، کم، گم): با هجری. ئەمە ڕاستە.

(٥) حوقووق: ماف. خیدمەتها: خزمەتی زۆر.

واتە: چی دەبێ ئەگەر لە پاداشت و ئەمەکدانەوەی مافی ڕەنج و خزمەتی زۆری لەمێژینەمدا، ڕەحم بکەی و ناوی منت بە دەمدا بێ؟!

ڕەنج و (ڕ): ڕەنجی. خیدمەتهایی (کم، گم): خزمەتهایی. آرد (ڕ، کم، گم): آری.

(٦) سەرگووشی: چپە. مودام: هەمیشە. گۆشەوارە: گوارە. عاجز. زویر، دڵتەنگ.

واتە: خەریکە لە چپەی بەردەوامی گوارەکانت کە بە لای گوێچکەتدا شۆڕ بوونەتەوە و بە پەنامەکی قسەت بۆ دەکەن، زویر ببم. نازانم لە کێوە پەیامێکی بۆ گوێی تۆ پێیە؟

لە سەرگووشیی (ج، ڕ): بە سەرگووشیی. دارد از کە (کم، گم): وارد کرد.

(٧) صەبا: بای بەیانی. عەططار: وشکەفرۆش. جا: جێ، شوێن. ساقی: مەیگێڕ. ئەغیار: بێگانە.

واتە: بای بەرەبەیان عەتارە و بۆنی خۆش بە تایبەتی لەلای دڵبەرەوە دێنێ. شوێنەکەیشمان گوڵزارە و مەیگێڕ یار و دۆستە و بێگانە لە ئارادا نییە. سالم وەرە ئەم هەلە بقۆزەرەوە و بە یادی جەمشیدەوە جامێك مەی بخۆرەوە.

یار و (کم، گم): یار.

-١١- (*)

بۆ پاسی ڕوو لە طوڕڕەیی موو، ماری ئەرقەمی
چین چین حەصاری بەستووە، هەر سوو بە مەحکەمی (١)
جوز خاڵی تۆ کە لالەیی دڵ داغْدارە لەو
کێ دیی ئەبەد لە کونجی لەبا عەیشی هەمدەمی؟! (٢)
مەنناعە بۆ طولووعی سەحەر، شەو لە بەختی من
ئەی بادی صوبحْدەم! وەرە سا لابە پەرچەمی (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، ه، غ، ڕ، ق، کم، گم)دا هەیە.
کێشی عەرووز: موزاریعی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) پاس: پاسەوانی، پارێزگاری. طوڕڕە: ئەگریجە. ئەرقەم: ماری شڵ، پیسترین جۆری ماری کوشندەیە. حەصار: دیوار. هەر سوو: هەر لا. مەحکەم: قایم و پتەو.

واتە: ماری ئەرقەم، بۆ پارێزگاریی ڕوخسارت لە پێچولوولی مووی ئەگریجەت، چین بە چین لە هەموو لایەکەوە بە قایمی دیواری بە دەوری ڕووتدا کردووە.

ڕوو (حا): دڵ. طوڕڕەیی موو (ه): طوڕڕە وەکوو. (ق): طوڕڕە و موو. (گم): طوڕڕەیی تۆ. چینچین (ه): سەیری چۆن. حەصاری (عا، ڕ): حەساری. بەستووە (کم): بەستوو. هەڵەی چاپە.

(٢) جوز: جگە لە. کونج: گۆشە. لەب: لێو.

واتە: لە خاڵی دەوری لێوت بەولاوە کە داخی لێوتی لە دڵدایە، کێ ژیانی دۆستایەتی و هاودەمی لە گۆشەی لێوی تۆدا دیوە!

لالەیی دڵ داغدارە لەو (ه): لالە دڵی داغدارە بۆی. (ق): داغدارە لەوێ لالەیی چەمەن. (کم): لە لای دڵ داغدار لەو. (گم): لالە دڵی داغدارە لەو. ئەبەد لە کونجی لەبا (ق): لە کونجی لەب بە ئەبەد. (ه، گم): ئەبەد لە کونجی نەفس. (کونجی) لە هەموو سەرچاوەکاندا وایە، تەنها لە (مان)دا (کنجی)یە، کە (گەنجی)ش هەڵدەگرێ.

(٣) مەنناعە: ڕێگرە. طولووع: دەرکەوتن، ئەنگووتن. سەحەر: بەرەبەیان. باد: با. صوبحدەم: کاتی بەیانی.

واتە: لە بەختی من شەوی زوڵفی دڵبەر ڕوویی داپۆشیوە و ناهێڵێ دەرکەوێ. ئەی بای کاتی بەرەبەیان، وەرە پەرچەمی یار لە ڕووی لادە.

**زەخمم کە ئەشکەبووسییە، نازانێ حاڵەتم**
**نەیدیوە هەر کەسێ لە موژەت تیری ڕوستەمی (٤)**
**گوڵ نایەوێ لە بولبولی شۆریدە غەیری مەرگ**
**عاشق شوعووری بێ، ئەمەتە شیققی ئەسلەمی (٥)**
**نەزدیکە گەر جەوابی فیغان، خەندە بێتە گوێم**
**نازانی دەردی دڵ چ دەکا؟ تۆ کە بێغەمی (٦)**

بادی (حا): بادە. هەڵەی نووسینە.

(٤) ئەم بەیتە لە (ه)دا نییە.

زەخم: برین. ئەشکەبووس: پاڵەوانێکی شانامەیە. لە شەڕی (هەماوەند)دا بە دەستی ڕۆستەم کوژراوە. موژە: برژانگ.

واتە: برینی من لەو برینانە دەچێ کە بە "ئەشکەبووس"ی پاڵەوانەوە و هیی دەستی ڕۆستەم بوون. هەر کەسێك تیری ڕۆستەمانەی لە برژانگەکانی یارەوە نەدیبێ، نازانێ حاڵی من چۆنە. (هەر کەسێ) بکەری (نازانێ) و (نەیدیوە)یە.

زەخم کە (کم): زامم. ئەشکەبووسییە (ن، کم): ئەشکەپووسیە. (گم): ئەشکەپووسی. نەیدیبێ (گم): نەیدیوە.

(٥) شۆریدە: شێواو و پەرێشان. شوعوور: هەست. شیقق: بەش و لا. ئەسلەم: عاشقێکی لە پێناوی عیشقدا فەوتاو، سەلامەتر.

واتە: گوڵ هەر مردنی بۆ بولبولی پەرێشان دەوێ. دلبەرانیش هەر دەیانەوێ عاشق بکوژن. عاشق ئەگەر هەستی هەبێ، ئەمەیە بەشە هەرە سەلامەتەکەی ئەم کارە، یا ئەمەیە مەشقی عیشقی ئەسلەمیانە (کەسێکی وەك ئەسلەم).

شیققی (کم، گم): مەشقی. (ق): تیری.

(٦) فیغان: هاوار و ناڵە.

واتە: نزیکە بەرامبەر بە هاوار و ناڵەی من، پێکەنین و گاڵتەی دلبەر بێتە گوێم. تۆ کە بێخەم و بێئاگای، چووزانی دەردی دڵ چی بە عاشق دەکا!

تۆ کە (ه): کاکە. هەڵەیە.

**بۆچی دەبێ کە عەرضەیی "سالم" بەری نیهان**
**ئەی دڵ، کە تۆ بە خەڵوەتی جانانە مەحرەمی؟! (٧)**

(٧) عەرضە: عەرزوحاڵ، سکاڵا و داد. نیهان: بە دزیەوە، پەنامەکی. خەڵوەت: گۆشەگیری. جانانە: خۆشەویستان، دڵبەران. مەحرەم: دۆست و نزیك.

واتە: ئەی دڵ مادەم تۆ مەحرەم و ڕێپێدراوی خەڵوەتخانەی یاری، بۆچی نابێ بە پەنامەکی داد و سکاڵای سالمی بۆ بەەی؟!

-١٢- (*)

**ڕاستە، ئەی زوڵفْ! سییەهمارانی**

**حاریثی گەنجی ڕوخی یارانی (١)**

**سونبول ئاشوفتەیە، ئەی طوڕڕە! لە ڕەشك**

**تا لەسەر چیهرەیی یار ئەفشانی (٢)**

**مایەیی فیتنەیی، ئەی نەفسی پەلید!**

**بۆ خەلیفەی دڵی من "مەروان"ی (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، ﻫ، ف، غ، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشیی مەخبوونی ئەصڵەم.

(١) سییەهمار: ڕەشمار. حاریس: پاسەوان. گەنج: گەنجینە. ڕوخ: ڕوو، ڕوخسار.

واتە: ئەی ئەگریجەی ڕەش، ڕاستە تۆ ڕەشماری و بەسەر گەنجینەی ڕووی یارانەوە پاسەوانی، بۆیە وا نیشتوویتە سەری و چەماویتەوە.

(حاریثی) لە (مان، ن، ق)دا هەڵەیە و (حاریسی) ڕاستە. (ف): بە حاریسی. لەنگ دەبێ ڕوخی یارانی (حا): رحمی یارانی. هەڵەیە. (ڕ): ڕوخی جا یارانی هەیە. (هەیە) بە هەڵە خراوەتە سەر کۆتایی هەردوو نیوەبەیت.

(٢) ئاشوفتە: شێواو. ڕەشك: حەسوودی. چیهرە: ڕوخسار. ئەفشان: بڵاو.

واتە: ئەی پێچولوولی ئەگریجە، سونبول شێواو و پەرێشانە و حەسوودیت پێ دەبا، تا تۆ بەسەر ڕووی یاردا بڵاو بوویتەوە.

سونبول ئاشوفتەیە (حا): سونبولی ئاشوفتەی. (کم): سونبول ئاشوفتە بە. لەسەر (ن): بەسەر. چیهرەیی (کم، گم): چارەیی.

(٣) ئەم بەیتە لە (حا، ﻫ)دا نییە.

فیتنە: ئاژاوە. پەلید: ناپاك، چەپەڵ.

واتە: ئەی دەروونی ناپاك و چەپەڵ! -مەبەستی ڕەقیبە- تۆ مایەی ئاژاوە و ئاشووبی. تۆ بۆ خەلیفەی پیرۆز کە دڵە، بوویی بە مەروان کە بوو بە مایەی نەهامەتی بۆ حەزرەتی عوسمان (خوای لێ ڕازی بێ). تۆیش بوویی بە هۆی ئائارامیی دڵ و نێوانی دڵ و یارت بە قسە و هاتوچۆ تێکداوە.

مەروانی (کم): مەر دانی. (گم): مەروانی. هەڵەن. (دڵی) لە هەردووکیاندا کەوتووە.

**جەوری یارم وەکو "فیرعەون"ـە، ڕەقیب!**
**تۆش لە پەهلوویی ئەوا "هامان"ی!! (٤)**
**بێ شەکەرخەندەیی تۆ، بێجانم**
**ئەی لەبی دڵبەری من! مەرجانی؟ (٥)**
**مەرتەبە و پایەیی تۆ، من بەڵەدم**
**«دُرّة التّاج»ی سەری شاهانی (٦)**
**بە ئیشارەی موژە "سالم!" بدە جان**
**با نەبی نادیمی نافەرمانی! (٧)**

(٤) پەهلوو: پاڵ، پەنا.

واتە: ستەم و جەوری یار وەك هی "فیرعەون"ـە، ڕەقیب تۆیش لەپاڵ ئەودا بووی بە «هامان» کە وەزیرێکی نامەرد و ناپیاو و فیتنەباز بوو و زیـانی لـە خـەڵك دەدا و فیرعـەونی هەڵـدەنا بـۆ ئیـشی خراپ، تۆیش بۆ نامیهرەبانیی هەڵدەنێی.

پەهلوویی (کم، گم): پالوویی. ئەوا (ق): ئەوای.

(٥) شەکەرخەندە: خەندەی وەك شەکر شیرین. جانم: گیانم. لەب: لێو.

واتە: ئەی دڵبەر، بەبێ خەندە و بزەی وەك شەکر شیرینت، من بێگیانم. ئەی لێـوی دڵبەرەکـەم تۆ وەك «مەرجان»ی، یانێ گەوهەرێکی وا بەنرخی کە من بە خولیای زەردەخەنەی تۆوە بێگیانم. یـا: ئەی لێوی دڵبەرەکەم مەگەر تۆ گیانی «جانی»، بۆیە من بەبێ خەندەی تۆ بێگیانم.

(٦) مەرتەبە: پلە. بەڵەد: شارەزا.

واتە: ئەی یار، یا ئەی لێوی مـەرجانیی یـار، مـن ئاگـادار و شـارەزای پلـە و پایـەی تـۆم. تـۆ گەوهەری تاجی سـەری پادشایانی.

مەرتەبە و .. تاد (هـ، ف): مەرتەبەی پایەیی تۆ، من بەڵەدم. (ڕ): مەرتەبەی پایەیی تۆ، من بـەڵام. هەڵەیە. التّاجی (کم): لتاجی. دەبێ هەڵەی چاپ بێ.

(٧) موژە: برژانگ. جان: گیان. نادیم: پەشیمان.

واتە: سالم، هەر بە ئیشارەتی برژانگەکان، گیانی خۆت تەسلیم بکە بە دڵبەر. با لەبـەر سەرپێـچی و نافەرمانیکردنی داوای دڵـبەر، پەشیمان نەبیتەوە.

موژە (ف): منە. نادیمی (غ): نادیم و. (کم): تا دمی. هەڵەیە.

## -١٣- (*)

**هیلاکی عیشقتم جاناوو دەشزانم کە دەیزانی**

**«کە هم نادیدە می‌بینیّ و هم ننْوشتە می‌خوانی» (١)**

**بە کوێریی دوشمنی بەدخوو، شەوێ با بێمە ئاغۆشت**

**«نبیند چشم نابینا، خصوص، اسرار پنهانی» (٢)**

**دڵی ڕەندانی ئاشوفتە لە طوڕڕەی زوڵفت ئاسوودەن**

**«نگر تا حلقهٔ اقبال ناممکن نجنبانی» (٣)**

**لە بەختی ئەبتەری من، عەیشی خەڵوەت طووڵی هەر کەم بوو**

**«بدان قدر وصال ای دل! کە در هجران فرومانی» (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ن)دا هەیە و لەناو (ملمّعات)دا دانراوە. تێهەڵکێشەکە لەگەڵ تەنها شەش بەیتی شیعرێکی "حافظ شیرازی" کراوە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتی تەواو.

(١) هیلاك: ماندوو. جانا: گیانەکەم، نادیدە: نەبینراو. ننوشتە: نەنووسراو. میخوانی: دەخوێنیتەوە.

واتە: گیانەکەم، من بە دەست عیشقی تۆوە ماندوو بووم و دڵنیام کە تۆیش ئەوە دەزانی. تۆ هەم شتی نەبینراو دەبینی و هەم شتی نەنووسراو دەخوێنیتەوە.

بە کوێریی (ن): بە کێوریی.

(٢) ئاغۆش: باوەش. نبیند: نابینێ. چشم: چاو. اسرار: ڕاز و نیاز. پنهانی: نهێنی.

واتە: با شەو بە کوێرایی چاوی دوژمنی بەدڕەوشت بێمە باوەشت. چاوی نابینا بەتایبەت ڕاز و نیازی شاراوە نابینێ.

(٣) ڕەندان: عاشقانی بێباك و کەمتەرخەم. ئاشوفتە: پەرێشان. طوڕڕە: پێچولوول. نگر (نیگەر): سەرنج بدە. نجنبانی (نەجونبانی): نەجووڵێنی.

واتە: دڵی عاشقانی بێباك و سەوداسەر لەناو پێچولوولی ئەگریجەتدا ئارامیان گرتووە و حەواونەتەوە. ئاگادار بە ئەڵقەی بەخت کە گوارەکەتە، بە شێوەیەکی نەگونجاو نەجووڵێنی.

(٤) ئەبتەر: ناتەواو. عەیش: خۆشگوزەرانی. خەڵوەت: خەڵوەکێشان و تەرکی‌دنیاکردن. طووڵ: درێژایی. بدان: بزانە. قدر: قەدر و بەها. وصال: بەیەك‌گەیشتن. هیجران: دووری. فرومانی: دابمێنی، ڕابمێنی، بێچارەیی، بێدەسەڵاتی و دەستەپاچەیی.

**ئەگەر گێسوو پەرێشان کەی بە سوجدەت، زاهیدان ڕاهیب؛**
**«کە از هر حلقەاش هردم هزاران بت بیفشانی» (٥)**
**کە ڕابورد ڕەنجی مەهجووری، دڵا! ئەییامی وەصڵیش دێ**
**«بکَش دشواری غربت بە یاد عهد آسانی» (٦)**
**خەفەت بەستوویە ڕێی شادی بە ڕووی دڵما لە شەش لاوە**
**«خدایا یك نفس با ما گره بگشا ز پیشانی» (٧)**

واتە: خۆشگوزەرانیی خەڵوەکێشانم لەبەر بەختی ناتەواوم درێژەی نەکێشا. ئەی دڵ، نرخ و بەهای بەیارگەیشتن بزانە، لە کاتێکدا لە حاڵی دووریدا دەستەپاچە و بێچارە ماویتەوە.

نیوەبەیتە فارسییەکە هیی "حافظ" نییە.

(٥) گێسوو: ئەگریجە. سوجدە: کڕنووشبردن. زاهید: تەرکیدنیاکردوو. ڕاهیب: ڕێبەری دینیی مەسیحی. هردم: هەمیشە. بیفشانی: بڵاو دەکەیتەوە.

واتە: ئەگەر لە کاتی کڕنووشبردندا ئەگریجەت بئاڵۆسکێ و بڵاو ببێتەوە، زاهیدان بەو هەزاران بتەی کە لە پێچ و لوولی ئەگریجەتدا بڵاو دەبنەوە، دەبنە ڕاهیب.

(حلقەاش هردم) لە لای حافظ (رقعهٔ دلقش)ە.

(٦) مەهجووری: دوورکەوتنەوە. دڵا: ئەی دڵ. ئەییام: ڕۆژان. وەصڵ: بەیەكگەیشتن. بکش: بکێشە. دشواری: نارەحەتی. غربت: غەریبی. بیاد: بە یادی. عهد آسانی: ڕەچاوکردنی سەردەمی مرۆڤایەتی.

واتە: ئەی دڵ، کە ڕەنج و مەینەتی دوورکەوتنەوە بەسەرچوو، ئیتر ڕۆژگاری بەیارگەیشتن دێ. بە یاد و خەیاڵی ئەو سەردەمەوە کە کاروبارت بە ڕەحەتی بۆ جێبەجێ دەبێ، نارەحەتیی غەریبی بکێشە.

(غربت) لە لای حافظ (منزل).

(٧) با ما: لەگەڵ ئێمەدا. گره: گرێ. بگشا: بکەرەوە. ز پیشانی: لە ناوچاوانەوە.

واتە: خەم و خەفەت لە شەش لاوە ڕێی شادیی لە دڵم گرتووە. خودایە هەر بۆ هەناسەیەك گرێی ئێمە لە ناوچاوانتدا بکەرەوە، یانێ ڕووگرژ مەبە.

(بەستوویە) بە هەڵە بە (بەستیویە) نووسراوە. (خدایا یك نفس با ما) لە لای "حافظ" (خدارا یك نفس بنشین)ە.

**خەیاڵی دەستڕەسیی ئەو زوڵفە، "سالم!"، باعیثی سەرمە**
**«نگر تا حلقۀ اقبال ناممکن نجنبانی» (٨)**

(٨) دەستڕەسی: دەست پێ ڕاگەیشتن. باعیث: مایە، هۆ.

واتە: سالم، ئەگەر بە خەیاڵیش دەستم بگاتە ئەگریجەی یار، ئەوە مایەی سەرتێداچوونمە. ئاگادار بە، ئەلقەی بەخت بە شێوەیەکی نەگونجاو نەجوولێنی.

نیوەبەیتی دووەم لە بەیتی سێیەمیشدا هەیە و دووبارەکراوەیە، دەبێ هەڵەی ڕوونووسکەرەوە بێ.

-١٤- (*)

غەرقە لە دڵم پەیکان پەیوەستە لە موژگانی

«چاك است گریبانم از چاك گریبانی» (١)

بێهوودەیە، ئەی عاقڵ! دێوانە دەکەی زەنجیر

«عمریست پریشانم از زلف پریشانی» (٢)

شەوقی مەه و ڕووی دڵبەر، کەوتوونە جەدەل دیسان

«ای کاش برون آیند یك روز بە میدانی» (٣)

جەمعن لە پەرێشانی دڵهاوو خەمی زوڵفت

«زیبَد کە زنی، جانا! صد گوی بە چوگانی» (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، ه، غ، ج، ڕ، کم، گم)دا هەیە، لە (مان، ن)دا خراوەتە خانەی «ملمعات». فارسییەکەی هەر هی "سالم" خۆیەتی و ناسناوەکەیشی لە دواین‌بەیتدا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەب.

(١) پەیکان: سەرەتیر. پەیوەستە: هەمیشە. موژگان: برژانگ. چاك: لەت. گریبان: یەخە.

واتە: سەرەتیری بەردەوامی برژانگی یار لە دڵمدا نوقوم بووە. یەخەم لە عیشقی کچێکی یەخەکراوە، وا لەت بووە و دادڕاوە.

چاك است گریبانم (کم): چاکست چاکی گریبانم. لەنگە.

(٢) بێهوودە: بێ‌سوود.

واتە: ئەی هۆشیاری ژیر، تۆ بەبێ سوود شێت زنجیر دەکەی و دەیبەستیتەوە.

زلف (گم): زوڵفی. وا نییە.

(٣) شەوق: درەوشانەوە. مەه: مانگ. جەدەل: گفت‌وگۆ. کاش: خۆزگە. برون آید: بێتەدەر.

واتە: تریفەی مانگ و ڕوخساری تۆ کەوتوونەتە گفت‌وگۆ و ململانێ. بەڵام خۆزگە مانگ هەر لە دوورەوە قسەی نەدەکرد و ڕۆژێك نزیك دەبووەوە و دەهاتە مەیدانی ڕووی تۆ، تا بمانزانیایە ڕووی هەیە بەرامبەرکێ لەگەڵ تۆدا بکا.

شەوقی مەه و ڕووی دڵبەر (غ): شەوقی مەه و ڕوخسارت (ه، ج، کم، گم): شەوق و مەهی ڕوخسارت. کەوتوونە جەدەل (ه): کەوتوونە جەلا. (کم): کەوتنە جەدەل لەنگ دەبێ. «ڕوخسارت» لە (کم)دا (ڕ)یەکەی کەوتووە. بە میدانی (کم): بە میدنی.

(٤) ئەم بەیتە و ئەوی پێشوو لە (کم، گم)دا پاش و پێشن.

**غەیری ئەلەمی هیجرت، یادی چ بەشەر ناکەم**

**«در عشق تو بشکستم صد عهد به پیمانی» (٥)**

**بۆ چارە، دڵی بیمار دامانی وەفا دەگرێ**

**«شاید که به دست آرد از لعل تو درمانی» (٦)**

**حەیرانی ڕەهی عیشقن، گەر شەمسە، وە گەر مەنصوور**

**«"سالم!" نبود پیدا زین بادیه پایانی» (٧)**

جەمعن: کۆن: دڵها. (دلها)ی فارسییە، دڵان.

واتە: دڵانی عاشقان و پێچولوولی ئەگریجە کەوتوونەتە یەك و وەك یەکتر پەرێشانن، یا ئـەو دڵانـە لەناو ئەگریجەی پەرێشانی تۆدا کەوتوون. گیانە. زۆر جوانە ئەگەر یەك گۆچان بوەشێنێ، صـەد دڵـی ناو ئەگریجەی تۆ وەك گۆ دەکەونە مەیدان و کۆدەبنەوە. چەند جوانـە، لـە پەرێـشانیدا وەك یـەکن، کەچی دوایی کۆیان دەکاتەوە.

دڵهاوو خەمی (ه): دلها لە سەری. (ج): دلهایی خەمی.

(٥) ئەلەم: ئازار. هیجر: دووری. بشکستم: شکاندم. پیمان: پیاڵە، جامی شەراب.

واتە: جگە لە ئازاری دوورکەوتنەوەی تۆ، بیر لە کەس و لە هیچ ناکەمەوە. من لە عیشقی تـۆدا سەد پەیمانم بە جامێك شەراب شکاندووە.

ئەلەمی هیجرت (غ، ڕ): ئەلەمی دووری. (ج): ئەلەم و دووری. (کـم، گـم): ئەلـەمی دووریـت. ناکەم (کم): تاکەم. هەڵەی چاپە. عهد به پیمانی (غ، ڕ): گوی به چوگانی. (کم، گم): توبهٔ کنعانی.

(٦) بیمار: نەخۆش. دامان: داوێن. شاید: بەڵکوو. لعل: کینایەیە لە لێو.

واتە: دڵی نەخۆش بە شوێن چارەسەردا دەگەڕێ و دەستەوداوێنی ئـەهلی وەفـا دەبـێ، بـەڵکوو دەرمانی لە ماچی لێوی تۆ دەستبکەوێ.

چارە، دڵی (ن): چارەی دڵ.

(٧) ڕەه: ڕێگە. شەمس: شەمسی تەبریزی. مەنصوور. مەنصووری حەڵلاج.

واتە: وەنەبێ هەر من سەرگەردانی ئـەم ڕێگـەی عیـشقە بم، کەسـانی وەك شەمـسی تـەبریزی و مەنسووری حەڵلاجیش لەم سارای عیشقەدا سەرگەردان بوون. سالم! ئەم سارایەیش هیچ کۆتایی بێ ناهێنێ و نابڕێتەوە.

وەگەر (غ، کم): نەگەر. بادیه پایانی (کم): به پیمانی.

## (*) -١٥-

**سوویی عاشق، وەختی ئیما، ڕووبەڕوو تیرئەفگەنی**
**بۆ فەراموورزی دڵم، ئەی تورکی کافر! بەهمەنی (١)**
**غەمزە عاجز بوو لە تیرئەندازییا، هەر طالیبی**
**ئەی دڵی بەدبەختی ڕووسەختم، مەگەر ڕووبێن‌تەنی؟! (٢)**
**ڕەنگە دامەن داتەکێنێ دڵبەری لامەذهەبم**
**گەر لە مەحشەردا بە زاری دەست بەرم بۆ دامەنی! (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، غ، ق، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) سوویی: بۆ لای. ئیما: ئیشارەت. تیرئەفگەن: تیرهاوێژ. فەراموورز: کوڕی ڕۆستەم. تورك: جوان و شۆخ. بەهمەن: کوڕی ئەسفەندیاری کوڕی گوشتاسیبی پادشای کیانی، بە باڵادەست ناسراو بووە.

واتە: ئەی یاری بێ‌دین، کە ئیشارەت بۆ عاشق دەکەی، ڕووبەڕوو تیری تێ‌دەگری و ڕەحمی پێ ناکەی. مەگەر تۆ بەهمەنی کوڕی ئەسفەندیاری و لە تۆڵەی باوکتدا فەراموورز دەکوژی.

سوویی (ڕ): بوویی. فەراموورزی (ڕ): مەراموورزی. هەڵەی نووسینە.

(٢) تیرئەنداز: تیرهاوێژ. طالیبی: دەتەوێ. ڕووسەخت: لاسار و توند و کەللەڕەق. ڕووبێن‌تەن: جەستەپۆڵا.

واتە: ئەی دڵی بەدبەختی سەرسەخت، غەمزە و ناز لە دڵبەری تیرهاوێژ بێزار بووە، کەچی تۆ ماندوو نابی و هەر داوای تیر دەکەی. سەیرە، دەڵێی جەستەت پۆڵایە، وا کارت تێ‌ناکا.

تیرئەندازییا، هەر (ق): تیرئەندازی ئێشتا. ئەی دڵی (گم): ایدی. هەڵەی چاپە. بەدبەختی (کم): بەدبەخت و. ڕووسەختم (ق): سەختم. لەنگە. ڕووبێن‌تەنی (ق): ڕویین‌تەنی.

(٣) دامەن: چمکی کەوا و کراس، داوێن. لامەذهەب: بێ‌دین. بە زاری: بە داماوی.

واتە: دڵبەری بێ‌دین ئەوەندە خۆیم لێ دوور دەخاتەوە، ڕەنگە ئەگەر لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە داماوی و گریانەوە دەست بۆ داوێنی بەرم، ڕای‌بپسکێنێ و نەهێڵێ دەستمی لێ گیر بێ. یانێ لەوێیش قەرەم نەکەوێ.

لامەذهەبم (عا، ق، ڕ، کم، گم): بێ مرووەتم. لە مەحشەردا. (عا، کم، گم): لە حەشریشا.

**دڵ چ حاجەت ئارەزووی گوڵشەن بکا وەختی بەهار؟**
**تۆ لە هەر فەصلا لە بەرچاوم بە عاریض گوڵشەنی (٤)**
**دەستی تۆیە و عەهدی تۆ، ئەی حەلقەیی زەنجیری زوڵف!**
**گەردەنی دڵ وەقفی تۆ بێ، تا موطیعی گەردەنی (٥)**
**تۆ بە جان تیشنە بە خوێنی "سالم" و جانی ئەوی**
**دۆستی وا نابێ تۆ دەیکەی، درێغا دوشمەنی (٦)**

(٤) حاجەت: پێویستی. گوڵشەن: باخ و گوڵزار. فەصڵ: وەرز. عاریض: ڕوومەت.
واتە: دڵ چ پێویستییەکی بەوە هەیە لە بەهاردا ئارەزووی باخ و گوڵزار و سەیران بکا. تۆ بە ڕوومەت و ڕوخساری ناسك و سەرنجڕاکێشت لە هەموو وەرزێکدا وەك باخ و گوڵزاری بەهار وەهای.
حاجەت (ق): لازم. وەختی (ق): وەقتی. (هەر) لە (عا)دا کەوتووە.
(٥) عەهد: پەیمان. وەقف: تەرخان. موطیع: گوێڕایەڵ و ملکەچ.
واتە: ئەی ئەڵقەی زنجیری زوڵفی یار، خۆمم خستووەتە بەردەستی تۆ و پەیمانم لەگەڵ بەستووی کە هەتا تۆ ملکەچی گەردنی من یا خۆت بی و ئۆباڵی گەردن بخەیتە ئەستۆی خۆت، دڵ تەرخانی تۆ و لە بەردەستتدا بێ، تێوەی بئاڵێ.
(تۆ)ی یەکەم لە (عا)دا کەوتووە. وەقفی (گم): زوڵفی. تۆ بێ (غ، ق): تۆیە. موطیعی (عا، ڕ): کە وەقفی. (غ): موحیطی.
(٦) جان: گیان. تیشنە: تینوو. درێغا: حەیف، بە داخەوە.
واتە: ئەی دڵبەر، تۆ بە دڵ و گیان تینووی خوێن و گیانی "سالم"ی. دۆستایەتی ئەوە نییە تۆ لەگەڵ منیدا دەکەی، بە داخەوە تۆ دوژمنایەتیم لەگەڵ دەکەی.
بە جان (کم، گم): ڕۆح. تیشنە (عا، کم): توشنەی. سالم و (کم، گم): سالمیش. وا نابێ (عا): دانا بێ. هەڵەیە. درێغا (کم، گم): ئەی درێغا. لەنگە. (تۆ) بڕگەیەکی کورتە، بۆیە دەبێ بە (تو) بخوێنرێتەوە.

## (*) -١٦-

لەطیف و سەروقەدد و گوڵجەبینی
حەریف و دڵفەریب و دڵنشینی (١)
لەگەڵ هەر بەرتەرین شۆخێ جەدەل کەی،
بە هەر ئانێ، لە حوسنا بیهتەرینی (٢)
خەریکی دڵنەوازیی دوشمنانی
لەگەڵ یارانی یەكدڵ هەر بە کینی (٣)
بە جەوری بێحیساب و لوطفی ئەندەك
لە صەدلا زەهر و یەكلا ئەنگەبینی (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، هـ، غ، ج، ر، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەحزووف.

(١) لەطیف: ناسك. سەروقەد: قەد وەك داری سەرو. جەبین: تەوێڵ، ناوچاوان. حەریف:هاوتـا. دڵفەریب: دڵفریودەر. دڵنشین: لە دڵدا جێگیر و دانیشتوو.

واتە: ناسکیت و باڵا وەك داری سەرو بەرزی و هاوتـای هـاوڕێی و دڵفریـودەری و لـە دڵـدا جێگرتووی و تێیدا دانیشتووی.

جەبینی (هـ): جەمینی. دڵنشینی (کم، گم): دڵشکێنی.

(٢) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا چوارەمە.

بەرتەرین: پێشووترین. جەدەل: گفتوگۆ و بەرامبـەریکـردن. ئـان: سـات. حوسـن: جـوانی. بیهتەرین: باشترین.

واتە: لـەگەڵ هەرە لەپێشترین جوانێکدا بکەویتە بەرانبەرکێکردن، هەموو کاتێك لـە جوانیـدا لەو زیاتری.

بەرتەرین شۆخێ (حا، ج): بیهتەرین شۆخێ. (کم، گم): بیهتەرین حوسنێ. بیهتەرینی (هـ): بەرتەرینی.

(٣) ئەم بەیتە لە (کم)دا دووەمە.

دڵنەوازی: دڵنەوایی، دڵدانەوە. یەکدڵ: هاودڵ. کین: ڕق و بوغز.

واتە: خەریکی دڵدانەوەی نەیارانی و ڕق و قینت لە یارانی هاودڵی خۆتە.

دوشمنانی (کم): دوژمەنانی. یارانی یەكدڵ (کم): یاران هەمیشە.

(٤) ئەم بەیتە لە (حا)دا چوارەم و لە (کم)یشدا حەوتەمە و لە (هـ)یشدا نییە.

**به تۆ نابن، هەموو غیلمانی جەننەت**
**ئەتۆ، ئەی نووری دیدەم، نازەنینی (٥)**
**چ سیحرێ بێ دڵت تەسخیری من کا؟**
**بە هەر ئانێ کە تۆ سیحرئافەرینی! (٦)**
**لەبی تۆ مەعدەنی مەرجانە، نەك یەم**
**مەحەللی شەككە ئەو، تۆ جێی یەقینی! (٧)**
**لە بۆسەی شەهدی من، گەر ڕوو ترش کەی**
**بە لەذذەت هەر وەکوو ئەسکەنجەبینی (٨)**

لوطف: سۆز. ئەندەك: کەم. ئەنگەبین: هەنگوین.

واتە: ستەم و ئازاری یار بێئەندازە و حیساب و لوتف و میهرەبانیی کەمێکە. تۆ لە سەد لاوە ژەهر و لە لایەکەوە هەنگوینی.

لە جەوری بێحیساب و لوطفی ئەندەك (کم): قەهر ڕۆی بێحیساب و ئەندەك لوطفی. زەهر و (کم، گم)، ژەهر و. صەد (کم): سەد. (لا) لە (کم)دا کەوتووە.

(٥) ئەم بەیتە هەر لە (کم، گم)دا هەیە و سێیەم بەیتە.

غیلمان: کۆی غولام، کوڕوکاڵ. جەننەت: بەهەشت.

واتە: هەموو کوڕگەلی بەهەشت ناگەنە تۆ. ئەی ڕووناکیی چاوم، تۆ شیرین و نازداری.

(٦) ئەم بەیتە لە (حا)دا چوارەم و لە (کم، گم)یشدا هەشتەمە.

تەسخیر: داگیرکردن و خستنەژێردەست. سیحرئافەرین: سیحرباز، جادووگەر.

واتە: نازانم چ سیحر و جادوویەك لە دنیادا هەیە، تۆ ڕام بکا و کارت تێبکا، لە کاتێکدا تۆ خۆت لە هەر ساتێکدا سیحرباز و سیحر دروستکەری.

ئانێ (غ): ئیما. کە تۆ (حا): کتُ. هەڵەیە. (کم): نو. هەڵەی چاپە.

(٧) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا نۆیەمە.

لەب: لێو. یەم: دەریا. مەحەل: شوێن. جێ. شەك: گومان. یەقین: ڕاستیی بێچەندوچۆن.

واتە: کانی مەرجان لە دەریایە، بەڵام گومانی تێدا نییە کە بڵێین لێوی تۆ کانی مەرجانە.

(٨) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا پێنجەمە و لە (حا، ه)یشدا نییە.

بۆسە: ماچ. شەهد: هەنگوین. ئەسکەنجەبین: شەربەتی سرکە و هەنگوین.

واتە: ئەگەر لە ماچی لێوەکانت کە جێی هەنگوینە بۆ دڵی من، ڕووی خۆت ترش بکەی لێم، ئەوا

وەکیلی "خضر"ی، ئەی خاڵی لەبی یار!
لە گوێ ئابی حەیاتا جانشینی! (٩)
دەکا تەسخیری دڵها، لەعلی لێوت
"سولەیمان"حیشمەت و صاحیبنگینی (١٠)
بە یادی چیهرە، ئەی دڵ! بەندی طوڕڕەی!
لە کوردستانە "سالم"، تۆ لە چینی!! (١١)

دەبێتە ئەسکەنجەبین کە تامی شیرینی و ترشیشی هەیە.

شەهدی من (ج): شەهیدی من. هەڵەیە. (کم، گم): مەشهەدم.

(٩) ئەم بەیتە لە (مان، حا، ھ، ن)دا نییە.

خضر: خدری زیندە. گوێ: کەنار و نزیك. ئابی حەیات: ئاوی ژیان. جانشین: جێنشین.

واتە: ئەی خاڵی لێوی یار، تۆ وەکیلی خدری زیندەی، چونکە ئەو بە ئاوی ژیان گەیشت. ئێستە ئەو ڕۆیشتووە، تۆ وای لە قەراغی لێودا کە جێی ئاوی حەیاتە.

لە کۆی ئابی حەیاتا (ج): لە گوێی ئابی حەیاتا. (کم، گم): لە گوێی ئابی بەقادا. (کوی) لە (عا)دا (گوێی)یش هەڵدەگرێ.

(١٠) دڵها: دڵان. سولەیمان: پادشای دەسەڵاتداری جولەکە کە پلەی پێغەمبەریی هەبوو و خودا بای خستبووە ژێر ڕکێفی و زمانی باڵندەکانی دەزانی. حیشمەت: گەورەیی. نگین: زێڕ و زیوی سەر ئەموستیلە، گوایە ئەموستیلەکەی حەزرەتی سولەیمان ناوی خودای بەسەرەوە بووە، بەو هۆیەوە حوکمی مرۆڤ و جنۆکەی کردووە.

واتە: پێم وایە لەعلی لێوت تەلیسمی بەسەردا خوێندراوەتەوە، بۆیە وا دڵی عاشقان داگیر دەکا. تۆ -بە ڕاستی- وەك سولەیمان گەورە و خاوەننگینی، وەك چۆن حەزرەتی سولەیمان بە ئەموستیلەکەی دێوەکانی ڕام کردبوو، تۆیش بە لەعلی لێوت عاشقەکانت ڕام کردووە.

دەکا (کم): ئەکا.

(١١) چیهرە: چارە، ڕوخسار. طوڕڕە: پێچولوولی ئەگریجە. چین: وڵاتی چین.

واتە: لەبەرئەوەی وام لە یادی ڕوخساری دڵبەردا و دڵم بەندی ناو زولفیەتی، من لە کوردستانم، چونکە ڕووی یار کوردستانی ڕووناك کردووەتەوە، بەڵام تۆ لە وڵاتی چینی، چونکە بۆنی میسکی زولفی یار، مەگەر لە ئاسۆی چیندا دەستبکەوێ.

دڵ بەندی طوڕڕەی (حا): دڵ بەندە طوڕە. (کم): دوڵبەندی طوڕەی. (عا، غ، گم): دڵبەندی طوڕە.

(*) -١٧-

صەد مەولەوی بە فەتوەیی دڵ دەبنە عیسەوی
گاهێ ئەگەر لە کیسوەتی تەرسا بەدەرکەوی! (١)
چەسپیدە باهەمن دڵ و عیشقت، هەمیشە وەك
زوڵفی "ئەیاز" و گەردەنی "مەحموودی غەزنەوی" (٢)
کەس وەك دڵم لە شۆری مەحەببەت بەڵەد نییە،
هەروەك حەکیمی ڕۆمیی و ئەشعاری (مەثنەوی) (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، ف، غ، ق، کم، پ، گم)دا هەیە.
کێشی عەرووز: موزاریعی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.
(١) ئەم بەیتە لە (ن)دا نییە.
مەولەوی: مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی. فەتوە: فتوا. عیسەوی: مەسیحی. گاه: کات، جار. کیسوەت: پۆشاك، جلوبەرگ. تەرسا: مەسیحی.
واتە: ئەی یار، ئەگەر جارێك لە جلوبەرگی کچە مەسیحییەکدا خۆت نیشان بدەی، دڵ فتوا دەدا سەد مەولەویی نیشانەی موسوڵمانیی گەورە، لە دین وەردەگەرێن و دەبنە مەسیحی.
فەتوەیی (کم): فەتوایی. کیسوەتی (عا): کوت. هەڵەیە. (کم، گم): گێسوویی.
(٢) چەسپیدە: چەسپاو. باهەم: پێکەوە. ئەیاز: خولامێکی جوانخاسی مەحموودی غەزنەوی بووە.
واتە: دڵ و عیشقی تۆ هەمیشە پێکەوە چەسپاو و جێگیرن، وەك زوڵفی "ئەیاز"ی ڕەشپێستی هۆشیار و دڵسۆز کە لە گەردنی سوڵتان مەحموودی غەزنەوی نزیك بووە، چونکە سەری ئەیاز بە زۆری بە لای سەری سوڵتانەوە بووە و قسە و ڕاوێژی بۆ کردووە، بەو پێیە مووی کاکۆڵی ئەیاز هاتووەتە سەر ملی مەحموودی غەزنەوی.
چەسپیدە باهەمن دڵ و عیشقت (کم): چەسپیدە باهەمین دڵ و زوڵفت. (گم): پێچیدە با بێ دڵی عیشقت. باهەمن (ق): بە ئاهی من. نوختەی (باهەمن) لە (ن)دا کەوتووە.
(٣) شۆر: سەودا. مەحەبەت: خۆشەویستی. حەکیمی ڕۆمی: مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی. مەثنەوی: شاکارە شیعرییەکەی مەولانا جەلالەددینە.
واتە: کەس وەك دڵی من شارەزای سەودای خۆشەویستی نییە، شارەزاییەکەی ئەوەندەی هی حەکیمی ڕۆمی و شیعرەکانی (مەثنەوی)یەکەیەتی.

**پەنهانە توركی دیدەیی مەستت لە شامی زوڵف**
**تەبدیلە جادووانە بە ئەسبابی شەبڕەوی (٤)**
**بولبول لە شاخساری چەمەن باربود نەوا**
**گوڵ نایە سەر بە شۆر و شەعەف تاجی خوسرەوی (٥)**
**صەد زۆری ڕۆستەمی نییەتی زۆری سیم و زەڕ!!**
**طالیع ئەگەر ضەعیفە، نەبەی پەنجە با قەوی (٦)**

حەکیمی ڕۆمیی و (غ): حەکیمی و ڕۆمی. مەثنەوی (عا): مەسنەوی. (کم، گم): مەولەوی.

(٤) پەنهان: شاراوە. تورك: جوانی، توركنەژاد. شام: شەو، وڵاتی شام. تەبدیل: ئاڵوگۆڕکردن. جاویدان: هەمیشەیی. ئەسباب: ئامراز و پێویستی. شەبڕەوی: شەو ڕۆیشتن.

واتە: جوانیی چاوی مەستت لەناو تاریکیی ئەگریجەتدا شاردراوەتەوە. هەموو ئامراز و پێویستییەکی شەو ڕۆیشتنی لە بەردەستدایە و بە شێوەیەکی هەمیشەیی خۆی دەگۆڕێ و لە تاریکیدا دەمێنێتەوە.

تەبدیلە (کم، گم): تەبدیلی. جادووانە (مان، کم): جاویدانە. جادووانە زیاتر بۆ ئێرە دەست دەدا. شەبڕەوی (عا): تەبڕەوی.

(٥) شاخسار: بەشی سەرەوەی درەخت کە لق‌وپۆپی زۆرە. چەمەن: باخ و گوڵزار. باربود: گۆرانیبێژێکی سەردەمی خوسرەوی پەرویز بووە. نەوا: ئاواز و نەغمە. شەعەف: خۆشحاڵی.

واتە: بولبول بە لق‌وپۆپی سەرتۆپی درەختەوە ئاواز و نەغمەکەی لە هیی "باربود"ی گۆرانیبێژی سەردەمی خوسرەوی پەرویز دەچێ. بۆیە گوڵ بە سەودا و خۆشحاڵییەوە تاجی شاهانەی ناوەتەوە سەری.

بولبول .. تاد (عا): بولبول .. چەمەن باز بەو نەوا. هەڵەیە. (ف): بولبول .. چەمەن بارە بەدنەوا. بە شۆر و شەعەف (غ): بە شەوق و شەعەف. (ق): بە شەعەف. لەنگە. (کم، گم): بە شەوق و شەغەف.

(٦) «زۆر»ی یەکەم: زۆرداری. «زۆر»ی دووەم: هێز و پێز. طالیع: بەخت. ضەعیف: کز و بێهێز. قەوی: بەهێز.

واتە: سەد زۆری ڕۆستەمانە هێزی زێڕ و زیوی نییە. ئەگەر بەختت نایهێنێ، پەنجە لەگەڵ پیاوی بەهێزی دارادا لێمەدە.

صەد زۆری (کم، گم): سەد زۆری. نییەتی (کم): تبەتی. هەڵەی چاپە. ضەعیفە (کم، گم): ضەعیف بێ. نەبەی پەنجە با قەوی (حا): نیەتی پەنجەی قەوی. (ق): تەن و بونیەمە قەوی. هەڵەیە.

## "سالم!" کەلامی کوردیی و بێوەزن و سست و لەنگ
## بێمەعنەیە بگاتە ئەلای شێخی مەعنەوی! (٧)

(٧) بێوەزن: کەمبایەخ. شێخی مەعنەوی: شێخی زانای خاوەنی دەسەڵاتی ئاینی.

واتە: سالم وتەکانی کەمبایەخ و سست و بێداروبار و بێمانان، ئەگەر بگەنە لای شێخی زانا و ڕێبەری دین.

کوردیی و بێوەزن و سست و لەنگ (عا): کوردیی و بێ وەزن و سست و است؟ (ن): کوردییە، بێوەزن و سست و لەنگ. (ق): کوردی دەڵێ زۆر لەنگ و سست. (حا، ف، کم، گم): کوردیی و بێ وەزن و لەنگ و سست. بێمەعنەیە بگاتە ئەلای (ق): بێمەعنەیە موعایەنەی لای. هەڵەیە. (کم، گم): بێمەعنییە بگاتە ئەلای.

(*) -١٨-

دەنگی «دَقّ الباب»ی دڵ دێ، ئەی خیرَدا دا ڕاکە، دەی
کەس نەزانێ بێ، خەیاڵی یارە گەر، دەر وا کە، دەی (١)
گەر لەبەر تیری نەظەر پڕ خوێنە مەنزڵگاهی دڵ،
بێتە چەشمەنداز دیدەم غورفەیێکی پاکە، دەی (٢)
ئەی خیرەدا بۆ دیدەنیی یاری حەبیبم هەستە سا
بێرە دڵ، بۆ ڕەهگوزارت سەددی سینەم چاکە، دەی (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، عا، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) دقّ الباب: لە دەرگادان. خیرەد: هۆش، عەقڵ. دا: دەی. واکە: بکەرەوە.

واتە: ماوەیەکە دڵم ڕۆیشتووە بۆ سۆراخ و دۆزینەوەی دڵبەرم، وا ئێستا هاتووەتەوە. ئەوەتا دەنگی تەقولبابی دەرگای دڵ دێ. ئەی هۆش و فام، بە پیریەوە بچۆ. بەڵام کە دەرگات لێ کردەوە، با کەس نەزانێ دڵ خەیاڵی یاری هێناوە، تا ڕەقیب ئاگاداری ئەم سەفەرەی دڵ نەبێ.

دا ڕاکە (کم): وا ڕاکە. وا کە، دەی (گم): وا دەکەی. هەڵەی چاپە.

(٢) نەظەر: ڕوانین. مەنزڵگاه: مەڵبەند. چەشمەنداز: دیمەن. دیدە: چاو. غورفە: ژوور.

واتە: ئەو شوێنە کە ئەوسا دڵ لە ناویدا بوو، لەبەر تیری تەماشای یار کە سینەی لەت و بریندار کردووە، پڕ بووە لە خوێن. مادەم وایە، با دڵ نەڕوانێتە ئەو شوێنەی پێشووی خۆی، با چاو ببڕێتە چاوم و ئەوێ بکاتە جێی تەماشا و ڕوانینی خۆی، چونکە ژوورێکی چاك و خاوێنە.

بێتە (کم، گم): بێنە. غورفەیێکی (عا): غورفێکی. لەنگە.

(٣) حەبیب: خۆشەویست. ڕەهگوزار: ڕێگوزار. سەد: بەست، بەنداو. چاك: لەت لەت.

واتە: ئەی هۆش و عەقڵ، بۆ خاتری چاوپێکەوتنی یاری خۆشەویستم، هەستە، بڕۆ دڵ بێنەرە لام. ئەگەر دەڵێی سینە ڕێی لێ گرتووم و بووە بە لەمپەر و کۆسپ لە ڕێگەمدا، وا نییە. ئەو کۆسپە ئێستا لەتلەت بووە و ڕێگەی هاتوچۆت لێ ناگرێ.

ئەی خیرەد (عا): ئەی فەرەح. بۆ دیدەنیی (کم): تۆ دیدەنی. هەڵەیە. هەستە (عا، ن، کم، گم): هەڵسە. بێرە (عا): پێرە.

**هاته سەر شوێنپێی خەیاڵی دڵبەرم، فیکری ڕەقیب**
**ئەی خیرەد! خۆ تۆ فەریبەندەی؛ دەسا حاشا کە، دەی (٤)**
**"سالم!" ئەمشەو، خاصصە بۆ فەوتی ڕەقیبی کەچنەظەر**
**ڕوویی دەستی حاجەتت بۆ دەرگەهی مەولا کە، دەی (٥)**

(٤) ڕەقیب: ناحەز، نەیار. فەریبەندە: فریودەر، لەخشتەبەر.

واتە: ئەی هۆش و عەقڵ، ئەگەر ڕەقیب زانیی دڵ هاتووەتەوە و خەیاڵی یاری هێناوەتەوە، هات تەماشای کرد و شوێنپێی خەیاڵی یاری هەڵگرت و دەستکەوت، نەکەی تەسلیمی ببی. خۆ تۆ دنیادیدە و فریودەری. دەسا زوو حاشا بکە و بڵێ: خەیاڵی یار ببڕای بڕ نەهاتووەتە ئەم دەوروبەرە، با ڕەقیب دەستبەردار بێ.

شوێنپێی (ن): شوێنوپێی. لەنگە.

(٥) خاصصە: بەتایبەت. فەوت: فەوتاندن، لەناوبردن. کەچنەظەر: ڕوانین چەوت و خوار. حاجەت: پێویستی. دەرگەه: دەرگا. مەولا: خودا.

واتە: سالم ئەمشەو کە دڵ خەیاڵی یاری هێناوەتەوە، شەوێکی پیرۆزە، کاتی ئەوەیە خودا دوعامان لێ قوبووڵ بکا. کەواتە ئەمشەو بۆ مردنی ڕەقیب و دوعاکردن لەو فیتنەبازی چەوتبینە زۆر چاکە. ڕووی دەستی نیازی خۆت بکەرە دەرگای خودا و بپاڕێرەوە، بەڵکوو لە چنگی ڕەقیب ڕزگار ببین.

خاصصە (کم): خاسە. فەوتی (ن، کم): قوتی. هەڵەی نووسین و چاپە. حاجەتت (عا): حاجتت. هەڵەی نووسینە. مەولا کە، دەی (گم): مەولا دەکەی.

## -١٩- (*)

### (در وصف والى كردستان انشا شده‌است)

مەهی دەی هات و چوو، ڕابورد شەوی دەی
دەسا دەی مەی بدەن، ئەمجا پەیاپەی (١)
خەلاصم کەن لەدەس غەم، موطریب ئامان
بە دەنگی بەربوت و چەنگ و دەف و نەی (٢)
دە بێ ساقی! لە مەی عیسانەفەس، بێ
بە نەشئە موردەیی صەد ساڵە کەی حەی (٣)
زومورڕودڕەنگە سەحرا و بادە گوڵگوون
هەتا کەی کاهیلی؟! چەنگێ، دەخیل، دەی، (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە درێژە لە (عا، غ)دا هەیە. ناسناوی "سالم" لە کۆتاییدا نیە. لە وەسفی والیی کوردستان (سنە)دا دانراوە. لە (غ)یشدا نووسراوە ((در وصف والی)). نەزانراوە ئەم والییە کێیە؟

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) مەه: مانگ. (دەی)ی یەکەم: یەکەم مانگی زستان لە ساڵی هەتاویدا. پەیاپەی: بەدووی یەکدا، بێپسانەوە.

واتە: یەکەم مانگی زستان هات و شەوی دەیەمی تێپەڕی. دەی یەك لەدوای یەك شەراب بێنن.

(٢) خەلاصم کەن: ڕزگارم کەن. موطریب: گۆرانیبێژ. بەربوت، چەنگ، دەف، نەی: چەند ئامێرێکی مۆسیقان.

واتە: گۆرانیبێژ، دەستم بە دامێنتان بە دەنگی بوربوت و چەنگ و دەف و شمشاڵ لە چنگی خەم دەرمبهێنن.

(٣) عیسانەفەس: وەك فووی عیسا مردوو زیندوو بکاتەوە. بێ: جەختکردنەوەی (دە بێ)ی پێشەوەیە. نەشئە: مەستی، خۆشی. موردە: مردوو. حەی: زیندوو.

واتە: مەیگێڕ وەرە، شەرابێك بێنە وەك فووەکەی عیسا مردوو زیندوو بکاتەوە. تا تۆیش بە مەستی مردووی سەدساڵە زیندوو بکەیتەوە.

بە نەشئە موردەیی صەد ساڵە کەی (غ): بە نەشئە .. کا.

(٤) زومورڕود: بەردێکی گرانبەهای زۆر سەوزە، مار بۆی بڕوانێ کوێر دەبێ. سەحرا: سارا،

**چ ڕەنگینە، بە مەستی، ڕوویی ساقی؟**
**چ دڵگیرە صەدای هەی بێنە مەی، هەی (٥)**
**عەجەب صەفوەتدەهێکە مەی، حەقیقەت**
**لە دڵ بیروون دەکا غەلل و غەش و غەی (٦)**
**بە یەغما چوو، هەمیسان، طاقەتی هۆش**
**لە چاوی مەستی ساقی، ئۆف خودا، وەی (٧)**
**سوراحی! وا لە پەردەت مەی دیارە**
**نیهانی قەد نییە ڕازت، چ فیتنەی؟! (٨)**

بیابان. بادە: مەی. گوڵگوون: چەشنی گوڵ. کاهیلی: تەمەڵی و سستی. چەنگ: ئامێرێکی مۆسیقایە.

واتە: سارا و بیابان ڕەنگی زمرووتی گرتووە و سەوز هەڵگەڕاوە و شەرابیش شێوەی گوڵی وەرگرتووە. ئیتر ئەم تەمەڵی و تەوەزەلییە تا کەی، دەخیلت بم وەی چەنگێك لێ بدە.

(٥) ساقی: مەیگێڕ. صەدا: دەنگ.

واتە: مەیگێڕ کە مەست و سەرخۆش دەبێ، ڕوخساری چەند جوان و ڕەنگینە. دەنگی بانگ‌کردنی شەرابی چەندە خۆشە و دەچێتە دڵەوە.

(٦) عەجەب: سەیرە. صەفوەتدەه: ئارامیبەخش، پاککەرەوە. حەقیقەت: بەڕاستی. بیروون دەکا: دەکاتە دەرێ. غەلل‌وغەش: خڵتە و فڕوفێڵ. غەی: سەرلێشێواوی، گومڕایی.

واتە: ڕاستییەکەی شەراب سەیرە، ئارامیبەخش و پاککەرەوەیە. خڵتە و هەموو خەیاڵێکی فڕوفێڵاوی و گومڕایی لە دڵ دەردەکا و پاکی دەکاتەوە.

(٧) ئەم بەیتە لە (ع)دا نییە.

واتە: دیسان توانایی هۆش و عەقڵم بە تاڵان چوو. خودایە، ئۆف لەدەست چاوی مەستی مەیگێڕ!

(٨) ئەم بەیتە لە (غ)دا شەشەمە.

سوراحی: دۆلکە. نیهانی: نهێنی. فیتنە: شەڕەنگێز.

واتە: ئەی سوراحیی شەراب، شەراب لە توێی شووشەکەتەوە دیارە. بۆیە ڕاز و نیازی تۆ ئاشکرایە و ناشاررێتەوە. بۆچی فیتنەبازی دەکەی؟!

لە پەردەت (غ): لە بەرپێت. (سوراحی) بە (صوراحی) نووسراوە.

تەنگظەرفی مەکەن، ئامان، حەریفان!
لەطیفە مەی، بە عەفوا با نەبێ قەی! (٩)
لە سایەی دەوڵەتی والییی والا
لە هەر سوو بەزمە، وەك جەشنی "جەم" و"کەی"! (١٠)
لە بیمی شەحنەیی ئەو، ئێستە ڕەهزەن
نەماوە، هەر لە (بەصرا) تا بە ڕێی (ڕەی) (١١)
ئیشارەی بەرقی تیغی ڕۆژی مەیدان
بە چالاکی دەکا ئەسپی قیران پەی! (١٢)
مەهـ و ماهی بە جەولانی دەکا ڕیش
لە ضەربی سممی ئەسپا و نووکی نێزەی (١٣)

(٩) ئەم بەیتە لـە (غ)دا نییە.

تەنگظەرفی مەکەن: کەم مەکەنە گەدەتان. حەریفان: دۆستان. لـەطیفـە: ناسـکە. بـە عـەفوا: بەخۆڕایی. قەی: ڕشانەوە.

واتە: یاران! دریغی مەکەن و شەرابێکی زۆر هەڵدەن و بیکەنـە گەدەتانـەوە. شـەراب شـتێکی ناسك و سازگارە، با بە خۆڕایی نەڕشێرێتەوە.

(١٠) والا: پایەبەرز. هەر سوو: هەر لا. بەزمە: شادیـە. جەشـن: جـەژن. جـەم و کـەی: دوو گەورە پادشای ئێرانی کۆن بوون.

واتە: لـە سێبەری حوکمی والیی پایەبەرزدا، بە هەمان شێوەی بەزمی جووتە پادشـای گـەورەی ئێرانیی وەك جەم و کەی، لـە هەموو لایەکەوە بەزم و شادییە.

(١١) بیم: ترس. شەحنە: حەسحەس، پاسەوان. ڕەهزەن: ڕێگر و چەتە. بەصرا: شاری بەسرەی خوارووی عیراقی ئێستا. ڕەی: ناوچەی خوارووی ڕۆژهەڵاتی تاران.

شەحنەیی (غ): سەحنەیی.

(١٢) بەرق: برووسکە، شەوقدانەوە. قیران: سمی جووت پەلی پێشـەوە یا پاشەوە کەوتوو. دەکـا پەی: دەبڕێتەوە.

واتە: هەر شەوقدانەوەیەکی تیغی والی لـە ڕۆژی شـەڕی مەیدانـدا، بـە گـورجی قاچـی ئەسـپی خۆشڕۆی لە خێراییدا سم پێنەماو، دەبڕێتەوە.

(١٣) مەهـ: مانگ. ماهی: ماسی. جەولان: گەڕان و سووڕانەوە. ڕیش: بریندار. ضەرب: لێدان.

**دەزانن بۆ مەسیحا کەوتە پشت ڕۆژ؟**
**لەتاو ئەوجی بوڵەندی داری تەقڵەی (١٤)**
**ظوهوورە شێوەیی فیردەوس و دۆزەخ**
**لە جەشن و بەزمیی و قەهر و فەلاقەی! (١٥)**
**بەدەنپۆش، گەر موزەییەن کا بە دۆشی**
**دەپۆشێ پەرتەوی خۆر، شەوقی شەمسەی (١٦)**
**ئەگەر مەیلی کەرەم کا طەبعی شۆخی**
**دەکاتە مەرد دوونان، حاتەمی طەی (١٧)**

واتە: والی، بە زەبری سمی ئەسپ و سەرەنێزەی خۆی، لە سووڕانەوە و گەڕانیدا سەرەنێزەی دەگاتە مانگ و تێی هەڵدەچەقێ و سمی ئەسپیشی جەرگی ماسی زەوی لەسەر خۆڕاگرتوو دەبڕێ.

(١٤) مەسیحا: عیسا پێغەمبەر. ئەوج: سەرتۆپ، بەرزایی. بوڵەندی: بەرزی. داری تەقڵە: دارتەقڵە، ئەو دارەی کە سوار لە جەنگەی تەقڵە و جلیتبازیدا هەڵیدەدا و دەیگرێتەوە و لە حەوا تەقڵەی پێ دەدا؛ یا کاتی لینگدانی ئەسپ بە پڕتاو دایدەهێنێتە ئەرز و دایدەکوتێ و کە خێرا بۆی دێتەوە، هەڵیدەکێشێتەوە، یاخۆ دەیهاوێتە سوارەی خەنیمی بەرامبەری.

واتە: مەسیح فەرامۆش کرا، چونکە وەزعێکی تازە هاتووەتە پێش کە والی لەبەر بەرزی و گەورەییەکەی دارتەقڵەی داکوتاوە یا گرتوویەتە خەنیمی خۆی، ئیتر پێویست بە مەسیح ناکا لە ئارادا بێ.

(١٥) ظوهوورە: دەرکەوتووە. فیردەوس: بەهەشت. جەشن: جەژن. بەزم: شادی. قەهر: تووڕەیی و بێزاری. فەلاقە: پەت و داری لەپێپێچراو بۆ دارکاریکردن.

واتە: جەژن و شادیی والی وەك شێوە بەهەشتێك دەردەکەوێ. داخ و تووڕەیی و ئەشکەنجەدانیشی وەك دۆزەخ وان.

شێوەیی (غ، پ): ڕەنگی.

(١٦) بەدەنپۆش: لەشپۆش. موزەییەن کا: بڕازێنێتەوە. دۆش: شان، کۆڵ. پەرتەو: ڕووناکی. شەوق: ڕووناکیدانەوە. شەمسە: نەخش و نیگاری سیمین کە بەسەر جلوبەرگدا دادەدووررێ.

واتە: ئەگەر والی جلەکانی کە بە کۆڵیەوەن و نەخش و نیگاری سیمییان بەسەردا دادووراوە، بڕازێنێتەوە، نەخشەکانی لە هیی خۆر جوانترن.

(١٧) مەیل: ئارەزوو. کەرەم: بەخشندەیی. طەبع: تەبیعەت، مۆرك و شەقڵ. طەبعی شۆخی:

**به خاصصییەت وەکوو زومڕووتە عەدلی**
**دەبێ سا دوشمنی کوێر بن وەکوو حەی (١٨)**
**لە باغا بیدی مەجنوون زۆر بەدەئبە،**
**ئەبەد، تا بێ بە سوجدەی ئەو دەبا پەی (١٩)**
**ڕەهوڕەسمی یەلی، گەر بێتە خاطر**
**دەکا شەق سینەیی قەیصەر بە دەشنەی! (٢٠)**
**ئەگەر بێ مەیلی ڕاو کا بۆ تەفەڕڕوج**
**دەکاتە صەعوە طوغرول، چنگی واشەی (٢١)**

تەبیعەتی جوانی، تەبیعەتی قۆشمەیی. دوونان: هیچوپووچان.

واتە: ئەگەر تەبیعەتی جوانی والی ئارەزووی بەخشندەیی بکا، وەك حاتەمی تەی دەتوانی کەسانی هیچوپووچ بکاتە مەرد و پیاو.

(١٨) خاصصیەت: خاسیەت، تایبەتمەندی. عەدلی: دادپەروەریی. حەی: مار.

واتە: خەسڵەتێکی والی ئەوەیە دادپەروەرییەکەی وەك بەردی زمڕووت گرانبەهایە و لە جێی خۆیدایە. با دوژمنەکانی وەك مار کوێر بن.

(١٩) بیدی مەجنوون: داربیی بەئوسوولْ. بەدەئب: بەمەشوور، سوور و پێداگر. ئەبەد: هەتاهەتایە. سوجدە: کڕنووشبردن. دەبا پەی: دەرکی پێدەکا، لێی حاڵی دەبێ.

واتە: مادەم داربیی شێت و شەیدا بەردەوام شۆڕە و لە کڕنووشبردندایە، تێدەگا و دەزانێ والی بۆچی کڕنووش دەبا. والی زۆر بێهەواوفیزە، بۆیە تا زەمانە پێش بکەوێ، باشتر لە کڕنووشبردنی والی تێدەگا.

(٢٠) ڕەهوڕەسم: ڕێوڕەسم. یەل: پاڵەوان. بێتە خاطر: بە خەیاڵ و بیردا بێ. دەکا شەق: دووکەرت دەکا. سینە: سنگ. قەیصەر: تزار، ناسناوی پادشایانی ڕووسیای کۆن. دەشنە: جۆرە خەنجەرێکە.

واتە: ئەگەر ڕێ و ڕەسمی پاڵەوانانەی والی بە خەیاڵدا بێ، سنگی قەیسەر بە خەنجەری خۆی دوولەت دەکا.

(٢١) تەفەڕڕوج: خۆشی، سەیران. صەعوە: چەشنە چۆلەکەیەکی پچووکە. طوغرول: مەلێکی شکاریی لە جۆری باڵندەی چاوزەردە، بازی ڕاو، شاهێن.

واتە: ئەگەر والی بۆ خۆشی و سەیران ئارەزووی ڕاو و شکار بکا، چنگی واشەی ئەو توغزول دەکاتە

**به دەنگی تەپڵی باز گەر بازی بەردا**
**عوقاب وەك كارەوان ماتە لە حەملەی! (٢٢)**
**خودایا! سا لە ڕێی ساقییی كەوثەر**
**هەتا بێ باغ و تاك و شاخ و ڕیشەی (٢٣)**
**بە بەزم و كامەرانی و عەیش و عیشرەت**
**لە بادەی لوطفی حەق پڕ بێ، پیاڵەی (٢٤)**

چۆلەكەیەكی چكۆلە.

صەعوە (غ): جوە. هەڵەیە.

(٢٢) ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی لە (پ)دا نین.

(باز)ی یەكەم: دووبارە. باز: مەلێكی ڕاوچییە. عوقاب: هەڵۆ. كارەوان: كەڕەواڵە. ماتە: سستە. حەملە: هەڵمەت.

واتە: ئەگەر والی دووبارە بازی بە دەنگی تەپڵی خۆی بەرەڵا كرد، هەڵۆ وەك كەڕەواڵە لە بەردەم هەڵمەتیدا مات و بێدەسەڵاتە.

(٢٣) ساقی: مەیگێڕ. كەوثەر: ئاوی حەوزی كەوثەر. تاك: ڕەز. شاخ: لقوپۆپ. ڕیشە: ڕەگ.

واتە: خودایە! باخ و ڕەزی والی و لقوپۆپ و ڕەگ و ڕیشەیان، لە پێناوی بەردەوامیی كاری مەیگێڕیی ئاوی حەوزی كەوسەردا هەتاهەتا و بەردەوام بێ.

(٢٤) عەیش: خۆشگوزەرانی. عیشرەت: ڕابواردن، كامەرانی و بەختیاری. بادە: شەراب. لوطف: لوتف، نەرم و نیانی. حەق: خودا.

واتە: پیاڵەی والی لە هەلومەرجێكی پڕ لە شادی و كامەرانی و ڕابواردن و خۆشگوزەرانیدا، پڕ بێ لە شەرابی لوتف و بەزەیی خودای گەورە.

-٢٠- (*)

ئەی دیدە، وا دْیارە کە تۆ ئابڕووم دەبەی
بەم نەوعە گەر لە مەجلیسی بێگانە گریە کەی (١)
ئەمشەو چ بوو سوپاهی خەیاڵ ئاخری نەهات!
ئابن بەقەد فەراخیی دڵ، «کەربەلاء» و «ڕەی» (٢)
لەو وەختەوە کە دوورە لە من ڕووی بەهاری تۆ
ڕووی کردْوم، خەزانی فیراقت، بە ڕەنگی بەی (٣)
یەکدەم ئەگەر بگاتە لەبم لێوی شەهدی تۆ
بۆ من هەمیشە، نەحلْصیفەت، ئەنگەبینە قەی (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، عا، غ، ج، کم، گم)دا هەیە.
کێشی عەرووز: موزاریعی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.
(١) مەجلیس: کۆڕ و کۆبوونەوە. گریە: گریان.
واتە: ئەی چاو، ئەگەر بەم جۆرە لە کۆڕی بێگاناندا بگریت، ئابڕووم دەبەی.
بەم نەوعە (غ): بەم شەرطە. (ج): بەم شەرمە. لە مەجلسی (ن): بە مەجلیسی.
(٢) دووەم نیوە ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (کم، گم)دا پاش و پێشن.
سوپاه: لەشکر. بەقەد: ئەوەندەی. فەراخی: فراوانی. کەربەلاء: شاری کەربەلا. ڕەی: باشووری تاران.
واتە: نازانم بۆچی ئەمشەو خەیاڵ توخنم نەکەوت تا تۆی پێ بهێنمەوە لای خۆم، لە کاتێکدا کەربەلا و «ڕەی»ش هێندەی دڵم فراوان و بەرین نین بۆ ئارامگرتن. باسی کەربەلای لەم شوێنەدا بۆ ئەوە کردووە کە دڵ کاتی لێکجیایی پڕ لە مەینەت و بەڵایە. «ڕەی»یشی لەبەر کێشی شیعر هێناوەتەوە.
سوپاهی خەیاڵ (ج): خەیاڵ سوپاهی. بەقەد (کم): بە قەدی. کەربەلاء و (عا، کم، گم): کەربەلا و. ڕەی (ج): ڕەی دەکەی. هەڵەیە.
(٣) فیراق: لێکجیایی. بەی: بەهێ.
واتە: لەوکاتەوە کە لە ڕووی گەشاوەی وەك بەهاری تۆ دوورم، وەرزی گەڵاڕێزانی دووریی تۆ ڕووی زەردهەڵگەڕاومی وەك بەهێ لێ کردووە.
کردووم (کم، گم): کردووە.
(٤) دەم: هەناسە. لەب: لێو. شەهد: هەنگوین. نەحلصیفەت: وەك ڕەفتاری مێشەنگ.

**گەھ دڵ ئەسیری زوڵفتە، گەھ شادیی بۆسەتە**
**زیندەی دەکەی بە ئابی بەقا، دەیکوژی بە حەی (٥)**
**ظاهیر بووە لە ئاھ و دڵ و ڕۆژ و ڕوویی من**
**ئەوقاتی قەوس و فەصڵی خەزان و تەمووز و دەی (٦)**
**مەخمموورە دیدەکەت لە خەو و بادە هەم لە ئەو**
**خەو چاکی سەند لە دیدەیی تۆ، ئینتیقامی مەی! (٧)**

ئەنگەبین: هەنگوین. قەی: ڕشانەوە.

واتە: ئەگەر لێوی هەنگوینیی تۆ بۆ یەکهەناسە بێتە سەر لێوم، هەموو گیانم وا شیرین دەبێ ڕشانەوەکەم وەك هەنگ دەبێتە هەنگوینی شیرین.

بۆ (کم، گم): بە. نەحل (غ، ج): گوڵ. (کم، گم): نەخل. هەڵەیە.

(٥) گەھ: جار. بۆسە: ماچ. زیندە کەی: زیندووی دەکەیتەوە. ئابی بەقا: ئاوی ژیان. حەی: مار، زیندوو. بە حەی: بە زیندوویی، بە مار.

واتە: دڵم جار بە جارێ دیلی ئەگریجەی تۆیە، جارجارێکیش بە ماچی لێوت شادمانی دەکەی. ئیتر یا بە ئاوی ژیانی لێوەکانت دەیژێنیتەوە، یا بە ماری زوڵفت پێوەی دەدەی و دەیکوژی.

ئابی (گم): ئاوی. حەی (غ، کم، گم): مەی.

(٦) ظاهیر: ئاشکرا، دەرکەوتوو. ئەوقات: کۆی وەقتە، کات. قەوس: نۆیەم مانگی ساڵی هەتاوی کە کۆتاییی پایزە. فەصڵ: وەرز. خەزان: گەڵاڕێزان، هەشتەم مانگی ساڵی کوردی. تەمووز: حەوتەم مانگی زایین. دەی: دەیەم مانگی ساڵی هەتاوی و یەکەم مانگی زستان.

واتە: دەرکەوتووە کە ئاھ و هەناسەی ساردم وەك سەرماوسۆڵەی مانگی (دەی) و گەرموگوڕیی دڵم وەك گەرمای مانگی (تەمووز) و ڕۆژی زەردهەڵگەڕاوم وەك مانگی (خەزان)ی پایز و ڕووی زەردیشم وەك زەردیی کۆتاییی پایز (قەوس) وایە.

لە ئاھ و دڵ و ڕۆژ و ڕوویی من (ما، عا، کم، گم): ئاهوویی دڵ ڕۆژووی من. (گم) لە پەراوێزدا ئاماژەی بۆ لەنگیی کردووە. ئەم نوسخانە (ئاھ و)یان بە هەڵە بە (ئاهووی) نووسیوە، کە لەگەڵ نیوەبەیتەکەیتر ڕێك نایێتەوە.

(٧) مەخموور: مەست. دیدە: چاو. بادە: شەراب. ئینتیقام: تۆڵە.

واتە: چاوەکانت بەهۆی نوستنەوە مەست بوون، جا مەبەست هەر نوستن بێ یا نەرمیی شێوەیان. پیاڵەی شەرابیش لە چاوەکانی تۆوە لێوڕێژ و مەست بووە. یانێ کە پیاڵەی شەراب چاوی بە چاوە

**ڕووت چەرخی حوسن و خاڵی لەبت قوطبی ثابیتە**
**مەشغووڵە دڵ بە گەردشی دەوری وەکوو جودەی (٨)**
**گوێم گرتووە هەمیشە لە ناڵەی حەزینی دڵ**
**"سالم!" لە غوربەتا چ بەتەئثیرە دەنگی نەی؟ (٩)**

مەستەکانی تۆ دەکەوێ، لە شەرمدا دەجۆشێ و لێی دەڕژێ. بۆیە نوستنی وەها چاوە مەستەکانی تۆی مەست کرد و تۆڵەی پیاڵەی شەرابی کە تۆ مەستت کردبوو، لێ سەندیتەوە.

لە خەو و بادە (کم): لە خود بادە. (گم): لە خودی بادە. هەردووکیان هەڵەن.

(٨) حوسن: جوانی. لەب: لێو. قوطب: ئەستێرە. ثابیت: جێگیر، چەسپاو. گەردش: سووڕانەوە. جەدەی: بورجی جەدی کە بورجی دوازدەهەمی فەلەکە بەرامبەر بە مانگی (دەی)ی هەتاوی.

واتە: ڕوخساری تۆ وەك چەرخی جوانییە، هەمیشە بەملاوبەولادا دەسووڕێتەوە بۆئەوەی ڕووناکیی خۆی بە جیهاندا بڵاو بکاتەوە. خاڵەکەی لێویشت وەك نوختەی قوتب لە جێی خۆیدا چەسپاوە و ناجووڵێتەوە. دڵی منیش وەك ئەستێرەی (جودەی) یا (جەدی) خەریکی سووڕانەوەیە بە دەوری ئەو خاڵەدا کە نوختەی قوتبە.

لێرەدا دەردەکەوێ کە "سالم" بەپێی یاسای ئەو ڕۆژە سەری لە ڕیازیات دەرکردووە و ئاماژە بەوە دەکا کە ئەو قسە باوەی وا -گوایە- ئەستێرەی جودەی قوتبە و ناسووڕێتەوە، هەڵەیە، بەڵکوو قوتب نوختەیەکی زۆر وردە لە نزیکی جودەی، جودەی بە دەوری ئەو نوختەیەدا دەسووڕێتەوە، بەڵام خەڵك هەست بەم وەزعە ناکەن.

ڕووت (عا، غ، ج، کم، گم): ڕووی. لەبت (عا): لەبی. (دڵ) لە (ج)دا کەوتووە.

(٩) حەزین: خەمگین. غوربەت: غەریبی، نامۆیی. تەئثیر: کاریگەری. نەی: شمشاڵ.

واتە: بەردەوام گوێم لە ناڵەی خەمگینی دڵ گرتووە کە لە ئاوازی شمشاڵ دەچێ، چونکە من لە تاران غەریبم و دەنگی شمشاڵیش کاریگەرە بۆ مرۆڤی غەریب.

غوربەتا (کم، گم): نوبتا. هەڵەیە.

(*) -٢١-

**جانانه حاڵی ئەم دڵە، گەر جوستوجۆ دەکەی:**

**مەشغووڵی ناڵەیە لە جودایی بە میثلی نەی (١)**

**چیهرەم کە ((پیش ازین)) بە صەفا ڕەنگی لالە بوو**

**ئێستە دەبا لە حینی خەزانا گرەو لە بەی (٢)**

**چاوت لە بەزمی بادەکەشان بێت و عیشوە کا**

**ناکەن، بە ڕەسمی نەشئەیی مەستی، هەوایی مەی! (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (عا، غ، ج، کم، گم)دا هەیە. سالم -بەپێی (دیوانی کوردی، بەرگی دووەم، ل٢٥٦، ٢٦٥)- ئەم شیعرەی لە وەڵامی شیعرێکی "کوردی"دا وتووە کە سەرەتاکەی ئەمەیە:

((شــێختنی بهّجرك والله یا صُبی

ڕەحمت برالە بۆ کەی و جەورت هەتا بە کەی؟!))

کێشی عەرووز: موزاریعی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) جانانە: یار. جوستوجۆ: سۆراخکـردن و بەدواداگـەڕان. جـودایی: جیـایی. میثـل: وەك. نەی: شمشاڵ.

واتە: ئەی دڵبەری گیانی من، ئەگەر لـە حاڵی دڵ دەپرسیت، بزانـە وەك شمـشاڵ لـەتاو دەردی دووری خەریکی ناڵینە.

(٢) چیهرە: چارە، ڕوخسار. پیش ازین: پێش ئەمە (فارسییە). صـەفا: دیمەنی جوان، بێگەردی. لالـە: مێلاقە، گوڵێکی سووری ئاڵە. حین: کات، دەم. خەزان: گەڵاڕێزان. بەی: بەهێ.

واتە: ڕوخسارم کە لەمەوپێش لـە سافی و گەشاوەییدا وەك لالە ڕەنگی سوور بـوو، ئێـستا لـە کاتی گەڵاڕێزاندا ئەوەندە زەرد بووە گرەو لـە بەهێ دەباتەوە.

ئێستە (عا، غ، کم، گم): ئیستێ. (ج): ئێستا. دەبا لـە حینی (عا): دبا لحی. هەڵەی نووسینە.

(٣) بادەکەشان: مەیخۆران. عیشوە: ناز. نەشئە: کەیف و شادی. هەوا: ئارەزوو.

واتە: ئەگەر چاوت لـە کاتی بەزمی پیاڵەگێڕانی مەیخۆراندا ئامادە بێ و ناز بکا، ئیتر ئەهلی ئـەو بەزمە تەرکی نەریتی خۆیان دەکەن و دەست لـە مەی خواردنەوە هەڵدەگرن.

بادەکەشان (گم): بادەگوشان.

**غەم جەیشی (سەلم) و (توور)ە ئەسەر "ئیرەج"ی دڵم**
**بە شۆڕشی وەغاوو ئەلەم سینە بوو بە (ڕەی) (٤)**
**"سالم!" دەلیلە میصرەعی "کوردی" بڵێ بە یار:**
**ڕەحمت براله، بۆ کەی و جەورت هەتا بە کەی؟! (٥)**

(٤) جەیش: لەشکر. سەلم و توور و ئیرەج: هەرسێ کوڕی فەرەیدوون و ئیرەج براچکۆلەیان بوو، فەرەیدوون کە وڵاتانی بەسەردا دابەش کردن، ڕۆم و ڕووس و ئالان و ڕۆژاوای دا بە سەلم و ناوی قەیسەری لێ نا، ئیرەج بووە خاوەنی وڵاتی ئەسڵیی خۆی. سەلم و توور حەسوودییان بە ئیرەج برد و نامەرادنە کوشتیان. ئەسەر: بۆ سەر. وەغا: شەڕ. ئەلەم: ئازار و ئێش. ڕەی: ناوچەی ڕەیی خوارووی تاران.

واتە: خەم وەك لەشکری (سەلم و توور)ە و هاتووەتە سەر "ئیرەج"ی دڵم. سینەم بۆ هەرا و شەڕ و ئازار بەرپاکردن بووە بە وڵاتی (ڕەی).

ئەسەر ئیرەجی (ف): ئەسراری بورجی. (کم، گم): دێتە سەر ئیرەجی. لەنگە. بە شۆڕشی وەغاوو ئەلەم (ف): بۆ شۆڕشی وەغاوو جەدەل (غ، ج): بۆ شۆڕش و وەغاوو جەدەل (کم، گم): بۆ شۆڕش و وەغا چ دەڵێ. لەنگە.

(٥) میصرەع: نیوەبەیت. ڕەحمت: بەزەییت.

واتە: ئەی سالم، ئەو نیوە شیعرەی کوردی بەڵگەی خێرە، بە یار بڵێ: برا تۆ ڕەحم و بەزەییت بۆ کەی و ستەم و زۆریشت تا کەیە؟

براله بۆ کەی و (کم): برا لە بوی. (گم): برا لە بۆ وی و.

-٢٢- (*)

"خضر"وارم ئەگەر ماچێ کەرەم کەی

«بە آب زندگانی بردەام پی» (١)

بەبێ زەحمەت گوڵاو گیرا لە گوڵشەن

«رُخش می‌بیند و گل می‌کند خوی» (٢)

غەمم پڕزۆرە موطریب! بێنە سازت

«رگش بخراش تا بخروشم از وی» (٣)

بە غەم، با ئەشکی یاقووتی نەڕێژم

«بە یاد لعلش ای ساقی! بدە می» (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، هـ، ف، غ، ڕ، کم، گـم)دا هەیـە. لـە (مـان، ن)دا خراوەتـە خانەی (ملمّعات)، تێهەڵکێشەکە لەگەڵ شیعرێکی "حافظ شیرازی"یە و پاش و پێشی تێدا کراوە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) خضر: خدری زیندە. وار: وەك. کەرەم کەی: ببەخشی. آب: ئاو. زندگانی: ژیان. بـردەام پی: پەیم پێ بردووە.

واتە: ئەگەر ماچێکم پێ ببەخشی، وەك خدری زیندەم لێ دێت. بەوە ڕێ بە ئاوی ژیان دەبەم.

بردەام (ڕ): پردەام. هەڵەیە.

(٢) گوڵشەن: گوڵزار و باخ. رُخ: ڕوو. می‌بیند: دەبینێ. خوی: ئارەق.

واتە: بەبێ ئەرك گوڵاو لە گوڵزار گیرا. ڕووی یار دەبینێ، گوڵی ڕووی ئاوی ئارەق دەڕێـژێ. دیارە ئارەقی ڕووی دڵبەر گوڵاوێکی نایابە.

گیرا (کم، گم): گیرە. می‌بیند و گل (کم): میبد و گولرا. (گم): میبەندەد گولرا.

(٣) پڕزۆر: بەهێز، بەتین‌وتاو. موطریب: گۆرانیبێژ. ساز: ئامێرێکی مۆسیقاییە وەك تار و سـێتار و چەنگ و عوود و شتی وا کە هەوایی یا ژێدار یا دەستییە. رگ: ڕەگ، دەمار، مەبەسـت تـاڵی سـازە. بخراش: بڕووشێنە، بخورێنە. بخروشم: بخرۆشێم، بێمە جۆش و خورۆش.

واتە: ئەی گۆرانیبێژ، خەم و خەفەتم بەتین‌وتاوە، سازەکە لێ بدە و تاڵەکانی بجووڵێنە، تـا منـیش وەك ئەو بێمە جۆش و خورۆش.

پڕ زۆرە (کم، گم): پەروازە.

(٤) ئەشك: فرمێسـك. یاقووتی: شـێوە یاقووت کە بەردێکی گرانبەهایە و مەبەست ئەو جۆرەیەتی

**کەسێ سەندوویە خوێنی خۆی لە دونیا**

**((کە باشد خون جامش در رگ و پی)) (٥)**

**نە دڵ دێنێ بڵێم: شەهـ بێ خەدەم بێ**

**((نە کس را می‌توانم دید با وی))! (٦)**

**نەما نامونیشانی تاجداران،**

**((کە می‌داند کە "جم" کی بود و "کی" کی؟)) (٧)**

کە ڕەنگی سوورە. لعل: بەردێکی گرانبەهای ڕەنگ‌سووری وەك یاقووتە. ساقی: مەیگێڕ.

واتە: با بەهۆی خەمەوە فرمێسکی خوێنین نەڕێژم. مەیگێڕ، وەرە بە یادی لەعلی لێوی یارەوە شەرابی سوورم بۆ بێنە، با دڵم ئارام بگرێ.

نەڕێژم (ف): بڕێژم.

(٥) خون: خوێن. جامش: دڵی. رگ و پی: دەمار و وردە ڕەگ.

واتە: کەسێك هەقی خوێنی خۆیی لە دنیادا لە بکوژانی خۆی سەندووە کە خوێنی دڵی لە دەمار و وردە ڕەگەکانی لەشیدا بێ. جا کە یەکێك کوشتی و خوێنی ڕژاند، ئەوسا خاوەنی خوێن دەتوانێ هەقی خوێنی وەربگرێ. بەڵام عاشقی وەك من خوێنی لە دەمار و وردە ڕەگدا نەماوە و ژیانم لە دەستی دڵبەردایە، بۆیە کە کوژرام هەقی خوێنم ناسێنرێتەوە.

سەندوویە خوێنی خۆی (ف): سەندوویە خۆشیی خۆی. (کم، گم): سەندوویەتی خوێنی. جامش (کم، گم): جانش.

(٦) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا دەیەمە.

شەهـ: شا. خەدەم: خزمەتکار.

واتە: نە دڵم دێت و بڕوایی دەدا بڵێم: با پادشاکەم خزمەتکاری نەبێ و نە دەتوانم و چاوم بەرایی دەدا کەسی‌تری لەگەڵ ببینم خزمەتکاری بێ.

بڵێم: شەهـ (کم، گم): کە شاهم. دید با وی (کم، گم): دیدە جوز دی.

(٧) جم: سووککراوی ناوی جەمشیدی –بەپێی شانامە– چوارەم پادشای پێشدادییە. کی: ناسناوی گەورەترین پادشایە. مەبەست پادشایانی کەیانیی وەك کەیقوباد و کەیکاوس و کەیخوسرەوە.

واتە: لەگەڵ دڵبەر ڕابوێرە و گوێ بە دنیا مەدە، تەماشا خاوەن‌تاجەکانی نەماون. بزانە ئێستا کێ دەزانێ (جەمشیدی جەم) کێ و (کەیخوسرەوی کەیانی) لە چ زەمانێکدا بووە؟

کی می‌داند (کم): کی داند. هەڵەیە.

**مەبە ئەیمەن لە تیر و قەوسی دونیا**
**«غنیمت دان فراغِ بهمن و دی» (٨)**
**لە عەهدی گوڵ حەرامە وەرع و پەرهیز**
**«بساطِ زهدرا چون غنچە کن طی» (٩)**
**نەکەی جانا! لەگەڵ من جەنگی بێصوڵح**
**«بباید کشتن و آنگە کنی حی» (١٠)**

(٨) ئەیمەن: دڵنیا، بێ ترس و بیم. تیر و قەوس: تیر و کەوان. تیر: چوارەم مانگی هەتاوی، یەکەم مانگی هاوین. قەوس: نۆیەم مانگی هەتاوی، سێیەم مانگی پایز. غنیمت دان: بە فرسەتی بزانە. فراغ: دەستبەتاڵی. بهمن: یازدەهەم مانگی هەتاوی، دووەم مانگی زستان. دەی: دەیەم مانگی هەتاوی، یەکەم مانگی زستان.

واتە: قەت لە تیر و کەوانی کارەساتەکانی جیهان ئەمین مەبە. دەستبەتاڵی و بێکاریی زستان بە هەل بزانە و بۆ خۆت لە هەردوو مانگی «بەهمەن» و «دەی»دا لە ماڵەوە دابنیشە و ڕابوێرە.

«دان فراغ» لە (ڕ)دا کەوتووە. نیوە فارسییەکە هیی حافظ نییە.

(٩) عەهد: سەردەم، چەرخ. وەرع: لە گوناه دوورکەوتنەوە. پەرهیز: پارێز، حەرامنەخۆری، خۆبەدوورگرتن.

واتە: حەرامە بنیادەم لە سەردەمی دەرکەوتنی گوڵی یاردا خۆ بە دوور بگرێ و لە گوناهی تەماشاکردنی ئەو گوڵە دوور بکەوێتەوە، بەڵکوو پێویستە فەرش و سفرەی تەرکی دنیا کردن وەك خونچەی نەپشکوتوو بپێچێتەوە و کۆبکاتەوە.

وەرع و (کم، گم): وەرعی. غنچە کن (گم): خونچە کەن. هەڵەیە. «زهدرا چون» لای حافظ «زهد همچون»ە.

(١٠) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا پێنجەمە.

جانا: ئەی گیانەکەم. صوڵح: ئاشتی. کشتن: کوشتن. آنگە: ئەودەمە. حی: زیندوو.

واتە: ئەی گیانەکەم، شەڕی وا لەگەڵ مندا مەکە کە پاشان ئاشت نەبیتەوە، پێویستە وەك عاشق دەکوژی، پاشان زیندوویشی بکەیتەوە.

نەکەی (گم): مەکە. جەنگی بێصوڵح (ھ): صوڵحی بێجەنگ. «من» لە (ن)دا کەوتووە.

## وەرە "سالم!"، ئەگەر ئەربابی سەمعی،
## «حدیث بی زبانان بشنو از نی» (۱۱)

(۱۱) ئەرباب: خاوەن. سەمع: بیستن. حدیث: باس‌وخواس، بەسەرهات. بی‌زبانـان: بێزمانـان. بشنو: ببیستە. نی: شمشاڵ، قامیش.

واتە: سالم، ئەگەر لە ڕیزی کەسانی جوانیپەرستدای، وەرە باس‌وخواس و بەسەرهاتی عاشـقانی بێزمان لە سۆز و ئاوازی خەمگینی شمشاڵ ببیستە کە لە هی ئەوان دەچێ.

سەمعی (کم، گم): حوسنی. بی‌زبانان (گم): این زبانان.

## -٢٣- (*)

**ماری موو بۆ باغی ڕوو پەرژین دەکەی**
**کافری بێدین ئەمینی دین دەکەی (١)**
**بۆ جەوابی یەکسوئالی من لە چاو**
**هەر نەظەر تیری نیگەهـ تەعیین دەکەی (٢)**
**شیعری "فەرهاد"م دەخۆند، لێوت گەزی**
**یەعنی: بۆ تەحسینی ڕووی "شیرین" دەکەی؟! (٣)**
**یادی وەصڵ، ئەی دڵ! لە هیجرا موشکیلە**
**وای لە (دەی)دا، مەیلی (فەروەردین) دەکەی؟! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشیی مەحزووف.

(١) ئەمین: دەستەمۆ، هۆگر.

واتە: ئەی دڵبەری بێویژدان، تۆ باخی ڕوخسارت بە ماری مووی ئەگریجەت پەرژین دەکەی، لە کاتێکدا عاشق پێویستی بە تەماشا و سەیرانی ئەو باخەیە. ئەمە وەك ئەوە وایە کافرێکی بێدین بکەی بە دینپارێز، یا کافرێکی بێدین لە تینی ڕوخسارت دڵنیا دەکەیەوە و لێی ئەمین دەبی.

(٢) جەواب: وەڵام. سوئال: پرسیار. نەظەر: ڕوانین. نیگەهـ: نیگا، تەماشا. تەعیین دەکەی: دادەمەزرێنی.

واتە: من وەڵامی پرسیارێکم لە چاو دەویست، کە پێم بڵێ بۆچی وا هەمیشە مەستە و لە حاڵێکی ئاساییدا نییە. کەچی نەك هەر وەڵامم دەست نەکەوت، بەڵکوو کەوتە دوژمنایەتی کردنم و لە هەر تەماشاکردنێکیشدا تیری نیگای بۆ دیاری دەکردم.

لە چاو (ن): بە چاو.

(٣) فەرهاد: عاشقی شیرین. تەحسین: جوانکردن.

واتە: من شیعری فەرهادم دەخوێندەوە، کەچی ئەو بە زویری و سەرسامییەوە لێوی خۆی گەزی. یانی من وازم لە عیشقی ئەو هێناوە و "شیرین"ی یاری "فەرهاد"م لە لا جوانترە.

دەخۆند (کم، گم): دەخوێند. (دەخۆند) بە (دەخوێند)یش دەخوێنرێتەوە، چونکە (وێ) لە نووسینی کۆنی کوردیدا وێنەی نەبووە و بە سەلیقە ناسراوەتەوە. لێوت (کم، گم): لێوی.

(٤) ئەم بەیتە لە (حا، کم، گم)دا نییە.

**ڕووت مونەققەش بوو لە نەظمی چەتر و خاڵ**
**ڕۆژ و شەو هەر مەشقی نەقشی چین دەکەی! (٥)**
**خەم دەبێ چەوگانی زوڵفت بۆ زەنەخ**
**وەه چ خۆش بازی بە گۆی سیمین دەکەی! (٦)**
**عەیبی "سالم" بۆ دەڵێی، واعیظ لە عیشق**
**کوفرە بۆ تۆ مەنعی ڕێگەی دین دەکەی! (٧)**

وەصڵ: بەیەكگەیشتن. هیجر: دووری. موشکیلە: گیروگرفتە، ئاڵۆزە. دەی: یەکەم مانگی زستان و دەیەم مانگی ساڵی هەتاوییە. مەیل: ئارەزوو. فەروەردین: یەکەم مانگی بەهار و یەکەم مانگی ساڵی هەتاوییە.

واتە: ئەی دڵ، تۆ لە یار دووری، بۆیە زەحمەتە پێی بگەی. وەك ئەوە وایە تۆ لە سەرەتای زستانێکی ساردوسڕ و تووشدا بی و ئارەزووی سەرەتای بەهارێکی تەڕوبڕ و گەشاوە بکەی.

(٥) مونەققەش: نەخشکراو، پڕ نیگار. نەظم: ڕێکخستن. نەقش: نەخش و نیگار. چین: وڵاتی چین.

واتە: ڕوخسارت نەخشاندووە و نیگاری زوڵف و خاڵ بەسەر تەختی ڕووتەوەیە. شەو و ڕۆژ خەریکی مەشق‌کردنی لەسەر شێوەکانی نەخشی چینی، یا مەشقی چین لەسەر چین دانانی ئەگریجەت دەکەی.

چەتر (کم): زوڵف.

(٦) خەم: چەماوە. چەوگان: گۆچان. زەنەخ: چەناگە. وەه: هەی. بازی: یاری. سیمین: زیوین.

واتە: کە ئەگریجەی شێوەگۆچانت بەرەو چەناگەت دەچەمێتەوە، بەه بەه چەند خۆش یاری بە گۆی زیوینی چەناگەت دەکا.

(٧) عەیب: خەوش. واعیظ: ئامۆژگاریکەر. مەنع: قەدەغەکردن.

واتە: ئەی ئامۆژگاریکەری وشك و بێئاگا، تۆ بۆچی پەردە لەسەر خەوش و کەموکووڕیی سالم لە عیشقدا هەڵدەماڵی؟ دین بەبێ عیشق دانامەزرێ. هەر کەسێك عەقڵی سالمی هەبێ، دەبێ عاشق بێ.

دەڵێی واعیظ (گم): دڵی سالم. هەڵەیە.

## -٢٤- (*)

**دریغا نەقدی دینم کردە صەرفی کاری دونیایی**
**صەلاحی دونیەویشم دایە دەستی نەفس و خودڕایی (١)**
**بلێم دونیا درەنگ سەرچێ، وە یاخۆ ئاخیرەت زوو بێ**
**منی شەرمەندەیی موفلیس؛ نە دونیاییم، نە عوقبایی (٢)**
**لە جوانیدا بە دانش هەرچی سککەی ئابڕووم لێدا**
**بە نادانی لە پیریدا هەمووم دانا بە خۆڕایی (٣)**
**سیاهەی جەمعی صەرفی نەقدی عومری خۆم تەماشا کرد،**
**چ دەخلی نیکنامیی تیا نەبوو، جوز خەرجی ڕیسوایی! (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان) و لە بەشی (غزلهای جدیده)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) دریغا: حەیف، بە داخەوە. نەقد: پارە، دراو. صەلاح: قازانج. دونیەوی: دنیایی. خودڕایی: خۆویستی، ملهوڕی.

واتە: بە داخەوە هەموو پارەیەکی دینداریی خۆمم بۆ کاری دنیایی بە خەرج دا. قازانجی دنیاییشم نایە چنگی نەفسی سەرکێش و خۆپەرست.

(٢) سەرچێ: بەسەر بچێ، ببڕێتەوە. ئاخیرەت: ئەودنیا. شەرمەندە: شەرمەزار. موفلیس: نابووت. دونیایی: بۆدنیاژیاو. عوقبایی: بۆ ئەودنیا کارکردوو.

واتە: ئەگەر دنیا درەنگ ببڕێتەوە و قیامەتیش زوو دەست پێبکا، منی شەرمەزاری نابووت و بێمایە، بەشم لە هەردوو دنیادا نییە.

(٣) دانش: زانست، زانین. سککەلێدان: پارە دروستکردن. نادانی: نەزانی.

واتە: لە تافی جوانی و لاویدا ئابڕوویەکی زۆرم بە زانایی کۆکردەوە، کەچی لە پیریدا هەموویم بە خۆڕایی دۆڕاند.

(٤) سیاهە: لیست. جەمع: کۆ. صەرف: خەرجکردن. دەخل: داهات. نیکنامی: ناوجوانی، ناووبانگی باش. جوز: جگە لە. خەرج: سەرفکردن.

واتە: کە ڕوانیمە لیستی سەرجەمی عومری بەخەرجدراوی خۆم، لە خەرجیی ڕیسوایی بەدەر، هیچ داهات و دەستکەوتێکی ناوجوانی و ناووبانگ باشیی تێدا نەبوو.

**حەریصیی پیریی و جەهلی شەبابە کەسبی کەونەینم**
**تەریقی عەهدی پیریم و خەجاڵەتمەندی بوڕنایی (٥)**
**لە گوفتەی پیریی و کردەی جەوانی بەس هەراسانم**
**خەرەفگۆی ناتەوانیم و خیلافکردەی تەوانایی (٦)**
**لە خوانی مونعیم و ئیرشادی مورشید، هەردو مەحرووم**
**لە دیدارم هەراسانن، چ ئەملایی، چ ئەولایی! (٧)**
**ڕەزالەت پەستییە "سالم!"، بوڵەندی ضیدی بەدبەختی**
**مەچۆ بەم نەوعە بۆ مەجلیس؛ نە پایینی، نە بالایی! (٨)**

(٥) حەریص: پەرۆش، مشوورخۆر. جەهل: نەزانی. شەباب: لاوی. کەسب: دەسکەوت. کەونەین: هەردوو دنیا. تەریق: شەرمەزار. عەهد: سەردەم. زەمان. خەجاڵەتمەند: شەرمەزار. بوڕنایی: جوانی.

واتە: دەسکەوتی هەردوو دنیام پەرۆشی سەردەمی پیری و نەزانیی هەرەتی لاوێمە، بۆیە ڕووزەردی سەردەمی پیری و شەرمەزاری تافی جوانی و لاویی خۆمم.

(٦) گوفتە: قسە، گفتولفت. بەس: زۆر. خەرەفگۆ: خەڵەفاوی قسەی نابەجێبێژ. ناتەوانی: بێتوانایی. خیلافکردە: پێچەوانەکردوو. تەوانایی: توانایی.

واتە: زۆر بێزارم لە قسەی بێکردەوەی کاتی پیری و کاری بێبەرنامەی لاوی. ئێستاکە بێ تینوتوانم، قسەی بێجێ دەکەم. ئەوسایش کە توانا بووم، کردەوەم پێچەوانە و ناڕاست بوو.

(٧) خوان: سفرە. مونعیم: خودای ڕۆزیبەخش و بژیو دابینکردوو. ئیرشاد: ڕێبەدیکردن، ڕێنیشاندان. مورشید: ڕابەر، ڕێنیشاندەر. مەحرووم: بێبەش. دیدار: چاوپێکەوتن.

واتە: بێبەشم لە سفرە و خوانی خودای ڕۆزی دابینکەر و ڕێنیشاندانی ڕابەری دینی کە دەبێ پێغەمبەر بێ، هەردوولا لێم بێزارن.

(٨) ڕەزالەت: داماوی. پەستی: نزمی، سووکایەتی. بوڵەندی: بەرزی. ضید: دژ، پێچەوانە. بەم نەوعە: بەم جۆرە. مەجلیس: کۆڕ و کۆبوونەوە. پایین: نزم، خواردەست. بالا: بەرز.

واتە: "سالم"، داماوی نزمی و خواردەستییە، بەرزیش پێچەوانەی بەدبەختییە. تۆ بەم حاڵ و شێوەیە مەچۆرە کۆڕی یاران، چونکە نە نزمی و نە بەرزی.

## -٢٥- (*)

**ئەسیرم باز لە داوی قەیدی طوڕڕەی موشکبۆ موویی**
**((فرنگی زادە خویی، کافری، زنار گیسویی)) (١)**
**گوڵئەندامیێ، سەمەنبوویێ، مەلەکڕوویێ، فریشتەخوو**
**((زلیخا مشربی، لیلیوشی، شیرین سخنگویی)) (٢)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، ف، ج، ڕ، کم، پ، گم)دا هەیە. لە (مان، ن)دا خراوەتە ناو (ملمعات). "پیرەمێرد" لە (ژمارە ٨١٧، ١٧ی کانوونی ثانیی ١٩٤٦، ل٢)ی ڕۆژنامەی "ژین"دا نووسیویە: تێهەڵکێشی "سالم" لەسەر شیعری "شەوکەت". ئەو ناسناوە لە دواینبەیتیشدا هەیە. ئەگەر شەوکەت، محەممەدئیسحاق "شەوکەتی بوخاری"ی شاعیر بێ، ئەوا فارسیی ئەم تێهەڵکێشە، نە لە دەستنووسی ناتەواوی دیوانەکەیدا لە (یەکەی دەستنووس)ی (بنکەی ژین) و نە لە دیوانی تەواویداکە لە بەشی دەستنووسی کتێبخانەی زانستگای ڕیاز (الریاض) پارێزراوە، هەبوو؛ بەڵام تەواوی فارسییەکەی لە کەشکۆڵەکەی "محەممەدڕەحیم ڕەمەزان"دا بە ناوی "شەوکەت"ەوە هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) ئەسیر: دیل. باز: دیسان. قەید: کۆت. طوڕڕە: زوڵف، ئەگریجە. موشکبۆ: بۆن میسک. فرنگی زادە خویی: خوو وەك هیی بەچکە فەڕەنگییەك. زنار: کەمەربەندێکە مەسیحییانی ژێر سایەی حوکمی ئیسلامی لە پشتیان دەبەست بۆ خۆجیاکردنەوە و خۆناساندن. گیسو: پرچ و کەزی.

واتە: دیسان داوی کۆتی ئەگریجەی دڵبەرێك کە مووی بۆنی میسکی لێ دێ و خووی وەك خووی بەچکە فەرەنگیە و موسوڵمان نیە و زوڵفی وەك زوننار کچە مەسیحیانە، دیلی کردووم.

ئەسیرم باز لە داوی قەیدی طوڕڕەی موشکبۆ موویی (پ): ئەمان، وا کەوتمە داوی چینی زوڵفی شێوەئاهوویی. فرنگی زادە خویی، کافری (کم، گم): فەرەنگی زادەیی خوو کافری. زُنّار (گم): زیننار.

(٢) گوڵەندام: ئەندامی لەش وەك گوڵ. سەمەن: یاسەمین، گوڵێکی بۆنخۆشی ڕەنگ زەرد یا شین یا سپییە. بۆ: بۆن. مەلەك: پەری. زلیخا: هاوسەری عەزیزی میسر کە یووسفی لە کاروانێك کڕییەوە و گەورەی کرد و سەوداسەری جوانیی بوو، بە خۆشی و ناخۆشی بۆی دەستەمۆ نەبوو، بۆیە خستییە زیندان. مشرب: زەوق و ئارەزوو. لیلیوشی: وەك لەیلا. شیرین سخنگویی: وەك شیرین قسەکەرێك.

واتە: ئەو دڵبەرە ئەندامی لەشی وەك گوڵ و بۆنی وەك سەمەن خۆش و ڕوخساری وەك پەری و خوو و ڕەوشتی وەك فریشتەیە، لە دڵداری و حەز و ئارەزوودا وەك زولەیخا و شێوەی وەك لەیلا و

**غەریب تاقە بە مەحبووبی، تەماشای خاڵی لای لێوی**

**«تو گویی بر لب آب بقا بنشسته هندویی» (٣)**

**بڵێم: گەر وەك گوڵ و ماهە بە نەفحە و ڕوو، خەطا و سەهوە**

**«ندارد مه چنین رویی، ندارد گل چنین بویی» (٤)**

**لە تۆی پیراهەنی دەرکەوت کە پوستانی، وتم: ئەی دڵ!**

**«تماشاکن کە سرو ناز بار آوردە لیمویی!» (٥)**

گوفتاری شـیرینە.

گوڵئەندامێ، سەمەنبوویێ، مەلەكڕوویێ، فریشتەخوو (پ): دڵی یووسف دەبا و قـەیس شـێت دەکا، فەرهاد دەسووتێنێ. لیلی وشی (کم، گم): لیلی ڕەوش.

(٣) غەریب: نامۆ و ئاوارە. تاقە: تاکە، بێکەسە. مەحبووب: خۆشەویست، یار. لـب: لێـو. آب بقا: ئاوی ژیان و مانەوە. بنشستە: دانیشتووە. هندو: خاڵ.

واتە: لـە خۆشویستندا کەسێکی تاقانەی غەریبە، بڕوانە خاڵی لای لێوی دەڵێی هیندییەکی ڕەشـە لە قەراغی ئاوی ژیاندا دانیشتووە. خاڵی بە هیندی و ئاوی دەمی بە ئاوی ژیان شوبهاندووە.

غەریب تاقە بە مەحبووبی، تەماشای خاڵی لای لێوی (پ): لـە گۆشەی لێوی لەعلی خاڵی ڕەش شیعرێکی تەشبیهە. بنشستە (ڕ): بنشستد.

(٤) ماه: مانگ. نەفحە: بۆن و بەرامە. خەطا: خەتا، هەڵە. ندارد: نییەتی. مە: مانگ. چنین: وەها.

واتە: ئەگەر بڵێم لـە بۆنوبەرامەدا وەك گوڵ و لـە ڕوخساردا وەك مانگە، بە هەڵەدا چووم. چونکە نە گوڵ ئەو بۆنوبەرامەی ئەوی هەیە و نە مانگیش وەك ڕوخساری ئەو جوانە.

ماهە بە نەفحە (ف): ماهە نەفخە. هەڵەیە. (پ): مانگە بە بۆن. ندارد مە...، ندارد گـل (ف، ڕ، کم، گم): ندارد گول...، ندارد مە. رویی (ج): بویی.

(٥) تۆ: توێ. پیراهەن: کراس. پوستان: مەمك. سرو ناز: سەروی نەوڕەستە.

واتە: کە مەمکەکانی لـە توێی کراسەکەیەوە دەرکەوتن، وتم تەماشاکە سـەروی تـازە پێگەیـشتوو بەری لیمۆی هێناوە، هەرچەندە سەرو بێبەرە.

لە تۆی پیراهەنی دەرکەوت کە پوستانی (پ): لەسەر باڵای نەمامی سێوی مەمکیم دی. لە تـۆی (گم): لـە توێی. کە پوستانی (کم، گم): دوو پوستانی.

«لە تۆی»، دەشێ بە «لـە توێی»ش بخوێنرێتەوە، چونکە ئەوسا «وێ» نیشانەی لـە نووسیندا نەبووە.

**به عیشوەی چاوی مەخمووری وەها پەیوەستەیە ئەبرۆی**
**«تو پنداری کمانداریست در دنبال آهویی» (٦)**
**به "سالم" شەوکەتە زەنجیری مەجنوونی لە کۆی لەیلا**
**«اسیر خال او گردم ز تیر چشم جادویی» (٧)**

(٦) عیشوە: ناز. مەخموور: مەست، خومار. پەیوەستە: پێوەبەستراو. ئەبرۆ: برۆ. پنداری: خەیاڵ دەکەی، وای بۆدەچی. کمان: کەوان. دنبال: لەدوای. آهو: ئاسك.

واتە: ناز و عیشوەی چاوە مەستەکانی دڵبەر وەها لەگەڵ برۆی دەرکەوتوویدا کەوتوونەتە یەك، وا خەیاڵ دەکەی کە بۆی بڕوانی دەڵێی ڕاوچییەکی تیر و کەوان بەدەستە بە دوای ئاسکێکەوە، دەیەوێ تیری تێبگرێ.

مەخمووری وەها پەیوەستەیە ئەبرۆی (ج، ر): مەخمووری وەها پەیوەستە ئەبرۆیی. (کم): مەخمووری وەها پەیوەستە بە ئەبر[ۆ]ی. (پ): وەك ئاسکی و برۆی پەیوەستی صەییادی.

(٧) ئەم بەیتە لە (ف)دا نییە.

شەوکەت: شانوشکۆ، ناساوی "شەوکەت"ی شاعیر. مەجنوونی: شێتی، هیی وەك (مەجنوون)ی عاشق. چشم: چاو.

واتە: وەك مەجنوون بە زنجیر بەسترانەوە لە ئاستانەی لەیلادا، سەبارەت بە سالم، حورمەت و پایە و شکۆمەندییە. خودایە، با من بەهۆی تیری چاوی سیحربازێکەوە هەر دیلی خاڵی بم. یانێ دڵبەرێکی سیحرباز بە تیری چاوە جوانەکانی ڕام بکرێ و لەو ڕاگرتنەدا بڕوانمە خاڵی گۆنای و دیلی عیشقی ئەو خاڵەی بم.

مەجنوونی لە کۆی لەیلا (پ): شێتیی لەیل لە دوجەیلا. گردم ز تیر (پ): گشتم بە بند.

## پیتی (یٚ)

### -١- (*)

ئەو یارە هەتا وا لە منی غەمزەدە لا بێ
شوربم لە دەما زەهرە، ئەگەر ئابی بەقا بێ! (١)
زوڵفت لە دو لا ثابیتی نەفیی وەکوو تۆی کرد
لێی لادە، بلاٌ دا لە دو سەر شێوەیی لا بێ (٢)
دیدەم بە نیگای دیدەیی مەستت، دڵی صەد چاك
بەس سەهوە سپاردوومە کە چاکێ بە خەرابێ! (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، حا)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) غەمزەدە: خەفەتبار، دڵتەنگ. لا بێ: کەنارە بێ، گوێنەداتێ. شورب: خواردنەوە. ئابی بەقا: ئاوی ژیان.

واتە: تا ئەو دڵبەرە خۆی لە منی خەفەتبار کەنار بگرێ و گوێم نەداتێ، هەموو جۆرە خواردنەوەیەك لە دەممدا، تەنانەت ئەگەر ئاوی زیندەگانیش بێ، وەك ژەهر وایە.

(٢) ئەم بەیتە لە (حا)دا سێیەمە.

دو لا: بە دوو شێوەی وەك پیتی (ل)، دوو تەنیشت. ثابیتی کرد: سەلماندی، چەسپاندی. نەفی: ڕەتکردنەوە، نەبوون. بلاٌ: با. لا: پیتی (ل)، لە (لا)، نا.

واتە: ئەگریجەت لە هەردوولای ڕوخسارتدا سەلماندی کە تۆ وێنەت نییە، لەبەرئەوە دەستی لێمەدە و وازی لێ بێنە، با لە هەردوو سەرەوە شێوەی پیتی (ل) وەربگرێ.

(٣) چاك: لەت. بەسێ: زۆر، بەڵام. چاکێ: باشێ. خەرابێ: خراپێ.

واتە: دڵی صەد پارچە و لەتم دەدەم بە نیگایەکی چاوی مەستی تۆ. زۆر بە هەڵەدا چووم کە نیگایەکی چاکی تۆم سپاردووە بە دڵی خراپی خۆم.

(خەرابێ) لە (مان)دا (نجدابی)یە و هەڵەی نووسینە.

مەعشووقەیی ئەم شارە هەموو طالیبی جاهن
تف لەو کەسە، وەك من، کە گەدا و بێسەروپا بێ! (٤)
بۆ خاطری ئەغیارە کە یار "سالم"ی تۆراند
نەیداوە کەسێ تووتییی ناطیق بە غورابێ!! (٥)

(٤) مەعشووقە: یار. جاه: پلە و پایە، بەرزی. گەدا: هەژار. بێسەروپا: بێسەرویێ، بێسەروبەر.
واتە: دڵبەرانی شار هەموویان پلە و پایەیان نەبێ، کەڵکی هیچ ناگرن.
(٥) خاطر: خاتر، دڵڕاگرتن. ئەغیار: بێگانە. گۆیا: قسەکەر. غوراب: قەلەڕەش.
واتە: یار، لەبەر خاتری بێگانە، دڵی "سالم"ی شکاند و تۆراندی. ناهەقیی کرد کە تووتییەکی بەدەموزمان و قسەکەری بە قەلەڕەشێکی بێدەموزمان گۆڕییەوە.

-٢- (*)

**زەمانە قەت لەگەڵ ئەولادی ئادەم باوەفا نابێ**
**وەکوو گوربەی سیەھ -ئەصڵەن- بە مەردوم ئاشنا نابێ (١)**
**مەکانی تیرە، وەك تەرکەش، لە غەمزەت قەلبی بیمارم**
**لە لەوحی سینە بۆ تیری نیگاهی غەیرە جا نابێ (٢)**
**چ صوڵحێکە، وتم، زوڵفت لەگەڵ ڕوو باھەمن دایم؟**
**وتی: ھەرگیز لە شەودا مەجلیسی من بێچرا نابێ (٣)**
**لە ضەربی نەبضی ئاشوفتە و لەبی خوشکم، موحەققەق بوو:**
**بەجوز بۆسەی لەبت، دەردم بە صەد حیکمەت دەوا نابێ (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، ف، غ، ن، ج، کم، گم)دا ھەیە.

کێشی عەرووز: ھەزەجی ھەشتیی تەواو.

(١) واتە: ڕۆژگار قەت لەگەڵ مرۆڤ وەفادار نابێ، وەك پشیلەی ڕەش وایە کە ھەرگیز نابێ بە ئاشنای مرۆڤ. ئەمەیش بەڵگەیەکی کۆمەڵایەتیی ھەیە کە ئەوەیە پشیلەی ڕەش لە ماڵدا شوومە.

قەت (عا، ف، غ، ج): قەد.

(٢) تەرکەش: تیردان.

واتە: دڵی بیمارم تیردانی تیری غەمزەتە، تەختی سنگم جێی تیری نیگای یەکێکیتری تێدا نابێتەوە.

غەمزەت (ف، کم، گم): دیدەت.

(٣) ئەم بەیتە لە (ف)دا پێنجەم و لە (غ، ج، کم، گم)یشدا شەشەمە.

باھەمن: پێکەوەن.

واتە: بە یارم وت ئەمە چ ڕێککەوتنێکە کە زوڵف و ڕووت ھەمیشە پێکەوەن و لە یەکتر جیا نابنەوە؟! وتی: من لە شەودا ھەردەم چرام ھەیە.

صوڵحێکە (عا): صوبحێکە. وتم: زوڵفت لەگەڵ (مان): لەگەڵ وتم: زوڵفت. ھەڵەی نووسینە.

باھەمن (کم، گم): پێکەوەن.

(٤) نەبضی ئاشوفتە: ترپەی شێواوی دڵ. لەبی خوشك: لێوی وشك. بە جوز: جگە لە.

واتە: لە ڕێی لێدانی شێواوی دڵم و لێوی وشکمەوە بۆم دەرکەوت، ماچی لێوی تۆ نەبێ، دەردەکەم بە سەد کاری پزیشکی تیمار نابێ.

**دەبێ هەر حەق بپارێزێ لە گێژاوی غەما، کەشتی**
**تەلاشی ناخودا، ئەی دڵ! بە ئەلطافی خودا نابێ (٥)**
**لە فیتنەی دامە ماهیی تیشنەلەب هیجرانی ئاوی دی**
**لە زوڵفت شانە گەر موهلەت بدا، دڵ قەد جودا نابێ (٦)**
**مەقامی حیرەتە لێوت لەناو ئاییینەیی ڕووتا**
**لە جێگەی ڕۆشنا سەرچەشمەیی ئاوی بەقا نابێ (٧)**
**لە ڕووی غونچەی دەهانت گوڵ لە گوڵشەندا بەها ناکا**
**کە سککەی زەڕ ظوهووری بوو، ڕەواجی شەهڕەوا نابێ (٨)**

ضەربی (عا): فەربی. هەڵەیە. ئاشوفتە و (کم، گم): ئاشوفتەم.

(٥) ئەم بەیتە لە (ف)دا نییە و لە (غ، ج، کم، گم)یشدا حەوتەم بەیتە.

ناخودا: کەشتییەوان. ئەلطاف: لوتف و سۆز.

واتە: دەبێ هەر لوتفی خودا کەشتی لەناو گێژاوی مەینەتدا بپاریزێ، ئەگینا هەوڵ و کۆششی کەشتییەوان قەت جێی لوتفی خودا ناگرێتەوە.

دەبێ (کم، گم): وەلێ. تەلاشی (کم، گم): تەماشای.

(٦) ئەم بەیتە لە (ف، ج)دا چوارەمە.

دام: داو. ماهی: ماسی. تیشنەلەب: لێوتینوو. هیجران: دووری. موهلەت: مۆڵەت.

واتە: ماسیی تینوو بە هۆی فیتنەگێڕیی داوەوەیە لە ئاو دوور کەوتووەتەوە. دەنا ئەگەر شانە مۆڵەتم بدا، قەت ناهێڵم دڵم لە ئەگریجەت جوێ ببێتەوە.

موهلەت: (کم، گم): مۆڵەت. قەد (کم، گم): قەت.

(٧) ئەم بەیتە لە (غ)دا پێنجەم بەیتە و لە (ج)دا نییە.

حیرەت: سەرسامی. ئاوی بەقا: ئاوی ژیان.

واتە: لێوت کە ئاوی ژیانە، مایەی سەرسامییە کە لەناو ئاوێنەی ڕۆشنی ڕووتدا بێ، چونکە وەك باوەڕ ئاوی ژیان لە شوێنێکی تاریکدایە، نەك شوێنی ڕۆشن.

ئاییینەیی (ف): ئاوێنەیی.

(٨) شەهڕەوا: پارەیەکی قەڵب بووە شای قاجار بەزۆر ڕەواجی پێ داوە. دەهان: دەم. سککەی زەڕ: پارەی زێڕ.

نەچوونی خزمەتی جانانە گەر وەك مردنە، ئەمما
مەچۆ "سالم!"، لە بەزمی مونعیما جێگەی گەدا نابێ! (٩)

واتە: گوڵ لە ئاستی خونچەی دەمتدا لە باخی گوڵاندا نرخی نییە، وەك چۆن کە پارەی زێڕ هاتە ئاراوە، ئیتر پارەی قەڵب برەوی نامێنێ.

لە گوڵشەندا (عا، ج، کم، گم): لە بوستانا. (ف): لە بوستان قەد. شەهرەوا (کم): پارە و پوولی وا.

(٩) جانانە: یار، خۆشەویست.

واتە: ئەگەر نەچوونە خزمەتی یاران بە گیان و بە دڵ وەك مردن وابێ، سالم تۆ مەچۆ، چونکە کۆڕی دەسەڵاتداران جێی هەژاری تێدا نابێتەوە.

جانانە گەر (عا، کم، گم): دڵبەر ئەگەر.

-٣- (*)

جانا! هەوەسی عیشقت بێ تەرکی هەوەس نابێ
کامە کەسی وا بێ، کام نایابە؟ چ کەس نابێ (١)
شەهـ کێیە لە لای مەعشووق؟ عوششاقی گەدا شاهن
ئارێ لە نەظەر ئەودا عەنقا بە مەگەس نابێ (٢)
عومرێکە لەتاو زوڵفت یاتاغی دڵە سینەم
بۆ مورغی لەداوترساو گوڵشەن بە قەفەس نابێ! (٣)
ئەم مەرحەلەجۆ بۆ دوزد، ئەو مەسئەلەجۆی ڕیشوەت
بۆ نەفعی موسوڵمانان (قاضی) بە (عەسەس) نابێ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان)دا هەیە.
کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەب.
(١) جانا: گیانە. هەوەس: ئارەزوو.
واتە: گیانە، ئەوی ئارەزووی عیشقی تۆی هەبێ، دەبێ دەست لە دیوانەیی و شێتی هەڵبگرێ. هەر کەسێك وابێ، نایاب و پەسەندە و هیچ کەسێکیتر بۆ ئەوە ناشێ.
(٢) شەهـ: شا، پادشا. مەعشووق: یار. عوششاق: دڵداران. گەدا: هەژار. ئارێ: بەڵێ. لە نەظەر: لە بەرچاوی. عەنقا: سیمورغ، باڵندەیەکی ئەفسانەییە. مەگەس: مێش.
واتە: کێ لە لای دڵبەر پادشایە؟ دڵدارانی هەژار و داماو پادشان. بەڵێ، عەنقایش بەو گەورەییەی خۆیەوە لە بەرچاوی دڵبەردا بە مێشێکی بچووك نابێ.
(٣) یاتاغ: نوێن و پێخەف. سینە: سنگ. مورغ: پەلەوەر. گوڵشەن: گوڵزار.
واتە: ئەوە تەمەنێکە سنگ بووە بە نوێن و پێخەفی دڵ و بە عەزرەتی ئەگریجەی یارەوەیە و نایگاتێ. وەك دڵ لە تاو ئەگریجەی دەترسێ، باڵندەی لە داو ترساویش ناتوانێ بچێتە ناو باخ و گوڵزار و تێیدا بحەسێتەوە و بیکا بە قەفەزی خۆی. یا (یاتاغی) بە مانای پاسەوان و ئێشکچی لێك بدرێتەوە کە ماناکەی بە بەیتی دواییەوە دەبەسترێتەوە و وای لێ دێ ((عومرێکە لەتاو زوڵفت یاتاغی دڵە سینەم... تاد)). سنگم تەمەنێکە لە ترسی ئەگریجە بووە بە پاسەوان و ئێشکی دەگرێ ...تد.
(٤) مەرحەلەجۆ: بەدوای قۆناغدا گەڕاو. دوزد: دز. مەسئەلەجۆ: بەدوای مەسەلەدا گەڕاو. ڕیشوەت: بەرتیل. نەفع: قازانج. عەسەس: کۆی (عاس)ـە، حەسحەس، پاسەوانی شەوی ناوبازاڕ.

**سالیك لە بیابانا شەو قافڵە گەر گوم کا،**
**صەد قیبلەنوما بۆ ئەو وەك صەوتی جەرەس نابێ (٥)**
**طەبعی نەجیسی بەنگی ناجینسی لە لا جینسە!!**
**بۆ جینسی کەسیفی وا شاور بە تەوەس نابێ (٦)**
**زەنجیری وەفا مەحکەم کێشامی بەلای تۆوە**
**عارف، سەگی وەك "سالم" حاجەت بە مەرەس نابێ! (٧)**

واتە: ئەگریجە وەك حەسحەس وایە و قۆناغ بە قۆناغ بە شوێن ئەو دڵانەوەیە کە دەیانەوێ بە دزیەوە لێی نزیك ببنەوە و بێنە ناو پێچولوولی مووەکانی. دڵیش وەك قازیەکی بێدادی لێهاتووە، لە پەیجۆری ئەوەدایە چۆن بەرتیل بدا تا بگاتە زوڵفت، بەڵام پێی ناکرێ. وەك چۆن دەبێ قازی بەرتیل وەرنەگرێ و کار بکا بۆ قازانجی هەموو خەڵك، ئاوایش دڵ نابێ بە بەرتیلدان ئەگریجەی یار بۆ خۆی داگیر بکا و لە ڕوخساری نزیك ببێتەوە و دڵدارانیتری لێ بێبەش بکا.

(٥) سالیك: ڕێی خوداگرتوو. ڕێبوار. قافڵە: کاروان. قیبلەنوما: قیبلەنوێن، نیشاندەری ڕووی قیبلە. صەوت: دەنگ. جەرەس: زەنگ.

واتە: ئەگەر ڕێبوار لە بیابانێکی کاکیبەکاکیدا شەو کاروانی لێ ون ببێ، دەنگێکی زەنگ زووتر کاروانی بۆ دەدۆزێتەوە و سەد قیبلەنوما ئەوەی بۆ ناکەن. یا ئەگەر عاشق ڕێی بەرەو زوڵفی یاری لێ ون ببێ و لە کاروان دوابکەوێ، هیچ شتێك هێندەی دەنگی گوارەی گوێی یار بەسوود نیە بۆ چوونەوە سەر ڕێی ڕاست و دۆزینەوەی زوڵف.

(٦) طەبع: تەبیعەت، شەقڵ و مۆرك. نەجیس: پیس و گڵاو. بەنگی: بەنگکێش، حەشیشەخۆر. ناجینس: ناپەسەند. (جینس)ی یەکەم: پەسەند. (جینس)ی دووەم: جۆر و تەرح. کەسیف: پیس و چڵکن، هیچوپووچ. شاور: جۆرێك تووتنی زۆر باشی کوردەواریە. تەوەس: جۆرێك تووتنی ڕەشۆکی وردە، زۆر توند و تیژ و تاڵە، ناکێشرێ.

واتە: تەبیعەتی گڵاوی بەنگکێش ناپەسەندی لە لا پەسەندە. (شاور) کە چەشنە تووتنێکی بۆنداری بەناووبانگە، لای ئەم بەنگکێشە چەپەڵانە، بە چەشنی تووتنی (تەوەس) نابێ.

(٧) مەحکەم: توند، قایم. عارف: ئاگادار و زانا، ئەوی لە ڕێی مەشق و ڕاهێنانی دەروون و بیرکردنەوەوە خودا دەناسێ. مەرەس: ڕستی ملی سەگ و تانجی.

واتە: ئەی خوداناس، من وەفاداری تۆم و بە توندی کەمەندکێش کراوم بەرەو لای تۆ، ئیتر سەگی وەك سالم پێویستی بە ڕست و پەتی مل نیە پێی ببەسترێتەوە و بەزۆر بهێنرێتە لای تۆ.

-٤- (*)

ئەبەد قەت سەتری ئەندامت بە تای جامەی کەتان نابێ
بەڵێ، شەوقی چرا -ئەڵبەت- لە فانۆسا نیهان نابێ! (١)
لە جوستەندایە موژگانی بە تەحریکی برۆ، ئەی دڵ!
حەذەر لەو تورکە بۆ ناکەی، کە بێ تیر و کەمان نابێ (٢)
بوخاری مەوجی ئەشکم ڕەونەقی دێبایی ڕووی لابرد
مەتاعی مایەیی تاجیر لە دەریا بێ زیان نابێ (٣)
لە ڕووی تۆ مەهڕوخێ گەر بێتە مەیدانی جەدەل، سەهوە
ئەگەرچی تا میان مووی بێ، وەکوو تۆ موومیان نابێ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) سەتر: داپۆشین. تا: تاڵ. جامە. کراس. نیهان نابێ: ناشاررێتەوە.

واتە: ئەندامی لەشی تۆ هەرگیز بە تاڵی کراسی کەتان داناپۆشرێ، چونکە لەشی تۆ وەك مانگەشەو وایە کە قوماشی کەتان دەڕزێنێ. بەڵێ، ڕووناکی چرا بە هەمان شێوە، لەناو شووشەی فانۆسدا ناشاررێتەوە.

سەتری (مان، کم): سّری. (گم): سیڕی.

(٢) جوستەن: جموجووڵ. تەحریك: جووڵاندن. حەذەر: وریایی، پارێز.

واتە: برژانگی دڵبەر بە هاندانی برۆی کەوتووەتە جموجووڵ، تا بێتە وێزەی دڵ. بۆچی وریای ئەو شۆخە خوێنڕێژە نابی کە هەرگیز بێ تیر و کەوان نابێ، یانێ برۆی کەوان و برژانگی تیرە.

(٣) بوخار: هەڵم و هاڵاو. مەوج: شەپۆل. ئەشك: فرمێسك. دێبا: قوماشێکی ناسکە. مەتاع: کەلوپەل. تاجر: بازرگان.

واتە: هەڵم و هاڵاوی شەپۆلی فرمێسك، بەرچاوی گرتم و جوانی و ڕەونەقی پارچەی ناسکی ڕووی یاری لابردم و تووشی زیانی کردم. کارەساتی وا بۆ بازرگان کەم نابێ کە کەلوپەلی سەرمایەکەی لە دەریادا زیانی لێ بکەوێ.

مەتاعی (حا، ن): مەطاعی. هەڵەیە. دەریا (کم): بەحرا.

(٤) مەهڕوخ: ڕوخسار وەك مانگ. جەدەل: گفتوگۆ. میان: ناوقەد. موومیان: کەمەرباریك.

**له مەعنای شیعری مەطلّووبا، دەبێ ئیظهاری مەطلّەب کەم**
**ئەگەر دلّداری سەنگیندلّ لە "سالم" دلّگران نابێ (٥)**

واتە: ئەگەر نازدارێکی ڕوخسار وەك مانگ بەرامبەر بە تۆ بێتە مەیدان و خۆی لە تۆ بە جوانتر دابنێ، یا خۆی وەك تۆ بە جوان دابنێ، بە هەڵەدا چووە، تەنانەت ئەگەر مووی ئەگریجەکانیشی بگاتە ناوقەدی، وەك تۆ کەمەرباریك نابێ.

بوخاری (گم): بوغازی. واتە دەربەند. هەڵەیە.

(٥) مەطلّووبا: داواکراودا. ئیظهار: دەرخستن. مەطلّەب: داوا.

واتە: دەبێ لە مانای شیعرێکدا کە مەبەستم بێ بینووسم، مەبەستی خۆم دەربخەم کە بریتییە لە باسی پێوەندی دڵم بە دڵبەرەکەمەوە، ئەگەر ئەو دڵدارە دڵسەنگینە دڵگران نەبێ و نەڵێ سالم هەقی نییە کارێکی وا بکا تا خەڵك بزانن پێوەندی بەمنەوە هەیە.

مەعنای (کم، گم): مەنعی، هەڵەیە.

-٥- (*)

چ دەبێ، گەر لە ڕەقیبم دڵم ئازاری ببێ؟
هەر گوڵێ بولبولی بێ، حوکمە دەبێ خاری ببێ (١)
مانیعە بۆ گوزەری دڵ لە ڕوخت، زوڵفی سیاه
گەنجی بێ هەر طەرەفێ، شەرطە دەبێ ماری ببێ (٢)
زەحمەتە عوقدەیی خاطر بە ویصالیش وا بێ!
قۆرغەیی بۆسە دەکەی، وا لەبی من باری ببێ (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ن، عا، غ، ق)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) ڕەقیب: ناحەز، بەدکار. خار: دڕك.

واتە: گرنگ نیە و هیچ نابێ ئەگەر ڕەقیبی بەدکار دڵم بئێشێنێ و ئازاری بەدەستەوە بچێژم. گوڵیش ئەگەر بولبولێکی شەیدای ببێ، بێ‌سێ‌ودوو دەبێ دڕکی هەبێ و بریندار ببێ.

ڕەقیبم (ق): ڕەقیب. (ببێ)ی دووەم (ن): بێ. لەنگە. هەموو (ببێ)کانی‌تریش لە (ن)دا بە هەڵە کراونەتە (بێ).

(٢) مانیعە: ڕێگرە. گوزەر: هاتوچۆ. ڕوخ: ڕوو. سیاه: ڕەش. گەنج: گەنجینە، خەزێنە. طەرەف: لا. شەرط: مەرج.

واتە: ئەگریجەی ڕەشت ڕێگرە و ناهێڵێ دڵ هاتوچۆی ڕوخسارت بکا. هەر شوێن و لایەك گەنجینەی هەبێ، مەرجەو دەبێ ماری خۆی هەبێ چاودێری بکا.

(٣) عوقدە: گرێ‌وگۆڵ. خاطر: خەیاڵ، بیر و ئەندێشە. ویصال: بەیەك‌گەیشتن. (وا)ی یەکەم: کراوە. (وا)ی دووەم: کە. قۆرغە: قۆرخ، پاوان، قەدەغە. بۆسە: ماچ. لەب: لێو. باری ببێ: لێوبەبار بێ، قەتماغەی بەستبێ.

واتە: کە تۆ ماچ لە من قەدەغە بکەی و ئەو ڕێیەم لێ بگری و وام لێ بێت لێوبەبار ببم، ئەستەمە گرێ‌کوێرەی خەیاڵ و بیرم، تەنانەت بە بەتۆگەیشتنیش، بکرێتەوە.

(خاطر) لە (عا)دا کەوتووە. وا بێ (عا، ق): دابێ. (باری) لە (مان)دا بە هەڵە بە (یاری) نووسراوە. بە ویصالیش (غ): بە ویصالت. قۆرغەیی (غ، ق): قەدەغەی. وا لەبی (ن): دا لەبی. واتە تا لەبی. جوانترە.

نیوەی یەکەمی بەیتەکە لەنگە.

**نایێڵێ لەذذەتی وەصڵت لە دڵا، جەوری ڕەقیب**
**شادمانی نییە بۆ ئەو کەسە ئەغیاری ببێ (٤)**
**لە ڕەهی کەشمەکەشا جانی هەمیشە هەدەرە**
**عاشقی بێدڵ، ئەگەر دڵبەری عەییاری ببێ (٥)**
**بە شەوێ ڕەنگە بەڵەد بێ لە غەمی طوولی فیراق**
**گەر طەبیبم وەکو من دیدەیی بێداری ببێ (٦)**
**جانْنیثاری ڕەهی جانانەیە "سالم" بە ئەبەد**
**لەتی کا تیغی جەفا، گەر دڵی ئینکاری ببێ (٧)**

(٤) نایێڵێ: ناهێڵێ. لەذذەت: لەزەت، تام‌وچێژ. وەصڵ: بەتۆگەیشتن. جەور: ستەم. ڕەقیب: بەدکار، ناحەز. ئەغیار: بێگانە، نەیار.

واتە: ئازار و ستەمی ڕەقیبی بەدکار، تام و چێژی گەیشتن بە تۆ لە دڵدا ناهێڵێ. ئەوی کەسانێك پێی بێگانە بن و دۆستایەتی لەگەڵ دانەمەزرێنن، شادمانیی بەتووشەوە نابێ.

(٥) ڕەهـ: ڕێ. کەشمەکەش: کێشمەکێش.جان: گیان. هەدەر: بەفیڕۆچوو. عەییار: مەکرباز.

واتە: ئەگەر عاشق دڵبەرێکی عەیار و بە مەکر و نازی هەبێ، خوێنی گیانی لە ڕێی کێشمەکێش و بگرەوبەردەدا دەڕێژێ و بەفیڕۆ دەڕوا.

جانی (عا): گیانی.

(٦) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

بەڵەد: شارەزا. طوول: درێژی. فیراق: لێك‌جیایی، دووری. طەبیب. پزیشك، مەبەست یارە. دیدە: چاو. بێدار: بەئاگا، خەولێ‌نەکەوتوو.

واتە: ئەگەر پزیشکی دەردم وەك من چاوێکی بەئاگا و تیژی هەبێ، ڕەنگە بە تاقە شەوێك شارەزای خەمی درێژبوونەوەی دووری و لێك‌جیایی ببێ.

(٧) جانْنیثار: گیان‌بەختکەر. جانانە: دڵبەر. ئەبەد: هەمیشە. ئینکار: سەرسەخت، نکوولیکەر.

واتە: ئەگەر سالم دڵێکی سەرسەخت و نکوولیکەری هەبێ، با تیغی مەینەت لەتوپەتی بکا، چونکە هەمیشە گیان‌بەختکەری پێناوی یارە.

جانانەیە (ن): جانانە.

## -٦- (*)

**پێم خۆشە کە عومرم بە جەفا صەرفی غەمت بێ**
**بەو شەرطە کە مایەی ضەرەرم ماچی دەمت بێ (١)**
**خۆ ڕۆشنە خانەی دڵی من، مەنزڵی تۆیە**
**مروەت نییە بەم ڕەنگە خەرابی ستەمت بێ (٢)**
**یاقووتی لەبت جایزە بەخشینی بە ئیثبات**
**بێت و بەقەدەر خدمەتی من، گەر کەرەمت بێ (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) واتە: پێم خۆشە تەمەنم بە ئازار و مەینەتەوە بۆ خەم و خەفـەتی تـۆ تـەرخان بـێ و بەسـەر بچێ، بە مەرجێك مایەی زیانلێکەوتنم ماچێکی دەمت بێ.

ضەرەرم (کم، گم): ئەمەلم.

(٢) مروەت: مەردایەتی، پیاوەتی. خەراب: وێرانە.

واتە: خانووی دڵی من ڕووناکە و مەڵبەندی مانەوە و ژیانی تۆیە. مەردایەتی نییە وا بەم شێوەیە بە ستەم و خراپەکاریت وێران بێ.

خەرابی (کم، گم): خرابی. (و)ی پاش (خەرابی) لە (ن)دا زیادە.

(٣) لەب: لێو. جایزە: دەشێ. ئیثبات: سەلماندن. کەرەم: چاکە و بەخشندەیی.

واتە: ئەگەر ئەوەندەی من خزمەتت دەکەم،، تۆیش بەخـشندە بـی، دەشـێ بیـسەلمێنی ئامـادەی یاقووتی لێوتم پێ ببەخشی، واتە ماچم بدەیتێ.

## -٧- (*)

ئەگەر نەخلی مورادم بێثەمەر بێ
بە من چی باغی دونیا جوملە بەر بێ؟ (١)
ڕەقیب! یار ئەر بە من بۆسێ کەرەم کا
بە تۆ چی گەر هەمووی شەهد و شەکەر بێ؟ (٢)
لە وەختێکا سەری خۆم بێکڵاو بێ
بە من چی تاجی شاهی پڕگوهەر بێ؟ (٣)
ڕەقیب! ئەمجار کە دڵبەر ڕامە بۆ من
بە تۆ چی گەر هەموو شام و سەحەر بێ؟! (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، عا، غ، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشی مەحزووف.

(١) نەخل: دارخورما. جوملە: هەموو، سەرلەبەر.

واتە: ئەگەر دارخورمای من کە یاری باڵا بەرزمە، بەر نەگرێ و سوودی بۆم نەبێ، بە من چی ئەگەر باخەکانی دنیا هەموو پڕ بەر بن بۆ عاشقی خاوەنیان و سوودیان لێ وەربگرن.

ئەگەر (غ، کم، ق، گم): کە من. دونیا (کم، ق، گم): عالەم.

(٢) ڕەقیب: بەدکار، دوژمن، ناحەز.

واتە: ئەی بەدکار! ئەگەر یار ماچێکم پێ بەخشێ، بە تۆ چی ئەگەر ماچەکەی هەمووی وەك هەنگوین و شەکر بێ.

یار (ڕ): بار. هەڵەیە. ئەر (عا): ا. هەڵەیە. بۆسێ (عا، ڕ): بۆسەی. (ق): بۆسە. هەمووی (کم): هەمە. (گم): هەر.

(٣) نوسخەکانی (غ، ڕ، کم، ق، گم) تەنها دوو بەیتی یەکەمی ئەم پارچەشیعرەیان تێدایە، ئەوەبەدوای هیی پارچەشیعری پاشەوەیە (٨).

واتە: بە من چی تاجی شاهی بە گەوهەر ڕازابێتەوە، ئەگەر من کڵاو بە سەرمەوە نەبێ.

(٤) واتە: ئەی بەدکار، ئەگەر یار دەستەمۆم بێ، بە تۆ چی ئەگەر لە هەموو ئێوارە و بەیانییەکدا بێتە لام؟!

هەموو (ن): هەمە. هەڵەیە.

که خۆم ڕەختی غولامی شکنەبەم هیچ
به من چی خواجە گەر زەڕڕینکەمەر بێ؟ (٥)
ئەیا دوشمن! کە بەختم هاتە یاری
بە تۆ چی گەر قەبای شاهیم لەبەر بێ؟ (٦)
لە کونجێکا لەگەڵ یار ئەر بنیشم،
بە من چی عالەمێ زیر و زەبەر بێ؟ (٧)
ئەرێ حاریث! کە مونعیم پێم کەرەم کا
بە تۆ چی صەد تمەن گەر بیشتەر بێ؟ (٨)
بە نەومیدی دەرمکا گەر لە دەرگا،
بە من چی تاق و حوجرەی پڕ لە زەڕ بێ؟ (٩)

(٥) زەڕڕینکەمەر: پشتێن زێڕین. ڕەخت: بەرگ. خواجە: دەوڵەمەند، گەورەپیاو.

واتە: کە من جلوبەرگی خزمەتکاریشم نەبێ، بە من چی ئەگەر دەوڵەمەند پـشتێنی زێڕینـی لـە پشتدا بێ؟!

(٦) ئەیا: ئەی. یاری: دۆستایەتی. قەبا: کەوا.

واتە: ئەی دوژمن ئەگەر من ڕۆژێك لـە ڕۆژان بەخت یارم بێ، بە تۆ چی ئەگەر کەوای شاهانەم لـە بەردا بێ؟! ئەگەر (شاهی) بە (شاهێ)یش بخوێنرێتەوە، دەشێ و بگرە جوانیشە.

(٧) زیر و زەبەر: ژێراوژوور.

واتە: من ئەگەر لـە کونجێکدا دانیشم، چ هەقێکم بەسـەر ئەوەوە هەیە کە دنیا ژێراوژوور بێ؟!

پێمان وایە ئەگەر لـەجیاتیی (هەر بنیشم)، (دابنیشم) بووایە، جوانتر بوو، چونکە (بنیشم) زیاتر بۆ پەلـەوەر بەکاردێ.

(٨) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی هەر لـە (عا)دا هەن.

حاریث: ناسناوی ئیبلیسە، کشتوکاڵکەر، یا ناوی زەلامێکی تایبەتی بووە، یـا (حـارس) بـووە و بـە مەبەستی پاسەوانی ماڵی دنیایە، یان (حارص= حریص) بووە بـە واتـای خـاوەن تـەماعی تێرنـەخواردوو.

مونعیم: ڕۆزیبەخش، خودا. بیشتەر: زیاتر.

واتە: ئەی ئیبلیس! کە من خودای ڕۆزیبەخش خەلاتم بکا، بە تۆ چی ئەگەر ئـەو خەلاتـە لـە سـەد تمەنـیش زیاتر بێ؟!

(٩) نەومیدی: نائومێدی.

**که "سالم" بازی دەوڵەت هاتە سەر من**
**بە تۆ چی دوشمن ئەر خاکی بە سەر بێ؟ (۱۰)**

واتە: ئەگەر خاوەن ماڵ خۆی لە بەردەرگا وەستابێ و دەست بە ڕوومەوە بنێ و بە نائومێدییەوە دەرم بکا، بە من چی ئەگەر تاق و ژووری ماڵەکەی پڕ بێ لە زێڕ.

(۱۰) واتە: سالم ئەگەر بازی بوون بە پادشا بەسەر سەری منەوە بنیشێتەوە، بە تۆ چی ئەگەر دوژمن بمرێ و بچێتە ژێر خاك؟!

-٨- (*)

ئیشارەی غەمزە ڕەنگە قەصدی سەر بێ
کە بۆ سەر بێ، دەسا با زووذتەر بێ (١)
سەرم گەر، سەرسەری، شۆرت قوبووڵ کا
هەموو مایەم سەراسەر دەردیسەر بێ (٢)
حەصاری سینە با لابەم لە ڕێدا،
مەبادا بۆ دڵم تیرت خەطەر بێ (٣)
گوشادیی دڵمە هەر جا، گەر لە تیرت
لە سینەم بۆ هەناسەم ڕێگوزەر بێ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، غ، ف، ج، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) ئەم بەیتە لە (مان، عا، ڕ)دا هەیە.

زوودتەر: زووتر.

واتە: کە یار بە چاو ئیشارەت دەکا، ڕەنگە مەبەستی ئەوە بێ کە قەستەسەریەتی و دەیەوێ بمکوژێ. جا ئەگەر نیازی کوشتنی هەیە، دە با زووتر بمکوژێ.

(٢) سەرسەری: لامسەرلایی.

واتە: ئەوی بە سەرپێیی و کەمتەرخەمییەوە شۆر و عیشقی تۆ قوبووڵ بکا، خودایە هەموو مایەی هەر مەینەت و دەردەسەری بێ.

شۆرت (ڕ): سورت. هەڵەی نووسینە.

(٣) ئەم بەیتە لە (ج)دا نییە.

حەصار: قوڵغە، دیواری دەوری قەڵا.

واتە: دیواری دەوری دڵم کە سنگمە، با لە ڕێی تیری چاوتدا لاببرێ، ئەوەکا ڕێی ئەو تیرە بگرێ و نەهێڵێ بەر دڵم بکەوێ .

حەصاری (حا، عا): حەساری. (ق): منارەی. (ف، کم، گم): غوباری. (ڕ): عباری. هەڵەی نووسینە و دەبێ (غوباری) بێ. لابەم (کم، گم): لادەم.

(٤) گوشادی: کراوەیی و ئاوەڵایی، فراوانی.

واتە: هۆی گوشادیی دڵی منە کە تیری زۆرم لێ بدەی و سنگم کونکون بێ، چونکە ڕێگوزاری

**له خۆشیدا کەسێ دوشمنمە، گاهێ**
**بە ڕووی مندا لە ڕووی تیغت سیپەر بێ (٥)**
**ویداعی دڵ دەکا جانم لە چاوت**
**کە وەختێ تیرْبارانی نەظەر بێ (٦)**
**چ مەنناعێ فیراقی خستە بەر من**
**ئەویش وەك من، خودایا! دەربەدەر بێ (٧)**
**شەفیعم بێ بە عەفو، ئەر قابیضی جان**
**لە ڕێی تیرت، دەبێ خوونم هەدەر بێ (٨)**
**وەها پڕ بوو، لەبالەب، دڵ لە غەمها**
**دەترسم جێی نەبێ، مەیلت بەدەر بێ (٩)**

هەناسەم بۆ دەرەوە زۆرتر دەبێ و هیچ شتێك ڕێی تیری تۆ ناگرێ.

(٥) واتە: یەکێك دوژمنی منە کە لە کاتی دۆستی و خۆشیدا لە لای من ڕابوەستێ. کە تیری تۆ هات، ئەو ببێ بە سوپەر و نەهێڵێ تیرەکە لە من بدا و بەر ئەو بکەوێ. یانێ یەکێك لە من زیاتر عاشقی تۆ بێ، دوژمنمە.

بە ڕووی مندا (ج): لە ڕێی. (ق): بە ڕوویی من. تیغت (ق): تیرت. سیپەر بێ (گم): سوپەر دێ. هەڵەی چاپە.

(٦) ویداع: ماڵئاوایی.

واتە: گیانی من، کاتی تیربارانی دڵم لە لایەن چاوی تۆوە، خواحافیزیی دڵ لە چاوەکانت دەکا. یانێ کاتی تیربارانی دڵ، گیانم لەسەر لێوە، بۆئەوەی لەباتیی دڵ ماڵئاوایی لە تۆ بکا.

کە وەختێ تیربارانی (ج):کە وەختێ تیرەبارانی. (ق): لە وەختی تیرەبارانی.

(٧) واتە: چ ڕێگرێك منی لە تۆ دوور خستەوە، خودا ئەویش وەك من گرفتار و سەرگەردان بکا.

(٨) ئەم بەیتە لە (حا)دا نییە.

قابیضی جان: گیانکێش.

واتە: ئەگەر فریشتەی گیانکێشان لە لای خودا تکاکارم بێ و لێبوردنم بۆ وەربگرێ و نەمرم، دەبێ خوێنم لە ڕێی تیری تۆدا بڕژێ، چونکە ڕێگەیەکیترم نابێ بۆ مردن.

خوونم (عا، ج، کم، گم): خوێنم. (ف): تیغم. هەڵەیە.

(٩) لەبالەب: لێوانلێو.

**ئەگەر گاهێ طەڵەب کا، عاشقی زار**
**بە پێ نا، ڕەنگە "سالم" هەر بە سەر بێ (١٠)**

واتە: دڵ وا لێوانلێو بوو لە خەم و خەفەت، دەترسم ئەگەر مەیل و خۆشەویستیی تۆ ڕووی تێ بکا، جێی نەبێتەوە و بڕوا.
وەها پڕ بوو (ف): دەڵێی. لەنگە. (غ، ج، کم، گم): دەڵێی پڕ بوو. غەمها (ن): غەمتا. جێی (کم): جێ.

(١٠) واتە: ئەگەر یار داوای هاتن بکا، ڕەنگە سالم، بە پێ نا، هەر بە سەر بێتە لای.
کا (عا، کم): کەی.

(*) -٩-

**به ئیما گەر لە عاشق خواهیشی مەعشووقە بۆ سەر بێ**
**ئەگەر نەیخاتە بەر پێی، ڕووڕەشی صەحرایی مەحشەر بێ (١)**
**لە ڕووی ئەم شەمعەدا صیححەت طەڵەب کا قورنجۆ، سەهوە**
**دەسووتێ یەك نەظەر، پەروانەئاسا، گەر سەمەندەر بێ! (٢)**
**لە مەیدانی نەظەر چاوت شەجاعەت نایێڵێ بۆ من**
**بە چاو کێ دیی غەزالی وا کە صەییادی غەضەنفەر بێ؟! (٣)**
**لەسەر خاڵی ڕوخت کەس وەصفی خاڵی کەس نەکا، خەتمە**
**"خەلیل"ی پێ بڵێن نابێ، کە هەر کەس جێی لە ئاذەر بێ (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) ئیما: ئیشارەت. خواهیش: داوا. مەعشووقە: یار.

واتە: ئەگەر یار داوای سەر لە عاشق بکا و نەیخاتە بەر پێی، خودایە ڕووڕەشی ڕۆژی قیامەت بێ.

(بۆ لە (ن)دا کەوتووە.

(٢) شەمع: مۆم. صیححەت: تەندروستی. قورنجۆ: ئەوی بە دوای نزیکی لە یاردا دەگەڕێ. سەمەندەر: باڵندەیەکی ئەفسانەییە، گوایە لەناو ئاگردا هێلانە دەکا.

واتە: ئەوەی بەدوای نزیکیدا لە یارەوە دەگەڕێ، بیەوێ لە نزیکی مۆمی ڕووی یاردا بە ساغی و سەلامەتی بێتەوە، بە هەڵەدا چووە، تەنانەت ئەگەر سەمەندەریش بێ کە ئاگر کاری تێناکا، وەك پەروانە بە ڕوانینێك هەڵدەپرووزێ و دەسووتێ.

ئەم (کم، گم): ئەو.

(٣) شەجاعەت: ئازایەتی. غەزال: ئاسك. صەییاد: ڕاوچی غەضەنفەر: شێر.

واتە: کە دەڕوانیتە من، سامی چاوەکانت هیچ ئازایەتییەکم بۆ ناهێڵنەوە و بێدەسەڵاتم دەکا. ئەمە شتێکی سەیرە، کێ بە چاوی خۆی دیویە ئاسك ڕاوی شێر بکا.

نایێڵێ (کم، گم): نایەڵێ. کێ (کم): کەی.

(٤) ڕوخ: ڕوو. خەتمە: کۆتایی پێهاتووە، براوەتەوە. خەلیل: حەزرەتی ئیبراهیمی خەلیل. ئاذەر: ئاگر.

**هونەر ثابت دەكەم بۆ ئەو ئیمامە قامەتی تۆی دی**
**لە وەختی خوێندنی ((قَد قامَت))ا، گەر ڕووی لە مینبەر بێ! (٥)**
**لەناو سینەی قەفەسما شەرطە ئازادی نەكەم ئیتر**
**لە داوی زوڵفی دڵبەر، گەر بە "سالم" مورغی دڵ بەربێ (٦)**

واتە: نابێ كەس لەسەر خاڵی ڕووی تۆوە باسی خاڵی خۆی بكا، ئەمە كۆتاییی پێهاتووە و بڕاوەتەوە. نابێ هەر كەسێك لەناو ئاگردا بێ، پێی بڵێن خەلیل، چونكە یەك ئیبراهیمی خەلیل هەیە.

كەس نەكا (كم، گم): خۆی نەكا.

(٥) قامەت: بەژن و باڵا.

واتە: ئەو پێشنوێژە كە لە كاتی خوێندنی ((قد قامت الصلوة))دا ڕووی لە مینبەر و میحراب بێ، بەژن و باڵای تۆ ببینێ و ڕوو وەرنەگێڕێ، دەیسەلمێنم هونەری نواندووە.

تۆی كرد (گم): تۆی دی. دەشێ (خوێندنی) لە (مان)دا (خۆندنی)ش بێ.

(٦) مورغ: باڵندە.

واتە: ئەگەر ئەمجارە باڵندەی دڵ بە سەلامەتی لە داوی زوڵفی دڵبەر ڕزگار ببێ، مەرج بێ لەمەودوا نەهێڵم دڵم لەناو قەفەزی سنگم بێتە دەرەوە.

-١٠- (*)

تا مەنزڵی تیری نیگەهت ناوی دڵم بێ
یا ڕەب، هەمە جا طوڕڕەیی تۆ طەوقی ملم بێ (١)
خوێن کا جگەرم خاری ئەلەم گاهی تەماشا،
بێ عاریضی تۆ گەر هەوەسی ڕوویی گوڵم بێ! (٢)
پڕ بادەیی خوێن بێ بە ئەلەم بیلبیلەیی چاو
بێ دڵبەر ئەگەر ئارەزوویی جامی مولم بێ (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (عا، غ، ق، ڕ)دا هەیە، لە پێـشیدا نووسـیویە «از گـفتهٔ سـالم». واتە: سالم وتوویە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) مەنزڵ: مەڵبەند، شوێن. نیگەه: تەماشا. یا ڕەب: خودایە. هەمە جـا: لـە هـەموو جێـەك. طوڕڕە: ئەگریجە. طەوق: ئەڵقەی دەوری مل.

واتە: تا من شەیدای تۆ بم و شوێنی تیری نیگارت هەر ناو دڵم بێ و بەو پێیە کوژراوی دەسـتی تۆ بم، خودایە لە هەموو شوێنێك ئەگریجەی تۆ ببێتە تەوق و کۆتی گەردنم و لێم نەبێتەوە.

(٢) خوێن کا: خوێنی لێ بێنێ، بریندار بکا. خار: دڕك. ئەلـەم: ئـێش و ئـازار. گـاه: کـات. عاریض: ڕوو. هەوەس: ئارەزوو.

واتە: ئەگەر بەبێ بینینی ڕووی تۆ، ئارەزووی ڕووی گوڵم هەبێ، با کـاتی تەماشـاکردن دڕکـی ئازار و ئێش جگەرم بریندار بکا و سزای خۆم وەربگرم.

گاهی (ق، ڕ): وەختی.

(٣) بادە: مەی، شەراب. مول: شەرابی ترێ.

واتە: ئەگەر بەبێ دڵبەر حەز لە پیاڵەی شەرابی ترێ بکەم، با بیلبیلەی چاوم بێتە ئـازار و بـەو ئازارە پڕ ببێ لە شەرابی خوێن و خوێنی تێ بزێ و هیچ نەبینێ.

بیبیلەیی چاو (ق): بەلبەلەیی جان.

## -١١- (*)

**هەتا کەی، ئەی فەلەك، بۆ بەختی من جەور و تەظەللوم بێ؟!**
**وە چاکە چەندْ ڕۆژێ نەوبەتی لوطف و تەرەححوم بێ (١)**
**لە قەهرت موددەتێکە زەهرْنۆشی جامی بەدبەختیم**
**لە خوانی نیعمەتم با هەفتەیێ باری تەنەععوم بێ (٢)**
**چلۆن دڵ دێنێ، ئەی یاران، دەخیل! صوحبەت لەگەڵ دوشمن؟!**
**گرانە ئیستیخوانی، لێی گەڕێن -تو خودا- بلاّ گوم بێ! (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ن، عا)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) تەظەللوم: سکالاّ لە دەست جەور و ستەم. وە: وا. نەوبەت: نۆرە. لوطف: نەرمونیانی. تەرەححوم: ڕەحمکردن، بەزەییناندن.

واتە: ئەی چەرخی ڕۆژگار، تا کەی بەخت و نسیبی من سکالاّ لە دەست ستەم و مەینەت و ناهەقی بکا؟! وا چاکە، ئەگەر بۆ چەند ڕۆژێکیش بووە، نۆرەی لوتف و بەزەیی نواندن بێ.

وە چاکە (عا): دە چاکە.

(٢) قەهر: داخ. موددەت: ماوە. زەهرنۆش: ژەهرخواردوو، ژەهرنۆشکردوو. جام: پیاڵە. خوان: سفرە. نیعمەت: ڕۆزی. بار: نۆرە. تەنەععوم: خۆشگوزەرانی.

واتە: من ماوەیەکە لە داخی کردەوەی ناپەسەندی تۆ ژەهراوی بەدبەختی و قوڕبەسەری دەنۆشم. چی دەبێ ئەگەر هەر بۆ حەفتەیەکیش بووە، نۆرەی ئەوە بێ یا بارودۆخی ئەومم بۆ هەڵکەوێ لەسەر خوانێکی پڕ لە ڕۆزی خۆشگوزەران بم؟!

بەدبەختیم (مان، ن): بەدبەختم. ئەوی (عا) جوانترە. نیعمەتم (عا): نیعمەتا.

(٣) چلۆن: چۆن. دڵ دێنێ: دڵ بڕوایی دەدا، دەخیل: دەستم بە دامانت. صوحبەت: دۆستایەتی. گرانە ئیستیخوانی: ئێسك قورسە و ڕەزا گرانە، بەدفەساڵە. بلاّ: با. گوم بێ: لە بەرچاو نەمێنێ، بێسەروشوێن بێ.

واتە: یاران دەستم بە دامێنتان، دڵ چۆن بڕوایی دەدا دۆستایەتی لەگەڵ دوژمندا بگرێ؟ لەکاتێکدا دوژمن ڕەزا گرانە و خۆشەویست نییە. بۆیە تو خودا کارێك بکەن لە بەرچاو ون بێ.

چلۆن (عا): چۆن. لەنگ دەبێ.

**به ئومێدی خودا، واجیب دەبێ قەتلی ڕەقیب شەرعەن**
**لە بەزمی دڵبەرا، گەر بۆ زوبانم ڕێی تەکەللوم بێ (٤)**
**قەدیمجانبازی ڕێی عیشقم، لەمەولا تازە لانادەم**
**ئەگەر لوطفت موجەددەد بێ، وەگەر قەهرت تەقەددوم بێ (٥)**
**تەسەلسول تەعزییەی دونیا ئەبەد پایانی قەت نابێ**
**بەجێیە خەرقەیی "سالم" مودام ئالوودەیی خوم بێ! (٦)**

(٤) واجب: ئەرك، پێویست. قەتل: کوشتن. ڕەقیب: بەدکار، ناحەز. شەرعەن: لە ڕووی شەرعییەوە، بە شەرع. تەکەللوم: قسەکردن، ئاخاوتن.

واتە: ئەگەر بۆم بلوێ لە بەزم و شادیی دڵبەردا قسە بکەم، پشت بە خودا کوشتنی ڕەقیب لە ڕووی شەرعەوە دەبێتە ئەرکێکی دینی.

دڵبەرا (ن): دولبەرا.

(٥) قەدیمجانباز: گیانبەختکەری کۆن. موجەددەد: تازە، سەرلەنوێ. قەهر: خەفەت و تووڕەیی. تەقەددوم: پێشکەوتن.

واتە: تۆ ئەگەر لوتفت تازە بکەیتەوە، یا داخ و تووڕەییت زیاتر بێ، من گیانبەختکردوویەکی کۆنی ڕێگەی عیشقم، هەمیشە هەر ئەم ڕێیەم گرتووەتە بەر و لێی لانادەم.

(٦) تەسەلسول: زنجیرە. تەعزییە: پرسە، ماتەمینی. ئەبەد: هەرگیز، قەت. پایان: کۆتایی. خەرقە: بالاپۆشی دەروێش. مودام: هەمیشە. ئالوودە: تێکەڵ. خوم: هەش، بەری گیایەکە خام و بەنی پێ شین دەکرێ.

واتە: مادەم زنجیرەی پرسە و ماتەمینیی دنیا هەرگیز نابڕێتەوە و دوایی پێنایێ، شتێکی بەجێ و گونجاوە خەرقەی سالم هەردەم تێکەڵ بە خوم و ڕەنگی شین بێ.

تەعزییەی (عا): تەعظییەی. هەڵەیە. قەت (عا): قەد.

## (*) -١٢-

**چ حاصڵ ئەژدەهای زوڵفت بە دایم وەقفی گەردن بێ؟**
**کەرەم کە، با ئەمانەت یەك شەوێ تەوقی ملی من بێ؟ (١)**
**کە بێ تیری نیگاهت، وەختی ئیما، بۆ دڵی خوێنین**
**بە نەرمیی مۆمە سینەم، گەر بە سەختیی حیصنی ئاهەن بێ (٢)**
**نیامی تیغی پاداشە بە مەخفی دڵ لە سینەمدا**
**لە وەختا هەر کەسێ فرصەت بە دوشمن دا، دەبێ ژن بێ! (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، ف، غ، ج، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) یەكشەوێ: دەبێ (یەكشەویش) بووبێ، دەشێ هەڵەی ڕوونووسکەرەوە بێ.

واتە: ماری زوڵفت لە ئەنجامی چییەوەیە دەبێ هەمیشە بە دەوری ملتەوە بێ، دەڵێی لەسەری وەقف کراوە. بفەرموو ئەگەر بۆ تاقە شەوێکیش بووە، ببێتە تەوقی ملی من.

حاصڵ (کم، گم): حاجەت. با ئەمانەت (ف، ج): با بە ئەمانەت. لەنگ دەبێ. (کم): یا ئەمانەت.

(٢) ئیما: ئیشارەتکردن.

واتە: کاتێك ئیشارەت دەکەی و تیری نیگات دەگریتە دڵی خوێنینم، سنگم لە سەختیدا وەك قەڵای ئاسنین و لە نەرمیدا وەك مۆم وایە.

وەختی (ف): وەقتە. هەڵەیە. خوێنین (ف): خوێن. هەڵەیە. بە سەختیی (غ، کم، گم): سەراسەر. حیصنی (ن): مەحضی.

(٣) ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی لە (ج)دا نین.

نیام: کیف، کێلان.

واتە: دڵ لە سنگمدا بە شاراوەیی وەك کیفی تیغی پاداشتی تۆ وایە.

لە وەختا هەر کەسێ فرصەت بە دوشمن دا، دەبێ ژن بێ (کم، گم): لە وەخت هەر کەسێ بێ دوژمنی ڕابیژەکەی بێ. (گم): لە پەراوێزدا نووسیویە بۆی ساغ نەبووەتەوە. ڕاستی وتووە، ئەوەندە لەنگە بۆ ئێمەیش ڕاست نەکرایەوە، بۆیە دیارە هەڵەیە.

(فرصەت) لە (ف)دا کەوتووە. بە دوشمن دا، دەبێ ژن بێ (کم، گم): بێ دوژمنی ڕابیژەکەی بێ.

**هەتا جێت غورفە بێ، وەك دووڕبینە دیدە بۆ چیهرەت**
**بە تیری غەمزەت، ئەر وەك پەنجەرە، دڵ جوملە کونکون بێ (٤)**
**لە ڕووی ئەغیار، ئەگەر شیرینە حەرفم، مەصڵەحەت وایە**
**لەگەڵ مەردی گەدا کەلبی دڕندە صەعبە دوشمن بێ! (٥)**
**نەنووسراوە لە مەکتەبخانەیی عیشقا حورووفی ((نا))**
**لە جوابت هەر ((بەڵێ)) بۆ "سالم"ە، گەر ئەمری مردن بێ (٦)**

(٤) چیهرە: ڕوخسار.
واتە: تا تۆ خۆت لەناو ژوورێکدا شاردبێتەوە، من چاوم دەبێتە دووربین بۆ تەماشای ڕوخسارت، ئیتر با دڵ هەمووی بە تیری غەمزەت وەك پەنجەرە کونکون ببێ.
جێت (ف، کم، گم): جێ. ئەر (ن): هەر. (جوملە) لە (کم، گم)دا کەوتووە.
(٥) واتە: ئەگەر قسەم لەناو بێگاناندا شیرین بێ، ئەوە مەسڵەحەت وا هەڵدەگرێ. سەگی هار زەحمەتە دوژمنی پیاوی هەژار بێ.
مەصڵەحەت وایە (ف، غ، کم، گم): بیمی ئاسیبە، زۆر جوانە. دوشمن (کم): دوژمن.
(٦) مەکتەبخانە: قوتابخانە.
واتە: سالم لە بەرنامەی خۆشەویستیدا گوێڕایەڵە و ئەگەر فەرمانی مردنیشی بدەیتێ، قوبوولیەتی و ملکەچە.
نەنووسراوە (گم): کە نووسراوە.

(*) -١٣-

فەلەك! ئەر مەرتەبەیێ بێت و وەفا كەی، چ دەبێ؟!
دەری شادی لە دڵم دەفعەیێ وا كەی، چ دەبێ؟! (١)
وەك دەكەی عاشقی سەرگەشتە هەزارێ بێڕۆح
دەردەدارێ بە كەرەم جارێ دەوا كەی، چ دەبێ؟! (٢)
من فوتادەم بە میحەن، تۆ بە غەضەب دێی و دەچی
وەختی گەردش نیگەهێ سوویی گەدا كەی، چ دەبێ؟! (٣)
حەق، حەقی كاهێ لە كۆه وەردەگرێ ڕۆژی حیساب
تۆ بە كۆهێ گونەه ئەر فیكری خودا كەی، چ دەبێ؟! (٤)
دڵ لە قەیدی ستەمت زارە بە دایم مەه و ساڵ
چەندْ ڕۆژێ بە وەفا تەركی جەفا كەی، چ دەبێ؟! (٥)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ن)دا هەیە.

كێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) فەلەك: چەرخی ڕۆژگار. مەرتەبە: پلە. دەر: دەرگا. دەفعە: جار، كەڕەت. واكەی: بكەیەوە.

واتە: ئەی چەرخی ڕۆژگار، ئەگەر تا پلە و ڕادەیەك وەفاداریم بەرامبەر بنوێنی و جارێك لە جاران دەرگای شادی لە دڵم بكەیتەوە، چی دەقەومێ؟!

(٢) سەرگەشتە: سەرگەردان. كەرەم: بەخشندەیی. دەوا: دەرمان.

واتە: وەك پیشەتە، گیانی هەزار عاشقی سەرگەردان دەردێنێ و دەیانكوژی، چی دەبێ -لەپاڵ ئەوەدا- جارێك بەخشندەیش بی و دەردەدارێك تیمار بكەی؟

(٣) فوتادەم: كەوتووم. میحەن: كوێ (میحنەت)ـە، مەینەت. غەضەب: تووڕەیی. گەردش: گەڕان. نیگەه: تەماشا. سوویی: بەرەو. گەدا: هەژار.

واتە: من مەینەت لە پێی خستووم و كەوتووم، تۆیش دێی و دەچی و غەزەبت لێ دەبارێ. ئەگەر لە كاتی گەڕاندا تەماشایەكی ئەم هەژارە بكەی، چی ڕوودەدا؟

(٤) حەق: خودا. كاه: كا. كۆه: كێو. ڕۆژی حیساب: قیامەت. گونەه: گوناه. ئەر: ئەگەر.

واتە: خوا لە ڕۆژی قیامەتدا تەنانەت هەق و مافی كایەكیش لە كێو دەستێنێ. چی دەبێ ئەگەر تۆیش بە كێوێكی گەورەی گوناهەوە بیر لە خودا بكەیتەوە و بترسی؟!

(٥) قەید: كۆت. زار: داماو. دایم: هەمیشە. مەه: مانگ. تەرك: وازهێنان. جەفا: ئازار.

**ڕەسمی عاشق نییە "سالم!" لە فەلەك شەكوە بكا**

**سەر و جان بۆ ڕەهی جانانە فیدا كەی، چ دەبێ؟! (٦)**

واتە: دڵ بە درێژایی مانگ و ڕۆژ هەمیشە داماوە بە دەست كۆت و بەندی ستەم و زۆرداریی تۆوە. چی دەبێ ئەگەر بۆ چەند ڕۆژێكیش بووە، واز لە ئازار و ستەم بهێنیْ؟!

(٦) ڕەسم: نەریت، عادەت. شەكوە: شكات. جان: گیان. ڕەه: ڕێگە. جانانە: دلبەر.

واتە: نەریتی عاشق نییە سكاڵا لای چەرخی ڕۆژگار بكا، چی دەبێ ئەگەر تۆ [سالم] سەر و گیان لە ڕێی دلبەردا بكەیتە قوربانی؟

(*) -١٤-

**خۆزگە دەمزانی لە تارانێ نەجاتم کەی دەبێ؟!**
**کۆیی یارە مەشهەدم، یا مەدفەنم هەر ڕەی دەبێ؟! (١)**
**طەییی ئەرضم بۆ نەکا، تا ڕۆحی شاهی نەقشبەند**
**کەی بە پێی پڕئابڵەم وادیی فیراقت طەی دەبێ؟! (٢)**
**هەر کەسێ زانیی، لە سۆزی ناڵە، حاڵی دەردی دڵ**
**مەطڵەبی نابێ، هەموو، حاڵی لە فەحوای نەی دەبێ (٣)**
**نێشی حەییەی زوڵفی لەیلا ڕاستە مەجنوونکوش بووە**
**خۆ گەزیدەی ماری وا قەد نامرێ، هەر حەی دەبێ (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) کۆ: مەنزڵ، مەشهەد: جێی شەهیدبوون، شاری (مەشهەد) کە گڵکۆی حەزرەتی ئیمام عەلی ڕەزای لێیە. مەدفەن: جێی ناشتن.

واتە: خۆزگە، پاش ئەم ماوەی ئاوارەیی و دەربەدەرییە، دەمزانی کەی لە شاری (تاران) ڕزگارم دەبێ. ئاخۆ جێی شەهیدبوونی من، یا شاری پیرۆزی (مەشهەد)ی من مەنزڵ و ئاستانەی یار و جێی بەخاکسپاردنم هەر (ڕەی) دەبێ؟!

دەمزانی (کم): ئەمزانی. تارانێ (حا، کم، گم): تارانا. یارە (کم): یارم. هەڵەیە.

(٢) طەی: پێچانەوە. ئابڵە: ئاوڵە. وادی: شیو، دۆڵ. فیراق: لێکجیایی.

واتە: ئەگەر هیممەت و گیانی پاکی شاهی نەقشبەند یارمەتیم نەدەن و ئەم ڕێگە دوورەم بۆ نزیک نەکەنەوە، بە زوو گەیشتنەوە بە وڵاتی خۆم، من چۆن بەم پێیە پڕ لە بڵق و ئاوڵەیەوە دەتوانم شیو و دۆڵی جیابوونەوەت ببڕم و بیپێچمەوە.

ئەرضەم (گم): ئەرضم. بە پێی پڕ (ن): بە بی پر پر. هەڵەی نووسینە.

(٣) فەحوا: ناوەڕۆك. نەی: شمشاڵ.

واتە: هەر کەسێك لە سۆزی ناڵەی دەردەدارەوە لە حاڵوباری دڵ تێبگا، هەموو مەبەستێکی خۆی نادرکێنێ، چونکە لە نەوا و نەغمەی شمشاڵەوە لێی حاڵی دەبێ.

نابێ (کم، گم): نای. حاڵی لە فەحوای (کم، گم): حاڵی فەحوای. لەنگە.

(٤) نێش: چزوو. حەییە: مار. مەجنوونکوش: مەجنوونکوژ. گەزیدە: مارانگاز.

**عەیشی وەصڵم بردە سەر، ئەندووهی هیجریش سەر دەچێ**
**مەوسیمی ئوردیبیهیشتم دی، دەمێکیش دەی دەبێ (٥)**
**بۆ طەلیسمی ڕوو، برۆ شەمشێری ڕووتە ڕاست و چەپ**
**تا دەگاتە گەنجی حوسنت، پەیکی فیکرم پەی دەبێ! (٦)**
**گەر بە حوججەت بێ، ڕوخم ثابیت دەکا صیدقی ضەمیر**
**مایلی سێبی ڕوخت، ڕەنگی بە میثلی بەی دەبێ (٧)**

واتە: ڕاستە ماری زولفی لەیلایە کە بە مەجنوونیەوە داوە و کوشتوویە، بەلام مارانگازی ماری وا هەر بە ڕواڵەت مردووە و هەمیشە بە زیندوویی دەمێنێتەوە.

مەجنوونکوش (کم، گم): مەجنوونکوژ. قەد (کم، گم): قەت.

(٥) وەصڵ: بەیارگەیشتن. ئەندووه: خەم و خەفەت. هیجر: دووری. مەوسیم: وەرز ئوردیبیهیشت: دووەم مانگی بەهار. دەی: مانگی یەکەمی زستان.

واتە: من لە دووەم مانگی وەرزی بەهاردا بە یار گەیشتم و ژیانێکی خۆشم ڕابوارد. لە یەکەم مانگی زستانیشدا خەم و خەفەتی دووریم چێشت کە ئەویش بەسەردەچێ.

سەردەچێ (مان، ن): سەردخی. هەڵەی نووسینە. دی (گم): دێ.

(٦) ئەم بەیتە لە (حا، گم)دا نییە.

طەلیسم: تەلیسم. ڕووت: لەکێلاندەرهاتوو. گەنج: گەنجینە. حوسن: جوانی. پەیك: تەتەر. پەی دەبێ: قاچی دەبڕرێتەوە.

واتە: هەردوو برۆت بە ڕاست و چەپدا وەك شمشێری هەڵکێشراو وان بەسەر تەلیسمی گەنجینەی جوانیی ڕووتەوە. بۆیە ناتوانم پێی بگەم و تا دەگەمە سەری تەنانەت زەین و بیریشم کول دەبێ و لە کار دەکەوێ.

ڕوو برۆ (کم): ڕووبەڕوو.

(٧) حوججەت: بەڵگە، نیشانە. ڕوخ: ڕووم. ثابیت دەکا: دەیسەلمێنێ. صیدق: ڕاستی، ڕاستگۆیی. ضەمیر: ویژدان. مایل: ئارەزوومەند. سێب: سێو. بە میثلی: بە وێنەی، وەك. بەی: بەهێ.

واتە: ئەگەر بە بەڵگە بێ، ئەوا ڕەنگی ڕووم ڕاستیی خۆم و ویژدانم دەسەلمێنێ، چونکە ئەوی ئارەزووی سێوی ڕووی تۆ بکا، دەبێ وا شەکەت و ماندوو بێ ڕەنگی وەك بەهێ زەرد هەڵگەڕابێ.

**من لە نەشئەی جامی لەعلت، مەحشەریش نایێمە هۆش**
**جامی وا "سالم!" لە دەورا قیسمەتی "جەم" کەی دەبێ؟ (٨)**

(٨) نەشئە: خۆشی و ئارامی. لەعل: کینایەیە لە لێو. مەحشەر: ڕۆژی قیامەت. لە دەورا: لە سووڕاندا. قیسمەت: بەش، نسیب: جەم: جەمشید.

واتە: من وا لە نەشئەی شەرابی لێوی سووری تۆدا سەرخۆش بووم، ڕۆژی قیامەتیش نایێمەوە هۆشی خۆم. پیاڵەی شەرابی وا کەی لە سووڕاندا دەبێتە نسیبی جەمشید و بەری دەکەوێ.

هەموو (دەبێ)کانی ئەم پارچەشیعرە لە (کم)دا کراون بە (ئەبێ).

## -١٥- (*)

تا لەسەر لێوم، خودایا! باری ئەم هیجرانە بێ
بێ لەبی من، لێوی غونچەت بۆ لەبی کەس وا نەبێ (١)
هەر کەسێ دەستی خەیاڵ لەو زوڵفی تۆ بێنێتە یاد
لەوحی سینەی چاك بە چاك وەك چاك و زەخمی شانە بێ (٢)
ورد کە ئەستۆم، ئیستیخوانم ئامیتەی خڕخاڵە کە
طەوقە لێم ئەم گەردنە، با سیلسیلەی پاوانە بێ (٣)
مەرحەمەت بێهوودەیە، ئەو شەمعی ڕووی خۆی دەربخا
دڵ دەسووتێ، چار نییە «لابدّ» دەبێ پەروانە بێ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (عا)دا هەیە و نووسیویە «از گفتهٔ سالم»، واتە لە وتراوی سالمە.
کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتی مەحزووف.

(١) بار: قەمتاغە. هیجران: دووری. (بێ)ی دووەم بە بێ. لەب: لێو. وا نەبێ: نەکرێتەوە.

واتە: خودایە، تا من بەهۆی ئەم لێك دوورکەوتنەوەیەوە لێوبەبار بم، تـا ئـەم لێوبەبارییـەی مـن نەبرێتەوە، لێوی خونچەی تۆیش نەکرێتەوە و نەپشکوێ. من شایانی ڕەحم و بەزەییم.

(تا ... لێوم) وشەی (سەر)ی پێ دەوێ، بۆ مەعنا تەواوکردن و ڕاستکردنەوەی بەیتەکە.

(٢) لەوحی: تەختی. سینە: سنگ. چاك بە چاك: لەت بە لەت، پارچە بە پارچـە. چـاك: لـەت، پارچە. زەخم: زام، برین.

واتە: هەر کەسێك بە خەیاڵیش بیر لەوە بکاتەوە دەستی بگاتە ئەگریجەی تۆ، تەختی سینەی لەتلەتی، وەك لەت و پارچە و برینی شانە بێ.

(لەو زوڵفی) شێوەنووسی دەستنووسەکەیە، کە دەبوو ڕاست (لەو زوڵفەی) بێ. ڕێیشی تێدەچێ (بۆ زوڵفی)یش بووبێ، کە دروستە و نیوەبەیتەکەی پێ ڕەوانتر دەبێ.

(٣) ئەستۆ: مل. ئیستیخوان: ئێسك، ئێسقان، دەبـوو (ئیـستیخوانی) بووایـە و ڕەنگـە هەڵـەی ڕوونووسکەرەوە بێ. ئامێتە: تێکەڵ. خڕخاڵە: خڕخاڵ، ئەڵقەی دارین بۆ شت قایمکـردن. طـەوقـە: وەك کۆتە، بە ملەوە بووە. سیلسیلە: زنجیر. پاوانە: پاموورە.

(ئامێتە)، لەبەر کێش، بە (ئامیتە) نووسراوە.

واتە: مل و ئێسقانم بشکێنە و وردیان بکە. من ئەم گەردنەم لێ تەوقە، با ببێتە زنجیری پاوانە.

(٤) مەرحـەمەت: ڕەحـم و بەزەیی نواندن. بێهوودە: بێسـوود. شـەمع: مـۆم. لابـدّ: دەبێ.

**تا لە فانۆسی جەمالا شوعلەوەر بێ، شەمعی ڕووت**
**دڵ بە تاریکی لەگەڵ غەم هەر دەبێ هەمخانە بێ! (٥)**

پەروانە: پەپوولـە.

واتە: ڕەحم و بەزەیی یار بێسـوودە. ئەگـەر ئـەو مـۆمی ڕووی خـۆی دەربخـا، دڵ دەسـووتێ، چونکە هیچ چارێکی نییە، هەر دەبێ ببێتە پەروانە و بە دەوریدا بسووڕێتەوە.

(٥) فانۆس: چرا. جەمال: جوانی. شوعلـەوەر: بلێسـەدار. هەمخانە: هاوخانە، هاونشـین، هاوماڵ.

واتە: تا مۆمی ڕوخسارت لەناو چرای جوانیتدا گڕدار و بەبلێسە بێ، دڵ ناتوانێ لێی نزیك ببێتەوە و لە تاریکیدا هاوماڵی خەم و خەفەت دەبێ.

(*) -١٦-

دەك ڕەقیب تووشی بەڵایێ بی، نەجاتت قەت نەبێ
مانیعی وەصڵی حەیاتم تۆی، حەیاتت قەت نەبێ (١)
وەك لە من تێكچوو حوضووری دڵبەرم، ڕەببی خودا!
غەیری دەستوداری کوێری، تۆش جمانت قەت نەبێ (٢)
ئەی موفەتتین، هێندە بەدگۆ بووی، نیشاطت کردمە غەم
تا بە سەر زیندوو بی، ڕەببی تۆش نیشاطت قەت نەبێ (٣)
چاوەکانت هەردو کوێر بن، دەستەوئەژنۆ دانیشی
زیندەگیت زەهری هەلاهیل بێ، مەماتت قەت نەبێ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ن، عا)دا هەیە. ناسناوی "بیمار" لە دوابەیتدا هەیە، نەك "سالم".
کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.
(١) ڕەقیب: بەدکار، ناحەز. نەجات: ڕزگاری. مانیع: ڕێگر. وەصڵ: بەیەك‌گەیشتن. حەیات: ژیان.
واتە: ئەی بەدکار، خودا تووشی بەڵا و نەهامەتییەکت بکا، لێی ڕزگار نەبی، لەبەرئەوەی ناهێڵی تا لە ژیاندام بە یار بگەم، تۆیش ژیان و گوزەرانت نەبێ.
(٢) ئەم بەیتە لە (عا)دا نییە.
حوضوور: ئامادەبوون، چوونە حوزوور. جمان: جووڵە و بزووتن.
واتە: مادەم من بۆم نەچووە سەر بە یار بگەم، خودایە تۆیش کوێر بی و دەستت بگرن و داری کوێری بە دەستەوە بگری و لە جووڵە بکەوی.
تۆش (ن): تۆیش.
(٣) موفەتتین: فیتنەگێڕ، مایەی ئاژاوە و هەرا. بەدگۆ: بەدزمان، زمانپیس. نیشاط: چالاکی.
واتە: ئەی فیتنەگێڕ! تا ئەو ڕادەیە دووزمان و خراپەکار بووی، هەموو جموجووڵ و چالاکییەکت کردم بە خەم. خودایە تۆیش تا بەسەر دنیاوەی چالاکیت نەبێ.
زیندوو بی (ن): زیندووی. تۆش (ن): تۆیش.
(٤) زەهری هەلاهیل: ژەهری کوشندە. هەلاهیل شیلەی کوشندەی گیایەکە. مەمات: مردن.
واتە: خودایە چاوەکانت کوێر بن و دەستەوئەژنۆ بە داماوی دابنیشی. ژیان و خواردنت هەر ژەهری کوشندە بێ و قەت نەمری و هەر وا بە زەلیلی بمێنیتەوە.
بن (عا): بی.

سینەپاڵوو بدگرێ، عیللەت بە سەردیی جێگەکەت
پارچە بۆریْیای ڕزیو، فەرشی بیساطت قەت نەبێ (٥)
ئەی ڕەقیب! بیمارە دڵ، تیکرار دوعای ئەووەڵ دەکا:
دەك ئە زنجیرێ کەوی، ڕەببی! نەجاتت قەت نەبێ (٦)

(٥) سینەپاڵوو: ژان و برك لە سەرماوە. بدگرێ: بتگرێ. عیللەت: هۆ. سەردی: ساردی. بۆریا: حەسیر. فەرش: ڕاخەر. بیساط: بەڕە.

واتە: لەبەرئەوەی جێوڕێت ساردوسڕە، خودایە تووشی ژان و برك و سەرئێشە بی، پارچە حەسیرێکی دارِزاو، ڕاخەرێکی وەك بەڕەیشت نەبێ.

بدگرێ (ن): بدگرێت. پارچە بۆرییای (عا، ن): پارچەیی بوریای.

(٦) بیمار: نەخۆش، ناسناوی شاعیریشە. تیکرار: دووبارەکردنەوە. ئەووەڵ: سەرەتا، یەکەمجار. ئە زنجیر: لە زنجیر.

واتە: ئەی ڕەقیب، دڵ دیسان نەخۆشە و هەمان دوعای یەکەمجار دەکاتەوە؛ خودایە بکەویتە داوی زنجیرێکەوە، هەرگیز لێی ڕزگار نەبی.

هەموو (قەت)ەکانی ئەم پارچەشیعرە، لە (عا)دا (قەد)ن.

## -١٧- (*)

**ڕەنجشی مەعشووقە، گەر عاشق لە بەرچاوی نەبێ**
**پادشەه عاجز دەبێ، هەر وادییێ ڕاوی نەبێ (١)**
**لامەبە گێسوویی موشکینت لە دەوری خاڵی ڕوو**
**مفتە بۆ مورغانی جۆیا، دانە گەر داوی نەبێ (٢)**
**نەهری ئەشکم بۆ مەداری دڵ گەلێ نەفعی هەیە**
**ناگەڕێ سەنگئاسیا، تا قووەتی ئاوی نەبێ (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، عا، ف، غ، ج، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) ڕەنجش: ئازار، ڕەنجان. وادی: شیو.

واتە: مایەی ئازار و دڵڕەنجانە دڵی یار کە هەمیشە لە بەرچاوی عاشقدا نەبێ، چونکە دەیەوێ هەردەم لە بەرچاویدا بێ و لەبەر خۆبەدەستەوەنەدان دڵی عاشق بەردەوام ئازار بچێژێ. وەك ئەوەی پادشایەکی حەزلەڕاوکردوو زویر دەبێ ئەگەر هات و وڵاتەکەی شوێنی ڕاوی تێدا نەبێ و خەڵك نەیێن بۆ ڕاو تێداکردنی.

مەعشووقە (ن): مەعشووق. پادشەه (ق): پادشا. وادییێ (ن، ف، ق، ج): وادەیێ. یانێ کات و دەمێك. زۆر گونجاو و جوانترە. (ڕ): دادیێ. هەڵەیە.

(٢) مورغانی جۆیا: پەلەوەری گەڕاو

واتە: زوڵفی وەك موشك بۆنخۆشت لەسەر خاڵی ڕووت لامەدە، چونکە خۆڕاییە بۆ پەلەوەری بەدوای داندا گەڕاو، ئەگەر داوی لەسەر نەنرابێتەوە، دیارە ئەو بێمەینەت دەچێ چینەی تێدا دەکا و دەڕوا.

لامەبە (کم، گم): لامەدە. جۆیا (ج): جۆیان. هەڵەیە.

(٣) مەدار: خولخواردن و سووڕانەوە. سەنگئاسیا: بەرداش.

واتە: ڕووباری فرمێسکی چاوم بۆ سووڕی خوێنی دڵم گەلێ سوود و قازانجی هەیە، چونکە بەرداش بە هێزی ئاو نەبێ ناگەڕێ.

هەیە (مان، ن): نییە. هەڵەیە.

**مەنعی موژگانت مەکە، با باجی خۆی بگرێ لە دڵ**
**شەهـ بە لەشکر چی بدا، گەر کیشوەری ساوی نەبێ؟ (٤)**
**باعیثە بۆ پوختەگیی دڵ، سۆزی ناری فیرقەتت**
**نانی نابرژێ تەنوور، ئەر گەرمیی و تاوی نەبێ (٥)**
**خاوی غەفڵەت عەهدی چاوت سەهوە بۆ بێدارْدڵ**
**کێ زەبوونگیری دەکا، خەرگۆش ئەگەر خاوی نەبێ؟! (٦)**
**باری دڵ گەر هەڵگرێ، دەشکێ بە تەنها گەردنم**
**حامیلی ناکا سەمەك هەمدۆشی وەك گاوی نەبێ (٧)**

(٤) واتە: برژانگ مافی خۆیەتی دڵداران بکوژێ، چونکە برژانگ لەشکری یـارە و هەقیـەتی بـاجی خـۆی وەربگرێ. پادشا چی بداتە لەشـکرەکەی، ئەگەر دەوڵەتەکەی باج و خەراجی نەبێ؟!

چی بدا (ق): چی دەدا. کیشوەری ساوی (ف): لـەشکری سـاوی.

(٥) واتە: سۆزی ئاگری دووری لە تۆ مایەی کوڵان و خاوێنکردنەوەی دڵە. وەك چۆن تەنوور ئەگەر ئاگری بەتین و گەرمایی نەبێ، نان نابرژێنێ.

ئەر (ف، غ، ق، ر، کم، گم): گەر. تەنوور گەر (کم، گم): تەنوورێ.

(٦) خاو: خەو. غەفڵەت: بێئاگایی. زەبوونگیری: بە داماویگرتن. خەرگۆش: کەروێشك.

واتە: نوستنی چاوت لـە کاتی بێئاگاییدا سوودی بۆ عاشقی دڵئاگـا هەیـە، چـونکە کەروێـشك ئەگەر نەنوێ، بە ئاسانی ناگیرێ.

خاوی (ق): خواوی. سەهوە (کم، گم): سەهلە. بێداردڵ (کم، گم): بێداری دڵ. کێ زەبوونگیری دەکا، خەرگۆش (ف): کێ زەبوونگیری دەبێ، خەرگۆش. (ق): کەی زەبوونی گـیر دەبـێ، خـەرگۆش. (گم): کەی زەبوون گیراوە خەرگۆشی. هەڵەیە. (دەکا) لە (غ، ج)دا کەوتووە.

(٧) ئەم بەیتە و دوو بەیتی پاشەوەی لـە (ج)دا نین.

سەمەك: ماسی. هەمدۆش: هاوشان. گاو: گا.

واتە: ئەگەر گەردنی من بە تەنیا باری خەمی دڵ هەڵگرێ، با پێکـەوە لـەگـەڵ دڵ هـەڵیبگـرن، بروانە ماسی بە تەنیا ئەرز هەڵناگرێ، ئەگەر گا هاوملی نەبێ. ئیشارەتە بە ئەفسانەی (گـا و ماسـی)، گوایە ئەرزیان لـەسەر پشتی خۆیان هەڵگرتووە.

بەردە بۆ دڵ داشی جانم، دەرنەکا گەر حوکمی خاڵ
داوی بەرنووی بۆسەیە گەر داشی کوژراوی نەبێ (٨)
هەر خودادادێ نەکا جامەی هەتیوێ بۆ خودا،
وا دەزانم، هەر کە بمرێ، بۆ کەفەن جاوی نەبێ (٩)
سەرڎمیهری وا لە بەینا، ناوی "سالم" گەر نەبەی
صاحیبی خۆی کەی دەناسێ، هەر سەگێ ناوی نەبێ (١٠)

دەشکێ (غ): دەشکا. تەنها (کم): تەنیا. حامیلی (ق): عامیلی. گاوی (ق): کاوی.

(٨) ئەم بەیتە لە (ف)دا نۆیەمە.

بەرنوو: ئاوریشمی باریك.

واتە: سالم لەم بەیتەدا مەسەلەی یار و دڵدار بە یاریی نەردێن دەشوبهێنێ، وەك چۆن لە نەردێنـدا ئەگەر لایەنی بەرامبەر نەتوانێ داشەکانی بەرامبەرەکەی بکوژێ، هیچی دەسگیر نابێ. تـانجیی ڕاویـش ئەگەر نێچیری کوژراوی نەبێ، سوودێك لە ڕاگرتنیدا نابێ.

بەردە (ق): نەردە. دروستترە. داشی (ڕ): داشتی. بەرنووی بۆسەیە (کم، گم): بەرنەو بۆســەیی. (ق): تربوی بۆسەیە. هەڵەیە.

(٩) ئەم بەیتە لە (ف)دا هەشتەمە.

واتە: هەر خوداپێداوێك ئەگەر لـە ڕێی خودادا کراسێك بۆ هەتیوێك نەکا، بە دووری نـازانم کـە خۆی مرد، پارچە جاوێکیشی دەست نەکەوێ بۆ کفن تێوەی پێچن.

هەتیوێ (ڕ): هەتیوی.

(١٠) سەرڎمیهری: خۆشەویستیی ساردوسڕ.

واتە: ساردوسڕی لە خۆشەویستیدا لەنێوانماندا هەیە، بۆیە دەبێ بزانرێ سالم سەر بـە کێیـە، وەك چۆن سەگ بە ناوی خاوەنەکەیەوە دەناسرێتەوە.

## -١٨- (*)

هەموو شەو چاوەڕێم، بەڵکم بە مەخفی یاری جانی بێ
لە تاریکیی شەوا شوعلەی چرا موشکیل نیهانی بێ (١)
چرای ئەووەڵ شەوی قەبرم گڕەی دڵمە لە هیجرانت
بە سروەی بای ئەجەل شەمعی حەیاتم هەر کە فانی بێ (٢)
لە صەحرای مەحشەریشا، یاری من تەرکی ستەم ناکا
فیدای ئەو شۆخە بێ ڕۆحم کە جەوری دوو جیهانی بێ (٣)
لیقا خواهیش دەکەم دایم کە بنوێنی، وەلێ ناچار
ڕەضام حەرفێ لە جوابت بشنەوم، گەر ((لَن ترانی)) بێ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، عا، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) مەخفی: شاراوەیی، کەس‌پێ‌نەزانیو. موشکیل: زەحمەتە. نیهانی: نهێنی.

واتە: هەموو شەوێك چاوەڕێم یاری گیانیی‌بەگیانیم بە دزییەوە بێت بۆ لام و کەس پێ‌نەزانێ، بەڵام زەحمەتە گڕ و بڵێسەی چرا لە تاریکی شەودا بشاردرێتەوە.

بەڵکم (کم، گم): بەلکو. یاری (مان): ناری. هەڵەی نووسینە. ((ی)ی (تاریکیی) لە (ن)دا کەوتووە.

(٢) واتە: کە سروەی بای ئەجەل مۆمی ژیانمی کوژاندەوە و خرامە گۆڕ، یەکەم شەوی ناو گۆڕم، باکم لە تاریکی نییە، چونکە ئەوە چرای دڵمە لەبەر دووریی تۆ دەگڕێ.

گڕەی (عا): گڕی. حەیاتم (کم، گم): مورادم.

(٣) واتە: یارم لە ڕۆژی قیامەتیشدا هەر ستەمکارە، لەگەڵ ئەوەیشدا، من هەر گیانم بە قوربانی ئەو شۆخە بێ کە لە هەردوو دنیادا ستەمی هەیە.

صەحرای (عا): سەحرای. ستەم (کم، گم): جەور.

(٤) لیقا: دیدار، چاوپێکەوتن. بشنەوم: ببیستم. لن ترانی: ناتوانی بمبینی.

واتە: هەمیشە داوا دەکەم بتبینم، بەڵام تۆ ئامادە نیت، بۆیە ناچار ڕازیم قسەیەکت لێوە ببیستم، تەنانەت ئەگەر ((نامبینی- لن ترانی))ش بێ.

دەکەم (کم): ئەکەم. بنوێنی (گم): بنوێنێ. با (عا، کم، گم): گەر. لن ترانی (عا): نستراني. هەڵەیە.

**به شێوەی چەنبەریی قەددی خەمیدەی پیری بێتاقەت**
**دەبێ فیکرێ بکا یار، ئەر غورووری نەوجەوانی بێ (٥)**
**بەجوز "مانی"ی موصەوویر قەوسی ئەبرۆی تۆی نەکێشاوە**
**کە "مانی" نەقشی کێشابێ، دەبێ هەروا کەمانی بێ (٦)**
**وەفا داغی نەکا، گەر دڵ، بە کزلك چاکە دوولەت بێ**
**زوبانی پێوە دا عەقرەب، کەسێ صیدقی زوبانی بێ (٧)**
**ڕەوانی کۆهکەن با تازەکا تەقریری شیرینم**
**بە شیرینیی لەبت ناگا شەکەر، با ئەصفەهانی بێ (٨)**

(٥) چەنبەری: چەماوەیی. خەمیدە: کۆماوە. غورروور: فیز و دەمارزلی.

واتە: یار هەرچەندە فیزی نەوجوانی و لاویی هەبێ، پێویستیشە میهرەبانیی هەبێ و بەزەیی بە شێوەی پشتی کۆماوەی منی پیری بێتوان و داماودا بێتەوە.

نەوجەوانی (گم): ئەو جەوانی. هەڵەیە.

(٦) بەجوز: جگە لە. مانی: هونەرمەندێکی وێنەکێشی ئێرانی بووە. موصەوویر: وێنەکێش. قەوس: کەوان.

واتە: هەر دەبێ "مانی"ی وێنەکێش نیگاری کەوانیی برۆی تۆی کێشابێ. بۆیە کە ئەو کێشابێتی، هەر دەبێ کەوانەیی بێ.

تۆی (گم): وی. دەبێ هەڵەی چاپ بێ. هەروا (ن): هەردوو.

(٧) کزلك: چەقۆی نووکلار. عەقرەب: دووپشك. صیدق: ڕاستگۆیی. زوبانی: بە زمان.

واتە: دڵی هەر کەسێك وەفای نەبێ و نیشانەی وەفای پێوە نەبێ، خودایە بە چەقۆی نووکلار دوولەت بێ. ئەو کەسە کە هەر بە زمان ڕاستگۆ بێ، نەك بە دڵ و لە ڕاستیدا، زمانی دووپشك پێوەی بدا.

گەر (مان، ن، عا): هەر. هەڵەی نووسینە. دوولەت (کم،گم): لەتلەت. صیدقی (کم، گم): میهری.

(٨) ڕەوان: گیان، دەروون. کۆهکەن: کێوهەڵکەن. تەقریر: ڕوونکردنەوە، دیاریکردن. لەب: لێو. شەکەر: شەکر. ئەصفەهانی: هیی شاری (ئەصفەهان) لە ئێران.

واتە: با ڕۆح و دەروونی فەرهادی کێوهەڵکەن ئەم ڕوونکردنەوە شیرینم بۆ تازە بکاتەوە و پەسەندی بکا، ئەویش ئەوەیە کە شەکر، ئەگەرچی هیی ئەصفەهانیش بێ کە بە شیرینی بەناووبانگە،

## خەمۆشی بەسیەتی "سالم!"، برینی باطینی کوشتمی
## نیهانی تا بە کەی خوێنم حەنای پەنجەی فلانی بێ؟! (٩)

ناگاتە شیرینیی لێوی تۆ. (شەکەر) ئاماژەیشە بۆ هەوێکەی "شیرین".

(٩) خەمۆشی: بێدەنگی، ئۆقرەگرتن. باطینی: هیی ناوجەستە، هەناوی. نیهانی: شاردنەوە و پەنامەکی.

واتە: سالم ئەم بێدەنگییە تا کەی؟ برینی ناو جەستە کوشتمی. ئەم کارە پەنامەکییە و شاردرانەوەیە تا کەی؟ وەرن ئاشکرا بمکوژن، با خوێنم ببێتە خەنەی پەنجەی فلانی، یانێ ئەو دڵبەرەی کە ئەم خۆی بە قوربانی کردووە.

بەسیەتی (کم، گم): تا بە کەی. کوشتمی (گم): کوژتمی. تا بە کەی (کم، گم): بەسیەتی.

-١٩- (*)

**ئەی بە طەڵعەت ماهی کامیل، وەی بە حورمەت (ب) و (ت))**

**((زلف داری همچو عنبر، لب چو (ش) و (ك) و (ر)) (١)**

**عیشوەیی چاوت، دەبا وەختی نیگەه صەد گیان و دڵ**

**((قبلە آزادگانی، ای صنم! با (ر) و (خ))) (٢)**

**دڵ وەها ئاشوفتەیە شەوها لە قەیدی (م) و (و)**

**((دردمندم، مستمندم، تب گرفتە (ت) و (ب))) (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، ف، ج، ڕ، کم، گم)دا هەیە. لە (مان، ن)دا خراوەتە ناو (ملمّعات). فارسییەکەی هی "سەعدی شیرازی"یە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف.

(١) طەلعەت: دەرکەوتن. ماهی کامیل: مانگی تەواو، مانگی چواردە کە پڕە و هەمووی دەبینرێ. حورمەت: ڕێز. (ب) و (ت): بت. همچو عنبر: وەك عەنبەر، بۆنی ماددەی عەنبەر. لب: لێو. (ش) و (ك) و (ر): شکر، شەکر، واتە شیرین.

واتە: ئەی دڵبەری بە ڕوخسار وەك مانگی تریفەدار و بە حورمەت و ڕێز وەك بت، تۆ ئەگریجەیەکی وەك عەنبەر بۆنخۆش و لێوێکی وەك شەکر شیرینت هەیە.

کامیل (ج، کم): تابان. حورمەت (ف، ج، ڕ، کم، گم): عزت. (ش) و (ك) و (ر) (ڕ): شکر. هەڵەیە، چونکە کێشی بەیتەکەی تێكداوە.

(٢) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا شەشەمە.

عیشوە: ناز. نیگەه: نیگا، تەماشا. آزادگان: کەسانی ئازاد. صنم: بت. (ر) و (خ): رُخ، ڕوو.

واتە: ناز و عیشوەی چاوەکانت لە کاتی تەماشادا سەد گیان و دڵ بۆ خۆی دەفڕێنێ. ئەی یاری وەك بت کە دەتپەرستم، ڕووی تۆ قیبلەی ئەو عاشقانەیە کە خۆیان لە کۆت و بەندی دڵ و گیان ئازاد کردووە.

نیگەه (کم، گم): نەظەر. گیان و دڵ (ف، ج، ڕ): دال و لام. (کم، گم): (ل) و (ب).

(٣) ئاشوفتە: شێواو و ئاڵۆز. شەوها: چەندین شەو، شەوان. قەید: کۆت. (م) و (و): موو. دردمندم: دەردەدارم. مستمندم: بێنەوا و بێچارە، خەمگین. تن گرفتە: لەشی گرتووە. (ت) و (ب): تب، تا.

**«غەین» و «میم»م گەر نەخۆی، جانا! لە دەستت دەردەچم**

**««دردمندان را ببايد «ط» و «ب» و «ی» و «ب»»» (٤)**

**بەزمی «ی»وو «ا» و «ر» وەك جەننەتە بۆ «م» و «ن»**

**««مطربان! با نای و بربط، با رباب و «دال» و «ف»»» (٥)**

**موددەعی دووره و منیش مەستم لە «و» و «ص» و «ل»**

**««تا سحرگاهان نهاده «ل» و «ب» با «ل» و «ب»»» (٦)**

واتە: دڵ کە شەوانێکە لەناو کۆت و زنجیری مووی ئەگریجەتدا شێواو و پەرێشانە، ئەمە کارێکی کردووە دەردەدار و بێچارە و خەمگین بم و تا لەشم دابگرێ.

وەها ئاشوفتەیە (ف): دەڵێ ئاشوفتەیە. (ج): دەڵێی ئاشوفتەیە. (ڕ): وەڵێ ئاشوفتە. (کم): گوڵی. (گم): گەڵێ. تب (ج): تن.

(٤) ئەم بەیتە لە (کم)دا سێیەمە.

غەین و میم: غەم، خەم و خەفەت. «ط» و «ب» و «ی» و «ب»: طبیب، پزیشك.

واتە: گیانەکەم، ئەگەر خەمم بۆ نەخۆی، نابم بە نسیبت و لە دەستت دەردەچم، چونکە دەردەداران پێویستیان بە پزیشك هەیە بۆ چارەسەری دەردیان.

«غ» و «م» (مان، ڕ): «غەین و میم». غەین و میمم گەر نەخۆی جانا! لە دەستت دەردەچم (کم، گم): من لە دەس چووم و ئەگەر جانانە بۆم خوا غ م.

(٥) «ی» و «ا» و «ر»: یار. «م» و «ن»: من. مطربان: گۆرانیبێژان. نای: نەی، شمشاڵ. بربط: ئامێرێکی مۆسیقای وەك تارە، کاسەکەی گەورەتر و دەسکەکەی کورتترە. رباب: ئامێرێکی کۆنی مۆسیقای وەك تارە، کاسەکەی بچووکترە و جاران دوو ژێی هەبوە. دال و «ف»: دف، دەف.

واتە: بەزم و شادیی یار بۆ من وەك بەهەشتە. گۆرانیبێژان سا دەی ئەم بەزمە بە شمشاڵ و بەربوت و ڕەباب و دەفەوە گەرم و ئاوەدان بکەنەوە.

«دال» لە (مان)دا دەبوو «د» بووایە.

بەزمی «ی» و «ا» و «ر» وەك جەننەتە بۆ «م» و «ن»* مطربان با نای و بربط، با رباب و دال و «ف» (ف، کم، گم): بەزمی ی ئەر وەك جنتە بو من* مطربان با نای و بوربوط بار ب د ف. «ا» و «ر» (ڕ): زوڵف و ڕووی. «م» و «ن» (ڕ): میم و نوون. «مطربان» لە (ف)دا «مطربا» و «یار» لە (کم)دا «بار» و «نای» لە (ڕ)دا «بای» و لە (گم)یشدا «تای»یە.

(٦) واتە: بەدکار دووره و منیش مەستی گەیین بە یارم. تا بەربەیانان لێوم ناوەتە سەر لێو.

(س) و (ا) و (ل) و (م) **ئاگاهه بێ کیذب و خیلاف**

((**این غزل گفته است مسکین** (س) و (ع) و (د) و (ی))) (٧)

دووره و (کم): دووره. (و) و (ص) و (ل) (ن): وصال بەو شێوەیە لەنگ دەبێ. با (ف، کم): بر.

(نهادە) لە (مان)دا کەوتووە.

(٧) واتە: سالم بەبێ درۆ و ناڕاستی ئاگادارە کە "سەعدی"ی داماو ئەم غەزەلەی وتووە.

هەرچەندە ناوی "سەعدی شیرازی" لە دواینبەیتدا هێنراوە، فارسیی ئەم پارچەیە لای "سەعدی" نەبینرایەوە.

## -٢٠- (*)

بەسەر گوڵدا لە شانەت دڵ دەبارێ
قەضا بۆ دڵ لەسەر سونبول دەبارێ (١)
چراغێ ڕووبەڕووی حوسنت بسووتێ
بە دوودی ئەو لە هەورا گوڵ دەبارێ (٢)
بەرێ باد، ئەر غوباری کوشتەیی ڕووت
بەسەر باغا سەحەر بولبول دەبارێ (٣)
لە دڵتا ناڕوێ توخمی مەحەببەت
لە چاوم ئەشکی بێحاصڵ دەبارێ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، ف، غ، ج، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) کە ئەگریجەکانت شانە دەکەی، دڵان بەدەم شانەکەتەوە دەبارێن. ئەو قەزا و قەدەرە کە بۆ دڵی عاشق دەبارێ و شانەکەتە، لە سونبولی زوڵفی تۆ دەکەوێ.

بەسەر (ن): لەسەر. لە شانەت (ڕ): نیشانەت. هەڵەیە. (دڵ)ی یەکەم (غ): گوڵ.

(٢) چراغ: چرا. حوسنت: جوانیت. دوود: دووکەڵ.

واتە: ئەگەر: چرایەك ڕووبەڕووی ڕوخساری جوانی تۆ بسووتێ، ئەوەندە بۆنوبەرامە لە ڕوخسارت وەردەگرێ، کە دووکەڵی بەرز بووەوە بۆ ئاسمان، دەبێتە هەور و بارانی لێ پەیدا دەبێ و بەو بارانەیش گوڵ دەبارێ.

چراغێ (ق): چراغ ئەر. بە دوودی (ق): لە دووی. (ئەو) لە (مان، ن)دا کەوتووە. لە هەورا گوڵ (ف، غ، ڕ، ج): لە ئەبرا گوڵ. (ق): لە ئەبر ئاگر. ڕووبەڕووی (کم، گم): ڕووبەڕوو.

(٣) باد: بار. ئەر: ئەگەر. غوبار: تەموژ، تەپوتۆز.

واتە: ئەگەر با تەپوتۆزی ئەو عاشقانەی کە لە دەوری ڕووی تۆدا کوژراون، هەڵگرێ و بیباتە سەر باخ، گوڵی ڕووی تۆی بەسەردا دەڕژێنێ و بولبولیش لە بەرەبەیانەوە بەسەر باخدا دادەبارێن بۆ تەماشای ئەو گوڵانە.

باد (کم): با. (غوباری) لە (ن)دا کەوتووە.

(٤) ئەم بەیتە لە (ق)دا نییە.

**بەسەر کشتی دڵا بارانی شادی**

**لە هەوری بەختی من موشکڵ دەبارێ (٥)**

**لەسەر یەك سەنگها لەم سەقفە هەر سوو**

**بەسەر شیشەی دڵا غافڵ دەبارێ (٦)**

**لە هەوری طالیعی نامەردی جاهیل**

**کودوورەت بۆ دڵی عاقڵ دەبارێ (٧)**

**لە قوربانگاهی عیشقا خوێنی "سالم"**

**لە شەمشێری برۆی قاتل دەبارێ (٨)**

توخم: تۆو. بێحاصڵ: بێبەرهەم.

واتە: هەرچەندە تۆوی خۆشەویستی بە ڕووی تۆدا دەپرژێنم و بە فرمێسکی چاوم ئاوی دەدەم، بێسوود و بێبەرهەم دەمێنێتەوە. تۆ تۆوی خۆشەویستی لە دڵتدا نەڕواوە.

چاوم (ن): چارم. هەڵەی نووسینە. توخمی (کم، گم): تۆوی.

(٥) کشت: کشتوکاڵ. موشکڵ: کێشە و نارەحەتی.

واتە: زەحمەتە بارانی شادی لە هەوری بەختی منەوە بەسەر کشتوکاڵی دڵدا بارێ.

کشتی (گم): کەشتی. هەڵەیە. لە هەوری (ف، غ): لە ئەبری. (ج): لە بری. هەڵەیە.

(٦) ئەم بەیتە لە (حا)دا نییە.

سەنگها: بەردی زۆر. هەر سوو: هەر لایەك. شیشە: شووشە. غافڵ: لەپڕ.

واتە: یەك لەدوای یەك بەردی زۆر لە هەر لایەکی میچی ئاسمانەوە لەپڕ بەسەر شووشەی بلووریی دڵدا دەبارێ، ئیتر چۆن دڵ وردوخاش نابێ.

لەم (ن): کەم. هەڵەی نووسینە. بەسەر (کم، گم): لەسەر.

(٧) ئەم بەیتە و بەیتی پاشەوەی لە (ق)دا نین.

طالیع: بەخت. جاهیل: نەزان. کودوورەت: پەرێشانی و دڵگرانی.

واتە: جگە لە قەزای ئاسمانی، لە هەوری بەختی نامەردی نەفامەوە هەمیشە پەستی و زویری بەسەر دڵی عاقڵی هۆشیاردا دەبارێ.

نامەردی (ن): نامەرد و. جاهیل (کم، گم): غافڵ. عاقڵ (ڕ): غافڵ.

(٨) قوربانگاه: شوێنی تێدا سەربڕینی قوربانی. قاتڵ: بکوژ.

واتە: خوێنی سالم لە شوێنی قوربانی تێدا سەربڕین لە شمشێری بڕۆی یاری بکوژەوە دەبارێ.
خوێنی (کم): خوینی. هەڵەی چاپە. شمشێری بڕۆی (کم): شمشێر بڕۆی. (گم): شمشێر و بڕۆی. هەڵەن. قاتڵ (عا): قاطل. هەڵەیە.

-٢١- (*)

بۆ منی سووخْتەدڵ شەمعی نەدامەت دەگرێ
کە لەمێ بەخْت سەگە، بۆیە هەموو دەم دەوەڕێ (١)
واعیظان! گوێ بگْرن لەم قصەیە، زۆرْ خۆشە
سەیری وا نابێتەوە گەر بە دو ئاویش بگەڕێ (٢)
ئەسپەکەی چەوت و سییەهعەینە، وەکو طالیعی خۆم
سەقەت و ساتمەزەن و لاجڵەو و لوقمەبڕێ (٣)
شێڕەت و بەدعەمەل و کەمڕەوەش و بەدسیرەت
سەرکەش و دەمقەویی و ئەستۆکوڵ و پوزەخڕێ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (ف، کم، گم)دا هەیە.
کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.
(١) سووختەدڵ: دڵسووتاو. شەمع: مۆم. نەدامەت: نەگبەتی، پەشیمانی. لەمێ: لەم جێیە، لێرە.
واتە: منی دڵسووتاو مۆمی نەگبەتیم نەکوژاوەتەوە و دەگرێ. لێرە بەختم لێ بووە بە سەگ و هەموو دەمێك پێم دەوەڕێ.
کە لەمێ بەخت (کم، گم): کە لەمێ بەختی. (لەمێ) بە مانای (ئێرە). (کم، گم): کۆمەڵێ بەختی.
(٢) واعیظان: ئامۆژگاریکەران.
واتە: ئامۆژگاریکەران گوێ لەم قسە زۆر خۆشە بگرن، سەیر و سەمەرەی وا نابێتەوە، ئەگەر وەك ئاش لەباتیی ئاوێك بە دوو ئاویش بگەڕێ.
قصەیە (کم، گم): قسەیە. بە دوو ئاویش بگەڕێ (ف): بدراویش بگڕێ. (گم): بە دوو ئاویش بگەڕێی. هەڵەیە.
(٣) سییەهعەین: چاوڕەش. طالیع: بەخت. ساتمەزەن: زۆر هەڵەنگووتوو لە ڕۆییندا، ڕەتەڵبردوو. لاجڵەو: ڕامنەکراوی سەرسەخت. لوقمەبڕێ: مایەی بڕینی خواردن.
واتە: ئەسپەکەی ئەو، وەك بەختی خۆم، چەوت و ڕەشە، ناتەواو و ڕامنەکراو و چەمووش و لوقمەی خواردن فڕێنە.
ئەسپەکەی (ف): ئەسپێکی. لوقمەبڕێ (کم، گم): لوقمەبەرێ. یانێ لوقمە دەبا.
(٤) شێڕەت: تووش و شەڕانی. بەدعەمەل: بەدکردار. کەمڕەوش: کەمڕۆیشتوو. بەدسیرەت:

**زینم لێ کرد و لەسەر ئاخوڕەکەی بەستمەوە**
**توورەکە دەسنەدەکەوت، نامە بەری سەویەشڕێ (٥)**
**ماینە بۆزە، دەبێ شوولی قەفەسی هەڵکێشم**
**کەبکی جەنگی بە بۆیی هەجوی ئەو هەڵدەفڕێ (٦)**
**گەر لەبن داری بەڕوو کیسەڵی ڕەق خشپە بکا**
**بێ هەوەس وەصڵی ئەویش بێ لە قوڕ هەڵدەپەڕێ (٧)**
**بۆزە بەو عیصمەتەوە هەر کە ئەوا تەقریر بوو**
**صاحێبی بەستییە جووت لە تەنیشت ئەسپەخڕێ (٨)**

سەرگوزەشتە خراپ. سەرکەش: سەرکێش. قەوی: ئەستوور، زل. کۆڵ: کورت. پۆز: قەپۆز.
واتە: ئەم ئەسپە تووش و بەگێچەڵ و بەدکردەوە و تەمەڵ و سەرکێش و دەمزل و مل‌کورت و قەپۆزخڕێکە ڕابوردوویەکی خراپی هەیە.
ئەستۆ کوڵ و (گم): ئەستۆ کو.. . بەدسیرەت (ف): بنزینت. هەڵەیە.
(پۆزەخڕێ)، لەبەر کێش، بە (پوزەخڕێ) نووسراوە.
(٥) سەوی: بەرچنەی گەورە.
واتە: پاش زین‌لێ‌کردن، خستمە سەر ئاخوڕ و سەویەیەکی شڕم لەباتی توورەکە نایە بەردەم.
(نەدەکەوت) لە (کم)دا بە (نەئەکەوت) نووسراوە. (گم): نەکەوت.
(٦) کەبکی جەنگی: کەوی شەڕەکەو. بۆ: بۆن.
واتە: ئەم ماینەبۆزە کەوی شەڕەکەو لە بۆنی خراپەکاریی ئەو بێزارە و لێی ڕادەکا، بۆیە دەبێ شوولی قەفەزی تێوە بژەنم.
کەبکی جەنگی بە بۆیی (ف): کەبکی دڵ جەنگییە بە بۆی. ئەو (ف): ئەتۆ.
(٧) خشپە بکا: بخشێ بەسەر ئەرزدا. (قوڕ) هەڵەیە و ڕەنگە (قۆڕ) یا (پڕ) بێ.
واتە: ئەوەندە ترسنۆکە، ئەگەر کیسەڵ لە بن داربەڕوودا ببینێ، لە ناکاودا ڕادەچەنێ.
بێ لە (ف): بیچلە؟!
(٨) بۆز: شینی ئاماڵ‌سپی. عیصمەت: پاکی. تەقریر بوو: بڕیاردرا، ڕوون‌کرایەوە.
واتە: بۆزە بەو پاکییەی خۆیەوە لە تەنیشتی ئەسپەخڕ بەسترایەوە بۆ جووت پێ‌کردن.
ئەوێ (کم، گم): ئەوا.

ئەسپەخڕ توند و بەجۆش، ماینەکۆێت بۆز، بەخورۆش
لە تەویلەی درێژا سەربەرەوژێر دایە بەرێ (٩)
ماینی گرد و دەرکی نزم و سیازینی پێوە
زین و قەڵتاخی بە جارێ دوکەرت کرد، دەرپەڕێ (١٠)
پێی دەڵێم: شای ئاڵچاخ، ماینی بۆز زینی شکاند
پێم دەڵێ: چاکی ئەکەم، گەر تەڵێ هەنجیر بکڕێ (١١)
هەی خودا داد لەدەس ظوڵمی حسەینی ڕانکسوور
زینیشم دەشکێنێت و هەنجیریشم پێ دەکڕێ (١٢)

(٩) تەویلە: جێی حەواندنەوەی وڵاخ. دایە بەرێ: لێی نیشت و کەوتە سەری.

واتە: ئەسپەخڕ و ماینەکوێتیش بە جۆش و خورۆش بوون، بۆیە ئەسپەخڕ لەناو تەویلەدا لێی نیشت و کەوتە سەری.

ماینەبۆزە (کم،گم): ماینەکوێتی بۆز. لە تەویلەی درێژا (ف): لە تەویلەیەکی درێژ.

(١٠) گرد: خڕ. سیازین: زینی ڕەش. قەڵتاخ: پێستی ئەستووری دەباغکراو بۆ پینەی بنی کەوش.

واتە: ئەسپەخڕ وا ماینەکوێتی بەگیرهێناوە و ماندووی کردووە، لە تاواندا دەرپەڕیوە و زین و قەڵتاخی شکاون و دوولەت بوون.

گرد (ف): گرت. (سیازین) لەنگ دەبێ، بۆیە کرا بە (سیازینی). دووکەرت کرد، دەرپەڕێ (ف): دەشکێت و دەدڕێ. لەنگە.

(١١) ئاڵچاخ: هیچوپووچ، بێنرخ.

واتە: بە حسەین دەڵێم وا ماینەبۆز زینی شکاندووە، دەڵێ چاکی دەکەمەوە.

(دەڵێم) و (شکاند) و (دەڵێ) و (دەکەم) و لە (کم)دا بەرودوا بە (ئەڵێم) و (شکان) و (ئەڵێ) و (ئەکەم) نووسراون، کە دیارە "سالم" وای نەنووسیون. تەڵێ (ف): ئەڵێ.

(١٢) واتە: داد و بێداد لە دەست زۆرداریی حسەینە سوور کە زیانم پێ دەگەیێنێ و پارەیشم پێ خەرج دەکا.

ڕانکسوور (کم): ڕەنگی سوور. لەنگ دەبێ. (گم): ڕەنگسوور.

ئەم پارچەشیعرە، لەبەر نەبوونی نوسخەیتری دروست، لەوە زیاتر ڕاست نەکرایەوە.

## -٢٢- (*)

به پابۆسی لە قەدتا طوڕڕە تا کەی چین بە چین دەڕژێ؟
وەکوو بارانی ڕەحمەت، هەر لە سەردا بۆ زەمین دەڕژێ؟ (١)
دەمی هیجرت، شەوێ گەر بێتە یادم لەذذەتی بۆسەت
لە لێوی وشکی بێئاوم سەحەرگەهـ ئەنگەبین دەڕژێ (٢)
بە چاکیی چاکی زەخمی دڵ، لە وەصلا سەهوە ئوممێدم
نەمەك تا وا بەسەر ئەودا لە لێوی شەککەرین دەڕژێ (٣)
دەڕێژێ دیدەکەت خوێنی دڵی پڕمیحنەتم، ئارێ
پێیاڵەی پڕ لە دەستی تورکی مەستا بێ، یەقین دەڕژێ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، غ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) پابۆسی: پێماچکردن. طوڕڕە: ئەگریجە.

واتە: وەك چۆن بارانی ڕەحمەت لە ئاسمانەوە دادەبارێتە سەر زەوی، تا کەی چین‌چینی ئەگریجـەت لـە قەدتەوە شۆڕ دەبێتەوە و پێت ماچ دەکا؟

لە قەدتا طوڕڕە (کم): بە قەتا طوڕڕە. هەڵەی چاپە. (گم): بە قەناطر. هەڵەیە.

(٢) هیجر: دووری. لەذذەت: تام و چێژ. بۆسـە: ماچ. سەحەرگەهـ: بەرەبەیان.

واتە: ئەگەر کاتی دوورکەوتنەوەت، شەو لەزەتی ماچی تۆم بیر بێتەوە، بەیانی هەنگوین لـە لێوی وشـکی بێئاومەوە دەڕژێ.

یادم لـەذذەتی (عا، غ): خوابم لـەززەتی. بۆسـەت (کم، گم): ماچت. وشـکت (غ): خوشـکت. (ئاوم) لـە (مان)دا بە (ئادەم) نووسراوە کە هەڵەی نووسینە.

(٣) (چاك)ی یەکەم: باش و ساغ. (چاك)ی دووەم: لـەت. زەخم: برین. وەصـڵ: بەیـەك‌گەیـشتن. سەهوو: هەڵە. نەمەك: خوێ. شەککەرین: شەکراوی، شیرین.

واتە: تا سوێراو لـە لێوی شیرینی یارەوە بڕژێ، هەڵەم ئەگەر هیوام بەوە هەبێ کاتی بەیارگەیـشتن برینی لەت‌لەتی دڵم چاك دەبێتەوە.

زەخمی (کم، گم): زامی. سەهوە (کم، گم): شەهدە. هەڵەیە.

(٤) دیدە: چاو. میحنەت: مەینەت. ئارێ: بەڵێ. تورك: جوان و شۆخ. یەقین: بێ‌چەندوچۆن.

**به میثلی ئەشکی مەجنوون خوێنی موشتاقانی بێسامان**
**لە شەمشێری برۆی بێدادی لەیلی مەهجەبین دەڕژێ (٥)**
**لە یەك میصرەع ئەگەر "سالم" بنووسێ شەرحی هیجرانت،**
**بەسەر مەعنای کەلاما، تا حەشر دوڕڕی ثەمین دەڕژێ (٦)**

واتە: چاوەکانت وا مەستن خوێنی دڵی پڕ لە مەینەتیان ڕشتووم. بەڵێ، ئەگەر پیاڵەی پڕ لە دەستی شۆخی چاومەستدا بێ، بێچەندوچۆن لێی دەڕژێ.

دەڕێژێ (حا): دەبێژرێ. هەڵەیە. مەستا بێ (حا، ن): مەستانی. (عا): مەستان بێ.

(٥) میثل: وەك. ئەشك: فرمێسك. موشتاقان: پەرۆشان. بێسامان: سەرگەردان و ماڵوێران. مەهجەبین: ڕوخسار و ناوچاوان وەك مانگ.

واتە: بە هەمان شێوەی فرمێسکی مەجنوون، خوێنی عاشقانی ماڵوێران لە شمشێری برۆی غەدداری لەیلای ڕوخسار مانگەوە دادەچۆڕێ و دەڕژێ.

بێدادی (کم، گم): بیراژ. هەڵەیە. لەیلی (غ): یاری.

(٦) میصرەع: نیو بەیتی شیعر. شەرح: بەسەرهات. هیجران: لێكجیایی و دووركەوتنەوە. کەلام: قسە. حەشر: ڕۆژی قیامەت. دوڕ: گەوهەر. ثەمین: گرانبەها.

واتە: ئەگەر سالم لە نیوەبەیتێکی شیعری خۆیدا بەسەرهاتی لێكجیایی و دووركەوتنەوەی خۆی و تۆ بنووسێ، تا ڕۆژی قیامەت گەوهەری گرانبەها بەسەر مانای ئەو قسانەدا دەڕژێ.

شەرحی هیجرانت (عا): تەرحی دندانت. ثەمین (کم، گم): یەمەن.

هەموو ‹دەڕژێ›کانی کۆتایی بەیتەکانی ئەم پارچەشیعرە لە (کم)دا ‹ئەرژێ›یە.

-٢٣- (*)

**بێم ڕەقەم کەم، گەر لە شەرحی غەم، کەمێ**
**ماتەمێ دەگرێ دەروونی عالەمێ! (١)**
**بێتە یادم هەر سەحەرگەه ڕوویی تۆ**
**دێ بەسەر ڕووما، لە هەر چاوم یەمێ (٢)**
**چاوی من مەخفی دەڕێژێ ئەشکی خوێن،**
**نەك بزانێ دەردی دڵ، نامەحرەمێ! (٣)**
**تا بە کەی لەم کارە کۆتاهی دەکەی؟**
**ئەی طەبیبی دەردی کاری! مەرهەمێ (٤)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، ف، غ، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشی مەحزووف.

(١) ڕەقەم کەم: بنووسم. عالەم: خەڵك.

واتە: ئەگەر کەمێك لە شەرحی خەم و خەفەتی خۆم بنووسم، دەروونی خەڵك ماتەمینی دایدەگرێ.

دەگرێ (کم): ئەگرێ. دەروونی (عا، غ): ضەمیری.

(٢) سەحەرگەه: بەرەبەیان. یەم: دەریا.

واتە: هەر بەرەبەیانێك یادی ڕووی تۆ بکەم، ئەوەندە دەگریم دەریایەك فرمێسك لە چاوەکانمەوە بەسەر ڕوومدا دێ.

یەمێ (کم، گم): تەمێ.

(٣) مەخفی: ژێربەژێر، بە دزییەوە. نامەحرەم: بێگانە.

واتە: چاوی من بە دزییەوە فرمێسکی خوێن دەڕێژێ، تا بێگانەیەکی نامەحرەم لە دەردی دڵم ئاگادار نەبێ.

(٤) دووەم نیوەی بەیتی پاشەوە لە (کم)دا خراوەتە سەر نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە و دوو نیوەکەیتریش کەوتوون.

کۆتاهی دەکەی: دریغی دەکەی، کەمتەرخەمی دەکەی. طەبیب: پزیشك.

واتە: تا کەی دریغی و کەمتەرخەمی لەم کارەدا دەکەی؟! ئەی پزیشکی دەردی گران و کاریگەری من، دەرمان و مەرهەمێك بۆ ئەم دەردە بێنە.

بەندی دێوی میحنەتە، کاووسی دڵ
سا لە وەصڵت بۆ نەجاتم ڕۆستەمێ (٥)
بۆ منی پڕغەم چ حاصڵ طەرفی باغ؟
خاصصە گوڵگەشتی چەمەن بۆ بێغەمێ (٦)
صوحبەتی حوور و بەهەشت و کەوثەرە
جۆێبار و سەبزەزار و هەمدەمێ (٧)
دیدە نابینێ، بە غەیرەز زوڵفی یار
هەر طەرەف، وەك کاری "سالم" دەرهەمێ (٨)

(٥) میحنەت: مەینەت. کاووس: دووەم پادشای کیانی و ناودارترین کەسی زنجیرە و نەوەی کەیقوبادە. ڕۆستەم: ڕۆستەمی کوڕی زاڵ.

واتە: کاووسی دڵ، بەندکراوی دەستی دێوی مەینەتە. سا ڕۆستەمێکی بەهێزم لە مەرامی گەیشتن بە تۆ بۆ دابین بکە، ڕزگارم بکا. کاووس -بەپێی (شانامە)ی فیردەوسی- پاش چوونە چین و توووران و موکران، لەشکری کردە سەر بەربەر، شای بەربەر بە یاریدەی پادشای میسر و هاماووران بەرەنگاری بووەوە و شکاندی. ئەو دەمە کاووس "سەودابە"ی کچی شای هاماوورانی خواست، بەڵام بە فێڵ دەستگیر کرا. ڕۆستەم ڕووی کردە هاماووران و ڕزگاری کرد.

(دێوی) لە (عا)دا نوختەکانی پیتی (ێ)ی کەوتوون. نەجاتم (حا، ن): نەجاتی.

(٦) طەرف: لا، کەنار. خاصصە: تایبەتە. گوڵگەشت: گەڕانی ناو گوڵان. چەمەن: گوڵزار.

واتە: گەڕانی کەناری باخ بۆ خەمبارێکی وەك من، چ بەرهەمێکی هەیە؟ گەڕانی ناو گوڵانی گوڵزار -بەتایبەت- هەر بۆ بێخەم دەگونجێ.

حاصڵ (ڕ): مەیلی. طەرفی (کم، گم): سەیری.

(٧) صوحبەت: دۆستایەتی و تێکەڵی. حوور: حۆری، پەری. کەوثەر: ئاوی بەهەشت. جۆیبار: جۆگەی ئاو. سەبزەزار: دەشتودەری پڕ گژوگیا و ئاودار. هەمدەم: هاودەم.

واتە: لای من تێکەڵی و نزیکی لە پەری و بەهەشت و ئاوی بەهەشت، بریتییە لە ڕابواردنی لای جۆگەی ئاو و دەشتودەری سەوزی ئاودار لەتەك یارێکی ئاشنا و هاودەم.

حوور و (گم): حوری. سەبزەزار و (کم، گم): لالەزار و.

(٨) دیدە: چاو. غەیرەز: جگە لە. هەر طەرەف: هەر لایەك. دەرهەم: ئاڵۆزاو.

واتە: چاو لە زوڵفی یار بەولاوە هیچیتر نابینێ. کاری کەس لە هیچ لایەکدا وەك هی سالم شێواو و ئاڵۆزاو نییە.

وەك کاری سالم دەرهەمێ (ف): وەك سالم دڵدەرهەمێ.

## -٢٤- (*)

**بەندی کردم بە جەفا لامەذەبێ، پڕستەمێ**

**نەمەکی ڕیتە برینم، نەمەکین‌لەب، صەنەمێ! (١)**

**جیلوەطاووس و نیگاهـئاهوو و دەڕڕاجخەرام**

**طووطیئاواز و هوماسایەوو فەڕڕوخقەدەمێ! (٢)**

**نەقش چین، بوویی خەتا، خوویی فەڕەنگ، موویی حەبەش**

**هیندوویی‌خاڵ و عەرەبدیدە، نەزاکەتعەجەمێ! (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، عا، غ، ج، کم، پ، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف.

(١) لامەذەب: بێمەزەب، بێدین. پڕستەم: ستەمکار، ستەم زۆر. نەمەك: خوێ. ڕیت: ڕشت. نەمەکین‌لەب: لێو خوێدار و سوێر. صەنەم: بت.

واتە: یارێکی بێدینی ستەمکار بەندی کردم و بتێکی لێو سوێر، خوێی ڕشتە سەر برینم و خستیە سوێ.

بە جەفا (ن): لە جەفا.

(٢) جیلوە: دەرکەوتن و خۆنواندن. ئاهوو: ئاسك. دەڕڕاج: پۆڕ. خەرام: ڕەوت و لەنجە. هوما: باڵندەی هوما کە سێبەری بکەوێتە سەر هەر یەکێك دەبێتە پادشا. سایە: سێبەر. فەڕڕوخ: پیرۆز. قەدەم: پێ.

واتە: دڵدارێکی وا بەندی کردم، لە جوانیدا وەك تاوس خۆی دەردەخا، وەك ئاسك خۆی دەنوێنێ و لادەکاتەوە، وەك پۆڕ بە لەنجەولار ڕێدەکا، ئاوازی وەك ئاوازی تووتی خۆشە، وەك هوما فەڕ و بەرەکەتی پێوەیە، بەسەر سەری هەر کەسێکەوە بنیشێتەوە، دەبێ بە پادشا و پێوقودوومی هەمووی خێر و بەرەکەتە.

خەرام (غ، ج، کم، گم): ڕەوش.

(٣) نەقش: نەخش و نیگار. بوویی: بۆنی. خەتا: شاری خەتا کە بە میسك بەناووبانگە. فەرەنگ: بیانی. دیدە: چاو. نەزاکەت: وێڵ و ماریفەت. عەجەم: فارس.

واتە: دڵدارەکەم نەخش و نیگارێ کە پێوەیەتی، وەك نەخش و نیگاری وڵاتی چین وایە، ڕەوشتی وەك هی بیانییانە، مووی وەك حەبەشەیی ڕەشە، خاڵی ڕەش و چاوی وەك چاوی عەرەب ڕەشە، ئەدەب و نەزاکەتی وەك هی عەجەمانە، بۆنوبەرامەی وەك بۆنوبەرامەی میسکی وڵاتی خەتا و خوتەنە.

نەقش (کم، گم): نەقشی. دروستترە. خاڵ و (کم، گم): خاڵ.

یەك نیگەه ڕەونەقی باغی ئیرەمی خستە دڵم
دڵبەرێ، لالەڕوخێ، گوڵبەدەنێ، غونچەدەمێ! (٤)
گەنجی کونجی لەبی ڕاگرت و وتی: بگرە، بڕۆ
فاضیلی فەضڵ، وەلی‌مونعیمْ، حاتەمکەرەمێ! (٥)
وەه لەپاش ڕەنجی چ گەنجێ بوو لە کونجی دەستکەوت؟
چ کەریمێکە کە دەروێشی غەنی کرد بە دەمێ؟ (٦)
تا زوبان قوفڵە لە کونجی لەبی گەنجا، "سالم"
گەنجی شاهی نییەتی قوربێ بە قەدری دڕەمێ! (٧)

(٤) ڕەونەق: گەشاوەیی. ڕوخ: ڕوو. بەدەن: جەستە.

واتە: دڵبەری ڕوخسار ڕازاوە و لەش‌ولار وەك گوڵ و دەم وەك خونچە، بە یەكڕوانین و لاكردنەوە، گەشاوەیی و ڕەونەقی باخی ئیرەمی خستە ناو دڵم.

باغی (ج): باخی.

(٥) گەنج: گەنجینە. کونج: گۆشە، قوژبن. لەب: لێو. فاضیل: چاکەکار. فەضڵ: چاکە و پیاوەتی. وەلی: خاوەن، سەرپەرشت. مونعیم: دابینکەری ڕۆزی. حاتەم: حاتەمی تەی. کەرەم: بەخشندەیی.

واتە: دڵبەرێکی چاکەکەری دابینکەری ڕۆزی و بە بەخشندەیی وەك حاتەم، گەنجینەی گۆشەی لێوی ڕاگرت و وتی ماچی بکە و بڕۆ.

گەنجی کونجی (ن): کونجی گەنجی. وەلی (عا، کم، گم): دلّی. مونعیم (غ، کم، گم): مونعیمێ. لەنگە. حاتەم (ن): حاطەم. هەڵەیە.

(٦) ئەم بەیتە لە (ن)دا نییە.

وەه: هەی، ئامرازی خۆشی دەربڕینە. کەریم: بەخشندە. غەنی: دەوڵەمەند. دەم: هەناسە.

واتە: هەی چ گەنجینەیەکم، پاش ڕەنج و ماندوویی، لە گۆشەی لێویدا دەست کەوت! یار چ بەخشندەیەکە، دەروێشێکی نەداری وەك منی بە هەناسەیەك دەوڵەمەند کرد!

لەپاش (عا): لەپاشی. ڕەنجی (گم): ڕەنج. «دەست کرت» لە «مان»دا هەڵەیە و «دەست کەوت»ی نوسخەکانی‌تر ڕاستە. دەروێشی غەنی (ج): دەروێش و غەنی.

(٧) قوفڵە: داخراوە، چووەتە کلیلە. قورب: نزیکی. دڕەم: درهەم، پارەیەکی کەم‌نرخ بووە.

واتە: سالم، تا زمان لە گۆشەی لێواری ئەو گەنجینەیەدا چوویێتە کلیلە و گۆ نەکا، گەنجینەی شاهانە ئەوەندەی درهەمێك نرخی نییە.

-٢٥- (*)

ڕۆژی دڵ هەر شەوی تارە، چ لەویٚ بم چ لەمیٚ
مەنزڵی گێسوویی تارە، چ لەویٚ بم چ لەمیٚ! (١)
گۆشەگیرم لە فیراق و لە ویصال دەمخەیە لا
جایی من هەر لە کەنارە، چ لەویٚ بم چ لەمیٚ! (٢)
گاهی بوعدت دەڕژیٚ لوئلوئی ئەشکم وەکوو قورب
دیدە مەشغووڵی نیثارە، چ لەویٚ بم چ لەمیٚ! (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، حا، عا، ه، غ، ق، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) (تار)ی یەکەم: تاریك. (تار)ی دووەم: ڕەنگی بێبریقە و مات و کینایەیە لە ڕەش.

واتە: دڵ کە مەڵبەند و شوێنی پێچولوولی زوڵفی ڕەشی یار بێ، هەر لـە تاریکیدایـە و تەنانـەت کاتی ڕۆژیشی هەر شەوە، جا ئیتر لەناو زوڵفیدا بم یا نەبم.

گێسوویی تارە (عا، کم، ق، گم): گێسوویی یارە. دیارە گێـسوو هـەر هیـی یـارە، بـەڵام سـالم ویستوویە ڕەشی و تاریکیی گێسوو نیشان بدا و جەختی لەسـەر بکاتـەوە. هـەموو (چ لـەویٚ بم، چ لەمیٚ)کان لە (کم، گم)دا (چ لەمیٚ بم، چ لەویٚ) و لە (ڕ)دا (چ لەویٚ بم، چ لەمیٚ بم)ن.

(٢) فیراق: لێكجیایی. ویصال: بەیەكگەیشتن، بەیەکەوەبوون. جا: جێ، شوێن.

واتە: لە کاتی دووریی تۆدا گۆشەگیرم، کاتی گەیشتن بە تۆیش هەر دەمخەیتـە لاوە و لـێم دوور دەکەویتەوە. بۆیە لە هەردوو حاڵەتەکەدا شوێنی من لە کەناردایە.

لە فیراق (ه): بە فیراق. لە ویصال (غ): لە وەصڵ. دەمخەیە (ه، کم، گم): مەیخـەرە. جـایی مـن (عا، ق، ڕ): مەنزڵم. هەر لە کەنارە (حا، کم، گم): هەردوو لە نارە.

(٣) ئەم بەیتە لە (ه)دا نییە.

گاه: کات. بوعد: دووری. لوئلوء: مرواری. ئەشك: فرمێسك. قورب: نزیکـی. دیـدە: چـاو. نیثار: پێشکەش، دیاری.

واتە: کاتێك دووری، وەك نزیك بی لێمەوە و دەستم پێت نەگا، مرواریی فرمێسکت بۆ دەڕێژم. جا دوور بی یا نزیك، چاوم هەر خەریکی فرمێسكڕشتنە.

گاهی بوعدت (ڕ): گاهێ بە حیددەت. لوئلوئی ئەشکم وەکوو قورب (ق): لوئلوی ئەشك. لەنگە.

**جەوری وەصڵت شەرەر و حاڵی فیراقت سەقەرە**
**مەنزڵم هەردو لە نارە، چ لەوێ بم چ لەمێ! (٤)**
**بەری دا طوڕڕە دڵ و لەشکری غەم دەورەیی دا**
**گەردی ئەو جوملە خەسارە، چ لەوێ بم چ لەمێ! (٥)**
**تا خەیاڵ قووەتی بێ، قوربە بە "سالم" فیرْقەت**
**ڕوویی جانانە دیارە، چ لەوێ بم چ لەمێ! (٦)**

(٤) شەرەر: گڕ و پریشکی ئاگر. سەقەر: دۆزەخ. مەنزڵ: مەڵبەند.

واتە: ستەم و زۆری گەیشتن بە تۆ، پریشکی ئاگرە و دەمسووتێنێ. کە جیا دەبیتەوە و دووریش دەکەویتەوە، وەك لە دۆزەخدا بم وەهایە. بەو پێیە، لە هەردوو باردا شوێن و مەڵبەندم ناو ئاگرە.

جەوری (ق): ڕۆژی. (ڕ): حەوری. هەڵەی نووسینە. شەرەر و (ه، ڕ، کم، گم): شەرەرە. مەنزڵم (عا، ق): جایی من.

(٥) ئەم بەیتە لە (مان، ه)دا نییە.

طوڕڕە: پێچولوولی ئەگریجە. بەری دا: بەری بدا. دەوری دا: دەوری بدا. جوملە: سەرپاك، هەموو. خەسار: زیان، بەفیڕۆچوو.

واتە: ئەگریجە کە دڵی لەناودا بوو، بەری دا و دەری‌کردە دەرێ. ئیتر خەم و خەفەت نیشتنە سەر دڵ و خەمباریان کرد. بۆیە هەموو تۆز و گەردێکی زوڵفی یار کە بە دڵەوەیە، بێسوودە و مایەی زیانە بۆ عاشق.

بەری دا طوڕڕە (حا، کم، گم): بەربدا شانە. دەورەیی دا (غ، ق، ڕ): حەلقەیی دا. گەردی (غ، ق، ڕ): دەوری. چ لەوێ بم (کم، گم): چ لەوێ بێ. هەڵەیە. خەسارە (عا، کم): حەسارە. دەبێ نوختەکەی کەوتبێ. (ق): حەصارە.

(٦) قووەت: هێز و پێز. قورب: نزیکی. فیرقەت: لێك‌جیابوونەوە. جانانە: یار.

واتە: مادامێکی سالم هێزی خەیاڵی هەیە و زۆر بڕدەکا، لێك‌جیایی و دووریت وەك نزیکیە بەلایەوە، چونکە یار لەوێ بێ (دووری) یا لێرە (نزیك)، بە خەیاڵ نزیکی دەکاتەوە و ڕووی ئەوی لێ دیارە.

تا خەیاڵ قووەتی بێ، قوربە بە سالم (عا): تا خەیاڵی قووەتی بێ، قوربە بە سالم. (ه): قووەتی قوربە، تۆ بە سالم. (ق): تا خەیاڵی قەویی بێ، قوربە بە سالم.

## -٢٦- (*)

هونەر ئیکسیرمە، بێ، تا زەڕ و سیمت بدەمێ
دیدە دەریامە، وەرە دوڕڕی یەتیمت بدەمێ (١)
داومە بۆ جەزبی دڵت دڵ وەکوو داروویی طەبیب
هەمە ئوممێدی دروست، ئەرچی بە بیمت بدەمێ (٢)
وەضعی ئەربابی جیهان، گەر هەموو تەغییرە، چ غەم؟
دڵ لە جێدایە، وەرە مەیلی قەدیمت بدەمێ! (٣)
ئەدەبئاموختەیە دڵ، نیگەرانم، سا بێ
تۆ کە شای مەملەکەتی حوسنی، نەدیمت بدەمێ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) هونەر: پیشە و سنعاتکاری. ئیکسیر: کیمیا، جەوهەرێکە ماددە دەگۆڕێ. زەڕ: زێـڕ. سـیم: زیو. دوڕڕی یەتیم: مرواریی تاقانەی درشت.

واتە: هونەر کیمیای منە، وەرە هەموو شتێکت بۆ بگۆڕم بە زێڕ و زیو. چاوم دەریـای منـە و لـە فرمێسك پێکمهێناوە. وەرە مرواریی تاقانەی درشتت بدەمێ، چونکە هەمووی ئەو مرواریـیەیە.

(٢) جەزب: ڕاکێشان. داروو: دەرمان. طەبیب: پزیشك. ئەرچی: ئەگەرچی. بیم: ترس.

واتە: دڵم وەك داوودەرمانی پزیشك بەخشیوە، تا دڵت بەرەو لای خۆم بێـنم. هیـوام ڕاسـت و دروستە، ئەگەرچی ناچارم بە ترسەوە دڵمت بدەمێ و نازانم لێمی قوبووڵ دەکەی یا نا.

(جەذبی) بە (جەزبی) نووسراوە، کە هەڵەیە.

(٣) وەضع: حاڵوبار. ئەرباب: خاوەنـان، پـەروەردەکاران. تـەغییر: گـۆڕین. مـەیل: ئـارەزوو. قەدیم: کۆن.

واتە: ئەگەر حاڵوباری خاوەنانی جیهان سەرلەبەر ڕوو لە گۆڕانە، من چ خەمێکم هەیـە؟ بگـرە بە خەیاڵیشمدا نایێ، چونکە دڵم لە شوێنی خۆیدایە و مەیل و ئارەزووی کۆنم هەر ماوە و نەگۆڕاوە، وەرە ئەو مەیلەت بدەمێ.

(٤) ئەدەبئاموختە: فێری ئەدەب بوو، ئەدەبوەرگرتوو. بـێ: وەرە. حوسـن: جـوانی. نـەدیم: هاودەم، هاوپیاڵە.

**وەھ چ کۆتا بوو، لەبەر طوولی ئەمەل، عومری خەسیس**
**بە حەڵاڵی وەرە میراثی لەئیمت بدەمێ! (٥)**
**دڵی ئیسقاطییی مەعیووبی ڕەقیبم بکە ڕەد**
**لە سەقیم لابدە، بێ، قەلبی سەلیمت بدەمێ (٦)**
**تەرجەمەی ئایەیی ((لاتَقْنِطوا)) ئەم شیعرە دەکا**
**با نەویدێ لە غەفووریی ڕەحیمت بدەمێ (٧)**
**حادیث و فەردی مەجازن هەمو فەرماندەهی دەهر**
**بێرە لای من، خەبەری فەردی قەدیمت بدەمێ (٨)**

واتە: دڵ فێری ئەدەب بووە. من نیگەرانم، وەرە لام. تۆ شای وڵاتی جوانیت، وەرە دڵمت بدەمێ، بیکە بە هاودەمی خۆت.

(٥) وەھ: ئای. کۆتا: کورت. طوول: درێژی. ئەمەل: هیوا. عومری خەسیس: تەمەنی هیچوپووچ. میراپ: میرات. لەئیم: دڵڕەش، ڕقهەڵگر.

واتە: ئای ئەم تەمەنە هیچوپووچە، لەبەر درێژیی هیوای مرۆڤ، چەندە کورت بوو! وەك پێشتر دڵت دابووە یەکێکیتری دڵڕەش، ئێستا خۆشەویستییەکی ڕاستەقینە لەگەڵ من بکە و ئاشکرا وەرە، میراتی ئەو دڵڕەشییەیشت دەدەمێ.

(٦) ئیسقاطی: بێکەڵك، قوبووڵنەکراو. مەعیووب: عەیدار، بەخەوش. ڕەقیب: بەدکار. ڕەد: ڕەتکردنەوە. سەقیم: نەخۆش. قەلب: دڵ. سەلیم: ساغ، تەندروست.

واتە: دڵی بێکەڵك و قوبووڵنەکراوی عەیبداری ڕەقیبی بەدکار ڕەت بکەرەوە. لە ڕەقیبی نەخۆش دوور بکەوە، وەرە دڵی ساغ و سەلامەتت بدەمێ.

(٧) تەرجەمە: وەرگێڕان. لاتقنطوا: نائومێد مەبن. نەوید: مژدە، مزگێنی. غەفوور: لێبووردە. ڕەحیم: بەبەزەیی. غەفووری ڕەحیم: خودا.

واتە: مانای ئایەتی ((لاتقنطوا)) ئەوەیە کە با مژدەیەکی خودای گەورەت بدەمێ. وا گونجاوتر بوو (بێ) لەباتیی (با) بووایە.

(٨) حادیث: تایبەتمەندیی ئەوە کە پێشتر نەبووە و دوایی پەیدا بووە یا ڕووی داوە. فەردی مەجاز: دەسەڵاتداری تازەپێگەیشتوو. فەرماندەهی دەهر: کاربەدەستی ڕۆژ و زەمانە. فەردی قەدیم: خودا.

واتە: کاربەدەستانی دنیا هەموو تازەکوورەن و فەردی ڕاستەقینە نین. وەرە لای من با دەنگوباس و زانیاریی سەبارەت بە فەردی ڕاستەقینەت بدەمێ کە خودایە و کۆن و بەردەوامە،

**تەنگە بەرچاوی لەئیمانی جیهان، "سالم!" بێ،**
**موژدەیی ویسعەتی بەرچاوی کەریمت بدەمێ (۹)**

ئەوانیتر هەموو کاتی و بەسەرچوون.

(۹) بێ: وەرە. ویسعەت: فراوانی. کەریم: بەخشـندە، خودا.

واتە: سالم، دڵڕەشانی جیهان بەرچاوتەنگن، وەرە مژدەی بەرچاوفراوانیی خودای بەخشندەت بدەمێ.

## -٢٧- (*)

نەسیمی صوبحْدەم دەمدەم بەسەر مندا قەضا دێنێ
لە طوڕڕەی چینی زوڵفی یارەوە موشکی خەتا دێنێ (١)
لە هەمدەردانی ئەهلی دڵ، ئەمەلها بۆچی پەنهان کەم؟
دڵم بۆس و کەناری دڵبەری حووریلیقا دێنێ (٢)
ئەگەر گوڵگوون دەکا پەنجەی نیگارین، دڵ خەبەردار کا
لە تاسی دیدەیی تارم مودام ئەشکی حەنا دێنێ (٣)
هەوا حاصڵ دەکا دڵ، گەر لە غەم یەکلەحظە فاریغ بێ
بەڵێ، شیشە سەری خاڵی بێ، ئەڵبەتتە هەوا دێنێ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (م، پ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) نەسیم: شنەبا. صوبحدەم: دەمی بەیانی. دەمدەم: تاو بە تاو، هەناسە بە هەناسە. قەضا: بەڵا و نەهامەتی، قەزا و قەدەر. طوڕڕە: پێچولوول. میشك: میسك. خەتا: وڵاتی خەتا.

واتە: شنەبای بەیانی تاو بە تاو قەزا و قەدەر بەسەر مندا دێنێ. بۆنوبەرامەی میسکی وڵاتی خەتا لە پێچولوولی چین بە چینی ئەگریجەی یارەوە دەهێنێ.

(٢) هەمدەردان: هاودەردان. ئەهلی دڵ: دڵداران. ئەمەلها: کۆی ئەمەل هیوا. پەنهان کەم: بشارمەوە. بۆس: ماچ. کەنار: باوەش. حۆری: پەری. لیقا: دیدار، چاوپێکەوتن و تەماشا.

واتە: بۆچی هیواکانم لە دڵدارانی هاودەردی خۆم بشارمەوە؟ دڵم ماچ و باوەشی دڵبەری پەریشێوە و دیداری دەست دەکەوێ.

ئەمەلها (پ): ئەمەل من.

(٣) گوڵگوون: وەك گوڵ، شێوە وەك گوڵ. نیگارین: نەخشێنراو، ڕازێنراوە. خەبەردار: ئاگادار. تاس: دەفر. دیدەیی تار: چاوی نابینا. مودام: هەمیشە. ئەشك: فرمێسك. حەنا: خەنە.

واتە: دڵبەر، ئەگەر دەیەوێ وەك گوڵ پەنجەی نەخشێنراوی خۆی بڕازێنێتەوە، با دڵم ئاگادار بکاتەوە. چاوی -بە هۆی گریانی زۆرەوە- تاریك و نابینام، هەمیشە فرمێسك دەڕێژێ و لە دەفری قوولکەی چاودا خەنە بەو فرمێسکە دەگرێتەوە، تا دڵبەر پەنجەی خۆیی پێ سوور بکا.

(٤) هەوا: ئارەزوو. حاصڵ دەکا: بەدەستدەهێنێ. لەحظە: سات، ترووکە. فاریغ: خاڵی، بەتاڵ. شیشە: شووشە.

**له زەردیدا ڕوخم هەمزادی کایە و خەوفی ون ناکا**
**بە بێڕەنگی، لە جەلبی ئیمتیحانا، کەهرِوبا دێنێ (٥)**
**مولووکی تەنگْدەستە، من نەبم، دڵبەر لەگەڵ ئەغیار**
**بەبێ ڕەنگی طەلاکارم ڕەواجی شەهرەوا دێنێ (٦)**
**خوداوەند نەقشی تەصویری لە دڵما حەك نەکا هەرگیز**
**بە یادی بێکەسی وەك من لە بەختا دڵگوشا دێنێ (٧)**
**لە سەیری گوڵشەنی ڕووی، هەر زەمان دیدەم خەتاکارە**
**نیگاهی جاویدانەی بۆ دڵم، تیری قەضا دێنێ (٨)**

واتە: بەڵێ، وەك چۆن شووشە سەری دانەخرێ، هەوای تێدەچێ، ئاوایش ئەگەر دڵ بۆ ساتێکیش لە خەم و خەفەت خاڵی بێ، ئارەزووی دەبزوێ و دەبووژێتەوە.

(٥) ڕوخ: ڕوخسار. هەمزاد: جمك. خەوف: ترس. جەلب: پەلکێش‌کردن. ئیمتیحان: تاقی‌کردنەوە. کەهرِوبا: کاراکێش.

واتە: ڕەنگ‌وڕووم لە زەردیدا وەك کا وەهایە و ناشاردرێتەوە کە دەترسێ. لەگەڵ ئەوەیشدا کە بێ ڕەنگ و ڕووە، کە پەلکێش دەکرێ بۆ تاقی‌کردنەوە، ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕێ.

(کایە)، دەبێ (کاهە) بووبێ. خەوفی (پ): حەققی. ئیمتیحانا (پ): ئیمتیحاندا.

(٦) مولووك: کۆی مەلیك، شا. تەنگ‌دەست: نەدار و هەژار. ئەغیار: کۆی غەیر، بێگانە. طەلاکار: زێڕکرد، زێڕکفت. شەهرەوا: پارەیەکی قەڵب کە شا ڕەواجی پێ دەدا.

واتە: ئەگەر من نەبم، دڵبەر وەك پادشایانی نەدار وایە، هیچی لەگەڵ بێگانان پێناکرێ. کەچی بەبێ ڕەنگی زێڕکفتم، خەریکە وەك شەهرەوا ڕەواج بە خۆی دەدا.

(٧) خوداوەند: خودا. نەقش: نەخش، نیگار. تەصویر: وێنە. حەك نەکا: نەسڕێتەوە. دڵگوشا: دڵ‌کراوە، مایەی دڵخۆشی.

واتە: خودا هەرگیز نەخش و نیگاری وێنەی ئەو لە دڵمدا نەسڕێتەوە، چونکە کە بیر لە بێکەسێکی وەك من دەکاتەوە، بەختی دەهێنێ و هۆی دڵخۆشیی دەست دەکەوێ.

(٨) گوڵشەن: باخ و گوڵزار. خەتاکار: خەتابار. جاویدانە: هەمیشەیی و بەردەوام.

واتە: چاوم هەر کاتێك بڕوانێتە باخ و گوڵزاری ڕووی دڵبەر، خەتابارە، چونکە کە بەردەوام تەماشای دڵم دەکا، تیری بەڵا و نەهامەتیی تێدەگرێ.

**عەجەب صاحێبئیعجازە و ساحیرە، یاران تەماشا کەن**
**بەبێ نێش، ئەژدەهای زوڵفی بە حەلقە سەر بە پا دێنێ (٩)**
**چ موشتاقم خەرامان بێ بە شۆخیی قامەتی سەروی**
**غوباری مەقدەمی، بۆ چاوی تارم، تووتیا دێنێ (١٠)**
**حەکیم تا خۆی نەدا داروو، دەوایی عیللەتم نابێ**
**ئەگەر زەهریشە شیرینە، بە دەستی ئەو شیفا دێنێ (١١)**
**بە خاڵی مەصحەفی "سالم!" تەکاسول غەیرە مەقدوورە**
**بە ئەمری سیرعەتی کۆشش کە ئایەی ((ماسَعی)) دێنێ (١٢)**

(٩) عەجەب: سەیر. صاحێبئیعجاز: موعجیزەنوێن. ساحیر: جادووگەر. نێش: چزوو. ئەژدەها: ماری گەورە.

واتە: یاران، بڕوانن دڵبەر تا چ ڕادەیەك موعجیزەنوێن و جادووگەرێکی سەیرە! ماری ئەگریجەی پاپۆکە دەخوا و بەبێ پێوەدان بە سەر و پێوە دێ.

عەجەب صاحێبئیعجازە و ساحیرە (پ): عەجایب صاحێب ئیعجازە، وەرن.

(١٠) موشتاق: ئارەزوومەند، پەرۆش. خەرامان: بە ناز و لەنجەولار. قامەت: بەژن و باڵا. غوبار: تەپوتۆز. مەقدەم: هاتن. تووتیا: دەرمانی چاو.

واتە: چەند بە عەزرەتەوەم دڵبەری بە ناز و لەنجەولاری بەژن و باڵای وەك دارسەرو شۆخ و شەنگیەوە بێ، چونکە تەپوتۆزی جێپێی وەك دەرمان وایە بۆ چاوی نابینا و تاریکم.

(١١) حەکیم: پزیشك. داروو: دەرمان. دەوا: چارەسەر، دەرمان. عیللەت: دەرد.

واتە: تا پزیشك دەرمان نەدا بە نەخۆش، دەردی چارەسەر نابێ. ئەگەر دەرمانەکە ژەهریش بێ، چونکە لە دەستی ئەوەوەیە، شیرینە و مایەی چاکبوونەوەیە.

(١٢) مەصحەف: قورئان، کینایەیە لە ڕوو. تەکاسول: تەمەڵی. غەیرە مەقدوورە: لە تواندا نییە. ئەمر: فەرمان. سیرعەت: خێرایی.

واتە: سالم، سوێند بە خاڵی ڕووی دڵبەر، ئیتر تەمەڵی و تەوەزەلی ناکرێ و مەحاڵە. هەر خودا فەرمان بدا و بە خێرایی کۆشش بکرێ، مەبەستی ئایەتی پیرۆزی ((وأن لیس للانسان الاّ ماسعی)) دێتە دی.

خاڵی (پ): فاڵی. تەکاسول (پ): تەکاهول.

(*) -٢٨-

**به خودایێ که ڕۆژ و شەو دێنێ**
**دڵی من هەر ویصالی ئەو دێنێ (١)**
**بە هەوای مەزرەعەم، درەوکەری چەرخ**
**داسی بوڕڕا لە ماهی نەو دێنێ (٢)**
**ڕامی بۆسەی پـێیاڵەیی لێوت**
**صوبحی مەحشەر خوماری نەو دێنێ (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لـە (مان، ن، حا، عا، هـ، غ، ج، ڕ، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: خەفیفی شەشیی مەخبوونی ئەصڵەم.

(١) (دێنێ)ی یەکەم: دەهێنێ. (دێنێ)ی دووەم: لایەقیەتی و بایی ئەوەیە.

واتە: بەو خودایە کە ڕۆژ و شەو بەدوای یەکتردا دێنێ، دڵی من ئەوە دەهێنێ بە یار بگا و شایانیەتی.

بە خودایێ (کم): بە خوایێ. (گم): بەو خودایەی. هەر ویصالی ئەو (حا): زوڵـف و ڕووی تـۆ. هەڵەیە، چونکە سـەرواکەی تێکداوە.

(٢) ئەم بەیتە لـە (هـ، ج)دا نییە.

هەوا: ئارەزوو. مەزرەعە: مەزرای کشتوکاڵ. درەوکەر: دروێنەکەر. بوڕڕا: بڕندە. ماهی نـەو: مانگی تازەی یەكشەوە.

واتە: ڕۆژگاری درەوکەری گیانی عاشقان، داسی تیژ و بڕندەی مانگی یەکشەوەی بـرۆی یـاری بۆ بەدەستەوە گرتووم، ئارەزوویەتی کشتوکاڵی عیشق و تەمەنم دروێنە بکا.

مەزرەعەم (عا): مذرمم. هەڵەیە. درەوکەری (کم، گم): درەوگەری. داسی بـوڕڕا (ڕ): داڵـەبی ترا. هەڵەیە. (کم): داسی بەرا. نەو (غ): تۆ.

(٣) ئەم بەیتە لـە (حا)دا نییە.

ڕام: دەستەمۆ. بۆسە: ماچ. صوبح: بەیانی. مەحشەر: ڕۆژی قیامەت. خومار: سەرخۆش. نەو: نوێ.

واتە: ئەوانەی کە دەستەمۆی ماچی پیاڵەی لێوی تۆن، لـە بـەیانیی ڕۆژی قیامەتـدا سـەرخۆش و مەستی تازە لەگەڵ خۆیان دێنن.

ڕامی (ق): ڕاجی. بۆسەی پیاڵەی (ڕ): پیاڵەی بوسەی.

فەرەح و غەم، بە دەستی گەردوونە
ئەم بە ئاهیستە، ئەو بە دەو دێنێ (٤)
پەرچەمت کەوتە سەر بەیاضی جەبین
ئەووەڵی صوبحە، تازە شەو دێنێ! (٥)
طیفلی دڵ هەرزەگەرد و «لایَشْعُر»
ئاسْمان ئەسپی لاجڵەو دێنێ (٦)
ماتی کردم ڕەفاقەتی زاهید
هەر کوجا هەمنشینە، خەو دێنێ (٧)

(٤) ئەم بەیتە لە (کم، گم)دا شەشەمە.

فەرەح: شادی. ئاهیستە: هیواش. بەدەو: خێرا و پەلە.

واتە: شادی و خەفەتی دنیا لە دەستی گەردووندایە. شادیەکە بە هێواشی و لەسەرخۆ و خەفەتەکەیش بە خێرایی دێنێ، ئەویان درێژماوە و ئەمیان کەمخایەنە.

بە دەستی (عا): بە دەس. لەنگە.

(٥) ئەم بەیتە لە (حا، ج)دا نییە.

بەیاض: سپێتی. جەبین: ناوچاوان، تەوێڵ.

واتە: پەرچەمی ڕەشت کەوتە سەر سپێتیی تەوێڵت، وەك ئەوەی سەرەتای گەردوگوڵی بەیانی بێ، کەچی کوتوپڕ شەوی تازەی بەسەردا دێ.

صوبحە. (کم، گم): صوبح. شەو (گم): شە. هەڵەی چاپە.

(٦) ئەم بەیتە لە (حا، ه)دا نییە.

طیفل: منداڵ. هەرزەگەرد: بەتاڵ پێ، گەڕۆکی بێکارە، بێئامانج سووڕاوە. لایشعر: هەستنەکردوو. لاجڵەو: ئەسپی ڕامنەکراو و سەرڕەق.

واتە: دڵ منداڵە و گەڕۆکێکی بێکارەی نەفام و هەستنەکردووە. ئەمەیش قەزایەکی ئاسمانییە، وەك ئەوەی ئەسپی ڕامنەکراوی سەرکێش بە تووشی مرۆڤەوە بێ.

(٧) ڕەفاقەت: برادەری، هاوڕێیەتی. زاهید. تەرکیدنیاکردوو. کوجا: کوێ. هەمنوشین: هاوجێ و لەگەڵ دانیشتوو.

واتە: دۆستایەتی زاهید مات و سستی کردم، لە هەر کوێیەکدا لەگەڵت دابنیشێ، خەوت لێ دەخا.

هەر کوجا (ق): هەر کەسی.

**دوڕڕی ئەشکە بیضاعەتی "سالم"**
**قەرضی بۆسەت دەکا، گرەو دێنێ! (٨)**

(٨) دوڕ: مرواری. ئەشك: فرمێسك. بیضاعەت: کاڵا، کەلوپەل. قەرض: قەرز.

واتە: کاڵا و سەرمایەی سالم مرواریی فرمێسکە لە بارمتەی ئەو ماچانەدا کە داوتن پێی بە قەرز. ئەگەر دەتانەوێ، گرەو دەکەم و مەرجمە مرواریی فرمێسکتان بۆ ئامادە بکەم و وەری بگرن. یانێ گرەو دەکا کە قەرزی ماچ بە مرواریی فرمێسك بداتەوە، یا گرەوەکە بەوە دەباتەوە بە کاڵایەکی کەمنرخی وەك مرواریی فرمێسك، کاڵایەکی گرانبەهای وەك ماچ پەیدا دەکا. جوانە، فرمێسك ئەگەر مرواریی گرانبەها بێ، بۆچی دەبێ بەرامبەر بە ماچێکی کاتیی ئایەخ و بێنرخ بێ!!

دوڕڕی ئەشکە (ج): دوڕڕ و ئەشکە. (کم، گم): دوڕڕی ئەشکم. دەکا (کم): ئەگەر.

(*) -٢٩-

سەری زوڵفت، بە ڕووی ڕۆژا، لە عەصرت تیرەشەو دێنێ
لە شاما ناصییەت، وەك صوبحْدەم، ئاثاری خەو دێنێ (١)
ڕەوایە گەر بزانی ماهی دووهەفتەش بەقای نابێ
خەمیدەقامەتم هەردەم بە یادت ماهی نەو دێنێ (٢)
ڕەهینت گەر قوبووڵ بێ، قیمەتی بۆسەت موعەییەن کە
لە بەحری دیدەیی مەردوم لوئلوئی ئەشکم گرەو دێنێ (٣)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (نم، پ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) عەصر: ئێوارە. تیرەشەو: شەوی تاریك. شام: شێو، شەو. ناصییە: تەوێڵ، ناوچاوان. صوبحدەم: دەمی بەرەبەیان. ئاثار: شوێنەوار.

واتە: کە سەری تاڵەکانی ئەگریجەت دەکەونە سەر ڕۆژی ڕوخسارت، وەك ئەوە وایە ئێوارەیەکی ڕووناك بێ و شەوێکی تاریکی بەسەردا بێ. دەمی شێوان ناوچاوانت لە کاتی بەرەبەیان دەچێ، کە هێشتا ڕەنگ و ڕووی خەوی شەوی پێوە دیارە.

عەصرت (پ): عەصری.

(٢) ماهی دووهەفتە: مانگی چواردە. بەقا: مانەوە. خەمیدەقامەت: بەژن چەماوە. هەردەم: هەمیشە. ماهی نەو: مانگی تازە.

واتە: هەقی خۆتە ئەگەر بزانی مانگی چواردە نامێنێتەوە و بەردەوام نابێ. من هەمیشە بەژنم بە یادی تۆوە چەماوەتەوە و مانگی تازەیشی بە نسیب دەبێ.

(٣) ڕەهین: بارمتە، ڕاسپاردە. قیمەت: نرخ. بۆسە: ماچ. موعەییەن: دەستنیشانکراو. بەحر: دەریا. دیدە: چاو. مەردوم: بیلبیلە. لوئلوء: مرواری. ئەشك: فرمێسك.

واتە: ئەگەر بارمتەیەکت بوێ، دەستنیشانی بکە نرخی ماچت چەندە؟ بیلبیلە لە دەریای چاوەکانمدا مرواریی فرمێسك دەردەکا و گرەوی ئەو ماچەی پێ دەباتەوە، یا گرەو دەکا کە بارمتەکەیە بۆ بەدەستهێنانی ماچی تۆیە.

(لوئلوئی)، لەبەر کێش، بە (لولووی) دەخوێنرێتەوە.

کەسێکم ناردە دووی دڵبەر، یەکێ چوو بادە حاضر کا
نە ئەو هات و ئەمی هێنا، نە ئەم زوو دێت و ئەو دێنێ! (٤)
مەگەر مەرگ ئاشتیی تەن دا لەگەڵ بالینی ئاسایش
نەوید، ئەی جانی بێتاقەت! ئەجەل وا دێت و خەو دێنێ! (٥)
بە ڕەنجم گەندومینگوونی لە خەرمانی مەحەببەتدا
جەفا و جەوری بە خەروار و وەفا و لوطفی بە جەو دێنێ (٦)
بە هەدیە کوحلە بۆ "سالم" صەبا عەهدی لەگەڵ کردی
هەتا بەختت وەها سست بێ، نە لەم دێنێ، نە لەو دێنێ (٧)

(٤) بادە: شەراب.

واتە: مەبەستم بوو لەگەڵ دڵبەر پێکەوە دابنیشین، بۆیە یەکێکم نارد بەدوایدا و یەکێکیش چوو شەرابمان بۆ ئامادە بکا بیخۆینەوە، کەچی نە ئەو لەگەڵ دڵبەر گەڕایەوە و نە ئەمیش بە شەرابەوە زوو هاتەوە.

حاضر کا (پ): دەربێنێ. (م): حازر کا. گۆڕیویە.

(٥) تەن: لەش. بالین: سەرین. نەوید: مژدە. جان: گیان.

واتە: مەگەر مردن و سەرکردنە بان سەرینی دڵنیایی و ئارامی لە گۆڕدا لەشی ماندووم بحەوێننەوە. مژدە بێ، ئەی گیانی بێئارام و بێزار، وا ئەجەل دێت و خەوی یەکجاری لەگەڵ خۆی دەهێنێ و ڕزگارم دەبێ.

(٦) گەندومینگوون: گەنمڕەنگ، ئەسمەر. مەحەببەت: خۆشەویستی. جەفا: ئازار و ئێش. جەور: ستەم. خەروار: سەد مەن لە وشکەدان، کینایەیە لە زۆری. جەو: جۆ، کینایەیە لە کەمی.

واتە: ڕەنجێك کە من بۆ خەرمانی خۆشەویستیم داوە، تۆی بە جوانی و گەنمڕەنگی بەرهەم هێناوە. کەچی ئازار و ستەمت زۆر و وەفا و لوتفنواندنیشت کەمە.

(٧) هەدیە: دیاری. کوحل: کل. صەبا: بای لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە هاتوو. عەهد: پەیمان.

واتە: بای سەبا پەیمانی لەگەڵدا بەستووی کە کلی خۆت بەودا بە دیاری بۆ سالم بنێری. ئەگەر بەختت یار نەبێ و نەیهێنێ، نە کل و نە سەبایشت بۆ دێنێ.

## -٣٠- (*)

بەرابەر گوڵعوزاری، دیدە خوێن وەك لالە دەڕژێنێ
بەسەر ڕووی زەردما بەو ڕەنگە ئەم تیمثالە دەڕژێنێ (١)
خەیاڵی بۆسەیی عاشق بە دڵیا گەر خوطووری بێ
بەسەر لەبیا تەب و لەرزی حەیا تەبخالە دەڕژێنێ (٢)
نیشانەی کەثرەتی بارانی ئەشکم، دیدەنی تۆ بوو
لە دەوری ماهی ڕوو زوڵفت کە ڕەنگی هالە دەڕژێنێ (٣)
مەراقی گریە بۆیێ دیدە دەگرێ، حاڵەتی دووری
بەسەر باغی خەیاڵی ڕوویی یارا ژالە دەرژێنێ!! (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) گوڵعوزار: ڕوو وەك گوڵ. دیدە: چاو: لالە: گوڵاڵەسوورە. تیمثال: پەیکەر.

واتە: چاو وەك لالە فرمێسکی خوێنین بەرامبەر بەو یارە ڕوخسار وەك گوڵە دەڕژێنێ. ئەو فرمێسکە بەسەر ڕووی زەردهەڵگەڕاودا دێتە خوار و بەو ڕەنگ و شێوەیە پەیکەرێك دروست دەکا.

(٢) بۆسە: ماچ. خوطووری بێ: بیری لێ بکرێتەوە، بە دڵدا بێ. لەب: لێو. تەب: تا. تەبخالە: تامێسك.

واتە: ئەگەر عاشق خەیاڵی ماچی یار بە دڵیدا بێ و بیری لێ بکاتەوە، لەرزوتای شەرم لەسەر لێوی دەبێتە تامێسك.

(٣) کەثرەت: زۆری. ئەشك: فرمێسك. دیدەن: بینین. ماه: مانگ. هالە: خەرمانە.

واتە: بارانی زۆری فرمێسکم نیشانەی بینینی تۆ بوو. ئەگریجەت لە دەوری مانگی ڕوخسارت، وەك خەرمانەی لێ هاتووە.

(٤) مەراق: خەم و پەرۆشی. دیدە: چاو. ژالە: شەونم، داری ژاڵە کە تفت و تاڵە.

واتە: کاتی دووریی یار، چاو دەکەوێتە سەر کەڵکەڵەی گریان، بۆنەوەی فرمێسکی تاڵ و تفت بەسەر باخی بیرکردنەوە و خەیاڵی ڕووی یاردا بڕژێنێ؛ یا شەونم کە هەر فرمێسکە، بەسەر گەڵای دار و درەختی باخی خەیاڵی ڕوخساری یاردا ببارێنێ.

به قەصدی دڵ، لە مەهتابی ڕوخا، ئەگریجە کەچ وەستا
بە نێشی عەقرەبی زەهری لەسەر دونباله دەڕژێنێ (٥)
بە مەیلی موددەعی، یارم بە قەتلی من میانی بەست
بە میثلی "سامیری" خوێنم لە پێی گووساله دەڕژێنێ!! (٦)
زیادیی قووەتی ظاڵم، نیشانەی فەتحی مەظلوومە
لە عەینی خواریيا خوێنی بە تیری ناڵە دەڕژێنێ (٧)
نیگای ساقی لە گەردشدا بەبێ مەی حاڵی هێنامێ!
لە مەجلیس دەستی "سالم" مەی لەتاو ئەم حاڵە دەڕژێنێ! (٨)

(٥) قەصد: مەبەست. مەهتاب: مانگی تابان. ڕوح: ڕوو. کەچ: خوار. نێش: چزوو. عەقرەب: دووپشك. دونبال: کلك، وەك کلك.

واتە: ئەگریجە بەسەر مانگی تابانی ڕووی یارەوە بە خواری وەستا، تا لە سەری مووەکانییەوە وەك کلکی دووپشك خۆی هەڵگێڕێتەوە و ژەهر لە چزوویەوە بڕژێنێ و پێوە بدا.

(٦) مایل: ئارەزوو. موددەعی: بەدکار. قەتل: کوشتن. میان: ناوقەد، کەمەر. میثل: وەك. لەپێی: لە پێناوی. گووساله: گوێرەکە. گووسالەی سامیری: گوێرەکەیەکە پیاوێکی جوولەکەی "سامیری" ناو لە زێڕ دروستی کرد و لە پاشملەی حەزرەتی مووسا بانگی خەڵکی دەکرد بیپەرستن.

واتە: یارم بۆ بەجێهێنانی ئارەزووی بەدکار، پشتێنی لە ناوقەد بەست بۆ کوشتنم. ئەوەتا وەك سامیری خوێنم لە پێناوی گوێرەکەیەکدا دەڕژێنێ.

(٧) قووەت: هێز. ظاڵم: زۆردار. فەتح: سەرکەوتن، گرتن. مەظلووم: زۆرلێکراو، داماو.

واتە: زۆردار تا بەهێزتر بێ، نیشانەی سەرکەوتن و ڕزگاریی زۆرلێکراوە. داماو لە کاتی خواردەستی و ژێردەستەییدا خوێنی زۆردار بە تیری ناڵەناڵی خۆی دەڕژێنێ.

(٨) ساقی: مەیگێڕ. گەردش: گەڕان و سووڕان. حاڵی هێنامێ: حاڵی لێ هێنام.

واتە: تەماشای یاری مەیگێڕ لە کاتی گەڕان و سووڕانیدا، بەبێ شەراب، حاڵی لێ هێنام. سالم لە کۆڕی خواردنەوەدا پیاڵەی مەیی بەدەستەوە بوو، لەتاو ئەم حاڵە لەرزی و شەرابەکەی لێ ڕژا.

## (*) -٣١-

دل له مه‌عمووره‌ی جیهانا، مونته‌خه‌ب هه‌ر تۆی ده‌وێ
وا له‌ناو چاهی زه‌نه‌ختا، ئابڕوو گه‌ر ده‌س‌که‌وێ (١)
دایێ لێلاییی دو دیده‌م، دوور له دیده‌ت ده‌فعه‌یێ
غه‌یری ده‌رگانه‌ت، ئه‌گه‌ر بێ، پێی خه‌یالم هه‌ڵکه‌وێ (٢)
تۆ فیراقیشت له لای من حوکمی نه‌زدیکیی هه‌یه
ڕاسته خۆم لێره‌م، به مه‌رگت، ڕۆح و دڵ هه‌ر وا له‌وێ (٣)
دوژمنێکی چه‌ند موهه‌ییایه ڕه‌قیبی سه‌گ‌صیفه‌ت
ڕۆژ و شه‌و بۆ مه‌لعه‌نه‌ت قه‌ت یه‌ك‌ده‌قیقه ناسره‌وێ (٤)

(*) ئه‌م پارچه‌شیعره له (ئم، پ)دا هه‌یه.

کێشی عه‌رووز: ڕه‌مه‌لی هه‌شتیی مه‌حزووف.

(١) مه‌عمووره: ئاوه‌دانی. مونته‌خه‌ب: هه‌ڵبژارده. چاه: چاڵ. زه‌نه‌خ: چه‌ناگه.

واته: دڵ له‌ناو ئاوه‌دانیی جیهاندا تۆی هه‌ڵبژاردووه و هه‌ر تۆی ده‌وێ، ئه‌گه‌ر ئابڕووی نه‌چووبێ، که‌وتووه‌ته ناو چاڵی چه‌ناگه‌ت و گیرۆده‌ت بووه.

زه‌نه‌ختا (پ): زه‌قه‌نتا. ده‌س (پ): ده‌ست.

(٢) ده‌فعه: که‌ڕه‌ت، جار. ده‌رگانه: ده‌رگا.

واته: هه‌ردوو چاوم لێلاییان دایێ، ئه‌گه‌ر جارێك له چاوی تۆ دوور بکه‌ومه‌وه و ته‌نانه‌ت خه‌یاڵیشم له به‌رده‌رگایه‌کی‌تردا هه‌ڵنووتێ و بکه‌وێ. من هه‌ر له به‌رده‌رگای تۆدا ده‌که‌وم.

(٣) فیراق: جیابوونه‌وه. نه‌زدیك: نزیك.

واته: تۆ له کاتێکدا لێشم دوور ده‌که‌ویته‌وه، وه‌ك ئه‌وه وایه له نزیکم بی. خۆم به جه‌سته لێره و گیان و دڵیشم هه‌ر لای دڵبه‌ر ده‌بێ.

(٤) موهه‌ییا: ئاماده، ساز و ته‌یار. ڕه‌قیب: به‌دکار. سه‌گ‌صیفه‌ت: وه‌ك سه‌گ شه‌ڕفرۆش. مه‌لعه‌نه‌ت: نه‌فره‌ت.

واته: به‌دکار دوژمنێکی شه‌ڕفرۆشی ساز و ته‌یاره، به ڕۆژ و شه‌و ته‌نانه‌ت ده‌قیقه‌یه‌کیش هه‌دا نادا و هه‌ر خه‌ریکی کاری نه‌فره‌تیی خۆیه‌تی.

دوژمنێکی (پ): دوشمنێکی. ڕاستره.

**شەو -دەڵێن- دڵبەر نیشانەی «لیلة القَدْر»ی هەیە**
**پەرتەوی ئەو نوورە، بۆچ جارێ لە کولبەم ناکەوێ؟ (٥)**
**گەردنی دڵ کەوتە ژێر سەنگی فیراق و "سالم"ە!**
**وای لەژێر ئەم کێوەدا، چەند مەحکەمە و چۆن نانەوێ؟ (٦)**

(٥) «لیلە القدر»: شەوی بەدیهاتنی مراز و ئاوات. پەرتەو: درەوشانەوە و تیشکدانەوە. نوور: ڕووناکی. کولبە: کەلاوە.

واتە: دەڵێن -گوایە- دڵبەر نیشانەی وەك ئەوەی «لیلة القدر»ی هەیە، بۆچی جارێك لە جاران پرشنگی ئەو ڕووناکییە ناکەوێتە سەر کەلاوەی دڵی من و ئاواتم بەدی بێنێ؟!

(٦) سەنگ: بەرد. مەحکەم: قایم و پتەو.

واتە: دڵی سالم کەوتووەتە ژێر بەرد و تاوێری جیابوونەوە لە یار، ئیتر وا لەبن کێوێکی گەورەدا کە نازانرێ چەند پتەو و قایمە و چۆنە وا ناکەوێ و نزم نابێتەوە؟!

-٣٢- (*)

داغی کردم بە جەفا لالەڕوخێ، زێبایێ
پیری کردم بە ستەم لامەذەبێ، تەرسایێ (١)
تیزبین وەختی ستەم، گاهی کەرەم بێبەصەرێ
لە وەفا هیچْنەدانێ، بە جەفا دانایێ! (٢)
یاری ئەغیارْخوێ، موئمینی کافرصیفەتێ
خوێشی دوشمنڕەوْشێ، قاتیلێ، بێپەروایێ (٣)
قەوم بێگانەدڵێ، خوونْڕەسێ، خوونیهەوەسێ
سەرکەشێ، ڕاستْقەدێ، کەچڕەوْشێ، ڕەعنایێ (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان، ن، حا، عا)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی ئەصڵەم.

(١) جەفا: ئازار. لالەڕوخ: ڕوخسار وەك گوڵەمێلاقەیەکی سوور. زێبا: جوان. لامەذەب: بێدین. تەرسا: کچە مەسیحی.

واتە: دڵبەرێکی ڕوخسار وەك گوڵەمێلاقە سوور و جوان، بە ئازار و مەینەت داغی پێوە نام و سووتاندمی. کچێکی بێئیمان و مەسیحی بە ستەم و زۆرداری عومری بردم و پیری کردم.

(٢) تیزبین: وردەکار و هۆشیار. گاه: کات، دەم. کەرەم: بەخشندەیی. بێبەصەر: نابینا، هیچنەبین. نەدان: نەزان. دانا: زانا.

واتە: ئەو دڵبەرە لە کاتی ستەمکاریدا وردەکار و هۆشیارە، خۆی دەزانێ چی دەکا. کاتی بەخشندەییش نابینایە و هیچی لێ نابێتەوە. هیچ لە وەفاداری نازانێ و لە سزادان و تالاّوکردن بە قورگمدا زانایە.

(٣) ئەغیار: بێگانە. موئمین: باوەڕدار، ئیماندار. کافرصیفەت: بە سیفەت وەك کافر. خوێش: خزم. دوشمنڕەوش: دوژمنانە ڕەفتارکردوو. قاتیل: بکوژ. بێپەروا: بێباك، نەترس.

واتە: ئەم یارە لە کردەوە و خوودا وەك بێگانە دەجووڵێتەوە، وەك ئیماندارە و باوەڕی هەیە، کەچی سیفەتی کافرانەیە. دوژمنانە لەگەڵ خزموخوێشدا ڕەفتار دەکا و بکوژ و بێباکە.

موئمینی (ن): موونیسی. قاتیلێ (حا): قاطیلێ. هەڵەیە.

(٤) قەوم: خزمان و نزیکان. بێگانەدڵ: دڵی وەك دڵی کەسێکی بێگانەیە. خوونڕەس: پەرۆشی خوێنخواردنەوە، خوێنخۆر. خوونیهەوەس: ئارەزوومەندی خوێنڕشتن. سەرکەش: سەرکێش، لاسار.

ناموسولْمان صەنەمێ، خوونی موسولْمان ڕیزێ
سەرکەشێ، توندْخْوێ، دڵشکەنێ، خودڕایێ (٥)
هۆش و عەقڵ و خیرەدی بردْ بە تاراجی نیگاه
زیرەکێ، ساحیرەیێ، پڕخیرەدێ، دانایێ (٦)
قیصصەیی حاڵەتی ئەو کەشفە لە ڕۆم و عەجەما
نییە وەك "سالم"ی سەرگەشتە ئەبەد، ڕیسوایێ (٧)

قەد: باڵا و بەژن. کەج: خوار و چەوت. ڕەوش: ڕەفتار. ڕەعنا: بەژن ڕێك و جوان.

واتە: ئەم یارە خزمان و نزیکانی لە بەر دڵی ئەودا وەك بێگانەن، خوێنڕێژە. سەرکێش و باڵا قنج و کردەوە خوار و چەوت و جوانێکی بەژن ڕێکوپێکە.

خوونڕەسێ (عا): خوێنڕەسێ. خوونی هەوەسێ (عا): خـوێنی هەوەسـێ. لەبـەر کـێش، دەبـێ (خوونهەوەسێ) بێ.

(٥) صەنەم: بت. خوون: خوێن. ڕێزێ: ڕێژێ. توندخوو: تەبیعەتتونـد. دڵـشکەن: دڵـشکێن. خودڕا: خۆسەر، تاکڕەو.

واتە: بتێکی ناموسوڵمان و خوێنڕێژی موسوڵمانانە، لاسار و تەبیعەتتوند و دڵشکێن و تاکڕەوە.

خوونی (عا): خوێنی.

(٦) ئەم بەیتە لە (مان، حا، ن)دا نییە.

خیرەد: عەقڵ. تاراج: تاڵان. نیگاه: تەماشا. سـاحیرە: کـچە جادووکـەر. پـڕخـیرەد: بـەهۆش، تێگەیشتوو.

واتە: ئەو یارە بە نیگا عەقڵی بە تاڵان بردین، زیرەك و سیحرباز و ژیر و زانایە.

برد (عا): بردووە. لەنگە.

(٧) قیصصە: چیرۆك، بەسەرهات. کەشفە: دیارە، لە ڕوودایـە. ڕووم: ڕوخـسارم، وڵاتـی ڕۆم. عەجەم: ئێران. سـەرگەشتە: سەرگەردان. ئەبەد: هەرگیز.

واتە: چیرۆکی حاڵوباری ئەم یارە لە وڵاتی ڕۆم و عەجەمدا دیارە. هەرگیز ڕیسوایەکیتری وەك "سالم"ی سەرگەردان نییە.

(*) -٣٣-

**سەراپا بەندە ئەندامم لە قەیدی سیحری جادوویێ**
**فەرەنگیمەذهەبێ، تەرسامیزاجێ، ئاتەشیخوویێ (١)**
**بە ئیما قاتیلی عوششاقە، دیدەیی مەست، بیمارێ**
**دەکا صەیدئەفگەنی صەییادی خوونرێزم بە ئاهوویێ! (٢)**
**وەفا ناکا بەڵا بەم مووميانەی من، سەری یەك موو**
**ئەگەر هەر مووم زوبانێ بێت و دەرکا هەر زوبان موویێ! (٣)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ن، عا، ف، غ، ج، کم، گم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتی تەواو.

(١) قەید: کۆت. فەرەنگی: بیانی، رۆژاوایی. تەرسا: مەسیحی. ئاتەشی: ئاگرین.

واتە: سەرتاپای جومگەکانی لەشم وا لە کۆت و بەندی سیحربازیی دڵبەرێکی جادووگەردا، کە بە دین فەرەنگی و بە میزاج مەسیحی و بە خوو ئاگرینە.

بەندە (کم، گم): بەندی. قەیدی (غ، کم، گم): بەندی. مەذهەبێ (کم، گم): مەذهەب و. ئاتەشی (کم، گم): ئاتەشین.

(٢) ئیما: ئیشارەت. قاتیل: بکوژ. عوششاق: عاشقان. دیدە: چاو. بیمار: نەخۆش. صەیدئەفگەن: نێچیر بە زەویدادەر. صەییاد: ڕاوچی. خوونرێز: خوێنڕێژ. ئاهوو: ئاسك.

واتە: ئەو دڵبەرە چاومەستە نەخۆشە، بە ئیشارەتێك عاشقان دەکوژێ. ئەو دڵبەرە ئاسکە، ئەگەرچی بێدەسەڵات و بێوەی و نەرمە، کەچی ڕاوچییەکی خوێنڕێژی وایە، نێچیرەکەی خۆی بە زەویدا دەکوتێ و تێکیدەشکێنێ.

بە ئیما (گم): بە دایم. دیدەی مەست، بیمارێ (عا، ن، ف، کم، گم): دیدەی مەستی بیمارێ. (ڕ): دیدەمەستی بیمارت. صەیدئەفگەنی (عا، ف، غ، ج، ڕ، کم، گم): شێرئەفگەنی. خوونرێزم (عا، کم، گم): خوێنڕێژم.

(٣) وەفا ناکا: وەفادار نییە، بێئەمەکە. موومیان: ناوقەدباریك. (مووی سێیەم: تیراوێ، دەردێکی سەختە کە نەخۆش بە زەحمەت لێی چاك دەبێتەوە.

واتە: بەڵا و مەینەت ئەوەندەی سەری موویەك وەفایان بۆ دڵبەرە قەد باریکەکەم نییە، ئەگەر هەر موویەکم ببێتە زمانێك و بێتە قسە و هەر زمانێکیشم هێندە هاوار بکا برینی تیراوێی لێ دەربێ، بێسوودە و قسەم لێ وەرناگرێ.

**سەرەنگوشتی گەزی ڕاهیب، کە دیی خاڵێ لە موهری ڕوو**
**بە سەریا دا، وتی: هەممەنزڵی عیسایە، هیندوویێ! (٤)**
**"خضر"ئاسا دڵم ئابی بەقای نۆشی لە خوەی عاریض**
**کە شەوهای ظوڵمەتی طەی کرد لە حەلقەی چینی گێسوویێ (٥)**
**لە سایەی طووبەیا زەخمی دەشۆن مەحشەر لە کەوثەر، حوور**
**بەرێ هەر کەس لە دونیادا برینی تیغی ئەبروویێ (٦)**

بەڵا بمم موومیانەی (کم، گم): لەگەڵ من موو میانی. هەر (ن): سەر. هەڵەیە.

(٤) سەرەنگوشت: سەری ئەنگوشت، سەرپەنجە. ڕاهیب: پیاوی دینیی مەسیحی. میهر: خۆر. هەممەنزڵ: هاومەنزڵ، هاوشوێن. هیندوو: هیندی، کینایەیە لە خاڵی ڕەش.

واتە: ڕاهیب کە خاڵێکی ڕەشی بەسەر مۆری سپیی ڕووی دڵبەرەوە دی، سەرپەنجەی خۆی گەست و بە سەری خۆیدا کێشا، وتی: چۆن دەبێ هیندوویەکی ڕەش ببێتە هاومەنزڵی عیسا کە شوێنەکەی پیرۆزە و دەبێ بە سپێتی بمێنێتەوە.

یان: ئەگەر (میهری ڕوو) بێ، ڕاهیب کە خاڵێکی ڕەشی بەسەر ڕووی وەك خۆر درەوشاوە و سپیی یارەوە بینی، سەرپەنجەی خۆی گەست و لە داخاندا بەسەری خۆیدا کێشا و وتی: سەیرە هیندییەکی ڕەشپێست بوو بە هاوشوێن و نیشتەجێی هەمان جێوڕێی عیسا. بەوپێیە، عیسا بە ڕوو و هیندوو بە خاڵ شوبهێنراون.

سەرەنگوشتی (کم، گم): سەرەنگوستی. کە دیی خاڵێ (کم): کە دیی خاڵی. (گم): دیتی خاڵی. هەممەنزڵی (گم): هەر مەنزڵی. هیندوویێ (کم، گم): جادوویێ.

(٥) خضرئاسا: وەك خدری زیندە. ئابی بەقا: ئاوی ژیان. خوە،: ئارەق. عاریض: ڕوومەت. شەوها: شەوان، چەندین شەو. ظوڵمەت: تاریکی. طەی کرد: پێچایەوە. گێسوو: زوڵف.

واتە: دڵم کە چەندەها شەوی لە تاریکیی ناو ئەڵقەی چین لەسەر چینی ئەگریجەی یاردا پێچایەوە و بەسەربرد، وەك خدری زیندە ئاوی ژیانی لە ئارەقی ڕوومەتی یار خواردەوە و بە مەرامی خۆی گەیشت.

ئابی بەقای نۆشی (ف): ئابی بەقای نۆش کرد. (کم، گم): ئاوی بەقای نۆش کرد. لە خوەی (ڕ): کە خوەی. کە شەوهای (گم): چ شەوهای.

(٦) طووبەیا: طووبایدا، داری تووبای بەهەشت. زەخم: برین. مەحشەر: مەیدانی حەشر. کەوثەر: ئاوی کەوسەر. حوور: حۆری. بەرێ: بیا. ئەبروو: برۆ.

واتە: هەر عاشقێك لە دنیا دەربچێ و برینی جێی تیغی برۆی یارەکەی لەگەڵ خۆیدا بەرێ، ئەوە

**حیجابت، با بە ناری ئارەزوو، "سالم" نەسووتێنێ**
**لە چاکی جامە بۆ دەفعی تەبی، سا دەرخە لیموویێ! (٧)**

پەریەکان ڕۆژی قیامەت بە شەهیدی دەزانن و لەژێر سێبەری داری تووبادا بە ئاوی حەوزی کەوسەر دەیشۆن.

لە کەوثەر (عا، ف، غ، ج): بە کەوثەر. لە سایەی طووبەیا زەخمی دەشۆن مەحشەر لە کەوثەر حوور (کم، گم): لەژێر سایەی طوبا دەشۆن زامی لە مەحشەر حور. دەشۆن (ڕ): شۆن. هەڵەیە. بەرێ (ف): برێ. تیغی (ف): زەخمی.

(٧) حیجاب: پەردە، ڕووپۆش. نار: ئاگر. چاك: داوێن. جامە: کراس. دەفع: لابردن، نەهێشتن. تەب: تا.

واتە: سالم تای هەیە، لەبەر جۆشی ئارەزوو و پەرۆشی، حەز لە لیمۆ دەکا. با پەردەی سەر ڕووی تۆ بە ئاگری ئەو ئارەزووە نەسووتێنێ و لێت نزیك نەبێتەوە. خۆت لیمۆی مەمکت لە یەخەی کراسەکەتەوە دەربخە بۆ چارەسەری ئەم تایەی سالم.

لە چاکی (ن): بە چاکی. بە ناری (غ، ج، ڕ): بە ناوی. جامە (کم، گم): پیرەهەن. تەبی (کم، گم): تەب.

-١- (*)

تا مشك سيه بر سر گل چتر برانداخت
برطلعت مه شب ز خجالت سپر انداخت (١)
پروانهٔ دل گرم پر طوف رخش بود
از پرتو آن شمع درخشنده پر انداخت (٢)
تا كرد تبسّم لب شيرين به حلاوت
بر فرق نثار سخنش نیشكر انداخت (٣)
دانی به ملاحت ز چه مشهور جهان شد؟
هنگام شكرخنده نمك در جگر انداخت (٤)
كس در كمر يار به "سالم" نكند دست،
گيسوی تو تازد بكمر دست سر انداخت (٥)

(*) ئەم پارچە شیعرە لـە (مان، هـ، ج)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور.

(١) واتە: تا ئەگریجەی میسکداری ڕەش چەتری بەسەر گوڵەوە بەست، شەو بە دەرکەوتنی مانگ لە خەجاڵەتیدا خۆی شاردەوە.

(٢) ئەم بەیتە لە (هـ)دا نییە.

واتە: پەپوولەی دڵ زۆر و بە گەرمی بە دەوری مۆمی ڕوخساریدا سووڕایەوە، پەڕی لەبەر پرشنگی ئەو مۆمە درەوشاوەیەدا هەڵوەری.

(٣) واتە: تا لێوی شیرین بە شیرینییەوە بزە و خەندە گرتی، شەکری قامیشی شەکری بەسەر قسەکانیدا هەڵدا و پرژاند.

سخنش (هـ): سخنت.

(٤) ئەم بەیتە لە (ج)دا نییە.

واتە: دەزانی بە شیرینی ناوبانگی بە چی دەرکرد لە جیهاندا؟ کاتێ خەندەی شیرینی خوێنی کردە جگەرەوە و هێنایە سوێ.

(٥) واتە: کەس بە سەلامەتی دەست لە کەمەری یار هەڵناگرێ. ئەگریجەی تۆ تا گەیشتە کەمەری تۆ سەری دانا.

-٢- (*)

**ترك چشمش كار جادو كرده‌است**
**تكيه بر شمشير ابرو كرده‌است (١)**
**بهر صيد مرغ دل آن نازنين**
**خال دانه دام گيسو كرده‌است (٢)**
**از كه نالم ور كه گيرم داد خود؟**
**غارت دل چشم جادو كرده‌است (٣)**
**كشور جان و خرد برباد داد**
**شاه عشقش هر كجا رو كرده‌است (٤)**
**نيست كارى تير رستم غمزه‌اش**
**اين به شوخى، او به بازو كرده‌است (٥)**
**عاقبت بخشنده شد درياى غم**
**قطرهٔ اشكم به لوءوء كرده‌است (٦)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (غ، نم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشی مەقسوور.

(١) واتە: جوانیی چاوی وەك سیحر كاری كردووە و پشتی بە شمشێری برۆ بەستووە.

(٢) واتە: ئەو نازەنینە نسیبی ڕاوی پەلەوەری دڵە. خاڵەكەیشی بووەتە دانەی داوی ئەگریجەی.

آن نازنين (نم): آصيدگير. دەبێ (آن صيدگير) بووبێ و (ن) لە نووسینەوەدا پەڕیبێ.

(٣) واتە: لەبەر ئەوەی دەناڵێنم و تۆڵەی دڵی لێ دەستێنمەوە، چاوی سیحربازی گیان بە تاڵان دەبا.

ور (نم): وز. خود (نم): دل. غارت دل (نم): غارت جان.

(٤) واتە: پادشای عیشقی ڕووی كردبێتە هەر كوێ، وڵاتی گیان و عەقڵی بە تاڵان بردووە.

برباد داد (نم): تاراج كرد. كجا (نم): طرف.

(٥) ئەم بەیتە لە (نم)دا نییە.

واتە: تیری ڕۆستەمی پاڵەوان كاریگەریی غەمزەی ئەوی نییە. یار بە گاڵتە یا دڵفڕێنی یان جەسارەت ئەوە دەكا، ڕۆستەمیش بە هێزی بازوو.

(٦) واتە: سەرەنجام دەریای خەم و خەفەت بەزەیی پێمدا هاتەوە و بەخشندە بوو، دڵۆپی فرمێسكمی كردووە بە مرواری.

**از شمیم جان و زلف مشکبار**
**باز "سالم" زخم دل بو کرده‌است (۷)**

بخشنده شد (نم): بخشنده‌ٔ. ناته‌واوه. دریای غم (نم): دریای عشق.

(۷) واته: سالم، دیسان له بۆنوبه‌رامه‌ی گیان و ئه‌و ئه‌گریجه میسکداره‌ی یاردا، بۆنی برینی دڵی کردووه.

از شمیم جان و (نم): از شمیمی کینی.

-٣- (*)

**نگنجد در خیال کس قیاس طول گیسویت**
**به آخر کی رسانَد عمر من تعریف یك مویت؟! (١)**
**نیگاه ناظران از مدّعی مستور کی باشد**
**که عکس مردمك غلطد درآب آتشین رویت (٢)**
**به تسخیر طلسم گنج رویت چون کمر بندم**
**کف پای خرد مجروح سازد تیغ ابرویت ! (٣)**
**به ترك عشق اگر گویم: دمی ثابت قدم باشم**
**ز جا بی اختیارم می‌رباید چشم جادویتْ ! (٤)**
**به هنگام نظر در اشك "سالم" رازها خوانند**
**به ایمای غرض مخفی رقبیان سر کویت (٥)**

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی تەواو.

(١) واتە: پێوانەی درێژیی ئەگریجەت لە خەیاڵی هیچ کەسێکدا جێی نابێتەوە. تەمەنی من کەی تاریفی تاڵەموویەکت بە کۆتایی دەگەیێنێ، چونکە بەشی ئەوە ناکا.

(٢) واتە: کەی تەماشای تەماشاکەران لە بەرچاوی بەدکاردا دەشاررێتەوە؟ کە ڕەنگدانەوەی بیلبیلەی چاوت لە ئاوی ڕووی ئاگرینتدا دەسوورێتەوە.

(٣) واتە: چۆن پشتێن بە نیازی داگیرکردنی تەلیسمی گەنجینەی ڕوخسارت ببەستم. تیغی برۆت بەری پێی عەقڵ بریندار دەکا، ئەگەر نیازی چوونێکی وەهای هەبێ.

(٤) واتە: ئەگەر بڵێم بە دەستهەڵگرتن لە عیشق تاوێك پایەدار و جێ‌پێ‌قایم بم، چاوی سیحربازت، بەبێ ئەوەی خۆم بمەوێ، لە جێی خۆم دەمفرێنێ.

(٥) واتە: سالم، ئەگەر بەدکارانی بەرایی مەنزڵت بە ئیشارەتی مەرامی شاراوە تەماشای چاوم بکەن، جۆرەها ڕاز و نیاز لەناو فرمێسکدا دەخوێننەوە.

## -٤- (*)

خوش بود بهار، در کنار کشت
حوروَش بتی، چهره چون بهشت
مشك‌بو نه بیدمیشك ریز بید
باده خوش‌گوار و ساده خوش‌سرشت
ساده باده لب، باده ساده‌کش
باده‌ام به لب و ساده‌ام به کُش
ساده لعل لب، باده ساده‌وَش
چیست زین دو خوش، در کنار کشت
شد دمن به من، زانکه از شقیق
کوه و دشت شد، معدن عقیق
خاك شد عبیر، آب شد رحیق
باغ ارم گشت، شد [چون] بهشت
ای ندیم خیز، می به جام ریز
کآید از چمن، باد مشك‌بیز
شد بهار بلخ، بوستان تو نیز
زنده کن ز می، رسم زَردُهُشت
پیر را کند کهنه می جوان
جان به تن چه سان، او به جان چنان
شاد باشدش، تا ابد روان
آن که از ازل تخم تاك کشت
پای خم فتم، مست و بیخبر
ز خاك خم تن، خشت زیر سر
تا ز خاك من، صنف کوزه‌گر
گه کنند خم، گه زنند خشت
آن پسر مرا برده دل [ز جا؟]

زند خوش ادا، شوخ دل[ربا؟]
دعویش وفا، عادتش جفا
زوست خوش‌نما، فعل هرچه زشت
بر ز سیم خام، دل سیه رُخام
زلفکان چو خام، دام خاص و عام
دانه‌های دام، خال مشك‌فام
کو به طرف رخ، جابه‌جا بهشت
تا به خط مو، آن بت چگل
بسته تار جان، بسته پود دل
دست جان به دل، پای دل به گل
تا چه چرخ آن تارپود رشت
تا به کلك صنع، کاتب قلم
بر لبش کشید، سبزخط رقم
کرد مشك را با عبیر خم
پس به غنچه آن سرخ‌گل نوشت
گفت محرم، آن کهنه اُستاد
مدح والیان، میر پاکزاد
دفتری غزل، زین زیب داد
فرد مدحتش، جمله درنوشت
آن که ذو الجلال، دادش این جلال
وان که رای او، مظهر جمال
بر شیوخ پاك، بر کشیش حال
طوف کوی او، کعبه و کنشت

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (غ)دا هەیە.
لەبەرئەوەی هەر لەم نوسخەیەدا هەیە و ناسناوی "سالم"یشی تێدا نیە، لێك نەدرایەوە.
کێشی عەرووز: ساغ نەبووەوە.

-٥- (*)

به دنبال نظر از دیده اشك لالەگون افتد
كه ترسم عاقبت از پرده راز دل بيرون افتد (١)
چو در چاه زنخدانت دلم افتاد دانستم
كه در زندان تو محبوس ماند، سرنگون افتد! (٢)
تجلّی صورت "شيرين" ز روی سنگ بگدازد
اگر از عكس رويت پرتو در (بيستون) افتد (٣)
مسلسل زلف مشكنيت چو بينم بر قد رعنا
بياد اين دل ديوانه زنجير جنون افتد ! (٤)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) واتە: دوابەدوای تەماشاکردن فرمێسکی خوێنین لە چاو دادەکەوێ. دەترسم سەرەنجام ڕازی دڵ لە پەردەی چاومەوە بێتە دەرەوە.

(٢) واتە: هەر کە دڵم کەوتە ناو چاڵی چەناگەت، زانیم بە بەندکراوی لە زیندانی تۆدا دەمێنێتەوە و بێسەروشوێن و سەرنگوون دەبێ.

(٣) واتە: ئەگەر ڕووناکییەك لە تیشکدانەوەی ڕوخسارت بکەوێتە سەر کێوی (بێستوون)، دەرکەوتنی وێنەی "شیرین" لە ڕووی بەرددا دەتوێنێتەوە.

(٤) واتە: کە ئەگریجەی میسکدارت ئەڵقە ئەڵقە بە دەوری قەدی بڵند و ڕێکتەوە ببینم، زنجیری شێتی دەکەوێتە یادی ئەم دڵە دێوانەیە.

## (*) -٦-

**چنین صورت تو داری چین ندارد**
**دریغا رخصت ماچین ندارد (١)**
**به صحن کعبهٔ رخ طرّه پازد:**
**که این دیوانه هندو دین ندارد! (٢)**
**هر آن طلعت که مه دارد، تو داری**
**ولی او طرّهٔ مشکین ندارد (٣)**
**زچشمت مرغ دل مشکل برد جان**
**که تاب پنجهٔ شاهین ندارد! (٤)**
**الا ای خسرو خوبان نگاهی!**
**که فرهادی چو من شیرین ندارد (٥)**
**تو خفته بر سریر ناز شبها،**
**سر من تا سحر بالین ندارد!! (٦)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (مان، ھ)دا ھەیە.

کێشی عەرووز: ھەزەجی شەشیی مەحزووف.

(١) واتە: ئەو شێوەیەی وا چین چینی ئەگریجەی تۆ ھەیەتی، وڵاتی (چین) نییەتی. بە داخەوە کە مۆڵەتی ماچ یا چوونە وڵاتی (ماچین)ی نییە.

(٢) واتە: ئەگریجە پێی کوتا بە تەختی کەعبەی ڕوخساردا و پێداگریی کرد کە ئەم دێوانە ھیندییە، یا دیوانە ڕەشپێستە، دینی نییە و کافرە.

(٣) واتە: ئەو دەرکەوتنە کە مانگ ھەیەتی، تۆ ھەتە، بەڵام ئەو ئەگریجەی بۆنخۆشی میسکداری نییە.

(٤) واتە: زەحمەتە پەلەوەری دڵ لەبەر چاوت گیان دەرکا، چونکە دەسەڵات و تین‌وتوانی پەنجەی شاھێنی نییە و دەرەقەتی نایێ.

مشکل برد جان (ھ): مستکمل جان.

(٥) واتە: ئەی شای جوانان نیگایەك! چونکە فەرھادی وەك من "شیرین"ی نییە.

(٦) واتە: تۆ لەسەر جێی نازی شەوان خەوتووی، سەری من تا بەرەبەیان لەسەر سەرین نییە.

**نگاهت تا نریزد خون "سالم"**
**به میدان نظر تسکین ندارد (۷)**

(۷) واته: تا نیگای تۆ خوێنی سالم نەڕێژێ، چاو لێکنانێ و ئۆقرە ناگرێ.

(*) -٧-

**ز خالش دلبرم در دام گیسو دانه می سازد**

**اساس صید مرغ دل چ استادانه می سازد؟ (١)**

**سر و جانم فدای دلبری گردد که در خلوت**

**برای بزم عاشق از لبش پیمانه می سازد (٢)**

**به ترك آن بتی ناصح دهد پندم، که گر بیند**

**همان ساعت ورا در یك نگه دیوانه می سازد (٣)**

**ز مهرش نیست گر دلبر نوازش کرد با اغیار**

**برای مصلحت زین گونه با بیگانه می سازد (٤)**

**اگر خالی ز شغل عشق باشد، گمرهی آرد**

**هر آن زاهد حساب سبحهٔ صد دانه می سازد (٥)**

(*) ئەم پارچەشیعرە لە (غ، نم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) واتە: دلّبەرم لە داوی ئەگریجەدا دانە لە خاڵی خۆی دروست دەکا. چەند وەستایانە بناغە بۆ ڕاوی پەلەوەری دڵ دادەنێ.

(٢) واتە: سەروی گیانم بە قوربانی دڵبەر بوو، کە لە تەنیاییدا پیاڵەیەك لە لێوی خۆی دروست دەکا بۆ کەیف و شادیی عاشق.

دلبری (نم): ساقیٔ.

(٣) واتە: ئامۆژگاریکەر ئامۆژگاریم دەکا، واز لەو بتە بێنم، ئەگەر ببینێ هەر لەو ساتەدا ئەو بە نیگایەك شێت و دێوانە دەکا.

آن بتی (غ): مهروخ. که گر بیند (غ): که می بیند. همان ساعت ورا در یك نگه (نم): به یك ایما درآن چون دیگران.

(٤) واتە: لە خۆشەویستیی خۆیەوە نییە ئەگەر یارم لوتفی لەگەڵ بێگانەدا هەبێ و دڵیان ڕابگرێ. بەم شێوەیە بۆ بەرژەوەندی خۆی لەگەڵ بێگانەدا ڕێك دەکەوێ.

ز مهرش نیست گر دلبر نوازش کرد با اغیار (نم): محبّت نیست اگر یارم تلطف داشت با اغیار.

(٥) ئەم بەیتە هەر لە (غ)دا هەیە.

**هوای آن پری "سالم" اگر در دل چنین گردد**
**به هر محفل در آخر سرّ ما افسانه می سازد (٦)**

واته: ئەگەر کاری عیشقی تێدا نەمێنێتەوە، هەر ئەو دەستلەدنیاهەڵگرتووە پارێزکەرە کە حیسابی تەزبیحی سەد دانەیی دەکا و خەریکی خوداپەرستییە، سەرگەردانی و گومڕایی دێنێ.

(٦) ئەم بەیتە هەر لە (غ)دا هەیە.

واتە: سالم، ئەگەر ئارەزووی ئەو پەرییە لە دڵدا وەهای لێ بێ، سەرەنجام ڕاز و نهێنی ئێمە لە هەموو کۆڕ و کۆمەڵێکدا دەبێتە ئەفسانە.

## -٨- (*)

شانه تا عنبر زلف تو به رخسار کشد
بر سر مهر درخشنده شب تار کشد (١)
در ره روم رخت دوختەام چشم به چین
تا نسیم سحری نافهٔ تاتار کشد (٢)
عنبرافشان شده سنبل به سر صفحهٔ گل
به خطا شانه زچین طبلهٔ عطّار کشد (٣)
نیست ممکن که بران زلف کشد دست خیال
به چه جرأت ز سر گنج چنین مار کشد؟! (٤)
زاغ بیدرد به راحت گذرد روز و شبش،
رنج سرمای چمن بلبل بیدار کشد (٥)
طعنهٔ کس نکند سرد زتو این دل گرم،
بلبل از بهر گلی زحمت صد خار کشد (٦)

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (مان)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) واتە: تا شانە بۆنوبەرامەی ئەگریجەی تۆ بەسەر ڕوخساردا بێنێ، شەوی تاریك بەسەر خۆری ڕووناك و درەوشاوەدا دەکێشێ.

(٢) واتە: لە ڕێی ڕوخساری سپی و ڕووناکتدا چاوم بە وڵاتی (چین)دا دادرووە. تا بای فێنکی بەرەبەیان بۆنی میسکی وڵاتی تاتار بێنێ.

(٣) واتە: سونبول بەسەر ڕووی گوڵەوە بۆنی عەنبەری بڵاوکردەوە. شانە شووشەی پڕ بۆنوبەرامەی عەتاری لە وڵاتی چینەوە بردە وڵاتی (خەتا).

(٤) واتە: مەحاڵە دەستی خەیاڵ بگاتە ئەو ئەگریجەیە. مارێکی وا بە چ بەخۆداڕاپەرموونێکەوە دەچێتە سەر گەنجینەی ڕوو.

(٥) واتە: قەلەڕەشی بێدەردەسەر و ناخۆشینەدیو، ڕۆژ و شەوی بە ئارامی تێدەپەڕن. بولبولی بێدار ئازار و مەینەتی باخ و گوڵزار دەکێشێ.

(٦) واتە: تانەی هیچ کەسێك ئەم دڵە گەرمەت لێ سارد ناکاتەوە. بولبول لە پێناوی گوڵێکدا

**دستم از تو نکشد کشمکش جور رقیب**
**جان "سالم" به نگه نرگس بیمار کشد (۷)**

زەحمەتی سەد درِك دەكێشێ.

(۷) واتە: دەستم كێشمەكێشی ئازار و ستەمی بەدكاری لەسەر تۆ پێ لانابرێ. گیـانی سـالم بـە نیگای نێرگزی مەست و سەرخۆش دەكێشێ.

-۹- (*)

(کلام سرکار شیخ است)

باز لیلی ز خیمه بیرون شد
بند ببرید و عقل مجنون شد
برقع از رخ فکند جلوه‌کنان
آفت عاشقان محزون شد
به هوای دو زلف شبرنگش
باد شبگیر در شبیخون شد
باز فرهاد در غم شیرین
دامنش ز اشك دیده گلگون شد
جلوه‌ای کرد عشق و تودهٔ خاك
پرزنان تا فراز گردون شد
قرعهٔ عشقشان به نام افتاد
فال دیوانگان همایون شد
روغن اندر لباس شیر آمد
باده اندر مزاج افیون شد
دُرد در خم نشست چند گهی
صاف باز آمد و فلاطون شد
زرّه‌ای جلوگاه مهر آمد
قطره‌ای مد راه جیحون شد
دوش جان در قضای عالم قدس
به تماشای صنع بیچون شد
دید نقشی ز هرچه افزون دید
عقل کاهید و حیرت افزون شد
هیچ رازی برو گشاد نشد
تا دل اندر تحیرش خون شد

ناگهان از سرادقات جلال
بی زبان این ترانه بیرون شد:
کای جهان جلوگاه قدرت تو
هردو عالم گواه وحدت تو
این همه نقش تست، پاك می‌دانم
لیك در معنی تو حیرانم

**

بس که مستغرق خیال توام
بیخود از لذت وصال توام
ای تو مولا و بندهٔ تو جهان
احمدی کن که من بلال توام
تشنه‌لب جان مردم، ارچه مدام
به لب چشمهٔ زلال توام
پای دارم که بردی از دستم
دست گیرم که پایمال توام
عاقلی را به نیم جو نخرم
من که دیوانهٔ جمال توام
خواجگان در صف نعال منند
تا من اندر صف نعال توام
سرکش از عشق بی زوال منی
بیخود از حسن لایزال توام
دام نفکنده بند پای منی
دانه ناچیده بسته‌بال توام
گرچه وصل تو بس محال افتاد
نیست در سر جز این محال توام
دلبران گو که عشوه نفروشند
زانکه من بیدل از دلال توام

فارغ از قیل و قال شاه و گدا
سر پر از شورش وصال توام
گر حلال است مستی از می ناب
ساقیا من سور این حلال توام
حسب‌وحالی ز دوست میگوید:
مطرب این نغمه از مقال توام
کای جهان جلوگاه قدرت تو
هردو عالم گواه وحدت تو
این همه نقش تست می‌دانم
لیك در معنی تو حیرانم

**

سالکانی که لامکان سفرند
رهروانی شکسته بال و پرند
کوچه‌گردان عور بی زر و سیم
کیمخابخش و کیمیانظرند
سرسپرده به تیغ و تیغ به کف
صف‌شکن در مصاف کرّوفرند
از لب خشك و اشك و دیدهٔ تر
شهریاران ملك کرّوفرند
همه چون لشکری شکسته‌پر شب
آیت فتح و رایت ظفرند
سری تسلیمشان به پای قضا
پای تعظیم بر سر قدرند
از دمی صد هزار جان بخشند
به لب آورده جان محتضرند
گاه در تخته‌بند بدن قفسی
گاه در شاخ سدره نغمه‌گرند

همه پاکیزه‌روی و پاک‌نهاد
همه ژولیده موی پر غبرند
گاه چون موم بر عسل پیدا
گاه پنهان چو شهد در شکرند
همه باطن به سیرت ملکی
همه ظاهر به صورت بشرند
شهرها طی نموده در دل شب
یکقدم ره نرفته در سحرند
پرده‌پوشند گاه و لب خاموش
به همین پرده گاه پرده‌درند
کای جهان جلوگاه قدرت تو
هردو عالم گواه وحدت تو
این همه نقش تست پاک می‌دانم
لیک در معنی تو حیرانم

**

باز در پردهٔ داستان تاکی
سوختم، سرّ جان نهان تاکی
همه سر بر خطیم و جان بر کف
جور و بیداد و امتحان تاکی
بر رخم اشك ارغوانی بین
دوری ای شاخ ارغوان تاکی
از تو یك جلوه و ز ما صد جان
نرخ کالای جان گران تاکی
بگـذر از عار و ننگ و نام نشان
مانده در نام و در نشان تاکی
از کمند زمانه بیرون شو:
دست و پا بستهٔ زمان تاکی

دامن وقت خویش گیر به کف
در پی عمر کف‌زنان تاکی
هفته و سال و ماه و روز گـذشت
پند پیران شنو، جوان تاکی
پیشرو باش و تیزگام به راه
مانده دنبال کاروان تاکی
جام خود گیر و جای خالی شد
زحمت بزم میکشان تاکی
در بهاران گلی بچین و برو
تکیه بر موسم خزان تاکی
گاه مست سرو و گاه غرور
گه چنین و گهی چنان تاکی
پنبه از گوش جان نکو بردار
غافل از فهم این بیان تاکی:
کای جهان جلوگاه قدرت تو
هردو عالم گواه وحدت تو
این همه نقش تست می‌دانم
لیك در معنی تو حیرانم

**

از جفاهای یار، جز بر یار
ناکسم گر به کس برم زینهار
بگرفت از سپهر زنگاری
باز آینهٔ دلم زنگار
چون کنم آرزوی روی کسی
کآروز را نداده ره به کنار
ای ترا آستان مدار جهان
وی ترا آستین جهان مدار

**دست مارا بر آستان بستند**
**دست از آستین غیب برآر**
**بیخود از باده می دیدم دوش**
**تا به دیدم در او فتاده گـذار**
**پیر دیر از درون صلان درداد**
**کی تو ناخوانده سر به خانه درآر**
**سر درون بردم و درو دیدم**
**خلوتی خاص و خالی از اغیار**
**یار در جلوه با هزار شئون**
**گاه با سبحه، گاه با زنّار**
**نقشها مختلف سیاه و سفید**
**جمعها مُئتلف بشیر و مشار**
**معنی اندر مقام جمع، یکی**
**صورت اندر لباس فرق، هزار**
**من به حسرت، چه خلوت است، چه جمع**
**من به وحشت، چه وحدت و چه شمار**
**ناگهان بی حروف صوت شنید**
**گوش جان این ترانه از لب یار:**
**کای جهان جلوگاه قدرت تو**
**هردو عالم گواه وحدت تو**
**این همه نقش تست می‌دانم**
**لیك در معنی تو حیرانم**

(*) ئەم پێنجبەندییە هەر لە (غ)دا هەیە.

لەبەرئەوەی هەر لەم نوسخەیەدا هەیە و ناسناوی "سالم"یشی تێدا نییە، لێك نەدرایەوە. نەزانراوە (سەرکاری شێخ)یش کێیە؟

کێشی عەرووز: خەفیفی شەشیی مەخبوونی ئەصلەم.

## -١٠- (*)

مرا کافی است ساقی، کو نگاه چشم مخمورش
چه شد دور نظر دیگر چه حاجت آب انگورش (١)
نظر در لعل نوشینش چو نقش بوسه می‌بندد
زند چشمش ز تیر غمزه بر دل نیش زنبورش (٢)
به قندیل دلم مهر جمالش در شب هجران
فروزد پرتو نوری که موسی دید در طورش (٣)
دل بی‌طاقتم بار محبّت برنمیدارد
چه سان جا داشتی مهر سلیمان در دل مورش؟ (٤)
ز تاج خسروی برتر کلاه فقر درویشی
نمی‌ارزد جهان‌گیری به غوغای شر و شورش (٥)
به دین مصرع شنیدم خواند "سالم" دوش ساقی‌را:
شراب تلخ میخواهم که مردافگن بود زورش! (٦)

(*) ئەم پارچە شیعرە لە (مان، ن)دا هەیە و لێی نووسراوە ((غزل فارسی)).
کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی تەواو.

(١) واتە: مەیگێڕ، کوا نیگای چاوی مەستی ئەو، ئەوە بەسە بۆ ئێمە. چی لە دەورووبەری ڕوانین و تەماشادا گوزەراوە، ئیتر پێویست بە ئاوی ترێ (شەراب) ناکا.

(٢) واتە: تەماشاکردنی پیاڵەی لێوی، وەك نەخشی ماچ چەسپ دەبێ. چاوەکانی چزووی هەنگ لە تیری غەمزە و نازیەوە دەگرنە دڵ.

(٣) واتە: پرشنگی ئەو ڕووناکییەی کە مووسا لە کێوی (توور)دا بینیی، خۆری جوانیی ئەو لە شەوی دووریدا لە چرای دڵمدا شەوق پێدەداتەوە.

(٤) واتە: دڵی بێتاقەتم باری خۆشەویستی دەرنابا. ئیتر خۆشەویستیی سولەیمان بە چ شێوەیەك لە دڵی مێروولەکەیدا جێگیر دەبێ.

(٥) واتە: کڵاوی هەژاریی دەروێشی لە تاجی شاهانە زیاترە. جیهانگیری بە هەراوهوریای شەڕوشۆڕ نرخی نیە و ئەوە ناهێنێ.

(٦) واتە: دوێنێ ئەم نیوەی بەیتەم بیست کە "سالم" بۆ مەیگێڕی خوێندەوە: شەرابی تاڵم دەوێ کە هێز و تواناییەکی وای هەبێ مرۆڤ بە ئەرزدا بدا.

## -١١- (*)

**تا سرشك از ديدەگان افشاندەام**
**ارغوان بر زعفران افشاندەام (١)**
**از سرشك ديده بهر مقدمش**
**بر نثارش لعل كان افشاندەام (٢)**
**وصف لعل او دهن شيرين كند**
**نكتهٔ شكرفشان افشاندەم (٣)**
**گشتەام همداستان كوەكن**
**بهر شيرين نقد جان أفشاندەام (٤)**
**تا گرفتم دامن وصلش به كف**
**آستين بر دو جهان افشاندەام (٥)**

(*) ئەم پارچە شیعرە لە (غ، نم)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی شەشی مەحزووف.

(١) واتە: لەو کاتەوە فرمێسکم لە چاوەکانمەوە داوەراندووە، ئەرخەوانی گوڵسوورم بەسەر زەعفەرانی ڕەنگزەرددا ڕژاندووە.

زعفران (غ): چعفران. هەڵەیە.

(٢) ئەم بەیتە لە (غ)دا چوارەمە.

واتە: لە فرمێسکی چاو بۆ هاتنی دڵبەر لەعلی کانگام بۆ پرژاندووە و کردوومە بە پێشکەشی.

(٣) ئەم بەیتە لە (غ)دا پێنجەمە.

واتە: وەسفی لێوی ئەو، دەم شیرین دەکا. نوکتەی شەکرڕێژی شیرینم بڵاوکردووەتەوە.

(٤) ئەم بەیتە لە (غ)دا سێیەمە.

واتە: بووم بە هاوداستانی (فەرهاد)ی کێوهەڵکەن. نەختینەی گیانم بۆ (شیرین) بڵاوکردووەتەوە.

(٥) ئەم بەیتە لە (غ)دا دووەمە.

واتە: تا داوێنی گەیشتن بە یارم بەدەست گرتووە، قۆڵم هەڵداوەتە ناو هەردوو دنیا.

باز "سالم" بر فلك بنگر ز آه

بر هوا ابر از دخان افشانده‌ام (٦)

(٦) واته: "سالم" دیسان لەبەر ئاه و ناڵە بڕوانە ئاسمان، دووکەڵم کردووە بە هەور و پڕژاندوومە بە هەوادا.

## -١٢- (*)

**دل روا نيست ز مهرت به ستم بردارم**
**به چه دلبر بدهم، چون ز تو دل بردارم (١)**
**گر به شام سر زلف تو شبى دست كشم**
**صبح تا شام دگر پنجه معطّر دارم (٢)**
**به يك بوسه نشد حاجت دل از تو روا**
**كه ازان لب طمع قند مكرّر دارم (٣)**
**وعدهٔ خلد به محشر دهدم واعظ شهر**
**من كنون از لب و رخ جنت و كوثر دارم (٤)**
**به تماشاى گلم سوى چمن دل نكشد**
**تا گل روى تو در ديده تصوّر دارم (٥)**

(*) ئەم پارچە شیعرە لە (مان، هـ، ج)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی ئەصلەم.

(١) واتە: ئەی دڵ، ڕەوا نییە بە ستەم و ناهەق واز لە خۆشەویستیی تۆ بێنم. دڵ بدەمە چ دڵبەرێك، ئەگەر دەست لە تۆ هەڵگرم.

(٢) واتە: ئەگەر شەوێك دەست بکێشمە ناو شەوی سەری ئەگریجەی تۆ، ئیتر لە بەیانییەوە تا ئێوارە پەنجەکانم بۆندار دەبن.

(٣) ئەم بەیتە لە (هـ)دا نییە.

واتە: ئیحتیاجی دڵم بە ماچێکی تۆ جێبەجێ نەبوو. کە تەماعی شەکری بەردەوامم لەو لێوانە هەبوو، ئیتر چۆن دەستم دەکەوێ.

به يك (ج): گر به يكى.

(٤) واتە: ئامۆژگاریکەری شار بەڵێنی بەهەشتم لە قیامەتدا دەداتێ. من ئێستا بەهەشت و ئاوی کەوسەرم لە ڕوخسار و لێوی دڵبەردا هەن.

(٥) ئەم بەیتە لە (ج)دا شەشەمە.

واتە: تا گوڵی ڕووی تۆ لە بەرچاومدا بێ، دڵ بەرەو باخ و گوڵزار ڕامناکێشێ بۆ تەماشای گوڵ.

در ديده (ج): وزيده.

**تا به ویرانهٔ من رو نهی، ای گنج مراد**
**چشم چون قفل بامّید تو بر در دارم (٦)**
**نقطهٔ خال لبت باز به "سالم" بنما**
**مردم دیده ازان دانه منوّر دارم (٧)**

(٦) ئەم بەیتە لە (ج)دا پێنجەمە.

واتە: ئەی گەنجینەی موراد! تا ڕوو نەکەیتە وێرانەی دڵی من، وەك چۆن قوفڵ بە دەرگاوەیە، من چاوم لە دەرگایە بە ئومێدی کردنەوەی.

رو نهی (ج): پا نهی.

(٧) واتە: جارێکیتر نوختەی خاڵی لێوت نیشانی سالم بدە. بیلبیلەی چاوم بەو خاڵە ڕووناك دەبێتەوە.

## -١٣- (*)

**خیز، تا در کمرت مشك معطّر بینم**
**بر سر سرو سهی ماه منوّر بینم (١)**
**گرد رخسار به کش دائرهٔ جدول زلف**
**تا بر اطراف قمر مشك مدوّر بینم (٢)**
**تا کنم خال تو با مردمك دیده قیاس**
**قَدَمی بیشترم خوان، که مکرّر بینم (٣)**
**از پی کشتن "سالم" چو کشی تیغ به قصد**
**در هوا دست نگهدار، که خنجر بینم! (٤)**

(*) ئەم پارچە شیعرە هەر لە (مان، ھ، ج)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی ئەصڵەم.

(١) دووەم نیوەی بەیتی دوایی لە (ج)دا کراوەتە نیوەی دووەمی ئەم بەیتە و دوو نیوەکەی‌تر کەوتوون.

واتە: هەستە، تا میسکی بۆندار بە کەمەرتەوە ببینم، مانگی تریفەداریش بەسەر سەری سەروی ڕێك و بڵندەوە ببینم.

(٢) واتە: بازنەی خشتەی ئەگریجە بە دەوری ڕوخساردا بکێشە. تا میسکی دەوراندەور بە دەوری مانگەوە ببینم.

(٣) واتە: تا بەراوردی خاڵی تۆ لەگەڵ بیلبیلەی چاودا بکەم، بێڵە هەنگاوێك بێمە پێشەوە، تا دووبارە ببینم.

بیشترم (ھ): پیشترم.

(٤) واتە: کە تیغ بە مەبەستی کوشتنی "سالم" هەڵدەکێشی، دەستت بە حەواوە ڕابگرە تا خەنجەر ببینم.

چو (ج): چە. بە قصد (ج): بە جان.

## -١٤- (*)

بیا دل از پریشانی به زلف دلبر اندازیم
مسلمان خانەزادی را به دست کافر اندازیم (١)
ز بند پر ملال غم بود صبح نجات ما
شبی گر عنبرین مویت به گردن چنبر اندازیم (٢)
ندادی جز نظر در گلشن رویت مرا رخصت
بیا کین رسم برداریم و طرح دیگر اندازیم (٣)
مرا تقلید زاهد رهبر دین شد، بیا ساقی!
بده راهی که دین را در پناه ساغر اندازیم (٤)
ز پستی تجرّد از خر هستی فرود آییم
ز عیسی چتر عزّت را بسی بالاتر اندازیم (٥)

(*) ئەم پارچە شیعرە لە (مان، هـ، ج)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتیی موسەببەغ.

(١) واتە: وەرە، با دڵ لەبەر پەرێشانییەکەی بخەینە جێی شایانی خۆی کە ئەگریجەی شێواوی دڵبەرە، با بخرێتە ئەو جێیە. کەسێك کە لە ماڵە موسوڵماندا لەدایكبووە، بیدەینە دەستی کافر.

مسلمان خانەزادی را (ج): مسلمان خانەرا دیرا. هەڵەیە.

(٢) واتە: بەرەبەیانی رزگاریی ئێمە لە بەندی پڕ مەینەتی خەم و خەفەت بەدی هاتووە. ئەگەر شەوێك مووی بە بۆنوبەرامەی خۆشت وەك ئەڵقە بخەینە گەردنمان.

(٣) واتە: رێی هیچت نەداین لەوە بەولاوە کە تەماشای باخی رووت بکەین. وەرە ئەم رێورەسمە لادەین و تەرزە رێوشوێنێکیتر بێنینە ئاراوە.

دیگر براندازیم (هـ): نو براندازیم.

(٤) واتە: وەرە مەیگێڕ، چاولێکەریی زاهیدی خوداناس بوو بە رێبەری دینمان. رێیەکمان بۆ بدۆزەرەوە کە دین بخەینە پەنا پیاڵەی شەراب.

رهبر (ج): رهزن.

(٥) واتە: لە نزمیی واز لە دنیا هێناندا لە کەری وجوود بێینە خوارێ. چەتری شانوشکۆ زۆر لە هیی عیسا بەرزتر بکەینەوە.

آییم (ج): آید. بالاتر اندازیم (ج): بالا براندازیم.

**نشد "سالم" مرا کامی میسّر زان لب شیرین**
**بیا تا چون مگس دست تحیّر بر سر اندازیم (٦)**

(٦) واته: سالم، ئارەزووویەکمان لەو لێوە شیرینە بۆ بەدی نەهات. وەرە، تا وەك مێش دەستی سەرسامی بخەینە سەر سەرمان.

## -١٥- (*)

پروانه‌صفت دل به هوای تو پریده
پر سوخته بر شمع جمالت نرسیده (١)
دشمن دهد انصاف که همچون تو جوانی
چشم فلك پیر در ایام ندیده (٢)
تصویر تو مانی نتواند کشد از چین
جز ذات ازل نقش چنین کس نکشیده (٣)
در گوشهٔ لب دانهٔ خالت شده معلوم
کنجشك خیال کس ازان دانه نچیده (٤)
هر شب چو خیال سر زلفت به دل آرم
غرق عرق آبم چو تب مار گزیده (٥)
جز هندوی خالت که برد پی به نمکزار
تا حال نمکدان لبت کس نمکیده (٦)

(*) ئەم پارچە شیعرە هەر لە (غ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: هەزەجی هەشتی مەکفووفی مەحزووف.

(١) واتە: دڵ وەك پەروانە بە تاسەی تۆوە لە فڕیندایە. پەڕوپۆی سووتاوە و نەگەیوەتە نزیکی مۆمی جوانیی تۆ.

(٢) واتە: دوژمنیش ئینساف دەنوێنێ کە چاوی ئەم گەردوونە پیرە جوانیی وەك ئەمەی تۆی لە ڕۆژگاردا نەدیوە.

(٣) واتە: مانیی نیگارکێش ناتوانێ لە (چین) وێنەی تۆ بکێشێ. لە خودای پەروەردگار زیاتر کەس نەخشی وای نەکێشاوە.

(٤) واتە: لە گۆشەی خاڵی لالێوتەوە ئاشکرا بوو کە پاساریی خەیاڵی کەس لەو دانەی خاڵەی نەچنیوە و هەڵنەبژاردووە.

(٥) واتە: هەر شەوێك خەیاڵی سەری زوڵفی تۆ بە دڵمدا بێ، نوقمی ئارەق دەبم وەك مارانگەستە بم و تام لێ هاتبێ.

(٦) واتە: لە ڕەشیی خاڵت بترازێ کە پەی بە خوێڵێن دەبا، تا ئێستا کەس خوێدان یا دەم و

**در عهد ازل تا به ابد چون دهن یار**
**رضوان ز گلستان ارم غنچهٔ نچیده (۷)**
**از رنج و جفا گنج وفا صرف بلا شد**
**در کنج لبت بوسه به "سالم" نرسیده (۸)**

لێوتی نەمژیوە.

(۷) واتە: فریشتەی دەرگاوانی بەهەشت هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی خونچەی وەك دەمی یاری لە گوڵستانی بەهەشت نەچنیوە.

(۸) واتە: گەنجینەی وەفاداری بە ئازار و ئەشکەنجە بە خەرجی بەلاّ و نەهامەتی چوو، هیچ ماچێك لە کونجی لێوتەوە بە "سالم" نەگەییوە.

## -١٦- (*)

بر سر مصحف رو زلف چليپا دارى
تو پرى‌چهره مگر دين مسيحا دارى؟! (١)
زده‌ٔ طرّه‌ٔ شبرنگ برآن صفحه‌ٔ رخ
روز و شب مجلس كافر به كليسا دارى (٢)
عرق شرم ز خجلت به رخ گل بچكد
زين طراوت كه تو در چهره‌ٔ زيبا دارى! (٣)
زلف يلدا به رخ سال توان ديد شبى
اين چه سرّيست به يك ماه دو يلدا دارى؟! (٤)
قصد قتلم نه به تنها كند آن ديده‌ٔ مست
خون صد طايفه در گردن مينا دارى! (٥)

(*) ئەم پارچە شیعرە هەر لە (مان، هـ)دا هەیە.

کێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی ئەصلەم.

(١) واتە: ئەگریجەی شێوە خاچ بەسەر قورئانی ڕوخسارتەوەیە. مەگەر تۆی پەری‌شێوە لەسەر دینی مەسیحیی؟!

(٢) واتە: ئەگریجەی ڕەشی وەك شەو تاریکت دەخەیتە سەر ئەو لایەی ڕوخسار. تۆ شەو و ڕۆژ کۆڕ و مەجلیسی کافرانت لەناو کلێسەدا هەیە.

صفحه‌ٔ رو (هـ): مصخف رخ.

(٣) واتە: لەو تەڕی و پاراویيەوە کە تۆ لە ڕوخساری جواندا شکی دەبەی، با ئارەقی شەرم لە شەرمەزاریدا لە ڕووی گوڵەوە دابچۆڕێ.

بچكد (هـ): بچكيد.

(٤) واتە: زوڵفی ڕەش دەتوانرێ لە ساڵێکدا شەوێك بە ڕوخسارتەوە ببینرێ. ئەمە چ نهێنییەکە کە تۆ بە یەك مانگ دوو شەوی یەڵدات هەیە.

به يك ماه (مان): بیگمان. هەڵەیە.

(٥) واتە: ئەو چاوە مەستە مەبەستی نییە هەر بە تەنها من بکوژێ، خوێنی سەد تیرە و تایەفە بە گەردنی شووشەییتەوەیە.

**سوی دل چشم تو کمتر کند امروز نگاه**
**چه خماریست که در نرگس شهلا داری؟ (٦)**
**در کفم ساعد سیمین تو بربود عنان**
**که به دل بردن "سالم" ید بیضا داری! (٧)**

(٦) واته: ئەمڕۆ چاوی تۆ کەمتر ڕوو دەکاتە دڵ و تێی‌دەڕوانێ، چ سەرخۆشییە کە تۆ لە نێرگزی شەهلادا هەتە؟!

(٧) واته: باسکی سپیی تۆ جڵەوی لە چنگی من فڕاند. ئەوەندە زیرەکی، یەدی بەیزات بۆ بردنی دڵی سالم هەیە.

-١٧- (*)

ای پیرهن نقاب عفت | ای مشرق آفتاب عصمت
ای بسته به گرد ماه هاله | وی گشته به دور شمع لاله
ای آب حیات در تو پنهان | وی مطلع ماه در گریبان
ای داده هزار بوسه بر گل | وی خون دل از تو خورده بلبل
ای آب حیات در تو موجود | وی تشنه ز دور کرد خوشنود
ای عطر گرفته در تن یار | وی نافه‌گشای مشك تاتار
در چاك تو می‌نماند از دور | آن گوی که هست قبهٔ نور
چون نقش تو گشت قامت‌آرا | گردید قیامت آشکارا
تا در بر یار مهربانی | برگ گلی و نقاب جانی

**

ای جامهٔ نیك‌بخت دلبر | غلطیده به روی آب کوثر
از سینه به تار عطربیزی | وز طره به بار مشك‌ریزی
از پرتوِ روی پیرهن‌پوش | مه مشعل خویش کرد خاموش
افگار به تار آستینش | نازك کف دست نازنینش
گر برگ گل آستین یاراست | او هم به کف نگار یاراست
گل چاکرِ آستین او شد | تارش چو ز خوی گلاب بو شد

(*) ئەم پارچە شیعرە هەر لە (غ)دا هەیە.
لەبەرئەوەی هەر لەم نوسخەیەدا هەیە و ناسناوی "سالم"یشی تێدا نییە، لێك نەدرایەوە.
کێشی عەرووز: هەزەجی شەشیی ئەخرەبی مەقبووزی مەحزووف.

## -۱۸- (*)

## (ساقی‌نامهٔ سرکار شیخ)

دگر دشنهٔ دهر خونریز شد | زمین و زمان فتنه‌انگیز شد
سپه را سیه چهر و چیر آمدی | به خون دلیران دلیر آمدی
ز روز و ز شب چرخ دولاب کرد | پلنگ دورنگ است اندر نبرد
عجب سست‌پیمانی و سخت‌چهر | ز چهرت نه‌پیداست آثار مهر
کسی را که بر خوان صلا میزنی | ز خوان بلا بر بلا میزنی
به ساقی بگو نخوتی از سر نهد | بریزد کسی خون مهمان خویش
نه مادر همه مهربانی کند | به نور از خود همزبانی کند
ز خون سازدش شیر پستان دهر | چو خاری به پا خلد جان دهر
تو ای منوال گردون، چه بدمادری | که چون شیر خون جوانان خوری
بر خم تو تا چند آلایشم | بیاسا زمانی در آسایشم
جز از تو ندیدم که بر خوان خویش | به کف جام یاقوت احمر دهد
قدم یکدمم در شبستان نهد | یکم جرعه از جام مستان دهد
کجا موکب شهریاران دهر | کزیشان نبینم نشانی به شهر
همه مست جامند و سراند، سرگرم می | چه کیخسرو و جم، چه جمشید و کی
بده ساقی آن بادهٔ جان‌نواز | جهان میزبانیست مهمان‌گداز
ازان باده دل را چه سازش دهد | جهان را دل اندر گـدازش دهد
گروهی که عار از شهی داشتند | همه جام خود را تهی داشتند
ز دام خیالات بگریختند | برفتند و پیمانها ریختند
بیا ساقیا آتشم تیز کن | مرا نیز پیمانه لبریز کن
بریزم یکی جام می در به کام | ازان پیش کز می بریزد به جام
ببین ساقی این بزم پاکیزه را | بیارای آن دخت دوشیزه را
بیرون آور از پرده شیشه را | که جان پرده پرداخت ز اندیشه را
حریفان به عقدش چو آیین نهند | زیك جلوه صد جان به کابین دهند
نه بر صدر میخانه صفها زدند | به سان عزاز می به کفها زدند

به عشرت همه باده بر کف بُدند / در آخر چنان باده در کف شدند
بیا ساقی آلوده شد دامنم / غم نیك و بد تا کی در تنم
میم ده که مخمور خواهم شدن / وز آلودگی دور خواهم شدن
بیا ساقی این چرخ گردان نگر / رهای ز هر نیك و بد بخشدم
دریغا غمم ناگهان در رسد / بهار طرب را خزان در رسد
میم ده که سرگرم مستی شوم / مگر فارغ از رنج هستی شوم
می‌ای ده که عاری ز شرمم کند / دمی فارغ از سرد و گرمم کند
ازان می که تابان چو خورشید بود / زمانی که نه جام و نه جمشید بود
ازان می که سرّ صمد بخشدم / به چرخ آفت شیرمردان نگر
بده می که با چشم بینا روم / به پیمانه بایست پیمان درست
فلك را مجالی زند، دیر نیست / بده می که هنگام تأخیر نیست
ازان می چو جامی به سر برنهم / فلك را ز نو دور از سر نهم
بیا ساقیا چست و چالاك باش / زمانی نه بر دور افلاك باش
مرا در عمر آخر آمد بیا / نگه‌دار فرصت، بیا ساقیا
که هر زده مر گوش آگاه را / ندائیست «انی انا الله» را
مدار جهان را قراریست سست / به همرازی طورسینا روم
الهی به شوریده‌حالان عشق / زمانی که نه شور و نه نور بود
الهی به آنان که صافی‌کشند / ملك سیرتند ار چه آدم‌وشند
به آنان که مستند از بوی تو / ز خود پرده بستند بر روی تو
به خونین کفنهای نازك بدن / به نازك کفنهای خونین بدن
به لب تشنگان از تف عشق تو / نرفته ز جا در صف عشق تو
ز عشقت به خون خود آغشته‌اند / خروشان و نالان و سرگشته‌اند
ازان می که در سینه مستور بود / که لالان دردند و نالان عشق
که یکباره از خویش بیرون شود / که مینا و ساغر هم درشکست
به آن پر سرمست میخوارگان / که مستی فروشد به بیچارگان
که یك جرعه زان بادهٔ کهنه‌سال / به تلخی دهد نفس را گوشمال
به حیران به حیران بده، می بده / به یك جرعه رطل پیاپی بده

الهی به آن رند بی پا و دست          سزاوار بخت همایون شود

(*) ئەم پارچەشیعرە هەر لە (غ)دا هەیە.

سەرناوی (ساقی‌نامەی سەرکاری شێخ)ە و نەزانراوە سەرکاری شێخ کێیە؟ لەبەرئەوەی هەر لەم نوسخەیەدا هەیە و ناسناوی "سالم"یشی تێدا نییە، لێك نەدرایەوە.

کێشی عەرووز: موتەقاریبی هەشتیی مەحزووف.

## -١٩- (*)

### فرد

**دوش در صفحهٔ دل نقش خيال تو زدم**

**تا دم صبح دم از مهر جمال تو زدم (١)**

(*) ئەم تاكە شيعرە هەر لە (مان)دا هەيە.

كێشی عەرووز: ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف.

(١) واتە: دوێنێ خەیاڵی تۆم لە لاپەڕەی دڵدا نەخشاند. تا دەمی بەرەبەیان دەمم لە باسی خۆری جوانیی تۆ ژەند.

# فەرهەنگی (دیوانی سالم)

نیشانەکان:

ع: عەرەبی.  ف: فارسی.

ك: کوردی.  ت: تورکی.

بێ‌نیشانەکان کوردین.

## (ئـ)

ئاب (ف): ئاو، ڕەونەق، جوانی.

ئاب‌وتاب (ف): ئاووتاو، جوانی و ئارایش.

ئابی یا ئاوی بەقا یا حەیات: ئاوی ژیان، ئاوی کانییەکە لە شوێنێکی تاریکدا، دەڵێن ئەوی لێی بخواتەوە، هەرگیز نامرێ.

ئاب‌وڕەنگ (ف): ڕەونەق و جوانی.

ئاب‌وهەوا (ف): ئاووهەوا، باری کەش.

ئابان (ف): مانگی هەشتەم بە حیسابی هەتاوی کە خۆر دەچێتە کەلووی دووپشك، شەو درێژە و ڕۆژ کورت، خەزەڵوەر.

ئابڵە (ف): ئاوڵە، تلۆق.

ئابنووس (ف): درەختێکە دارەکەی ڕەش و سەخت و بەنرخە.

ئاتەش (ف): ئاگر.

ئاتەش‌ئەفشان (ف): ئاگرپرژێن، ئاگروەشێن، ئەو کێوە کە لە لووتکەکەیەوە هەڵمی گۆگردی و مایەی تواوە دێتە دەرێ.

ئاتەشزەن (ف): ئاگرکەرەوە، ئاگرپژێن.

ئاتەشناك (ف): ئاگراوی.

ئاتەشی‌خوو (ف): بە خوو ئاگرین. تووڕە و ڕقهەڵگر، کینایەیە لە توندی.

ئاتەشین (ف): ئاگرین.

ئاخوڕ: جێی ئالیك دان بە وڵاخ.

ئارا: ڕازێنەوە، ئارایشکەر.

ئارایش (ف): ڕازاندنەوە و جوانی.

ئارش (ف): ئارشی شیواتیری پاڵەوانی تیرهاوێژی کۆن کە بە تیرهاوێشتن سنووری نێوان ئێران و توورانی دیاری کردووە، یان: جێی دواین‌شەڕی نێوان لەشکری بابان و سوپای عوسمانی لە نزیکی شاری کۆیە.

ئارەزوومەند: حەزلێ‌کردوو، پەرۆش.

ئارەقچن: تەقیلە، کڵاوی لە پەڕۆ و دەزوو.

ئارێ (ف): بەڵێ.

ئارێز: کێوێکی شاری (سنە)یە لە کوردستانی ئێران.

ئازوردە (ف): خەمبار.

ئاسا: وەك.

ئاستان، ئاستانە (ف): کەوشکەن، بەردەرگا.

ئاستین (ف): سەرقۆڵی کراس و کەوا.

ئاسیاب (ف): ئاش، ئاشی ئاو.

ئاشکار (ف): ئاشکرا.

ئاشنا: دۆست، یار.

ئاشوفتە (ف): پەرێشان، تێکچوو.

ئاشوفتەبەخت (ف): بەخت شێواو و ئاڵۆز.

ئاشوفتەخاطر (ف): دڵپەشێو، دڵپەرێشان.
ئاشوفتەگی (ف): شپرزەیی، شێواوی.
ئاشی با: ئاشێ بە با کاربکا. بە تەوسەوە بە کاری بێهوودەی نەکراو دەوترێ.
ئاشیان، ئاشیانە (ف): هێلانە.
ئاصەف: ئاصەفی کوڕی بەرخیای یەکێ لە زانایانی بەنیئیسرائیل و وەزیری ئەفسانەییی سولەیمان پێغەمبەر، کە لەتەك سولەیمان سواری قاڵیچە بووە و تەختی بەلقیسی لە شاری سەبەئەوە هێناوەتە بەر دەرگای سولەیمان.
ئاغا طاها: کوڕی مەلا عەبدوڵڵای کوڕی مەلا محەمەدی مەرخوزی کوڕی مەلا مەحموودە، گەورەی بنەماڵەیەکی دەوڵەمەند و دەسڕۆی بە هەمان ناوەوەی ناسراوی سلێمانییە، کە گەڕەکی (دەرگەزێن)ی ئاوا کردووەتەوە.
ئاغالەر: ئاغاکان، بنەماڵەیەکی دەسڕۆ و ناسراوی ناوشاری سلێمانی بووە، دەچنەوە سەر مەحموودی مەصرەف کە دەسەلاتدارێکی زەمانی بابان بووە. پیاوی گەورەی وەك ئەحمەد ئاغا (ئەحمەد باشچاوەش) و عەبدوڕڕەحمان ئاغای کوڕی و حەماغای عەبدوڕڕەحمان ئاغایان تێدا هەڵکەوتووە.
ئاغۆش (ف): باوەش، ئامێز.
ئافتاب (ف): خۆر، کینایەیشە لە شەرابی ترێ.
ئافەت (ع): پەتا، بەلا.
ئاق (ت): سپی.
ئاق دەنگز (ت): ئاق دەنیز، دەریای سپی ناوەڕاست.
ئالان: دێهاتی سەرسنووری بەری باکووری ڕۆژاوای ناوچەی (شارباژێڕ) لە سلێمانی، دێیەکی ناوچەی دەربەندیخان.
ئالوودە (ف): تێکەڵ، لیڵ، شتێك تێکەڵ بە شتێکیتر بووبێ.
ئالەت (ع): ئامراز، دەعبای نێرینە.
ئامەد (ف): دەرامەت و بەرهەم، هات و بەخت.
ئامەدوشود (ف): هاتوچۆ.
ئامەدی بەخت (ف): هاتنی بەخت، بەخت‌یار بوون.
ئاوارە: بێ‌جێ‌وڕێ، سەرگەردان.
ئاوزوونە: ئاغزوونە، ئەڵقەی ددانەداری مەعدەنی کە زمانی پێوەیە بۆ بەستنی قایشی پشت و کەوش و بەرەزین.
ئاونگ: ئاودار.
ئاوەسوو: بە زەبری ئاو سوواو.
ئاه: ئاخ و ناڵە، هەناسەهەڵکێشان.
ئاهوو (ف): ئاسك.
ئاهووی خەیاڵ (ف): ئاسکی خەیاڵ، کینایەیە لە تیژڕۆیی و سرکیی خەیاڵ.
ئاهیستە (ف): لەسەرخۆ، هێواش.
ئاهیستەخەرامی (ف): لەنجەولاری شێنەیی.
ئاینە، ئایینە (ف): ئاوێنە.
ئاینەخانە (ف): ئاوێنەخانە، کۆشکی بلووربەند کە وێنەی یاری تێدا دەبینرێ، کینایەیە لە دڵ.

ئاینەدار (ف): ئاوێنەهەڵگری پێش بووك، کینایەیە لە خزمەتکار و بەندە و مانای ئارایشکەریشی هەیە؛ نەریتی دەرباری پادشایان ئەوە بوو، خزمەتکاران ئاوێنە بەدەستەوە بگرن و چاوەڕێ بن، هەر کاتێ پادشا ویستی ڕوخساری خۆیی تێدا ببینێ، ئاوێنەی بەرامبەر ڕابگرن.

ئاینەڕوو (ف): ڕوو وەك ئاوێنە ساف و پاك.

ئاینەی گەردوون (ف): خۆر.

ئایە (ع): ئایەتی قورئانی پیرۆز.

ئایەی حیجاب (ع): ئایەتی ژمارە ٤٦ی سوورەتی (الأعراف): ((وبینهما حجاب.. )).

ئایین (ف): جەژن، زینەت و ئارایش، دین.

ئۆردیبیهیشت (ف): مانگی دووەمی بەهار، بانەمەڕ.

ئوستاد (ف): مامۆستا.

ئوستوار (ف): قایم و مەحکەم، پایەدار.

ئوشتر (ف): وشتر.

ئوصوولات (ع): داب و نەریت.

ئۆغلەمە (ت): گرمەگرم.

ئوفتادە (ف): کەوتوو، لێکەوتوو، لەپێ‌کەوتوو.

ئوفتادەگان کۆی (ئوفتادە)یە.

ئوفتادەگی (ف): لەپێ‌کەوتن، لێکەوتوویی.

ئومێد: هیوا.

ئووەیس: وەیسی قەرەنی کە "وەیسی مایدەشتی"ی پێ دەڵێن، یەکێك بووە لە پیاوچاکانی لەخوداترس و یەکێکە لەوانەی کە هەندێ لە هاوڕێیانی پێغەمبەریان دیوە.

ئەبەد (ع): هەمیشە.

ئەبەدەن (ع): هەرگیز، هەتاهەتایە.

ئەبرۆ (ف): برۆ.

ئەتراك (ع): کۆی (تورك)ە، تورکان.

ئەجزا (ع): کۆی (جوزء)ە، بەشەکان، بەشی هەر شتێك، مەبەست شتی وردە.

ئەجەل (ع): ئاکام.

ئەحمەد بەگ: ئەحەحەیتە، برای مەحموود ئاغای شیوەکەڵ.

ئەحمەر (ع): سوور.

ئەختەر (ف): ئەستێرە.

ئەخگەر (ف): پشکۆ.

ئەخگەرنوما (ف): شتێ وەك پشکۆ بنوێنێ.

ئەخلاق (ع): ڕەوشت.

ئەدەب‌ئاموختە (ف): فێرەئەدەب، ئەدەب‌وەرگرتوو.

ئەدهەم (ع): ئیبراهیم ئەدهەمی خوداپەرستی بەناووبانگ و لە میرزادەکانی بەلخ، کە لە سۆفیگەریدا پایەیەکی گەورەی بەدەستهێنا.

ئەدیم (ع): چەرم، چەرمی دەباغکراو.

ئەر (ف): ئەگەر.

ئەربابی سەمع (ع): ئەوانەی کە ئارەزوویان لە بیستنی گۆرانییە.

ئەربابی نیاز (ف): داماوان، موحتاجان، ئەوانەی کە داوا و خواستیان هەیە.

ئەڕڕە (ف): مشار.

ئەرغەوان: ئەرخەوان، دارێکی بەهاریی ڕەنگینی ڕەنگ‌سووری بە سروشتی سارد و وشکە.

ئەرقەم (ع): ماری ڕەشی شڵی کوشندە.

ئەڕۆملی: ڕۆمەیلی، بەشی بەری ئەورووپای تورکیا.
ئەرووس: عەرووس، ڕووس.
ئەزبەس (ف): ازبس، ئەوەندە زۆر.
ئەزبەسکی (ف): ازبس‌کی، ئەوەندە زۆر.
ئەزنجیرکەوتن: لەزنجیرکەوتن، کەوتنە ناو زنجیر و بەسترانەوە.
ئەزەل (ع): سەرەتای دروستکردنی جیهان.
ئەزەلئەفیوون (ف): هەمیشە وڕ و کاس، لە ئەزەلەوە ئەفیوون کاری تێکردووە و بە وڕوکاسیی گەیاندووە.
ئەزەلجانسەخت (ف): لە ئەزەلەوە سەرسەخت کە گیانی دەرنەچێ و نەمرێ.
ئەژدەها: ماری زۆر گەورە، لە ئەفسانە کۆنەکاندا وتراوە، گوایە باڵی گەورە و چنگی بەهێز و کلکی درێژ بووە و ئاگر لە دەمیەوە دەرچووە.
ئەسباب (ع): هۆ و ئامراز.
ئەسپی هەوەس (ك-ع): ئەسپی ئارەزوو، کە دەشێ جڵەو بکرێ یان نەکرێ.
ئەسەد (ع): وێنەی پێنجەمی ناوچەی بورجەکان کە لە نیوەگۆی ئاسماندا بە شێوەی شێری نێر دەردەکەوێ، یان بورجی پێنجەمی دوازدە بورجەکان کە پاش بورجی قرژاڵ و پێش بورجی فەریك دێ، گەلاوێژ.
ئەسەر: بۆ سەر.
ئەستۆ: گەردن، مل.
ئەستۆکوڵ: مل‌کورت.
ئەستوون: کۆڵەکە.
ئەستێڵ: دێیەکی ناوچەی (قەرەداخ) لە سلێمانی.
ئەسرار (ع): کۆی (سیرڕ)ە، نهێنییەکان.
ئەسکەندەر: ئەسکەندەری گەورە، کە لە مەکدۆنیا لەدایك بوو و لە بابل کۆچی دوایی کرد. ئەرەستوو مامۆستای بوو. جێی "فیلیپس"ی باوکیی گرتەوە و ٣٣٣پ.ز ئیمپراتۆریی فارسی داگیرکرد. پاشان فینیقیا و میسری گرت و ٣٣١پ.ز لە گۆگەمیلای نزیکی هەولێر بەسەر "داریووش"دا سەرکەوت. ئەمجا بەسەر فارس‌دا چووە کەنارەکانی ڕووباری سند لە هیندستان.
ئەسکەنە: ئامرازی دارکۆڵینی دارتاش.
ئەشعار (ع): کۆی (شیعر)ە، شیعرەکان.
ئەشعەث (ع): پیاوێکی کۆنی پارەپیسی پوولەکی بووە.
ئەشك (ف): فرمێسك.
ئەشکبار (ف): فرمێسکرێژ.
ئەشکرێزان (ف): بە فرمێسك‌ڕشتنەوە.
ئەشکەبووس (ف): پاڵەوانی یاریدەدەری ئەفراسیاب دژی ڕۆستەمی زۆراب، کە بە دەستی ڕۆستەم کوژرا.
ئەصحابی کەهف (ع): یارانی ئەشکەوت. حەوت خەوتووەکەی ئیفیسووس، کە دەستیان لە بتپەرستی هەڵگرت و باوەڕیان بە مەسیحێتی هێنا. ئەمجا لەتاو ستەمی داقیۆسی ئیمپراتۆری ڕۆمان هەڵاتن، لە ئەشکەوتێکدا

خۆیان شاردەوە و نوستن. پاش ساڵانێکی درێژ بەخەبەر هاتن. بەسەرهاتەکەیان لە سوورەتی (الکهف)ی قورئانی پیرۆزدا هەیە.
ئەصڵ (ع): نەوە، وەچە.
ئەصناف (ف): پیشەوەران، خاوەنپیشە و سنعاتکاران.
ئەطـــڵەس: بەرگی ئاوریشمین.
ئەعدا (ع): کۆی (عەدوو)ە، دوژمنان.
ئەعضا (ع): کۆی (عوضوو)، ئەندامەکان.
ئەعما (ع): کوێر.
ئەغیار (ع): کۆی (غەیر)ە، بێگانان.
ئەغیارخوو (ف): بە خوو بێگانە.
ئەفراسیاب: کوڕی پشەنگ و پادشای تووران بووە و لەگەڵ شاهان و پاڵەوانانی ئێران شەڕی کردووە، بە تاوانبار و پاداشتی مەرگ و جادووگەر ناسراوە.
ئەفزوون (ف): زیاد.
ئەفسوردە (ف): سیس، ژاکاو، بێتین، خەمبار.
ئەفسوردەگی (ف): ژاکاوی، خەمباری، دڵتەنگی.
ئەفسوون (ف): سیحر، فێڵ و ساختەکاری و چاوبەست.
ئەفسەر (ف): تاجی سەر، کڵاوی پادشایی.
ئەفشان (ف): پەخش و بڵاو.
ئەفگار (ف): ماندوو.
ئەفگەندەسەر (ف): سەرشۆڕکردوو.
ئەفغان= فیغان (ف): هاوار.
ئەفغانکونان (ف): هاوارکەرانە، بە هاوار وناڵەوە.
ئەقاریب (ع): کۆی (قەریب)ە، نزیکەکان، خزمان.
الأمان (ع): لە تەنگانەدا داواکردنی یارمەتی و پەنادان و فریاکەوتن.
ئەلای: بۆ لای.
ئەلبورز: زنجیرەکێوێکە لە باکووری ئێران، لە بەری ڕۆژاوای دەریای خەزەرەوە دەست پێ دەکا و بە شێوەی کەوانێکی گەورە بە دەوری کەنارەکانی باشوور و باشووری ڕۆژاوای ئەو دەریایەدا پێچ دەکاتەوە لە باکووری ڕۆژاوای ئوستانی خوراساندا دەگاتەوە بە کێوەکانی باکووری ئەو ئوستانە. ئەم زنجیرەکێوە دەریای خەزەر لە ناوچەکانی ناوەڕاستی ئێران جوێ دەکاتەوە.
الغرض (ع): مەبەست.
ئەڵماس (ع): بەردێکی گرانبەهای چەند ڕەنگە، لە شووشەبڕین و دروستکردنی کەرەستەکانی جوانکاریدا بەکاردەهێنرێ.
ئەلحەذەر (ع): وریایی، خۆپاراستن.
ئەلطاف (ع): کۆی (لوطف)ە، نەرمونیانی نیشاندان، لوتفنواندن.
ئەلفی قەد (ف): باڵای ڕێك و ڕاست.
ئەڵوەند: کێوێکە لە ناوچەی (هەمەدان) لە ئێران.
ئەلەمدیدە (ف): ئازاردیو.
الوداع (ع): ماڵئاوا، خودا حافیز.

ئەملاکی پیتر: ناوچەکانی قەڵەمڕەوی سەردەمی ئیمپراتۆر "پیتری گەورە"ی تزار کە دامەزرێنی رووسیای نوێیە و چاکسازییەکی زۆری کارگێری و رۆشنبیریی کرد و پیشەسازی و فەرهەنگی ئەوروپای هێنایە ناو وڵات. پاش داگیرکردنی کەنارەکانی دەریای باڵتیکیش، ١٧٠٣ شاری (پیترسبۆرگ)ی بنیات نا و پایتەختی لە مۆسکۆوە بۆ گواستەوە، کە دووسەد ساڵ زیاتر بە پایتەخت مایەوە.

ئەممارە (ع): فەرماندەر بە خراپەکردن، فریودەر.

ئەمنییەت (ع): ئەمینی و دڵنیایی، نەترسان.

ئەمەل (ع): هیوا.

ئەنجوم (ع): کۆی (نەجم)ە، ئەستێرەکان.

ئەندازە: هێند، میقدار.

ئەندووە (ف): خەفەت.

ئەندەروون (ف): ناوەوە، حەرەمسەرا.

ئەندێشە (ف): خەیاڵ، بیرکردنەوە، ترس.

ئەنفاس (ع): کۆی (نەفەس)ە، هەناسە، وەك هەناسە و فووی عیسا پێغەمبەر کە مردووی زیندوو کردەوە.

ئەنگوشت (ف): پەنجە.

ئەنگوشتنوما (ف): پەنجەبۆڕاکێشراو، وەك پەنجە باریك دەنوێنێ.

ئەنگووتن: هەڵکردنی با، دەرکەوتن.

ئەنگوور (ف): ترێ، هەنگوور.

ئەنگووری (ف): وەك ترێ، مەبەست لە ڕەنگی شەرابە کە ڕەنگی سوورە.

ئەنگووریڕەنگ: ڕەنگ وەك ترێ سوور، شەرابی.

ئەنگەبین (ف): هەنگوین.

ئەنوار (ع): کۆی (نوور)ە، رووناکییەکان.

ئەنوەر (ع): ورشەدار، رووناککەرەوە.

ئەنوەری: ناسناوی ئەوحەدەددین محەمەد کوڕی ئیسحاقی شاعیرێکی ئێرانییە. لە دەرباری سوڵتان سەنجەری سەلجووقیدا پێش‌کەوت. دیوانی شیعرەکانی چەندین جار لەچاپ دراوە.

ئەنیس (ع): هاودەم، هاوڕاز، ئولفەت لەگەڵ‌گرتوو.

ئەوج (ع): بەرزی، دوورترین خاڵ کە مانگی تێدا لە زەوی دوور دەکەوێتەوە.

ئەوڕەنگ (ف): فەڕ و شکۆ، گەورەیی، تەختی پادشایی.

ئەوضاع (ع): کۆی (وەضع)ە، بارودۆخ.

ئەهریمەن (ف): شەیتان و ناقۆڵا.

ئەهلی خیرەد (ف): هۆشیاران، ژیران.

ئەهلی دڵ: عاشقان، ئەوانەی کە دڵیان ئاوەدانە بە خۆشەویستی.

ئەهلی دیوان (ف): کاربەدەستانی بارەگای دەوڵەتی.

ئەهلی مەعریفەت (ع): فامیو و تێگەیشتووان.

ئەی بەسا (ف): ئای چەند!

ئەیاز: لە شازادە خۆشەویستەکانی سوڵتان مەحموودی غەزنەوی و نموونەی جوانی و چابوکی و هۆشیاری بووە.

ئەیمەن (ف): ئەمین، هێمن و بێترس.

ئەیمەنشودە (ف): دەستەمۆ و ڕام، دڵنیاکراوە.
ئەیام (ع): کۆی (یەوم)ە، ڕۆژان.
ئەیووب (ع): حەزرەتی ئەیووب کە ئیبلیس حەسوودیی پێ برد. کینایەیە لە پشوودرێژی و دەربردنی ناخۆشی.
ئیبتیدا (ع): لە سەرەتاوە.
ئیبرام (ع): وەڕس کردن، پێداگری.
ئیبلیس (ع): شەیتان.
ئیجرا (ع): بەجێهێنان.
ئیحاطە (ع): چواردەورگرتن، گەمارۆدان.
ئیحتیاج (ع): هەژاری، نەدار.
ئیحیاکون (ف): زیندووکەرەوە.
ئیخوان (ع): برایان.
ئیدراك (ع): تێگەیشتن.
ئیدریس: لە نەوەی شیثی کوڕی ئادەم و پێغەمبەر بووە. دوو جار ناوی لە قورئاندا هاتووە. هێندێ پێیان وایە وەك خدر و ئەلیاس ژیانێکی نەمری هەیە و جلوبەرگی درووە و نووسینی بە قەڵەم داهێناوە، زانایی و شارەزاییشیان داوەتە پاڵ. جوولەکە پێی وایە بە زیندوویی چووەتە بەهەشت، یەکەم پێغەمبەری پاش ئادەمیشە کە لەبەر زۆر دەرسوتنەوە بە مامۆستای حەکیمان ناسراوە.
ئیرەم (ع): بەهەشتەکەی شەددادی کوڕی عاد، کە مرد و پێی تێنەنا. ئایەتەکانی ژمارە ٦ و ٧و ٨ی سوورەتی (الفجر) ئاماژەیان بەوە داوە: ((الم تَرَ کیف فعل ربك بعاد، إرم ذات العماد، التي لم یخلق مثلها في البلاد)).

ئیرەمئارا (ف): ڕازێنەوەی باخی ئیرەم.
ئیست (ف): ڕاوەستان، مۆڵەت، مانەوە.
ئیستادە (ف): ڕاوەستاو.
ئیستیخوان (ف): ئێسقان، ئێسك.
ئیستیسقا (ع): ئاوبەند، ئیسقا، جۆرە نەخۆشییەکە شانەکانی لەشی پێ پڕئاو دەبن و نەخۆش هەرگیز تێراو نابێ و هەمیشە تینوویەتی.
ئیستیغنا (ع): قەناعەتکردن و نەفسبەرزی، دەستنەگرتنەوە بۆ خەڵك، بێنیازیی پێڕەوان لە هەموو شتێ، جگە لە خودا.
ئیستیقامەت (ع): ڕێکی و ڕاستی.
ئیستیقبال (ع): پێشوازیلێکردن.
ئیستیهزا (ع): گاڵتەپێکردن.
ئیسپەر (ف): قەڵغان.
ئیسقاطی: بێکەڵك، قوبووڵنەکراو.
ئیشتیهار (ف): ئیشتیهارد، شارێکی سەر بە شارستانی (کەرەج)ە لە ئوستانی ئەلبورز و لە دەشتدایە.
ئیصطیلاح (ع): زاراوە.
ئیضطیراب (ع): شڵەژان و تێکچوون.
ئیظهار (ع): نیشاندان، دەرخستن.
ئیعتیبار (ع): حورمەت و ڕێز، حیساببۆکردن.
ئیعجازی کەلیم (ع): موعجیزەی مووسا پێغەمبەر، کە دارعاساکەی و ڕووناکیی دەستی بوون.
ئیعجازی یووسف (ع): بۆنوبەرامەی کراسەکەی کە ناردی بۆ حەزرەتی یەعقووبی باوکی (خ.ڕ).

ئیفاقه (ع): چاكبوونەوه لـه نەخۆشی.
ئیفشا (ع): بڵاوبوونەوه، ئاشکرابوون.
ئیفك (ع): بوختان.
ئیقدام (ع): دەستپێشخەری، هاتەپێشەوه.
ئیقلیم (ع): هەرێم، وڵات.
ئیکسیر (ع): به وتەی کیمیاگەران، مایەیەکە مایه ناچیزه بێنرخەکانی پێ دەگۆڕدرێ به مایەی گرانبەها، وەك مس به زێڕ.
ئیلتیفات (ع): ئاوڕلێدانەوه، بەسەرکردنەوه، بەزەیی‌پێداهاتنەوه.
ئیما (ع): ایماء، ئاماژه، هێما، ئیشاره به چاو.
ئیمتیحان (ع): تاقیکردنەوه.
ئیمداد (ع): یارمەتی، کۆمەك.
ئیمڕووز (ف): ئەمڕۆ.
ئیمکان (ع): ئەوەی که دەتوانرێ بکرێ.
ئینتیها (ع): کۆتایی.
ئینسانییەت (ع): مرۆڤایەتی.
ئینشا (ع): إنشاء، دانانی شیعر و پەخشان و وتار.. تاد.
ئینعام (ع): نیعمەتپێدان.
ئینقیلاب (ع): هەڵگەڕانەوه و تێکچوون.
ئینگلیس (ف): وڵاتی ئینگلیز (ئینگلستان)، میللەتی ئینگلیز.

(ب)

باب ئۆغڵی: دارودەسته و کارهەڵسووڕێنانی بارەگای میرانی بابان، ڕەنگیشه دەرگاوان بێ.
بابان: میرایەتیی بابان که حوکمی بنەماڵەیەکه بەو ناوەوه ناوەندەکەی ناوچەی پشدەر و مەرگه و قەڵاچوالان و —دواجار— سلێمانی بووه. یان: میرانی بابان لـه "فەقێ ئەحمەدی دارەشمانه"وه تا "ئەحمەد پاشا"ی دواین‌میری بابان.
بابل: شارێکی کۆنی خوار بەغدا و لـەسەر ڕووباری فورات. گوایه جادووگەر لـەوێوه چووەته ناو ئیسرائیلییەکان. شەیتانیش لـه زەمانی حەزرەتی سولـەیماندا خەڵکی فەلـەستینی فێری جادووگەری کردووه، بۆیه سیحری بابل و جادووگەریی بابل ناووبانگیان پەیداکردووه.
بابمردوو: ئەوی بابی مردبێ.
بابەجان: میرزا بەدیع باباجانی سەرپزیشك (حەکیمباشی)ی سەردەمی دوادوایی میرایەتیی بابان.
باتەقا: بارتەقا، هێنده.
باتوو (ف): گون، ترنج.
باخەبەر (ف): ئاگادار، هۆشیار.
باد (ف): با، شنەبا.
باده (ف): مەی، شەراب.
بادەکەش (ف): مەیخۆرەوه، بادەنۆش.
بادەنۆشی (ف): مەیخواردنەوه.
بادەوەرگر: مەیخۆرەوه که شەراب وەردەگرێ.
بار: جار.
باراندیده: باراندیو، تەڕبوو، ستەمدیو، کینایەیه لـه بەئەزموون و ئەزمووداره.

باربودنەوا (ف): ئاواز و گۆرانیی باربودی هونەرمەندی دەرباری خوسرەوی پەرویز.
بارش (ف): باران.
بارنەبەر: بارهەڵنەگر، تەمەڵ و کارنەکەر.
بارەوش (ف): تیژڕۆی وەك با.
باریٚ (ف): جاریٚ.
باز (ف): دیسان، باڵندەیەکی ڕاوکەرە.
بازوو: قۆڵ، مەبەست جووڵاندنەوەی قۆڵە بۆ شمشێروەشاندن.
بازی: یاری، گەمە.
بازیان: ناوچەیەکی باشووری ڕۆژاوای سلێمانی.
بازی دەوڵەت: بازی دیاریکردنی پادشا.
بازیگەه (ف): شوێنی یاری.
بازیی چەوگان (ف): یاریی (گۆ و گۆچان).
باطینبەد (ف): ناخڕەش، دڵڕەش.
باعیث (ع): هۆ، سۆنگە، مایە.
باغی (ع): دەستدرێژیکەر.
باقڵ: بە عەقڵ، پێم وایە.
بالاَبولەند (ف): بالاَبەرز.
بالاَدەست: سەرکەوتوو، بەرز، زۆر.
باڵش: سەرین.
باڵەبان: مەلێکی گۆشتخۆری ڕاوکەری خێرای لە باز گەورەترە، دەهۆڵی گەورە.
بالین (ف): سەرین، ڕاسەر، لای سەر.
بام (ف): بان.
بانە: شارێکی کوردستانی ئێران.
بانی (ع): بنیاتنەر، دروستکەر.
باوجوود (ف): سەرباری ئەوە، لەگەڵ بوونی.

بای یان بادی موخالیف (ك-ف): بای پێچەوانەی ڕێڕەوی کەشتی کە ڕێگربی لیٚ بکا. کینایەیە لە کۆسپی بەردەم بەدیهاتنی مەرام.
بتی ئازەر: بتەکەی ئازەری باوکی حەزرەتی ئیبراهیم.
برادەرمادەر (ف): دایكبرا، خاڵ، کینایەیە لە خاڵی ڕوومەتی یار.
برنجی (ت): یەکەم.
بیرووز (ع): دەرکەوتن.
بز (ف): بزن.
بژارە: بژارکردن، جیاکردنەوە، جوێکردنەوەی شتێکی کەم کە تێکەڵی شتێکی لە خۆی زۆرتر بوویٚ.
بست: بستە، ئاسنی نێوان تەوەرە و بەرداش، کە لە تۆپێکی دارینی پەڕەدار هەڵکێشراوە. لای خوارووی لەسەر موورەسەنگ و ژێر دۆزەخەی ئاش و لای سەرەوەی خراوەتە کونی تەوەرە کە لەسەر بەرد توند کراوە. کە ئاو بە توندی لە نیٚ یا تەنوورەوە لە تۆپەکە دەدا، دەیسووڕێنێتەوە و بەمە بەرداش دەگەڕیٚ.
بلاَ: وازبێنە، لیٚگەڕیٚ.
بلح: گەوج و بیٚکارە و هیچلیٚنەهاتوو.
بناگۆش (ف): بناگویٚ.
بۆ (ف): بۆن.
بوتکەدە (ف): بتخانە.
بۆچەك: بۆچرووك، بۆنکرووز، بۆنی گۆشت و ئێسقانی سووتاو.

بوخار (ع): هەڵم.

بوخارا: شارێکی ئۆزبەکستان.

بوخچەها: کۆی (بوخچە)یە، بوخچەکان.

بۆرچین: مێی مراویی ماڵی.

بورەهنە (ف): ڕووت.

بوڕرا (ف): بڕندە و تیژ.

بوڕڕان (ف): زۆر تیژ، بڕندە.

بورنا (ف): گەنج، لاو.

بوریان (ف): برژاو.

بۆریا (ف): حەسیری لە قامیشی باریك دروستکراو، کە لە ناچاریدا دەکرێ بە ڕایەخ.

بۆس، بۆسە (ف): ماچ.

بۆسەدان: شاردنەوە، حەشاردان.

بۆسین: ماچکردن.

بوغضاندن: ڕقەبەرایەتیکردن، حەز لە چارە نەکردن.

بوڵەندی (ف): بەرزی، بڵندی.

بولهەوەس (ع): بوالهوس، هەوەسباز، شوێن هەوەسی خۆ کەوتوو.

بونیاد: بناغە، بنیات.

بووتیمار (ف): خەمخۆرە، باڵندەیەکە هەمیشە مات و مەلوولە و لە قەراغی ئاودا دەنیشێتەوە. هەرچەندە تینوویەتی، لە ئاوەکە ناخواتەوە، نەبادا کەم ببێتەوە.

بووعەلی سینا: ناسراوە بە (شیخ الرئیس)، زانا و فەیلەسووف و پزیشك و ئەستێرەناسی ئێرانییە، لە (خەرمەیثەن)ی دەوری بوخارا لەدایك بووە و لە هەمەدان مردووە.

بووم (ع): کوندەپەپوو.

بە حوججەت (ف): بە توندی.

بە ڕەنگی: بە چەشنی.

بە سان (ف): وەك.

بە قەصدی (ك-ع): بە دەسەنقەست.

بەئەندێش: بە خەم و خوتوورە.

بەبادچوون: بەربادبوون، بەباچوون.

بەبری بەیان: گیانلەبەرێکی دڕندەی چابوکە، دوژمنی شێری شەڕانییە.

بەتێ: عابا.

بەپایینهاتن: کۆتاییپێهاتن.

بەجوز (ف): جگە لە، ئیللا.

بە چوستی: بە گورجی، زوو.

بەچەڕوو (ف): سادەڕوو.

بەحث (ع): باسوخواس.

بەختسووتان: بەختڕەشبوون، نائومێدبوون.

بەختی خوفتە (ف): بەختی خەوتوو، بێبەختی.

بەخوێنبوون: برینداربوون، خوێنلێتکان.

بەد: خراپ.

بەدبەنا (ف): وەستای خراپ، بنیاتەری خراپ.

بەدخوا، بەدخواه (ف): ناحەز.

بەدخواهی (ف): ناحەزی، خراپەویستی.

بەدذات (ف): چەپەڵ، بەدخوو، نەگریس.

بەدرەقە (ف): ڕێنیشاندەر، ڕێبەر.

بەدڕەوت: خراپڕۆیشتوو، بە خراپی ڕێکردوو.

بەدسروشت (ف): تەبیعەتخراپ، بە خراپی خوڵقێنراو.

بەدسیرەت (ف): بەسەرهات خراپ، کەسێ لە ڕەوتی ژیانیدا بە خراپەکار ناوی دەرکردبێ.
بەدصەدا (ف): دەنگ‌ناساز.
بەدصەوت (ك–ع): دەنگ ناخۆش و ناساز.
بەدعەمەل (ف): کارخراپ، بەدکردار.
بەدفەڕ: بێ‌فەڕ و قەڵب، نارەسەن.
بەدفیعالی (ف): بەدڕەفتاری، خراپەکاری.
بەدگۆ (ف): دووزمان، زمانخراپ.
بەدگیل (ف): بەدفەساڵ و ناشیرین، ڕەزاگران.
بەدڵ: لە هەموو دڵێکەوە، لە قووڵاییی دڵەوە.
بەدلەهجە (ف): زمانپیس، بەدزمان.
بەدەستبوون: لەدەسەڵاتدابوون، ئەوی مرۆڤ پێی بکرێ.
بەدەڵکردن (ع–ك): گۆڕین.
بەدەن (ع): لەش، جەستە، قاڵب.
بەدەو (ف): خێرا و بەغار.
بەربەر: بەربەرستان، سەرزەمینی میللەتی بەربەر کە ناوچەکانی تێدا دەژین، لە سنووری میسرەوە دەست پێ دەکا تا کەناری شادەریای ئەتڵەسی لە سەرووی ئەفریقیا.
بەرتەر (ف): پێشتر، بەرزتر.
بەرحەق (ف): ڕەوا، ڕاست.
بەرد: مەبەست تاشەبەردەکانی کێوی بێستوون کە فەرهاد نەخشەکانی خۆی لەسەر هەڵکەندوون.
بەردان: سوودبەخشین، بەرگرتن، بەرەڵڵاکردن، دەستلێبەردان.
بەردووخ: کلکەتەشی.
بەردووخموو: مووی سەری ئامرازی بەردووخی خەڕەکە. بەردووخ بەردێکە دەخرێتە سەر پێچکەی خەڕەك تا نەجووڵێ.
بەردەباران: بەرد بەسەردا دادان، کینایەیە لە ماڵوێرانی و نەگبەتی.
بەرڕە (ف): بەرخ.
بەرڕەئاهوو (ف): بێچووەئاسك.
بەرش (ف): جۆرە شۆربایەکە لە گۆشت و کەلەرم و چەوەندەر و گێزەر دروست دەکرێ.
بەرشکەست (ف): تێشکاو و زیانلێکەوتوو.
بەرعەکس (ف): پێچەوانە.
بەرق (ع): شەوقی برووسکە، چەخماخە، تیشکدانەوە، بەرقی بێ‌تەل (ئاوێنە).
بەرقوەش (ف): وەك برووسکە، کینایەیە لە خێرایی.
بەرکەوت: کەوتووەپێش.
بەرگەشتە (ف): سەرنگوون، شکاو، هەڵگەڕاوە.
بەرگەشتەبەخت (ف): بەختی خراپ و نالەبار.
بەرگەشتەطالیع (ف): بەختی هەڵگەڕاوە و پێچەوانە.
بەرگەشتەموژگان (ف): برژانگی هەڵگەڕاوە.
بەروبووم: خاك، وڵات.
بەروو: پێشوو.
بەڕەزا: گیایەکی کوێستانیی ناسکی تام و بۆن خۆشی لاسكبەرزی گەڵا وەك گەڵای تەڕەتیزەیە.

بەززازی (ع): قوماشفرۆشی.
بەس (ف): زۆر، تەنها.
بەسا (ف): زۆر.
بەستەر (ف): سەرین، جێخەو.
بەستەری (ف): نەخۆشی لەجێداکەوتوو.
بەسط (ع): بڵاوکردنەوە، بەردان.
بەسکی (ف): بس کی، ئەوەندە.
بەسیەسی: بەسیەتی.
بەصرا: شاری (بەسرە)ی خوارووی عیراق.
بەصەر (ع): بینین.
بەعدەزین (ف): بعدازین، پاش ئەمە.
بەعەفواچوون: خۆڕایی و بێهوودە بوون، بەسەرچوون.
بەقەم: درەختێکی بەرز و قایمە، بەرێکی خڕ و سووری هەیە. دارەکەیشی ڕەنگسوورە و ئەو ڕەنگەی لێ دەردێنرێ بۆ ڕەنگ کردنی خوری و ئاوریشم. وشەکە لە بنەڕەتدا (بەققەم)ە.
بەکراوا: گردێکی شوێنەواریی ناوچەی (شارەزوور) لە سلێمانی.
بەلاجۆ (ف): بەلاخواز، بەدوای بەلادا گەڕاو.
بەلاداهاتن: تۆپین، مردن.
بەڵخە: دێیەکی ناوچەی (قەرەداخ) لە سلێمانی.
بەلعەم: بەلعەمی کوڕی باعوور، خوداپەرستێکی گاوری زەمانی حەزرەتی عیسایە، شەیتان لەخشتەی برد و لە دینی وەرگێڕا.
بەلقیس: شاژنی وڵاتی سەبەء، کە هاوزەمانی حەزرەتی سولەیمان بوو. سولەیمان -بەپێی قورئانی پیرۆز- زمانی باڵندەکانی دەزانی و لە ڕێی پەپووەسلێمانکەوە زانیی میللەتێکی خودانەپەرست لەو وڵاتە هەیە. بە هەمان ڕێ نامەی بۆ شاژن نارد و داوای خوداپەرستیی لێ کردن، هاتە لای و باوەڕی هێنا.
بەلەبهاتن: هاتەسەرلێو و خەریکی دەرچوون.
بەڵەد (ف): شارەزا.
بەند: حەپس.
بەند بەند (ف): جومگە جومگە، گرێ گرێ.
بەندەر: کەناری دەریا کە کەشتیی تێدا دەوەستێ، لەنگەرگا.
بەندەگی (ف): بەندایەتی، کۆیلەیی.
بەنەفشە (ف): وەنەوشە.
بەهارستان(ف): جێیەك خونچە و گوڵی زۆر بن.
بەهرام (ف): ئەستێرەی مەریخ.
بەهرامی گوور (ف): پازدەیەمین پادشای ساسانی و جێنشین و کوڕی یەزدگوردی یەکەمە، کە پاش مردنی باوکی، بە هاوکاریی لەشکری مونذیری کوڕی نوعمان، شازادە خوسرەوی لەسەر تەخت لابرد و خۆی چووە جێی. بە ڕاوکردنی گوور -کەری کێوی- ناوی دەرکردووە.
بەهرەوەر (ف): بەهرەمەند، ئەوی بەهرەی هەبێ.
بەهرەیاب (ف): بەهرەوەرگر، بەهرەمەند.
بەهمەن (ف): فریشتەیەکە ڕق و تووڕەیی دادەمرێنێ، ئەردەشێری کوڕی ئەسفەندیاری کوڕی گوشتاسبی پادشای کەیانی، ڕۆستەم

پەروەردەی کرد و کە بوو بە پادشا فەرامورزی کوشت.
بەهەم (ف): بەیەکەوە.
بەیاض (ع): سپێتی، ڕووناکی، بەیاز، دەفتەری سپی یا دەفتەری درێژکۆلەی باخەڵ.
بەیضە (ع): هێلکە.
بەیەکهاتن: هاتنەوەیەك، کرژبوونەوە.
بیابانی: چۆلگەڕ.
بێئیفاقە: بێشیفا، دەردی گران.
بێپیر (ف): بێدین، کەسێ پیر و شێخی تەریقەتی نەبێ و لە خودا نەترسێ.
بێپەردە: بە ئاشکرا.
بێپەی: بێبن.
بێتاو (ك-ف): بێگوڕوتین، بێهێز.
بێجان (ف): بێگیان.
بێجڵەو: ئەسپی بێلەغاو و دەسەڵات بەسەردانەبوو.
بێخودی (ف): بێهۆشی.
بێداردڵ (ف): دڵی بەئاگا، عاشقی دڵوریا.
بێدەستوپا: بێدەسەڵات و بێهێز، داماو و دەستەپاچە.
بێدەوڵەتی: هەژاری، بێدەسەڵاتی.

بیدی مەجنوون (ف): شۆڕەبی کە زۆر بەملاوبەولادا دەکەوێ، کینایەیە لە عاشقی شێت و شەیدا.
بیرجیس (ع): ئەستێرەی موشتەری.
بیروون (ف): دەرەوە.
بیروون سوو (ف): لای دەرەوە.
بیروونهاتن: دەرهاتن، دەرچوون.
بێڕەوان: بێگیان.
بیژەن: کوڕی گیو و خوشکەزای ڕۆستەمی زاڵ.
بیشار: هەر شتێ کە ئاڵتوون و زیوی پێدا داکوترابێ و ئاڵتوونڕێژ و زیوڕێژ کرابێ، بۆ نموونە کڵاوزەڕ.
بێشومار: زۆر، لەژمارەنەهاتوو.
بێشەی نەی: نەیچەڵان.
بێغائیلە: بێمەراق، بێخەم.
بێگانەدڵ: دڵی نائاشنا و بێگانەویست.
بیم (ف): ترس.
بیمار (ف): نەخۆش، مەبەست لە بیماریی چاوی یار، مەستییەتی.
بێمیهری: بێمەیلی.
بێنەوایی (ف): هەژاری و نەداری.
بیهتەرین (ف): باشترین.
بێهوودە: بێسوود.

## (پ)

پا (ف): پێ، بەرپێ، داوێن.
پابەرجا (ف): پێداگر و سوور، پێ لە جێی خۆیدا، جێقایم.

پابۆس (ف): پێماچ کردن.
پابەند (ف): پێوەند کە زیاتر پێی ولاخی پێ دەبەسترێتەوە، پێبەستراو، پێمل.

پاپاخ (ف): کڵاوی قووچی گەورەی پەشمین.
پاپاخچەپیش (ف): کڵاوی سەر هاوشێوەی سەری سابرێنی یەکساڵە.
پادشەه (ف): پادشا.
پارە (ف): لەتوپەت، پارچە.
پازەند: لێکدانەوەی ئاڤێستا.
پاسەبان (ف): پاسەوان.
پاشوو: هەردوو پەلی پاشەوەی وڵاخ.
پاشێل: پێشێل، بەپێشێلان، پێخوست.
پاڵان: پاش و پێشی کورتانی کەر کە کای تێدەکرا بۆ ئەوەی پشتەرێشەی تووش نەبێ.
پالوودە (ف): حەلوایەکی تایبەت لە نەشە و شەکر و بادامی کوتراو و ئاو.
پاڵوو: پارچەیەکی کورتانە دەنرێتە ژێر کلکی وڵاخ.
پاماڵ، پایەماڵ: لەناوچوو، پێخوست.
پایبۆس (ف): پێماچکەر، ڕێزگر، کینایەیە لە زیارەتکەری پیاوی گەورە.
پایەنداز: خراوەبەرپێ، ئەوەی لە بەرپێی خۆشەویست و بەڕێزدا پەخشان دەکرێ، پێشکەش، پێشواز.
پایین (ف): کۆتایی، دوایی شت.
پڕئاشناژن: ژنی فرەدۆست.
پڕئەفسوون (ف): پڕ لە سیحر و جادوو.
پڕبار (ف): لێوبەبار.
پڕتابش (ف): زۆر گەرم و بەتاو.
پڕچاك (ف): زۆر لەتلەت.
پڕچین: چینچینی زۆر.
پڕخیرەد (ف): عاقڵ، بەهۆش.
پڕدڵ (ف): دڵپڕ، ئازا و جەربەزە.
پڕڕەوزەن (ف): پڕ لە شەبەق، پڕ لە کڵاوڕۆژنە، پڕ لە کون و کەلەبەر.
پڕزۆر (ف): بەهێز.
پڕشکەن (ف): پڕپێچولوول.
پڕمووددەعا (ف): پڕئیددیعا، ڕقلەدڵ.
پڕموشکیل (ف): ئاڵۆز و پڕ لە گرێ.
پڕوەحشەت (ف): تەنیایی زۆر دیتوو.
پلووسك: ئاوێکی ڕەوانە لە بەرزاییەکەوە بێتە خوارەوە، لەو جێیەدا کە لە بەرزاییەکەی جیادەبێتەوە و دادەپەڕێ، بەو شوێنەیش دەوترێ کە ئاوەکەی پێدا دەڕوا.
پودەر (ف): باوك.
پورسش (ف): پرسین.
پۆزەخڕ: قەپۆز خڕ و پان.
پۆزەگا: دەموقەپۆز وەك هی گا.
پوستان (ف): مەمك.
پوستە (ف): فستق، کینایەیە لە لێوی یار.
پوشتە (ف): تەپۆلکە.
پۆشیدە (ف): داپۆشراو، شاراوە.
پۆشیدەڕوو (ف): ئافرەتی ڕووپۆشیو لە نامەحرەم، پەچەگرەوە.
پول (ف): پرد.
پووری هورمز (ف): کوڕی هورموز، یانێ خوسرەوی پەروێز.
پوول: پارە، پووڵ.

پەتپسێن: پەتپچڕێن، هەرچی پەت بپسێنێ، بێشەرم.

پەڕاگەند: پەرش‌وبڵاو و لێك‌دوور.

پەربەستە (ف): باڵ‌بەستراو، دیل.

پەرتەو (ف): ڕووناکی.

پەردەدار (ف): دەرگاوان.

پەردەرکردن: باڵ‌دەرکردن، باڵ‌گرتن، کینایەیە لە ئەوپەڕی شادی کە مرۆڤ لە خۆشییاندا خەریك‌بێ باڵی لێ بڕوێ و بفرێ.

پەرژین: دەوراندەوری باخ تەنین بە گەڵا و دار و تەیمان.

پەرزەنان (ف): لەشەقەی‌باڵ‌دان.

پەرگارصیفەت (ف): وەك پەرگار (دوّار) بە دەوری خاڵێکدا سووڕانەوە.

پەرنیان (ف): پارچەی ئاوریشمی گوڵدار.

پەروا (ف): ترس، مەیل، توانایی.

پەرواز (ف): باڵ‌گرتنەوە، فڕین.

پەروانەوار (ف): پەپوولەئاسا، وەك پەروانە کە بەردەوام دەسووڕێتەوە.

پەروین: کۆمەڵەئەستێرەی کۆ (پێروو- ئۆر) کە چەند ئەستێرەیەکی بچووکن لە جێیەکدا کۆبوونەتەوە.

پەرە: پەروانەی ئاش، چەند تەختەیەکی پان و بستێ زیاتر درێژە، سەرەکانی وەك کەوچك چاڵە، بە تۆپی ئاشدا داکوتراون. ئاو کە بە توندی لە گونجەوە هات، تۆپ دەخاتە جوولە.

پەرهێز (ف): پارێز.

پەری‌چیهرە (ك-ف): ڕوخسار وەك هی پەری، کینایەیە لە جوانی.

پەرێشان‌خاطر (ف): دڵتەنگ، پەشێوحاڵ.

پەرێشان‌زوڵف (ف): ئەگریجەی ئاڵۆزکاو و شێواو.

پەرێشان‌موو (ف): مووی ئاڵۆزکاو و شێواو.

پەزێرا (ف): پـــذیرا، قوبوولکەر.

پەژموردە (ف): سیس و ژاکاو.

پەس: پاشان، کینایەیە لە پاشەوەی مرۆڤ.

پەس و پێش (ف): بەرودوا.

پەستی (ف): نزمی، زەلیلی، خەمباری، بەدخوویی.

پەششە (ف): مێشوولە.

پەششەقووەت (ف): هێزی مێشوولەی هەیە، بێ‌هێز.

پەشم (ف): خوری.

پەشیز (ف): پارەی ڕێزەرێزەی زۆر ورد.

پەشێوحاڵ: پەرێشان، حاڵ‌وبار تێکچوو.

پەڵاس: جلی نەرێسراوی زبز لە تەنراوی ئەستوور کە هەژار دەیپۆشێ.

پەلیت (ف): پەلید، ناپاك، پیس.

پەنا: پەناگە.

پەنادان: داڵدەدان، جێ‌کردنەوە.

پەنبە (ف): پەموو، لۆکە.

پەند: ئامۆژگاری، قسەی نەستەق.

پەهلوو (ف): پاڵ، تەنیشت، لاکەلەکە.

پەیغام: نامە، ڕاسپێری، هەر زانیاری و ئاگاداریيەك.

پەیك (ف): تەتەر، ڕاسپێردراو بۆ نامەبردن.
پەیکان (ف): سەری تیر و نووکی نێزەی لە ئاسن.
پەی‌کردن (ف-ك): بڕینەوە.
پەیکی ئەجەل (ف): ئیزرائیل، نامەبەری گیانکێش.
پەیمانە (ف): پیاڵە.
پەیوەست (ف): هەمیشە، پێوەندکراو و بەستراو بە شتێکی‌ترەوە.
پیادە (ف): سەرباز، جوندی، داشێکی شەترەنجە کە لە جووڵەی یەکەمدا یەك یا دوو خانە و لە جووڵەکانی‌تردا یەك خانە دەچێتە پێشەوە.
پێ: داوێن، خوار. وەك پێی کەمەر، یانێ خوار کەمەر.
پێچیدە (ف): لوولکراو، پێچراوە وەك قەباڵەی جاران.
پیر: شێخی تەریقەت.
پیراهەن، پیرەهەن (ف): کراس.
پیرمەسوور: پیرمەنصوور، شەخس و مەزارێکە لە گەڕەکی مەڵکەندیی شاری سلێمانی.
پیرەزاڵ: پیری کۆنەساڵی زۆرزان و بەدەسەڵات، زاڵی کوڕی سام و باوکی ڕۆستەمی پاڵەوانی ئێرانی.
پیرەهەن‌ئاڵ (ف-ك): کراسی سووری بە خوێن ئاڵ.
پیری سولووك (ك-ف): شێخی تەریقەت.
پیری کەنعان: حەزرەتی یەعقووبی باوکی حەزرەتی یووسف.
پیش (ف): پێش، بەردەم.
پێشامەد (ف): پێشهات، چارەنووس، ئەوەی کە دێتە ڕێی مرۆڤ یا چارەنووس.
پێشانی (ف): ناوچاوان.
پێ‌شوتورمورغ (ك-ف): پێ وەك وشترمر کە بە باڵ باڵندە و بە قاچ و ملی درێژ وشترە.
پیشەوەر (ف): خاوەن‌پیشە.
پێشە (ف): ئێسك.
پێکان: هەڵدان (چەتر).
پیل‌ئەفگەن (ف): فیل‌بەئەرزدادەر.
پیل‌تەن (ف): لەش وەك فیل کەتە و زل.

## (ت)

تاب (ف): هێز و توانایی، گەرمی، چین و پێچی ئەگریجە.
تابش (ف): گەرمی، تین‌وتاو، گڕ، ڕووناکیی خۆر.
تابوشت (ف): تا و گەرما.
تاتار: میللەتی تەتەر کە بەشێکی مەغۆلە لە ئاسیا، یان تاتارستان کە هەرێمێکی خۆبەڕێوەبەری نێوان دەریاچەی بایکاڵ و چیای تائییە لە ڕووسیا، ناوەندەکەی (قازان)ە. ئەم وڵاتە بە میسکی بۆنخۆش بەناووبانگە.
تاج: کڵاوی کووزکووزی دەروێشی.
تاجیر (ع): بازرگان.
تار (ف): تاریك، تاڵی موو.

تاراج (ف): تالآن.
تارین: تاریك.
تازەساو: تازە بە تازە لەهەساندراو.
تازەعاشق: دڵداری تازەکوورە.
تازەئاموختە (ف): تازەدەرس‌دادراو، تازەفێربوو.
تازی (ف): ئەسپی عەرەبی، تاژی، تانجی.
تازی‌ئەسپ (ف): ئەسپی عەرەبی.
تازی‌سەوار (ف): ئەوی ئەسپی عەرەبیی لەژێردایە، کە دەبێ سوارچاك بێ.
تازی (ف): ئەسپی عەرەبی کە چابوك و بەناووبانگە.
تاژان: دێیەکی ناوچەی (بانە) لە کوردستانی ئێران.
تاژەبان: دێیەکی ناوچەی (بانە) لە کوردستانی ئێران.
تافان: دێیەکی ناوچەی (قەرەداخ) لە سلێمانی.
تاودان: سازدان.
ترازووباز: فێڵ‌کردوو لە کێشانەدا.
تررووسك: چالاك.
تکاجۆ (ف): تکاکار.
توانا (ف): بەهێز.
تۆپ: جگە لە تۆپ و گۆی عادەتی، مانای (هەموو)یشی دەگەیێنێ.
توخم (ف): تۆو، ناوك.
توربە: توورەکە، توورەکەی ئالف‌تێ‌کردنی ولآخ.
توربەت (ع): لە ئەسڵدا گڵە، بۆ گۆڕ بەکاردەهێنرێ.
تورك (ف): کینایەیە لە مەعشووقە و جوان، تالآنکەر.
تورك‌ئەندێشە (ف): بیر لە ستەم و تالآن کردووەوە، ستەمکار.
تورکستان: مەبەست تورکستانی چینە، نەك تورکستانی ڕۆژاوا یا ڕووسی. تورکستانی چین (سینکیانگ) لە باکووری ڕۆژاوای چینە، ئوورومچی ناوەندیەتی و خوتەن، یارکند، کاشغەر و تورفان لە شارە گەورەکانیەتی. زۆری دانیشتووانی ئۆیغووری و زۆربەیشیان موسوڵمانن.
تورمە: قوماشێکی شاڵە، دەوڵەمەندان جلی لێ دروست دەکەن.
تورمەپۆش: ئەوی قوماشی تورمەی پۆشیبێ، کینایەیە لە دەوڵەمەند.
تۆڕ: توورە، شیرەت.
تۆڕی عەنکەبووت: تەونی جاڵجاڵۆکە.
تولەك (ف): تازەلاوی بێ‌موو، گیانداری مووهەڵوەریو.
توندخوو (ف): تەبیعەت‌توند، تووڕەوتۆسن.
توندڕەو (ف): خێرارۆیشتوو، زیادەڕۆ.
توهمەت (ع): تۆمەت.
توویی خودا: لە ڕێی خودادا.
تووتیا (ف): کل، جۆرەبەردێکی وەك کلە، دەهاڕرێ و چاوی پێ دەرێژرێ و دەرمانی چاوە.

توران: وڵاتی توران لەوبەری ئەمۆدەریا (جەیحوون).
تولەمار: ماری چکۆلە.
تەئەمول (ع): تێرامان، بە قووڵی وردبوونەوە.
تەب (ف): تا، تاداری.
تەباه (ف): فەوتاو، لەناوبراو.
تەبەسسوم‌کردن (ع-ك): زەردەخەنەنیشاندان.
تەبرید (ع): ساردکردنەوە.
تەتەر: نامەبەر.
تەجنیس (ع): هێنانەوەی جیناس -کە هونەرێکی ڕەوانبێژییە، دوو وشە کە چەند پیتێك یا هەموو پیتەکانیان وەك یەکن و مانای جیاوازیان هەیە.
تەحریرات (ع): نووسین.
تەحصیل (ع): ئەنجام، دەسکەوت.
تەحقیق (ع): ڕاست، پوختوپەتی.
تەحقیقە (ع): ئاشکرا و دیارە، گومانی تێدا نییە.
تەحەررو کبەخش: هۆی جووڵە و بزاوتن.
تەحەمول (ع): دەربردن، سەبر، بارهەڵگری.
تەدبیر (ع): تەگبیر، چارە.
تەرتیب (ع): ڕیزکردن، ڕێکخستن.
تەڕدەست: گورج هاتەنەدەست، ئامادە.
تەڕدەستی: بە گورجی، بە لێزانی و دەستڕەنگینی.
تەرسا (ف): گاور.
تەرساخوو (ف): خوو وەك خووی مەسیحی.
تەرسامیزاج (ف): بە میزاج و هەڵکەوت گاور.
تەرك (ع): وازلێهێنان، دەستلێهەڵگرتن.
تەرکەش (ف): تیردان.
تەرکیب (ع): جۆری پێکهاتن و دروستبوون.
تەرەحوم (ع): بەزەیی‌پێداهاتنەوە، ڕەحمپێ‌کردن.
تەرەددود (ع): هاتوچۆ.
تەرەققی (ع): بەرزبوونەوە، هەڵکشان.
تەرزەکووبی (ك-ف): بە تەرزەکوتران.
تەریق: تەریقبوونەوە و شەرمگرتن.
تەزویر (ع): ساختەکاری.
تەزەروو (ف): تذرو، کەڵەشێری سەحرانشین، باڵندەیەکی کلکدرێژی پەڕوباڵ ڕەنگینی پۆپنەدارە.
تەسبیحات (ع): تەسبیح بەدەستەوەگرتن و ویردی دینی وتنەوە.
تەسخیر (ع): داگیرکردن، زەوتکاری و خستنەژێردەست.
تەسکین (ع): ئارامکردنەوە.
تەسلیم (ع): خۆبەدەستەوەدان، ملکەچ‌کردن.
تەصویر (ع): وێنەگرتن.
تەطاول (ع): دەستدرێژی.
تەظەللوم (ع): سکاڵا لەدەست ستەم.
تەعجیل (ع): خێرایی و پەلەکردن.
تەعزیە (ع): پرسە، سەرخۆشیلێ‌کردن.
تەعظیم (ع): بەگرنگ و مەزن دانان.
تەعلیم (ع): ڕاهێنان، فێرکردن، مەشقپێ‌کردن.

تەعویذ (ع): چاوەزار، نوشتە، دوعا.
تەعەششوق (ع): عاشقبوون، پابەندبوون.
تەغاراو: دەفری ئاوی پینەچی بۆ خووساندنەوەی چەرم و شتی وا، گلێنەیەکی درێژکۆلەیە هەویری تێدا دەکرێ، قاپی چلکاو و چەرماوی سەرڕاج.
تەغافول (ع): سستی و کەمتەرخەمی نوواندن.
تەفاوتکردن (ع-ك): جیاوازیکردن، بەراوردکردن.
تەفسیر (ع): لێکدانەوە، کتێبێکە جاران فەقێ خوێندوویانە.
تەفەڕڕوج (ع): سەیران، گەشت و گەڕان.
تەقدیر (ع): قەزاوقەدەر، چارەنووس.
تەقەرروب (ع): نزیككەوتنەوە، لێنزیکی.
تەکاپۆ (ف): هاتوچۆی بە پەلە.
تەکان: گوژم.
تەکەڵتوو: نمەدزین، نەرمەزین، لەژێر زینەوە بەسەر پشتی ئەسپ و ماینەدا دەدرێ، تا ئازار بە پشتی نەگا.
تەکیە (ع): جێی دەروێشان، پشتپێبەستن.
تەکیە: دێیەکی ناوچەی (قەرەداخ) لە سلێمانی.
تەلاش (ف): هەوڵ و کۆشش.
تەلاطوم (ع): بەیەکدادانی شەپۆلەکان.
تەلان: دێیەکی ناوچەی (دووکان) لە سلێمانی.
تەلبیس (ع): فێڵ و ڕووکەشکردن.

تەڵخ (ف): تاڵ، لە ڕەنگدا لێڵ و دێز، سووری قاوەیی.
تەڵخڕوو (ف): ڕوو ترشوتاڵ.
تەڵخڕەنگ (ف): سووری لێڵ.
تەڵخکام (ف): ئارەزوو تاڵ.
تەڵخگۆیی (ف): قسەی ترشوتاڵ کردن.
تەڵخوەقت (ف): کات و سات ناخۆش و تاڵ.
تەلەتتوف (ع): تلطّف، لوتفنوواندن، شۆر و غەوغا.
تەما: نیاز، ویست.
تەمبەستن: تەمگرتن، دروستبوونی تەمومژ.
تەمکین (ع): گوێڕایەڵی، ملکەچی، توانایی، ساماندارى.
تەمووز: قرچەی گەرمای هاوین، مانگی حەوتەمی ساڵی زایینی.
تەن (ف): لەش، لاشە.
تەن بە تەن (ف): یەك بە یەك.
تەنپۆش (ف): لەشداپۆش.
تەنخواه (ف): لەباتی.
تەندوور، تەنوور: جێی نان سازکردن.
تەنفسوورده (ف): لاشەی ژاکاو.
تەنك‌ظەرفیکردن: خواردنی کەم کردنە گەدە، کەمخۆریکردن.
تەنگچەشمی (ف): بەرچاوتەنگی، چاوبرسێتی.
تەنگدەست (ف): دەستکورت.
تەنگدەستی (ف): دەستکورتی، نەداری.
تەنگدەهانی (ف): بچووکی و تەسکیی دەم.

تەنگی‌سەر: دێیەکی ناوچەی (قەرەداخ) لە سلێمانی.
تەنەززول (ع): نزم‌بوونەوە، بارلاربوون، خواردەستی.
تەنیدەتەن (ف): لەش‌تەنیو، بە هەموو لەشدا تەنینەوە.
تەه (ف): خوار، بن، ناخ.
تەهەمتەن (ف): ناسناوی ڕۆستەمی زاڵە، ئازا.
تەهی (ف): خاڵی، بەتاڵ، چۆڵ.
تەوانایی (ف): توان، توانایی.
تەوبە (ع): تۆبە، پەشیمانبوونەوە لە گوناه.
تەوسەن (ف): سرك و سەرکێش (بەتایبەتی ئەسپ).
تەوقی سەر: زەقایی تەپڵی سەر.
تەوەججوه (ع): زاراوەیەکی نەقشیـەکانە، بە مانای ڕووکردنی شێخ لە مورید بە نیازی پڕکردنی ناخی لە بەرەکەت.
تەیهوو (ف): سوێسکە، باڵندەیەکە لە کەو بچووکترە و گۆشتیشی خۆشترە.
تیپ: تیپی لەشکر، تاقم.
تێچاندن: تێچێن‌کردن، وردەوردەتێ‌کردن.
تیر: ئامرازێکی شەڕ لە کۆندا، کینایەیە لە برژانگ و باڵای قنج و ڕاست.
تیرئەفگەن (ك-ف): تیرهاوێژ، تیرخەرەخوار.
تیرباران: تیری زۆر لێدان، مەبەست تیری برژانگ گرتنە دڵە.
تیرقەد: باڵا ڕێك و ڕاست.
تیرەوش (ك-ف): وەك تیر، کینایەیە لە خێرایی.
تیرە (ف): تاریك.
تیرەشان: ڕاستایی بەیەکەوەبەستراوی لوتکەی زنجیرە شاخ.
تیرەشەو (ف-ك): تاریکەشەو.
تیرەگی (ف): تاریکی.
تیرە و تار: تاریك.
تیری قەضا (ك-ع): تیری چارەنووس، تیری قەزاوقەدەر.
تیری نەظەر (ك-ع): تیری چاوی یار، یا تیری چاوی پیس.
تیری نیگەه (ك-ف): تیری نیگا، کینایەیە لە برژانگی چاو.
تیز (ف): تیژ.
تیزباڵ (ف): تیژڕۆ.
تیشنە (ف): تینوو.
تیشە (ف): تەشوێ، ئەو ئامرازەی کە فەرهاد نەخشەکانی شیرینی لەسەر بێستوون پێ هەڵکەند.
تیغ: شمشێر.
تیغبەرکەف (ف): شمشێربەدەست.
تێگیران: لێ‌گیرکردن.
تیمار: دەرمانکردن، چارەسەری برین.
تیمار: دێیەکی ناوچەی (قەرەداخ) لە سلێمانی.

## (ث)

ثانی (ع): دووەم.

ثورەیا (ع): کۆمەڵەئەستێرەیەکی زۆر و جوانە لە گەردنی بورجی گۆ (پێروو- ثور)دا، ملوانکەی جوانانی پێ دەشوبهێنرێ.

ثوعبانی کەلیم (ع): ثوعبان- ئەژدەها، ماری گەورە، کەلیم- ناسناوی مووسا پێغەمبەرە کە قسەی لەگەڵ خودا کرد.

ثەبت (ع): پایەدار و جێگرتوو.

ثەبتبوون (ع-ك): جێگیربوون.

ثەبتکردن (ع-ك): جێگیرکردن، تۆمارکردن.

ثەمەر (ع): بەر، بەرهەم.

ثەناخوان (ف): ستایشگۆ، بەشانوباڵداهەڵدەر.

## (ج)

جادە (ع): ڕێگا، شەقامەڕێ.

جاذیب (ع): ڕاکێش، بەکێشکەر.

جاڕووب (ف): گسك.

جاڕووکەش (ف): گسکدەر.

جاریە (ع): کەنیزەك.

جافان: جافەکان، ئەوانەی کە سەر بە هۆزی جافن.

جام: کاسە، پیاڵەی مەی.

جامە (ف): کراس.

جامەدار (ف): پەشتەماڵبەدەستی حەمام، ناتر، ئاگاداری پۆشاکی خەڵك لە حەمامدا.

جامەنەسرین (ف): کراس لە گوڵی فرەپەڕەی ڕەنگاوڕەنگ و جوانی نەسرین.

جامەی عوقبا (ف): کراسی دواڕۆژ، کفن.

جان (ف): گیان.

جانان، جانانە (ف): دڵبەر، یاری نازدار و خۆشەویست.

جانداده (ف): گیانبەخشیو، یەکێ لە گیانەلاّدا بێ.

جانستان (ف): گیانستێن، گیانکێش.

جانشین (ف): جێنشین.

جانفشان (ف): گیانبەختکردن.

جانفەرسا (ف): گیانئازاردەر.

جانگوداز (ف): هەر شتێ ئازاری دڵ بدا.

جاننیثار (ف): گیانبەختکەر.

جانەوەر (ف): گیاندار.

جاوید (ف): هەمیشەیی، نەمر.

جایەز (ع): شیاو، ڕێپێدراو.

جڵەوڕێژ (ك-ف): جڵەوکێش، جڵەوکراو.

جڵەوکێش: جڵەوبەدەستەوەگر، جڵەوڕاکێش.

جڵەوگیر: شتێ ببێتە مایەی گرتنی جڵەوی ولاّخ و ڕاگرتنی، کۆسپی ڕێ.

جۆ (ف): جۆگە، خوازیار.

جۆبار: جۆگە.

جوبەخانە: جێی تایبەتی چەكوچۆڵ و گوللە.

جوبریل (ع): جوبرائیل فریشتەی هێنانی سرووش بۆ حەزرەتی پێغەمبەر.

جۆچێن: خۆشنشین، کەسێ زەویی لە دێدا نەبێ و بە کرێ کار بکا.
جودا (ف): جیا، جوێ.
جورعەنۆشی (ف): بە قوم شەراب خواردنەوە، پێکهەڵدان. (جورعە)کەی عەرەبییە.
جوز (ف): جگە لە.
جوزئی (ع): لە زاراوەکانی زانستی مەنتیقە. ئەو چەمکەیە کە ڕێنادا ڕاستودروستیی بەسەر زۆربەی خەڵکدا بسەپێندرێ.
جوستوجۆ (ف): گەڕان بە وردی بەدوای شتدا، سۆراخکردن.
جوستوخێز (ف): جموجووڵ و هەستانەوە.
جوستەن (ف): غار، ڕاکردن، هەڵمەت و جووڵەی گورجوگۆڵانە.
جۆش: کوڵان.
جۆشش (ف): جۆش و خرۆش، تینوتاو.
جوغد (ف): کوندەپەپوو.
جولـلاب (ف): گوڵاوی شیرین، جۆرە شەربەتێکە لە گوڵاو و شەکر یا هەنگوین و چەند شتێکیتر دەگیرێتەوە.
جوملە، جوملەگی (ف): هەمووی.
جونبوش (ف): لەرزە، جووڵە.
جونوونبازی (ف): شێتی.
جوهد (ع): ڕەنجدان، ماندووبوون.
جووتە: لەقەهاویشتنی وڵاخ بە هەردوو لاق.
جوود (ع): بەخشندەیی، چاکە و دڵفراوانی.
جووع (ع): برسێتی.
جۆیا(ف):داواکەر، بەدوایهەرشتێکدا گەڕاو.
جۆیبار (ف): جۆگەی دەوروبەر سەوز.
جەبین (ع): ناوچاوان، تەوێڵ.
جەدوەل (ف): پێچولوول و چینچینی ئەگریجە.
جەدەل (ع): گفتوگۆ، مشتومڕ و دەمەدەمی نێوان دوو کەس یا زیاتر.
جەدیوار (ع): وەك جەدی، ئەستێرەی جەمسەر کە لە وێنەی گەردوونیی ورچی چکۆلەدایە نزیك بە جەمسەری گۆی زەوی.
جەذبکردن (ع-ك): بۆ لای خۆ ڕاکێشان.
جەذبە (ع): ڕاکێشان، دۆخێکی نائاسایی سۆفییەکانە لە زاراوەی نەقشیدا بە مانای ڕاکێشانیدڵی مورید و حاڵلێهاتن، ڕاچڵەکان، ئەمە لە مانگی بەفرانباردا دەبێ.
جەرەس (ع): زەنگ.
جەشنئارا (ف): جەژنڕازێنەوە.
جەعد (ع): مووی لوول و پێچپێچ.
جەفا (ع): ئازار، ناخۆشی.
جەفاجۆ (ف): بەدوای ئازاردا گەڕاو، ئازاربەخش.
جەفاکێش (ف): ستەمئایین، ستەمکار.
جەلا (ع): جەلاء، ڕوونی، دەرکەوتن، ڕۆشنایی، ڕۆشنبوونەوە.
جەلادان (ع-ك): لابردنی ژەنگی ڕووی وەك ئاوێنە، مشتوماڵدان.
جەڵدەڕاه (ف): ڕێی باریك و درێژ، یا ڕێی تێدەچێ جەردەڕاه بێ: ڕێی جەردە و چەتە.
جەم (ف): جەمشیدی چوارەمین پادشای زنجیرەی پێشدادی، هەر پادشایەکی گەورە.

جەماڵئاباد (ف): ئاوەدانیی جوانی، ڕەنگە جێیەکی دڵگیر بێ بەم ناوەوە.
جەمع (ع): کۆمەڵ.
جەمعی ضیددەین (ع): کۆکردنەوەی دوو شتی دژبەیەکی وەك ئاگر و ئاو.
جەنگجۆ (ف): شەڕخواز، بەدوای شەڕدا گەڕاو، بەگێچەڵ.
جەو (ف): جۆ، کینایەیە لە کەمی.
جەوانمەردی (ف): جوامێری، مەردایەتی.
جەواهیرسورمە (ف): کلی گرانبەها.
جەوت: کڵاوی بەڕوو کە بۆ خۆشەکردنی پێستە بەکاردەهێنرێ.
جەور (ع): ستەم.
جەوزا (ع): سێیەم کەلووی ئاسمانی، سێیەم مانگی هەتاوی کە دوا مانگی وەرزی بەهارە، جۆزەردان.
جەوشەن (ع): کراسی زرێداری جەنگ، درع.
جەوشەنلەبەر (ع-ك): کراسی زرێی جەنگ لەبەرکردوو.
جەولان (ع): جموجووڵی بەهێز.
جەولانگاه (ف): جێی جووڵە و بزاوتن.
جەوهەر (ع): ڕەسەنایەتی، لێهاتوویی.
جەوهەرئالوود (ف): جەوهەردار، نیشاندەری جەوهەر، لەگەڵ جەوهەر و لێهاتوویيدا تێکەڵ. (جەوهەر)ەکەی عەرەبییە.
جەوهەردار (ف): بەجەوهەر.
جەیحوون: ئەمۆدەریا، کۆن (ئۆکسوس)ی پێ وتراوە، سەرچاوەکەی لە چیاکانی پامیری هیندستانەوەیە و بەشێکی سنووری ئەفغانستان و ئۆزبەکستان پێكدەهێنێ، تا دواجار دەڕژێتە کەناری باشووری دەریاچەی ئاراڵ.
جێب (ف): گیرفان، بەرباخەڵ، ژێرسوخمە لەسەر سنگ.
جیبریل: فریشتەی سرووش هێنان لە خوداوە بۆ پێغەمبەران.
جێپەیکان (ك-ف): جێی بەرکەوتنی سەرەتیر.
جیسر (ع): پرد.
جێگاگۆڕکێ: لە جێیەکەوە چوون بۆ جێیەکیتر. گۆڕینی جێ.
جیفە (ع): لاکی تۆپیو.
جیلوە (ع): جوانی، ورشە، دەرکەوتن، ڕووناکی.
جیلوەطاووس (ف): دەرکەوتن بە ڕەنگی جیاجیای ئاڵووالاوە، بەوێنە کە پەڕ و کلکی تاووس خۆی فرەڕەنگن.
جیلوەکونان (ف): بە خۆنوواندنەوە، بە درەوشاوەیی و دەرکەوتوویی.
جیلوەگەر (ف): ئاشکرا و دیار.
جینان (ع): کۆی (جەننەت)ە، بەهەشت.
جینس (ع): جۆر.
جێنێش (ك-ف): شوێنی پێوەدانی چزوو.
جیهان (ف): دنیا، گێتی.
جیهانئارا (ف): جیهانڕازێنەوە، جیهانجوانکەر.
جیهانئەفرووز (ف): جیهانڕۆشنکەرەوە.

چابوك: گورجوگۆڵ.

چابوكانه: گورجوگۆڵانه.

چارەساز: چارەسەركەر، مایەی چارەسەر.

چاك (ف): لەت، پارچە، دڕاو.

چاكچاك (ف): لەتلەت.

چاكیر (ف): خزمەتكار و نۆكەر.

چاو (ف): پارچەكاغەزێكی چوارگۆشە بووە، پادشایەكی جەنگیزییەكان وێنەی خۆی لێداوە و وەك پارە برەوی پێ داوە، پاش مردنی ڕەواجی نەماوە و قاچاخ بووە. یان: پارچەكاغەزێكە جادووگەر یا فاڵچی هێڵ یا خشتە یا پیت یان وشەی لێ دەنووسێ و پێی وایە كەسێ یا شتێ دەپارێزێ و مرۆڤ لە بەڵا دوور دەخاتەوە.

چاومردوو: داوداخراو.

چاه (ف): چاڵ، قۆرت، كینایەیە لە زیندان.

چاهی زەنەخ، چاهی زەنەخدان (ف): چاڵی چەناگە.

چاهی هارووت (ف): ئەو چاڵە كە هارووت و ماروتی تێدا زیندان كران و ئەشكەنجە دران، چەناگەی یاری پێ شوبهێنراوە.

چرا: هۆیەكی ڕووناككردنەوەی جاران كە بە نەوت كاری كردووە، مصباح، كینایەیە لە ڕوخساری یار.

چراچی: ئەوانەی وا چرا لە پێش بووكدا هەڵــدەگرن.

چراغ (ف): چرا.

چرك: چڵك.

چنگنی: تیرەیەكی هۆزی جافە.

چوارباغ: گەڕەكێكی كۆنی ناوشاری سلێمانی.

چۆپان (ف): شوان.

چوستی (ف): گورجی.

چۆڵگەرد (ف): چۆڵگەڕ، ئەوی بە دەشتودەر و چۆڵەوانیدا بسووڕێتەوە.

چۆماغدەركەف (ف): كوتەكبەدەست.

چووچانی: تیرەیەكی هۆزی جافە.

چەتری نادری: ڕەنگە جۆرە چەترێكی تایبەتی نادرشای ئەفشار بووبێ، بەكاری هێنابێ و لەوەوە ئەو ناوەی بەسەردا برابێ.

چەرا (ف): لەوەڕ.

چەرخ: سووڕانەوە، ڕۆژگار.

چەرخە: سەرەتەشی و هەر شتێ بۆ دەزووڕستن.

چەرخەدان: بادان، سووڕپێخواردن.

چەرخین: بادانەوە، ڕووەوەرگێڕان.

چەردە (ف): ڕەنگ.

چەسپ: جێگرتوو، پێوەلكاو، پێوەبەستراو.

چەشم (ف): چاو.

چەشمە (ف): سەرچاوە، كانی.

چەشمەسار (ف): سەرچاوە.

چەشمەی حەیوان: سەرچاوەی ئاوی ژیان.

چەكیدە(ف):ڕێنگاڵ،داچۆڕاو،گوشراوو پوختە.

چەلیپا (ف): خاچ، دوو داری ڕاست و چەپی ـبە باوەڕی مەسیحییەكانـ بەداردا كردنی عیسا پێغەمبەر. كینایەیە لە ئەگریجەی یار.

چەمچەتاش: كەوچكتاش.

چەمەن (ف): گوڵزار، باخ و سەوزایی.
چەمەنئارا (ف): گوڵزاررازێنەوە.
چەنبەر (ف): بازنە، جوغز.
چەنگاڵ، چەنگەڵ (ف): چنگ.
چەنگچی (ف): ئەوی ئامێری مۆسیقای چەنگ لێ بدا.
چەوگان (ف): گۆچانی یاریی (گۆ و چەوگان). گۆ: گۆیەکی دارینە بە گۆچانەکە لێی دەدرێ و هەر کەسێك لە مەیدانەکە دەری کرد، ئەوە یارییەکە دەباتەوە.

چەم (ف): چاڵ.
چیاسەوز: دێیەکی ناوچەی (ئاغجەلەر)ی سەر بە قەزای (چەمچەماڵ).
چێشتان: ناوەڕاستی بەیانی و نیوەڕۆ.
چیقڵدان: چیکڵدانی پەلەوەر کە خواردنی تێدا کۆدەکاتەوە.
چین: وڵاتی چین کە لەوپەڕی ئاسیایە.
چیهرە (ف): ڕوخسار، ڕوومەت.

## (ح)

حاتەمدڵ: بەدەستودڵ و بەخشندە، دڵفراوان وەك حاتەمی تەی.
حاتەمکەرەم (ف): بەخشندە و بەدەستودڵ وەك حاتەمی تەی.
حاتەمی طەی (ع): حاتەمی تائی، شاعیرێکی پێش ئیسلامە، بە ئازایی و بەخشندەیی ناوی دەرکردووە و بە نموونە هێنراوەتەوە.
حاجەت (ع): پێویستی
حاجی ئەحان: حاجی ئەحمەد بەگی گەورەی دەوڵەمەندێکی دێی (قەڵاچوالان) و لە بنەماڵەی صاحێبقڕان بووە، لە دامەزرانی سلێمانیدا هاتووەتە ناوشار و (مزگەوتی حاجی حان)ی لە گەڕەکی مەڵکەندی بنیات ناوە و موڵکێکی زۆری لەسەر وەقف کردووە. شاعیر بووە و ناسناوی "شەوقی"ی هەبووە. باپیری عەبدوڕڕەحمان بەگی محەمەد بەگی قەرەجەهەننەمی شاعیر "سالم"ە.

حاجیب (ع): دەرگاوان.
حادیث (ع): تایبەتمەندیی ئەوە کە پێشتر نەبووە و دوایی پەیدا بووە یا ڕووی داوە.
حاریث (ع): کشتوکاڵکەر، پاسەوان، خاوەنتەماعی تێرنەخواردوو، ئیبلیس.
حاصیل (ع): بەر، بەرهەم، ئەنجامی کار.
حافظ (ف): خواجە شەمسەددین محەمەدی ناسراو بە حافظ شیرازیی شاعیری گەورەی ئێرانە.
حاڵی: تێگەیشتوو.
حوب (ع): خۆشویستن.
حوباب (ف): بڵقی سەر ئاو، (ع): مار.
حوججاج (ع): کۆی (حاجّ)ە، حاجی.
حوججەت (ع): بەڵگە، بیانوو، هێز.
حوجرە (ع): ژوور، هۆدە.
حورووف (ع): کۆی (حەرف)ە، پیت.

حۆریلیقا: ئەوی پێگەیشتن و بینینی وەك گەیشتن بە پەریی بەهەشت وایە.
حوسن (ع): جوانی.
حوسەین: کوڕی حەزرەتی عەلی (خ.ڕ)، کە لـە کەربەلا کوژرا.
حوکم (ع): ئەوەی ... بڕیکا.
حوکمی قەضا (ع): کاری قەزاوقەدەر، مەرگ.
حولی (ع): خشڵ.
حومەیرا (ع): حومەیراء، ناسناوی حەزرەتی عائیشەی هاوسەری حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ).
حوور (ع): پەریی بەهەشت، کینایەیە لـە کچی جوان.
حەبس (ع): بەند.
حبل المتین (ع): پەتی توند و قایم.
حەبەش: وڵاتی حەبەشە لـە ئەفریقیا، کە ئێستا (ئەسیووپیا)یە و خەڵکەکەی ڕەشپێستن. کینایەیە لـە ڕەشایی و ڕەشپێستی.
حەبیب (ع): خۆشەویست.
حەجم (ع): قەوارە، بارستایی.
حەجەر (ع): بەرد.
حەدنەبوون (ع-ك): نەتوانین. پێنەکران.
حەدیث (ع): باسوخواس.
حەذەر (ع): خۆپاریزی، وریایی.
حەذەرکون، ئەلحەذەر (ف): خۆت بپارێزە، وریا بە.
حەربە (ع): سونگی، نیزە.
حەرف (ف): قسە.

حەرەم (ع): حەرەمسەرا، ژووری تایبەتی ژن و مێرد.
حەریرڕەنگ (ف): ڕەنگئاوریشمی.
حەریص (ع): تەماعکار، بەهەڵپە، پەرۆش.
حەریف (ع): هاوپیشە، هاودەم.
حەریم (ع): حەرەمسەرا.
حەسرەت (ع): داخ و خەفەت.
حەسرەتا (ع): داخەکەم.
حەسسان: "حەسسانی کوڕی ثابیت"ی شاعیری ستایشوێژ و هاوڕێی پێغەمبەر (د.خ).
حەشر (ع): کۆبوونەوەی مەردوم لـە قیامەتدا.
حەشیش (ع): پووش و گژوگیا.
حەصار (ع): شوورا، گەمارۆدان، چواردەورگرتن.
حەصاری (ع): خۆقایمکردوو، متحصّن.
حەضرەت (ع): حەزرەت، جەناب.
حەضەر (ع): نیشتەجێ، دژی سەفەر.
حەفی (ع): ماری گەورە.
حەق (ع): خودا، ڕاستی.
حەك (ع): کوژاندنەوە، سڕینەوە.
حەکیم (ع): پزیشك.
حەلاوەت (ع): شیرینی.
حەلقووم (ع): قوڕگ، گەروو.
حەلقە (ع): ئەڵقە و گرێی نەگریجە.
حەلقەدەرگۆشی (ف): ئەڵقەلەگوێی، نۆکەری و خزمەتکاری.
حەلقەزەن (ف): ئەڵقەداو، بازنەیی.

حەلقەکردن (ع–ك): کردن بە ئەڵقە و بە دەوری قەددا هێنانەوە.
حەلقەگیر (ف): دەورەدەر.
حەلوەلا: داماوی و ناچاری لە تەنگانە و پەرێشانیدا بۆ وتنی «لاحول ولاقوة الاّ بالله».
حەمایەڵ: ئەوی ڕاست و چەپ لە مل کرابێ، وەك فیشەکلغ و شمشێر و شتی وا یا دوعای لەکیف‌نراو.
حەمرا (ع): سوور.
حەمل (ع): سکپڕی، سكوزا.
حەملە (ع): هێرش.
حەملەوەر (ف): هێرشبەر.
حەنا (ع): خەنە، مەبەست خوێنە کە ڕەنگی وەك ڕەنگی خەنە سوورە.
حەواڵە: پارە یا کالآیەکە بە کەسێکدا نێررابێ بۆ کەسێکی‌تر و بگاتە دەستی.
حەی (ع): مار.
حەی‌پەروەردە: پەروەردەی دەستی مار، وەك مار بەخێوکراو. (حەی) عەرەبیـە.
حەیا (ع): شەرم.
حیجاب (ع): پەردە، پەچەگرتنەوە و سەرداپۆشین.
حیرز (ع): پاراستن، شوێنی پاراستن.
حیرص (ع): پەرۆشی، خەمخۆری، چاوچنۆکی.
حیرە (ع): سەرسام، سەرلێ‌شێواو.
حیصن (ع): قەڵآ.
حیکایەتخوان (ف): حیکایەتخوێن، چیرۆککگێڕەوە، کینایەیە لە قسەی زۆرکەر.
حیکمەت (ع): عەقڵ و تێگەیشتن.
حیللە (ع): شارێکی ناوەڕاستی عیراقە.
حیلەجۆ (ف): فێلباز، بەدوای فێڵدا گەڕاو.

## (خ)

خاتەم (ع): ئەنگوستیلە، مۆر.
خاج (ف): خاچ، داری ڕاست و چەپی بەداردا کردنی حەزرەتی عیسا (د.خ).
خار (ف): دڕك، ناز و عیشوە. خارەها– چەندین دڕك.
خارا (ف): ڕەق، بەردی سەخت.
خارپوشت (ف): ژیشك.
خارەسوم (ف): سمی سەختی بەرگەگر.
خارەموو (ف): پەتکی ئاڵۆزاو و قایم کە دەدرێتە بەر گەڵآکوتك.
خاریج (ع): لە دەرەوەی نیشتمان.
خاصصە (ع): بەتایبەتی.
خاصیەت (ع): تایبەتمەندی، سوود.
خاطر (ف): دڵ، ختوورە و خەیاڵ و ئەندێشەی ناو دڵ.
خاقانی: ناسناوی بەدیل کوڕی عەلی شاعیرێکی گەورەی ئێرانە. لە (شیروان) لەدایك بووە. لای مامی و ئەبووعەلای گەنجەوی خوێندوویە و پێ‌گەیشتووە. دواتر ئەو ناسناوەی لە دەرباری خاقانی گەورە

فەخرەددین مەنووچەهر کوڕی فەرەیدوون شیروانشاه بێدراوه. به زۆر ولاتدا گەڕاوه و بەرهەمی زۆریشی لەپاش بەجێ ماوه.
خاکبۆسی (ف): خاکی بەرپێ ماچ کردن.
خاکیستەر (ف): خۆڵەمێش.
خاڵیگه: خوار پەراسوو، لاقەبرغه، بۆشایی لاکەلەکه.
خام (ف): کاڵ، نەکولاو و نەبرژاو، بێئەزموون.
خامۆش (ف): بێدەنگ.
خامۆشی (ف): بێدەنگی.
خانەبەردۆش (ف): ماڵبەکۆڵ، کینایەیه لە هەژاری و سەرگەردانی.
خانەخوێ: خاوەنماڵ.
خانەخەراب (ف): ماڵوێران.
خانەوێران (ف): ماڵوێران.
خاو: خەو، گوڵێکی بۆنخۆشه.
خاوەر (ف): ڕۆژهەلات.
خایه (ف): هێلکەی مریشك و پەلەوەری وا، هێلکەگون.
خایەماڵی (ف): ماڵین و پاککردنەوەی هێلکەگون، کینایەیه لە مەرایی کردن.
خرس‌خوو (ف): خووی وەك خووی ورچ.
خستنەڕێ: ڕەوانەکردن.
خشپه: خشه و جووڵەی کەم.
خضر (ع): خدری زینده، گوایه وەلی بووه و ئاوی ژیانی خواردووەتەوه.
خضروار (ف): وەك خدری زینده، نەمر.

خلْخاڵ (ع): ئەڵقەی زێڕ و زیوی پێی ئافرەت.
خمخۆرك: قلێش و درزی ڕووی ئەرز.
خوابگاه (ف): جێخەو.
خواجانشین: ڕاڕەوی دەروازەی خانووی زوو که سەری کەوانی و خواری پێپلکەیه به نێوان دوو سەکۆدا بۆ سەرەوه.
خوارکشان (ف): بەرەوخوار کێشان.
خواستن: ویستن.
خوان (ع): سفره.
خوانساری (ف): خوانسالاری، سەرپەرشتیی سفره و خوانی ماڵەگەوران، سەرۆکاریی چێشتخانه. (خوانسار)یش کارەکه دەکا.
خوانەمیهمان (ف): میوانی سەر سفره و خوان.
خوتەن: شارێکی گەورەی تورکستانی چین (سینکیانگ).
خود (ف): خۆ- ذات.
خودئارایی (ف): خۆڕازاندنەوه.
خوداڕوو: خوداڕۆ، خودایه بمرێ و ڕۆڕۆی بۆ بکرێ.
خوداوەند (ف): خودا.
خودڕا: خۆسەر، تاکڕەو.
خوردسال، خوردەسال (ف): تەمەنْدرێژ و پەڕپووت.
خوردەبینان (ف): وردبینان، زیرەکان.
خوڕڕەم (ف): خۆش و شاد.
خوڕڕەمبەهار (ف): بەهاری خۆش و شاد.
خوڕڕەمدەوڵەت (ف): دەوڵەتێکی خۆش و شاد.
خورسەند (ف): شاد و دڵخۆش.

خورشید (ف): خۆر.
خۆرش (ف): خواردن، پێخۆر.
خوسرەو (ف): هەر پادشایەکی دادپەروەر، خوسرەوی پەروێزی یەکێ لە ناودارترین پادشایانی ساسانی.
خوسرەوی خاوەر (ف): پادشای ڕۆژهەڵات، کینایەیە لە خۆر.
خوسرەوی خووبان (ف): پادشای پادشایان، شای جوانان.
خۆشا (ف): ئای کە خۆشە!
خۆشبەز (ف): خۆشڕەوت.
خۆشخوانی (ف): خۆشخوێنی، خوێندن بە ئاوازێکی خۆش، وەك خوێندنەوەی شیعر یا گۆرانیوتن بە دەنگێکی خۆش، یان خوێندنی بولبول و پەلەوەریتر.
خۆشخەبەر (ف): هەواڵیخۆشهێن.
خۆشڕەنگ (ف): جوان.
خۆشڕەوش (ف): خۆشڕەوت، بەلارولەنجە.
خوشك (ف): وشك.
خوشکیدە (ف): وشکەوەبوو.
خۆشنوما (ف): دیمەنجوان.
خۆشنوودی (ف): شادمانی.
خوطوور هاتن: بیرلێکردنەوە، بەدڵداهاتن.
خۆفناك (ف): ترساو، ترسناك و مایەی مەترسی.
خول: سووڕان.
خولد (ع): مەبەست بەهەشتە.
خوڵمار: خورماڵ، لە ناوچەی (هەڵەبجە)ی سلێمانییە.
خولوود (ع): نەمری.
خومار (ف): مەست، سەرئێشەی پاش خواردنەوە و سەرخۆشی.
خوماردیدە (ف): چاومەست، چاوی بەخومار.
خومرە: خوم، کووپەی شەراب.
خوود: تاسکڵاوی جەنگ.
خووصەنعان (ف): ڕەوشت وەك هی شێخی صەنعانی لەدینوەرگەڕاوی سەرگەردان.
خووگ: بەراز.
خووگدەم (ف–ك): دەم وەك دەمی بەراز.
خووگصیفەت(ع–ف): بەکردەوە وەك بەراز.
خوونئالوود (ف): لەخوێنهەڵکێشراو، خەڵتانی خوێن، خوێناوی.
خوونبەست: خوێنخۆشکەر، مەسڵەتکەر.
خوونبەها (ف): خوێنبایی، نرخی خوێن، نرخ.
خوونچەکان (ف): خوێنلێتکان.
خوونڕەس (ف): پەرۆشی خوێنخواردنەوە، خوێنخۆرەوە.
خوونرێزی (ف): خوێنرێژی.
خوونفشان (ف): خوێنفرێدەر، خوێنپرژێن.
خوونیهەوەس (ف): ئارەزوومەندی خوێنڕشتن.
خوێشخۆ (ف–ك): خزمخۆر.
خەبط (ع): تێکدان، سەرلێتێکچوون، تێکەڵوپێکەڵکردنی قسە.
خەتا (ف): نەك خەطا، شارێکە لە سەرووی وڵاتی چین، کە مەنشۆریا و مەغۆلستان دەگرێتەوە.

خەجاڵەت گرتن (ع–ك): شەرمەزاربوون، تەریق‌بوونەوە، ڕوزەردی.
خەجڵین: شەرمەزاربوون. لە (خەجاڵەت)ی عەرەبییەوە هاتووە.
خەدەنگ: داری زۆر سەخت و پتەو و بێ‌گرێ‌وگۆڵ و ساف کە تیری ڕاستی – جگە لە نێزە و زینی ئەسپ و شتی‌تری هاوشێوە– لێ دروست دەکرێ. دەوترێ تیری خەدەنگ، یا خەدەنگ بە تەنها.
خەراب (ع): وێران.
خەرابخانە (ف): وێرانە، کاولە.
خەراج (ع): باج و داهات.
خەراك (ف): پرخەی قورگ.
خەرام (ف): لەنجە.
خەرامان (ف): بەلەنجەولار.
خەرقە (ع): بالاپۆشی دەروێش، عابا، جبە.
خەرقەئەنگووری (ف): عەبا بە ئاوی ترێ (شەراب) تەڕ و ئالوودە کراو.
خەرقەپۆش (ف): دەروێش و عەودالّ کە بەرگی هەژارانەیان لەبەردایە.
خەرگۆش (ف): کەروێشك.
خەرموهرە (ف): مووررووەکەرانە (شین‌ڕەنگ).
خەروار: سەد مەن لە وشکەدان، کینایەیە لە زۆری.
خەرمەن (ف): خەرمان.
خەرووس (ف): کەڵەشێر.
خەز (ع): ئاوریشم.
خەزان: گەلاڕێزان.
خەزەف: سواڵەت.
خەس: کاهوو.
خەستە (ف): نەخۆش.
خەشم (ف): قین.
خەطا (ع): خطأ، هەڵە، چەوتی.
خەطەربوون: سەرکردن، کورت‌هێنان، نیشان نەپێکان و ئەملاوئەولاکردنی تیر و گوللە.
خەفتان، خەفدان (ف): کراس‌زرێی جەنگ.
خەفەتخانە: خانەی خەم و خەفەت، ماڵی خەم.
خەلاقی ئەزەل (ع): یەزدان.
خەلعەت (ف): خەلات و بەرات.
خەڵوەت (ع): چلەخانە.
خەڵوەتسەرا (ف): خەڵوەتخانە، جێی بە تەنهایی دانیشتن و مانەوە بۆ خوداپەرستی و بیرکردنەوە.
خەلەخواه (ف): حەزلەخراپەکردوو.
خەلیل (ع): دۆست، ئاشنا.
خەم (ف): پێچ‌ولوول، چەماوە، کەوانی.
خەمری چلەمین: شەرابی چل‌ڕۆژە.
خەمیازە (ف): باوێشك.
خەمیدە (ف): چەمیو، چەماوە.
خەمیدەقامەت (ف): بالای چەماوە.
خەمیر (ف): هەویر.
خەندەق (ع): شەڕی نێوان موسوڵمانان و کافرانە کە موسوڵمانانی تێدا ناچار بوون –بە قسەی سەلمانی فارسی– خەندەك بە دەوری مەدینەدا لێ دەن بۆ بەربەستی کافران.

خەوەرنەق: ئەو کۆشکە جوانەی وا نوعمانی کوڕی مونذیر بۆ بەهرامی گووڕی دروست کردبوو.
خیایان (ف): شەقام.
خیانەتپیشە: ئەوی ناپاکی و خیانەتکاریی کردبێ بە پیشەی خۆی.
خیدمەت (ع): خزمەت، خزمەتکاری.
خیرس (ف): ورچ.
خیرە (ف): سەرسام.
خیرەد (ف): عەقڵ و هۆش.
خیسسەت (ع): نزمی، بوودەڵەیی.
خیصیە (ع): هێلکەگون. خیصیەتەین– هەردوو هێلکەگون.
خیطاب (ع): نامە.
خیگە: هیزەی ڕۆن، پێستەی حەیوانە کە بەتایەتی بۆ ڕۆن هەڵگرتن خۆشە دەکرێ.
خیگەی با: هیزەی با کە فووی تێ‌کرابێ.
خێو: خاوەن.

(د)

دا: هەتا.
داتراشین: داتاشین، هێڵ بە هێڵ بریندارکردن.
دادروون: دروونی پارچەیەك بەسەر پارچەیەکی‌تردا.
دادگەر (ف): دادپەروەر، بەداد.
دادوبێ‌دادی: هاوار و پاڕانەوە.
دارا: دەوڵەمەند، پارەدار.
دارۆغە: سەرۆکی پاسەوانانی شار و حەسحەسان.
دارولحوزن (ع): دار الحزن، خەفەتخانە.
دارولخیلافە (ع): دار الخلافة، سەرای حوکمداریی خەلیفە کە لە ئەستەمووڵ بووە.
داروو (ف): دەرمان.
داری تەقڵە: دارتەقڵە، دارێ کە سوار لە تەقڵە و جلیتبازیدا هەڵیدەدا و دەیگرێتەوە و لە حەوا تەقڵەی پێ دەدا، یا لە کاتی لینگدانی ئەسپدا بە پڕتاو دایدەهێنێتە ئەرز و دایدەکوتێ و کە خێرا بۆی دێتەوە، هەڵیدەکێشێتەوە یا دەیهاوێتە سوارەی خەنیمی بەرامبەری.
داستان (ف): حیکایەتی درێژی ئەفسانەیی.
داسنی: ئێزدی.
داشتن: شتن، پاککردنەوە، داشۆردنی ئاسایی، بەسەرداهاتن و ئابڕووبردن.
داگرتن: گرتنەوە، تەنینەوە، پەلهاوێشتن.
داغ: داخ، سووتاندن و نیشانەکردن.
داغدار (ف): داخلەدڵ.
داغستان: وڵاتێکی سەر بەری ڕۆژاوای دەریای خەزەر.
دام (ف): داو، تەپکە، کینایەیە لە ئەگریجەی یار.
دامنەدیو (ف–ك): داونەدیو، بەداوەوەنەبوو.
داموسك: مووی کلکی وڵاخی یەکسم.
دامەن: داوێن.

دامەنبۆسی (ف): داوێنماچ کردن.

دامەنپاکی (ف): داوێنپاکی.

دامەنداتەکاندن: دامەن– چمکی کەوا و کراسە، داوێن، داتەکاندن– ڕاپسکاندن و ڕێنەدان بە دەست تا لێی گیر بێ. کینایەیە لە دەستلێهەڵگرتن و خۆدوورخستنەوە.

دامەنسیا (ف): چوارپەل ڕەش.

دامەنگرتن: گرتنی داوێن، پێوەپابەندبوون.

دانا: ژیر.

دانش (ف): زانست.

دانگ: شەشیەکی مسقاڵ، هەشت حەببە، بۆ کێشانەی زێڕ و زیو بەکاردەهێنرێ، شەشیەکی موڵك یا پارەیشە.

دانە: یەك، خاڵ، کینایەیە لە کەم.

داوەشین: دارزان.

داهۆڵ: پەیکەرێکی لە دار و پەڕۆ و شتیوای دانراو لەناو مەزرا بۆ ترساندنی باڵندە و جانەوەر.

درازی (ف): درێژی.

درەفش (ف): درەوش، لە چەرمکاریدا بەکاردێ و یاریدەی زوو بەکارهێنانی دەزوو دەدا.

درشت: زبر، گەورە.

درێغا (ف): بەداخەوە، مخابن.

دزلی: دێیەکی ناوچەی (سەید صادق) بەودیوی چیای سوورکێودا.

دڵئازار: بێزارکەری دڵ، کینایەیە لە یاری ستەمکار.

دڵئەندووختە (ف): دڵداگیرساو و گڕگرتوو.

دڵرِوبایی (ف): دڵکێشی، دڵفڕێنی.

دڵا: دلا، ئەی دڵ.

دڵارا (ف): دڵفڕێن.

دڵارام (ف): دڵئارامکەرەوە، کینایەیە لە یار.

دلاوەر (ف): قارەمان، ئازا و جەنگاوەر و جەربەزە.

دڵاوێز (ف): دڵخواز خۆشەویست، پەسەند و جوان و دڵنشین.

دڵجۆ: دڵخواز، چی دڵ بە دوایدا بگەڕێ.

دڵدادە (ف): دڵداو بە یار.

دڵدۆز: دڵکونکەر، دڵسم.

دڵسەخت: دڵرەق.

دڵسەردی (ف): دڵساردی.

دڵستان (ف): دڵبەر، دڵستێن، دڵفڕێن.

دڵسەنج (ف): بەدڵوەزنکراو.

دڵشکەن: دڵشکێن.

دڵغەمین (ف): دڵناخۆش و خەمبار.

دڵفگار (ف): دڵنەخۆش.

دڵگوشا (ف): دڵکراوە، مایەی دڵخۆشی.

دڵنەوازی (ف): دڵدانەوە.

دوختەر (ف): کچ.

دوختەری ڕەز: کچی مێو، شەرابی ترێ.

دورج (ف): قوتووی متوموورووی بەنرخ.

دوڕڕە (ع): عاصاکەی حەزرەتی عومەر (خ.ڕ).

دوڕڕی یەتیم: مرواریی تاقانەی درشت.

درة التاج (ع): گەوهەری تاجی سەر، کینایەیە لە بەرزی و ڕێزلێگیراوی.

دوزدجۆ (ف): بەدوایدزداگەڕاو، حەسحەس.
دۆش (ف): دویٚشەو، شان.
دۆشان: دێیەکی سەر بە شاری (سنە) لە کوردستانی ئێران.
دوشمنڕەوش (ف): دوژمنانە ڕەفتارکردوو.
دوشنام (ف): جنێو، ناوی خراپ.
دوعاخوان (ف): دوعاخوێن، دوعای خێرکەر.
دۆکەرۆ: دێیەکی ناوچەی (قەرەداخ) لە سلێمانی.
دۆلان: دێیەکی ناوچەی (قەرەداخ) لە سلێمانی.
دوم (ف): کلك.
دۆم: خەڵکێك بوون، جاران کڵاشی پەڕۆ و بێژنگ و هێڵەك و شتیوایان دروست دەکرد.
دومادوم (ف): یەك لەدوای یەك، بێبڕانەوە.
دۆمەژن: ژنی دۆم.
دوو: کلك.
دووئەسپە (ف): عەرەبانە، کینایەیە لە خێرایی.
دووبڕصیفەت (ك-ع): دوو ساڵ تەمەن بڕیو یا (دۆبڕصیفەت)ە، یانێ ناشوکور و بوونە مایەی دۆبڕین.
دوود (ف): دووکەڵ.
دوودمان (ف): خانەدان.
دوودی ئاه (ف): دووکەڵی ئاه و ناڵە. کینایەیە لەوپەڕی خەفەتباری و پەرێشانی.
دوودی هەناسە (ف-ك): دووکەڵی هەناسەی ئەنجامی هەڵقرچانی دڵ و خەم و پەژارەیەکی زۆر.
دووربین: کەسێ لە هەموو کارێکدا ڕەچاوی لایەنەکانیان بکا و دوور بڕوانێ، ئەو ئامێرە کە شتی دووری پێ نزیك دەکرێتەوە.
دووشەش: زۆرترین خاڵ هێنانە لە نەردێندا کە نیشانەی بردنەوە و بەختیاربوونە.
دوون (ع): نزم، بەدخوو.
دوونپەروەر (ف): حەزبەنزمیکردوو.
دوونهیممەت (ف): ورەڕووخاو.
دوونیـەت (ع): ئاستنزمی و بێنرخی، یان (دوو نییەت) بە مانای دوو نیاز و ئامانج.
دووهەفتەمەه (ف): مانگی چواردە.
دەباشان: دێیەکی نزیکی شاری سلێمانی.
دەجلە: ڕووباری دیجلە.
دەربچە (ف): دەرگای بچووك، دەریچە (پەنجەرە).
دەرخۆر (ف): شایان، لایەق.
دەردان: دادان و دەڵاندن، دەرکەوتنی نیشانەی وەك تلۆق و برین و شتیوا لەسەر ڕووی لەش.
دەردەروون (ف): لە دەرەوە بۆ ناوەوە.
دەردەم (ف): گورج، دەمودەست، هاوزەمان.
دەرڕاجخەرام (ف): ڕەوت و لەنجە وەك پۆڕ.
دەرەك (ع): دۆزەخ.
دەرزەمان (ف): گورج، هاوکات.
دەرزیباشی (ت): تەرزیباشی، باشخەیات، سەروەستای بەرگدرووەکان.
دەرك: دەرگا، زارك.
دەرگانە: دەرگا.

دەرگوشا (ف): دەرگاکەرەوە، خۆشەوەکەرە.
دەرگەه: دەرگا.
دەرهەم (ف): شێواو و ژاکاو.
دەروون (ف): ناوەوە.
دەروونسەودایی (ف): سەودا و عەشقی لە ناوەوە یا ژێربەژێر.
دەستئامووز (ف): دەستپەروەردە.
دەستتەهی (ف): دەستبەتاڵ.
دەستدان: گونجان، ڕێکهاتنەوە.
دەستزەن (ف): دەستلێدان.
دەستکەش (ف): دەستڕاکێش، دەستگر.
دەستکەوت: ئەوەی کە بەدەست دەهێنرێ.
دەستگاه (ف): ئاسنێکی سەرپانی نیمچەچەماوەیە، کەوشدروو و کڵاشکەر لە بەردەستی خۆیاندا دایدەکوتن و تیلمەقایش و شتیوای پێ دەبڕن و ڕێکدەکەن.
دەستوبردی: گورجوگۆڵی.
دەستوخەنجەر: دەست بەخەنجەرەوە.
دەستوداری کوێری: دەستگرتن و داری کوێری بەکارهێنان لە ڕۆیشتندا.
دەستوشەمشێر: دەستی شمشێرهەڵگرتوو.
دەستوگەریبان (ف): دەستەویەخە.
دەستوور: فەرمان، ئەمر.
دەستی خەیاڵ: دەستێك کە ڕاستەقینە نییە و هەر بە خەیاڵ و لە بیرکردنەوەدایە، کینایەیە لە ئەوپەڕی پەرۆشی و تامەزرۆیی.
دەستی قودرەت (ف): کینایەیە لە خودا.
دەستی قەضا (ف): چارەنووس، خودا.
دەشتی زەڵێ: دەشتێکی ناوچەی (بەرزنجە) لە سلێمانی.
دەشنە (ف): جۆرە کێرد یا خەنجەرێکی بچووکە، دەمی تیغی بەرز و نووكتیژ و مشتووی کورتە بۆ دادڕین و پارچەپارچەکردنی بەتایبەتی جەستە بەکاردێ.
دەعوا (ع): شەڕ و هەرا.
دەفر: قاپ.
دەفعە (ع): جار، کەڕەت.
دەق: دێیەکی ناوچەی (دەربەندیخان) لە سلێمانی.
دەککە (ع): دووکانی بچووك.
دەلووجە: دێیەکی ناوچەی (قەرەداخ) لە سلێمانی.
دەلێن: جۆگەئاوێکی ناوچەی (شارەزوور) لە سلێمانی.
دەم: دەمی شتپێخواردن، هەناسە، خوێن، کات.
دەمبوون: دەمکێشانی چێشت.
دەمادەم (ف): هەمیشە و بەردەوام.
دەماوەند: بەرزترین لوتکەی زنجیرەچیای (ئەلبورز).
دەم بە دەم (ف): هەناسە دوای هەناسە.
دەمنە (ف): چەقەڵ.
دەنیز (ت): دەنگز، دەریا.
دەو (ف): ڕاکردن، خێرا.
دەوال (ف): تیلمەچەرمێکی باریك بۆ تەپڵلێدان.

دەوان (ف): بە ڕاکردن، بە غار.
دەوڵەت (ع): دەوڵەمەندی، دەسەڵاتداری.
دەوەران (ع): سووڕانەوە بە دەوری خۆدا.
دەهر (ع): چەرخی گەردوون.
دەهرە (ف): قەمەیەکی سەر وەك داسی مشتووئاسنە.
دەهری (ع): ئەوی باوەڕی بە ڕۆژی دوایی نەبێ و بڵێ هەر لە خۆمانەوە پەیدا دەبین و دەمرین و زیندووبوونەوە و بەهەشت و دۆزەخ نییە.
دەهەن، دەهان (ف): دەم.
دەی (ف): یەکەم مانگی زستان لە ساڵی هەتاویدا، بەفرانبار.
دەیجوور (ف): شەوی زۆر تاریك.
دەیلەم: بەشی شاخاویی وڵاتی گەیلانی باکووری قەزوین، کە هەندێکیان بوونە موسوڵمان و لە خیلافەتی عەبباسیدا کاریان کردووە.
دێبا (ف): قوماشێکی ڕەنگداری ئاوریشمینە.
دیدە (ف): چاو.
دیدەئاهوو (ف): چاومامز.
دیدەبان: کەسێکە لەسەر بەرزییەك دادەنیشێ و هەر نەناسێ بێتە ئەو شوێنە، خەبەر دەدا.
دیدەعەبهەری (ف): چاو وەك گوڵەنێرگز.
دیدەن (ف): بینین.
دیدەی دڵ (ف): چاوی دڵ، کینایەیە لە وریایی و سەربزێوی.
دیدەی مەخموور (ف): چاوی مەست.
دیرع (ع): کراسزرێی جەنگ کە جەنگاوەر بە بەر سنگی خۆیەوە دەگرێ، تا شمشێری دوژمن نەیبڕێ و تیری نەیسمێ.
دیرهەم، درەم (ع): درەم، پارەی زیو، یۆنانییە (دراخما).
دێرینە (ف): کۆن، لەمێژینە.
دێرەخەرەك: دەزگای شووم و بێفەڕی ڕستن.
دیگ (ف): مەنجەڵ.
دیگەران (ف): ئەوانیتر، بێگانان.
دیققەت (ع): وردەکارینوواندن، قسەی پڕواتا.
دێوئەردەڵان: کینایەیە لە بەهێزی و گەورەیی دەعبای پیاو.
دیواربڕ: هەر شتێ دیوار ببڕێ و کوناودەری بکا.
دێوانە (ف): شێت و پەتیارە.
دیهقان (ف): جووتیار، وەرزێر.

**(ذ)**

ذائیقە (ع): هەستی چەشتن.
ذوذەنەب (ع): ئەو ئەستێرانە کە بە شەو دەبینرێ دەکشێن و لەڕاستیدا نەیزەکن و لە ئەستێرەکە جوێ دەبنەوە، گوایە نیشانەی نەگبەتی و کارەساتە؛ کە هەرگیز ئاوا نەبێ و نەکوژێتەوە، نەگبەتییەکە زیاتر دەبێ.

ذولفیقار (ع): ئەو شمشێرە کە پێغەمبەر (د.خ) لە شەڕی (بەدر)دا دەستی کەوت. کە شیری ئیمامی عەلی لە شەڕی (ئوحود)دا شکا، پێغەمبەر ئەمەی دایێ و ئازایەتیی پێ نوواند.
ذەڕڕەئاسا (ع-ك): وەك گەرد و تەپوتۆز.
ذەڕڕەبین‌میرئات (ف): ئاوێنەی زەڕڕەبین کە شتی ورد لە بەرچاودا گەورە دەکا.
ذیکر (ع): ویرد، ناوهێنان.

ذیجەوشەن، ذي الجوشن (ع): خاوەن‌زرێ، زرێپۆش. ئەوس کوڕی ئەعوەر لە یارانی پێغەمبەر کە چووە لای کیسرا ئەنووشیروان و جەوشەنێکی لێ وەرگرت و لەبەری کرد، گوایە ئەمە ئەو "ئەبی شەمر"ەیە کە ئیمامی حوسێنی کوشتووە. جەوشەنیش بەرگێکی تایبەتیی جەنگ بووە لە ئەڵقەی ئاسن دروست کراوە و کاتی شەڕ لەبەرکراوە.

## (ڕ)

ڕاجیع (ع): پێوەند، دەگەڕێتەوە بۆ.
ڕادار (ف): ڕاهدار، پاسەوانی ڕێ، چاودێری ڕێوبان کە باجی ڕێ لە ڕێبوار و باردار وەردەگرێ.
ڕاداری ئەجەل (ف): کینایەیە لە یار.
ڕاڕفاندن: فڕاندن، لەگەڵ‌خۆبردن و دوورخستنەوە.
ڕاز: نهێنی.
ڕاستڕەو (ف): ڕاستڕۆیشتوو.
ڕاستقەد (ف): بالاّ ڕێك و قنج.
ڕافیضی (ع): شیعە، بە زاراوەی ئەهلی سوننەت.
ڕام: دەستەمۆ، ماڵی.
ڕامین (ف): دڵداری وەیسە.
ڕاوییە (ع): ئەو دەفرە کە ئاوی تێدایە.
ڕاهوڕەسم (ف): ڕێوڕەسم، داب و نەریت.
ڕاهیب (ع): تەرکی دنیاکردوو (لە غەیرەموسوڵمان).

ڕجا (ع): تکا، هیوا.
ڕستە (ف): ڕشتە، ڕیز، یان گیای ڕوواو و سەوزبوو.
ڕشتە (ف): چەند تاڵەدەزووی بادراو، ڕێسراو.
ڕملی ئەمەل (ع): لمی هیوا، کینایەیە لەوپەڕی بەتەماعی و چاولەڕێبوون کە هیوای تێدا بووەتە لم و کاتێ بە چاودا دەپرژێ، نابینای دەکا.
ڕوئیەت (ع): بینین.
ڕۆبردن: بردنە ناو، خستنە ناو.
ڕوجووع (ع): گەڕانەوە.
ڕۆحبەدەربردن: گیان‌دەرنەچوون، دۆخی کەسێ کە گیان دەرببا و خۆی ڕابگرێ.
روح الأمين (ع): جوبرائیلی فریشتەی خودا کە سرووشی خوداوەندی گەیاندە حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ).
ڕوخ (ف): ڕوومەت؛ گیاندارێکی وەك عەنقایە، ناوی هەیە و ناوکەی نییە. دەڵێن ئەوەندە

زەبەلاحە فیل و کەرکەدەن دەداتە بێچووەکانی؛ قەلا، داشێکی شێوە بورجی شەترەنجە، بە شێوەی ئاسۆیی و ستوونیش دەجوولێ.
ڕۆزگار (ف): ڕۆژگار.
ڕۆزەدار (ف): ڕۆژووەوان.
ڕوکناباد (ف): سەیرانگایەکی خۆشی شاری شیراز بووە.
ڕۆم: ولاتی ڕۆم (تورك)، کینایەیە لە پێستی سپی.
ڕۆمی: تورك.
ڕۆنیشتن: دانیشتن.
ڕووبەرقەفا (ف): ڕووبەرەودوا وەرگەڕاو، پشتاوپشت. (قەفا)کەی عەرەبییە.
ڕووبەندە (ف): چارشێو.
ڕووبەهی (ف): ڕێویێتی، کردەوەی فێڵبازانە.
ڕووبینتەن (ف): لەشپۆلا، ناسناوی ئەسفەندیاریشە، کینایەیە لە بەهێزی.
ڕووسەختەدڵ: دڵی سەربەرز و ڕووسوور یا ڕووقایم و بێشەرم.
ڕووسەختی: بێشەرمی، ڕووسووری.
ڕووگەرمی: ڕووی پڕ لە قین، یا خولقی زۆر نوواندن.
ڕوولەڕوومالین: پێکەوەبوون، بەیەکەوە هەلکردن و گونجان.
ڕەحم (ع): بەری ئافرەت.
ڕەخت: فیشەکدان.
ڕەخت خواب (ف): تەختی خەوتن.
ڕەخش (ف): ئەسپەکەی ڕۆستەمی زاڵ.
ڕەخشان (ف): درەوشاوە، ڕازاوە.
ڕەخنە (ف): کون و کەلەبەر، شکستە، عەیبداری. ڕەخنەها– کۆی (ڕەخنە)یە.
ڕەد (ع): دەستبەڕووەوەنان، جێبەجێنەکردنی داخوازی.
ڕەدبردن: پاشەکشەکردن و دوورکەوتنەوە، سەرەنگرێبوون، ڕەتەڵبردن، هەڵەنگووتن.
ڕەزامەند: ڕازی.
ڕەزم (ف): شەڕ و جەنگ و هەرا.
ڕەزمازوما (ف): رزم آزما، شەڕتاقیکردووەوە.
ڕەسم: شێوە و نەریت.
ڕەسووڵ: برای مەحموود ئاغای شێوەکەڵ.
ڕەش: کینایەیە لە پاشەوەی مرۆڤ.
ڕەشبەچە: بەچکەی ڕەش، لەڕەشبوو.
ڕەشحە (ف): ئارەق، جواناو.
ڕەشك (ف): ئیرەیی، حەسوودی و بەخیلی.
ڕەشید: ڕەشید ئاغای مووبرەی کوڕی مەحموود ئاغای شێوەکەڵ.
ڕەضامەند (ع–ك): ڕەزامەند، قایل.
ڕەطلی سەبوك (ف): جامی بچووکی شەراب.
ڕەعدصەدا (ع–ف): دەنگی وەك چەخماخە بەرز و بەگرموهووڕ.
ڕەعنا (ع): بەرز و هەڵچوو.
ڕەغم (ع): سەرباری ئەوە.
ڕەف: جنێودان، ڕەنگە لە (رفض)ەوە هاتبێ.
ڕەفع (ع): هەڵگرتن و لابردن.
ڕەفعی جووع (ع): خۆتێرکردن.

ڕەفووکردن (ف): چاككردنەوە و چنینەوەی قوماشی دڕاو، ڕەووافی ئەمڕۆ.
ڕەفیق (ع): هاوڕێ.
ڕەقص (ع): سەما، هەڵپەڕکێ.
ڕەقصین: سووڕدان و سەما کردن، سووڕانەوە.
ڕەقەمکردن (ع-ك): نووسین.
ڕەقیب (ع): بەدکار، نەیار.
ڕەگ: دەمار.
ڕەمکردن (ف-ك): سڵەمینەوە و هەڵاتن.
ڕەمەق (ع): نیوەگیان.
ڕەنجش (ف): ئازاردان، ڕەنجان.
ڕەنجووری (ف): دەردەداری و نەخۆشی، دڵتەنگی.
ڕەنجیدە (ف): ئازاردراو، خەمبار، زویر.
ڕەند (ف): قۆشمە، دێوانە، فێڵباز.
ڕەنگپەریدە (ف): ڕەنگ بەڕووەوەنەماو.
ڕەنگجانەوەر: ڕەنگ وەك دڕندەی کێوی.
ڕەنگدۆم: ڕەنگوڕوو ناشیرینی وەك دۆم.
ڕەنگرێژی دەوران: خودا، کە ڕەنگی کاروباری ڕۆژگاری ڕشتووە.
ڕەنگزیندۆز (ف): ڕەنگی مردوو لێنیشتوو.
ڕەوان (ف): گیان، ڕاست، لەبەرڕۆیشتوو.
ڕەوت: ڕۆیشتن.
ڕەوتکەمتیار: ڕۆیین و جووڵەی وەك هی کەمتیار.
ڕەوزەن (ف): شەبەق، ڕۆژنە، هەر کونێك لە دیواری خانوو یا بنمیچ کە ڕووناکی و هەتاوی لێ بێتە ژوورەوە.
ڕەوش: شێوە و چۆنایەتیی هەڵسوکەوت.
ڕەوشەنبناگۆش (ف): بناگوێی ڕۆشن.
ڕەونەق: جوانی، گەشاوەیی.
ڕەه (ف): ڕێ.
ڕەها (ف): بەرەڵڵا.
ڕەهجۆ (ف): بەدوای ڕێدا گەڕاو.
ڕەهڕەو (ف): ڕێبوار، بەڕێداڕۆیشتوو.
ڕەهزەن (ف): ڕێگر، جەردە.
ڕەهگوزار (ف): ڕێ، ڕێی تێپەڕین، ڕێبوار.
ڕەهوار (ف): ئەسپی خۆشڕەو و هەنگاوفراوان.
ڕەهەندە (ف): دەربەدەر، ئاوارە.
ڕەی: شارێکی کۆنی باشووری ڕۆژهەڵاتی (تاران) لە ئێران.
ڕەیحان (ع): ڕێحان.
ڕیاڵ: دراوێکی زیویی قاجاریی هاوتای ١٢٥ دینار بووە، لە ئاخروئۆخری حوکمی قاجاریدا کردوویەتیە قرانێك و پێنج شاهی.
ڕیان: دانیشتن لە پێشاودا، پیسایی‌کردن.
ڕیتن: ڕشتن.
ڕیحلەت (ع): کۆچ، کینایەیە لە مردن.
ڕیسوا: سووك و ناوزڕاو.
ڕیشبۆز: ڕەنگی ڕیش تێکەڵ لە ڕەش و سپی.
ڕیشوە (ع): بەرتیل، پارەیەك بدرێ بۆ تێپەڕاندنی ناهەقی و بەژێرپێوەکردنی مافی کەسیتر.
ڕیشەکەنیو: ڕەگهەڵکێشراو.
ڕێش (ف): بریندار.
ڕێکاب: ئاوزەنگی، ئەو پیاوانەی هاوڕێی سوارن بۆ ڕێزلێگرتنی.

زاج (ع): زاخ، ماددەیەکی بلووریني ڕەنگ جێگیرکەرە کە نەچێتەوە و جۆری زۆرە؛ هەیەتی سپیە، ئاوی لێ بکەوێ، ڕەش دەبێ.
زاخە: زاغە، چوار دیواری تەنگ و پەڕپووتی جێی ژیانی کۆچەران و هەژاران، عەماری ژێرزەمین، تەویلە، ئەشکەوت.
زاد (ف): لەدایكبوون، دەوترێ زاد و مەرگ.
زار (ف): نەخۆش، لاواز.
زاری (ف): بەکوڵگریان.
زاغ (ف): قەلەڕەش.
زاڵ: باوکی ڕۆستەم، پیر.
زانوو (ف): ئەژنۆ.
زگ: سك، سكوزا، دووگیانی.
زمڕووت: بەردێکی گرانبەهای زۆر سەوزە، مار بۆی بڕوانێ کوێر دەبێ.
زمستان (ف): زستان.
زۆپین (ف): کوڕی کەیکاوس، نێزەی بچووکی دووفلیقانە کە ئەمەوێش لە جەنگدا بەکار هاتووە.
زوڕناسەر: سەر وەك زوڕنا، کینایەیە دەعباکەی پیاوە.
زۆر (ف): هێز و توانایی.
زۆرئاوەر (ف): زۆربۆهێن، تەنگپێهەڵچن، توانا، پاڵەوان و بەهێز.
زۆرخانە: جێی زۆرانگرتن.
زولەیخا: کچی تیمۆسی پادشای مەغریب و ژنی فۆتیفاری عەزیزی وڵاتی میسر. شەیدای حەزرەتی یووسف بوو. کە ملی بۆ نەدا و لە دەستی هەڵات، دووی کەوت و کراسەکەیی لە پشتەوە دڕاند. هەرچەندە قسەکەی ڕاست دەرنەچوو کە یووسف پەلاماری داوە، کەچی یووسف خرایە زیندان. کە یووسف بووە عەزیزی میسر، زولەیخا نەدار و کوێر بووبوو. زولەیخا هاتە سەر دینی یووسف و گەنج بووەوە و دواجار بوو بە هاوسەری یووسف.
زومڕرودڕەنگ (ف): ڕەنگ وەك بەردی زمڕوت.
زوننار: ملەوانەیەکە بە خاچەوە مەسیحییان لە ملی دەکەن، یا کەمەربەندی مەسیحییان کە بۆ خۆجوێکردنەوە لە موسوڵمانان لە پشتی دەبەستن، یان کەمەربەندی پشتی زەردەشتییان.
زوهرە: یەکێکە لە حەوت ئەستێرە گەڕۆکەکان، جوانە و چاوی جوانی یاری پێ دەشوبهێنرێ.
زوودڕەنج (ف): زووتۆراو، گورج تووڕەبێهەستاو.
زوور (ف): زۆر و دەسەڵات، ستەم.
زوهرەچەشم (ف): چاو ڕۆشن وەك ئەستێرەی زوهرە.
زەبوونگیرکردن: بەداماویگرتن، ئازاردانی کەسی بێهێز و ستەملێکراو.
زەبیبطەبع (ع): تەبیعەتمێوژی، کینایەیە لە کورد.

زەخیم (ف): ضخیم، ئەستوور، بە جورم قەبە و گەورە.
زەردگۆشئاسا (ف-ك): وەك دووڕوو.
زەڕڕەسان (ف): ذرەسان، وەك گەرد و تۆز، کینایەیە لە دەستەپاچەیی و بێهێزی.
زەڕڕین (ف): زێڕین، ئاڵتوونی.
زەڕڕینکەمەر (ف): پشتێنزێڕین.
زەرگ: جۆرێ نێزەی سێسووچی باریکی کورت، دەروێشیش بەکاری دێنێ.
زەرنیشان (ف): تاڵ یا وردەزێڕ پێوەنراو.
زەغەن (ف): کۆلارە، مشکخۆرە، بازێکی چکۆلەی کلك دووفلیقانەی چابوکی ڕاوکەری مشك و جرج و باڵندەی بچووکە.
زەقووم (ع): هەر خواردنێ ئینسان بکوژێ، ژەهر.
زەمزەمە (ف): دەنگەدەنگ و هەرا، سروود و گۆرانی، نارەنار، ورتەورتی ئەسپایی.
زەن (ف): ژن.
زەنبوور (ف): زەردەواڵە.
زەند: باسك، بازوو، کتێبی ئاڤێستای زەردەشت.
زەنگار (ف): ژەنگ، سوورێکی ئەرژەنگیی ناشیرین.

زەنگی (ف): ڕەشپێست.
زەنەخدان (ف): چەناگە.
زەنەخسیمین (ف): ژێرچەناگە زیزینی سپیوسۆڵ.
زەوار: کاروان.
زەوجە (ع): ژنی مێرد، هاوسەر.
زەورەق (ع): بەلەم، کەشتیی بچووك.
زەهرنۆش (ف): ژەهرخۆرەوە.
زەهرئالوود (ف): ژەهراوی، تێکەڵ بە ژەهر.
زەیدۆمەر: دێـەکی ناوچەی (قەرەداخ) لە سلێمانی.
زێبا (ف): جوان.
زیین: ڕازانەوە و جوانبوون.
زیر و زگار (ف): خەمبار.
زیروزەبەر (ف): ژێروژوور.
زیشت (ف): ناشیرین.
زیشتبین (ف): ناشیرین و دزێو بین.
زیشتڕوو (ف): ڕوومەت ناشیرین.
زیمام (ع): جڵەو.
زینەت (ع): جوانی، ڕازانەوە.
زێوەر (ف): هەرچییەك شتێ یا کەسێکی پی برازێنرێتەوە، بە تایبەتی ئەوەی کە ژنان بۆ جوانی بە خۆوەی دەکەن، وەستای زیو.

(ژ)

ژوولیدە (ف): تێکەڵوپێکەڵ و ئاڵۆز.
ژەرف (ف): قووڵ.
ژێرقەپۆز: ژێرچەناگە.

ژیشكبەدەن (ك-ع): لەش وەك ژیشك دڕکاوی و زبر.

# (س)

سابرێن: نێری بزن.
سابرێنڕیش: ڕیش لە وێنەی مووی چەناگەی نێرەبزن.
ساتمەزەن: زۆر هەڵەنگووتوو لە ڕۆیینـدا، ڕەتەڵبردوو، سەرسەمداو.
ساحیرنەژاد (ف): بە ڕەچەڵەك جادووگەر.
ساحیل (ع): کەناری دەریا.
سادە (ف): لاوی موولێتەهاتوو، کەسی خۆئارایش‌داو، نەزان و گەمژە، کۆسە.
سارەنگ (ف): سێروو، باڵـندەیەکی خۆش‌ئاوازی بچووکە، پەڕی ڕەش و خاڵ‌خاڵ سپییە.
ساز: هەر جۆرێکی ئامێری مۆسیقای وەك عوود و بلوێر و .. تاد.
سازش (ف): گونجان، گونجاندن.
سازندە (ف): مۆسیقاژەن، سازلێدەر، زوڕناژەن.
ساعەتەن (ع): هاوزەمان، لەو ئانوساتەدا.
ساغەر (ف): پیاڵەی مەی.
ساق (ع): لوولاقی قاچ.
ساقی (ع): مەیگێڕ، ئاوگێڕ، کینایەیە لە یار.
ساڵخوردە (ف): پیر و کەنەفت کە تەمەنی درێژ خواردوویەتی.
سالم (ع): ناسناوی عەبدوڕڕەحمان بەگی صاحێبقران، سەلامەت.
سالیك (ع): ڕێگرتوو، ڕێبوار، سۆفی و مورید.

سام (ف): پاڵـەوانێکی سیستانیی کوڕی نەریمان و نەوەی گرشاسپ بووە.
سامان (ف): ڕێکخستن و ئارایش‌کردن، دارایی.
سامیعە (ع): گوێ.
سان (ف): وەك.
ساودان: لەهەساندان، تیژکردن.
ساوە: دەریاچەیەکی خوارووی عیراق بووە، هەموو ساڵێك یەکێکی تێدا خنکێنراوە تا لافاو نەکا، شەوی لەدایکبوونی پێغەمبەر (د.خ) ڕۆچووە.
ستارە (ف): ئەستێرە.
ستەمدیدە (ف): ستەمدیو، زۆرلێکراو.
ستێزەدان (ف): هەڵخراندن و هاندان، شەڕپێفرۆشتن.
سرپۆشی (ف): نهێنی‌شاردنەوە.
سروشت: خولْقاندن، هێنانەبوون.
سروشك (ف): فرمێسك.
سروشکی شۆر (ف): فرمێسکی سوێر و پڕخوێ، کینایەیە لە پەرۆشی.
سرووش (ف): پەیامی ئاسمانی، وحي.
سستەك: هەر گیاندارێکی بەگشتی سست و خاو لە جووڵەدا.
سستڕەو (ك-ف): سستڕۆ، بە هێواشی ڕۆیشتوو.
سفرەصیفەت (ع-ف): وەك سفرە و خوان.
سفید (ف): سپی.

سککەلێدان (ع-ك): دراو دروستکردن، کینایەیە لە نەمری و مانەوە.

سڵ: سرك، ترساو.

سمکۆڵ: سمی دوو پەلی پێشەوە بەزەویداکوتانی ولاخی بەرزە و زەوی هەڵکۆڵینی.

سنك: ئەو پەتەی کە دەخرێتە ملی سەگ و پێی دەبەسترێتەوە.

سنە، سەنەندوج: شارێکی کوردستانی ئێران.

سوپای بەرگەشتە (ف): سوپای هەڵگەڕاوە، کینایەیە لە برژانگی درێژ و هەڵگەڕاوە.

سوجدە (ع): کڕنووش.

سوجدەجۆ (ف): حەزکردوو لە کڕنووش-بردن.

سوجدەکونان (ف): کڕنووشبەرانە.

سوخەن (ف): قسە.

سوودکردن: قازانجکردن، کەڵكوەرگرتن.

سوراخ (ف): کون.

سورب (ف): قوڕقوشم.

سورمە: کلی چاو.

سورمەسا (ف): بە کل ڕێژراو.

سۆزەندە (ف): مایەی سووتاندن.

سۆفیلەر: ساغ نەبووەوە لە کوێیە؟ ڕەنگە یەکێ بێ لەو دێیانە کە ئێستا نەماون.

سوقاق (ف): ڕێگە و کۆڵان. لە (زوقاق)ی عەرەبییەوەیە.

سوکووبا: خوداپەرستێکی بەناووبانگی گاور بووە.

سوڵـــطانی (ع): شاهانە.

سوڵـــطانیخەیاڵ: شوبهاندنیخەیاڵ بە سوڵتان، نیشانەی بەندایەتیی عاشقە لە بەردەم دڵبەردا.

سولەیمان: بچووکترین کوڕی داوود پێغەمبەرە. خودا مەردوم و جنۆکەی خستنە ژێر ڕکێفی. قاڵیچەی هەبووە و مەلان سێبەریان بەسەریەوە کردووە.

سولووك (ع): گرتنەبەری ڕێی سۆفیەتی، تەریقەت.

سولەیمانی: شاری سلێمانی کە ساڵی ١٢٠٠ك (١٧٨٥-١٧٨٦ز) بنیات نراوە و پایتەختی میرایەتیی بابان بووە تا ١٨٥٠، کە ڕووخا. ئەوەبەدوا لە سایەی حوکمی عوسمانیدا بووە لیوایەکی -سەرەتا- سەر بە ویلایەتی شارەزوور و پاشان -لە ١٨٧٩وە- ویلایەتی مووسڵ تا ١٩١٨، کە دەسەڵاتی عوسمانیی لەسەر پێچرایەوە. تا تەمووزی ١٩٢٤ - کەموزۆر- حوکمداریی شێخ مەحموود و حوکمی ئینگلیز بەڕێوەیان برد. پاشتر بووە لیوایەکی سەر بە حکوومەتی عیراق.

سونبول: گیایەکی بۆنخۆشە، زوڵفی یاری پێ دەشوبهێنرێ.

سونبولزار (ف): جاڕی سونبول وەك بڵێی گوڵزار.

سونبولستان (ف): جاڕی گوڵە سونبول.

سونگی: قەمە.

سوننەت: وتە و کردار و بڕیاری پێغەمبەری ئیسلام.

سوو (ف): لا، بەرەو.

سووچەڕمەکان (ك–ع): سووچەڕ (سیخوڕ)یشی پێ دەوترێ و لە ژیشك گەورەترە. جێی لە کونی سووچەڕ دەچێ.

سووختەدڵ (ف): دڵسووتاو، دڵشکاو.

سووختەطوور (ف): کێوی سووتاوی توور.

سوور (ف): شایی.

سووورداش: ناوچەیەکی باکووری ڕۆژاوای شاری سلێمانی.

سووزاندن: سووتاندن.

سووگواری (ف): پرسە و ماتەمینی.

سووهان (ف): بڕبەند هەسان، زبرەبەردێکی سووکەڵە بۆ تیژکردنەوە.

سووهانزەدە (ف): بە بڕبەند ڕنراو و سافکراو و تیژکراو .

سەبعەیی قوڕرا (القّراء السبعة): حەوت مامۆستاکەی قورئانخوێنی سەرەتای ئیسلامەتی کە لە تەجوید و خوێندنەوەی قورئاندا ئاماژەیان پێدەدرێ و هەریەکەیان ڕێبازێکی تایبەتیی هەیە.

سەبك (ع): جۆر، تەرز و شێوەی داڕشتن (شێواز لە ئەدەبدا).

سەبوکبار (ف): بارسووك، بێنرخ، ئاسوودە و بێخەم.

سەبوکرەو (ف): چابوك، تیژڕۆ.

سەبوکتەر (ف): سووکتر.

سەبوكعەقڵ (ف): عەقڵسووك، گەمژە.

سەبەق (لێبردن) (ع): لێپێش کەوتن، گرەولێبردنەوە.

سەحاب (ع): هەور.

سەحەرگەھ (ف): کاتی بەرەبەیان.

سەختجان (ف): گیانقایم، گیانی لە جێیەکی عاسی و سەختدایە و دەرناچێ.

سەختڕوویی (ف): ڕووقایمی، سەرسەختی، بێعری و گوێبەهیچنەدەری.

سەختگیریکردن: سەرسەختینوواندن.

سەخیطەبع (ع–ك): بەدەستودڵ، دڵفراوان، بەخشندە.

سەددە (ع): بەربەست.

سەرا: یانە.

سەراب (ع): تراویلکە، ئاوەلینە.

سەراپا: هەموو.

سەراسەر: هەموو.

سەراسیمە (ف): سەرگەردان، پەشێوحاڵ.

سەربلووك (ت): سەردەستە، سەرۆکی بلووك (سریە)ێك سەرباز.

سەربوڕەهنە (ف): سەرڕووت.

سەربولەند (ف): سەربەرز.

سەربەستە (ف): سەرداپۆشراو، پەنهان.

سەربەسەر (ف): بەتەواوی، هەمووی.

سەرپاك: هەموو.

سەرپەتی: سەرڕووت.

سەرچنار: هاوینەهەوارێکی ڕۆژاوای شاری سلێمانی.

سەرچەشمە (ف): سەرچاوە، کانیاو.

سەرحەد (ف): سنوور.

سەرحیساب: حیسابۆکراو، حیسابڕاگر، ئاگادار.
سەرخووسێن: هەرچی سەر تەڕ و نەرم بکا.
سەرخەڕەك: سەری لە شێوەی دەزگای خەڕەکی خوریڕستنە.
سەردەشت: شارێکی کوردستانی ئێران.
سەرڕاج (ع): وەستای زیندروو.
سەرڕشته (ف): سەرەداو، جەمسەر.
سەرزەغەن (ف): سەر هێندەی سەری باڵندەی کۆلارە.
سەرسم: بەدەمداکەوتن، هەڵنووتان.
سەرسەبوك (ف): سەرسووك، ئاسوودە.
سەرطان (ع): سەرەطان، چوارەم کەلووی هەر دوازدە کەلووی ئاسمان، چوارەم مانگی ساڵی هەتاوی و یەکەم مانگی وەرزی هاوین، پووشپەڕ.
سەرفراز (ف): سەربەرز، گەردنکەش، ڕزگاربوو.
سەرفگەندە (ف): سەرداخستوو، سەرشۆڕ.
سەرقەدەم (ف): بەردەوام، کاری ناشارەزایانە.
سەرقەدەمکردن (ف-ك): سەرکردنە پێ، بە سەر ڕۆیین. کینایەیە لەوپەڕی عەزرەت و پەرۆشی بۆ زوو گەیشتن بە یار.
سەرقەف: سەری ئەڵقەداری پەت و گوریس و شتی وا.
سەرکاتب (ف): سەرۆکی کاتبەکان.
سەرکار: کاربەدەستی پیاوی گەورە، دەربار و دەزگای پادشایی و بەڕێوەبردن.
سەرکەش (ف): سەرکێش، یاخی؛ لێفە، ئەوەی بەسەردا دەکێشرێ.
سەرگوزەر: سەرکۆڵان، سەرەتای شوێنی تایبەت بە پیشەیەك لە بازاڕدا.
سەرگەشتە (ف): سەرگەردان، سەرلێشێواو.
سەرمەشق: ئەو دێڕە کە مامۆستا لە سەرەوەی لەوح و کاغەز دەینووسێ و قوتابی مەشقی لەبەر دەکا.
سەرنیگوون (ف): بێسەروشوێن، لێخراو لە پایە و دەسەڵات، ئەوی سەری بەرەو خوارەوە نەوی بووبێ.
سەرو: دارسەرو، کینایەیە لە بەژن و باڵای بەرزی یار.
سەروپا: هەموو، تێکڕا.
سەروقەد: باڵا وەك سەرو بەرز.
سەروکار: سەروساخت، پێوەندی.
سەروناز: سەروی تازەهەڵچوو یا سەروی بەرز و جوان، کینایەیە لە دڵبەری قەد و باڵا جوان کە لەنجەولارێکی بەنازی وەك لەرینەوەی دارسەروی هەبێ.
سەری موو: هێندەی سەرەموویەکی یەکجار بچووك، کینایەیە لەوپەڕی ڕاستگۆیی.
سەطربەندی (ف): دێرڕیزکردن، ڕێکخستنی دێڕی نووسین.
سەعدی: سەعدی شیرازیی شاعیری گەورەی ئێران.
سەطیح (ع): پەککەوتوو.
سەعادەتمەند (ف): بەختەوەر.

سەعد (ع): بەختەوەری.
سەقا: ئاودەر، ئاوگێڕ.
سەقەر (ع): دۆزەخ.
سەقەنقوور: گیاندارێکی وەك توولەمارە، لە جێی گەرم و فێنك دەژی.
سەقیم (ع): نەخۆش. چاوی سەقیم: چاوی مەست.
سەکەراتی مەوت (ع): غەرغەرەی سەرەمەرگ، گیانەلاً.
سەگساری: خراپەکاری.
سەگصیفەت (ف): بەدکردار، سپلە و بێوەفا، سەگخوو، سووك و بوودەلە.
سەگمەرگ: نزیکی مەرگ و نەمردن، بە زەحمەت مردن، کینایەیە لە پیاوخراپی چەپەڵ.
سەڵتەنەت (ع): دەسەڵاتداری، کینایەیە لە ناز و نیعمەت.
سەلم: سەلم و توور و ئیرەج، هەرسێ کوڕی فەرەیدوون و ئیرەج براچکۆلەیان بوو. فەرەیدوون کە وڵاتانی بەسەردا دابەش کردن، ڕۆم و ڕووس و ئالان و ڕۆژاوای دا بە سەلم و ناوی قەیسەری لێ نا. ئیرەج بووە خاوەنی وڵاتی ئەسڵیی خۆی. سەلم و توور حەسوودیان پێ برد و نامەردانە کوشتیان.
سەلمانی پاك: سەلمانی فارسیی یەکێك لە یارانی پێغەمبەر (د.خ).
سەلوا (ع): شۆکە، هەنگوین.
سەلەم (ع): پێشفرۆش کردن ، سەوزخڕ کردن.
سەلیح (ع): پڕچەك، ئامادە بۆ جەنگ، پێشەنگی سوپا.
سەلیم: باوکی مەحموود ئاغای شێوەکەڵ.
سەما: ئاسمان، سووڕ، هەڵپەڕین‌ودابەڕین.
سەماوات: دێیەکی ناوچەی (شارەزوور) لە سلێمانی.
سەمتوور (ف): ئامێرێکی مۆسیقایە.
سەمع (ع): بیستن.
سەموور: سمۆرە، مەبەست کەوڵی بەنرخیەتی.
سەمووم (ع): گڕەی گەرمای هاوین.
سەمەرقەند: شەکری بەرهەمهێنراو، شاری سەمەرقەند لە وڵاتی ئۆزبەکستان.
سەمەك (ع): ماسی، ئەو ماسییە کە -گوایە- گایەك لەسەر پشتیەتی و پێکەوە زەوییان ڕاگرتووە.
سەمەن (ف): یاسەمەن، گیایەکی ماڵڕازێنەوەی گوڵ جرشت و بۆنداری سپی و زەرد و سووری بۆنخۆشە.
سەمەنبۆ (ف): بۆن وەك بۆنی گوڵی سەمەن.
سەمەندەر: پەلەوەرێکی ئەفسانەییە، دەڵێن لە ئاگردا دەژی و هێلکە دادەنێ.
سەنجاب (ع): سمۆرە.
سەن سەن (ت): تۆ تۆ.
سەنگ (ف): بەرد.
سەنگئاسیا (ف): بەرداش.
سەنگئاسیائاسا: وەك بەرداش، کینایەیە لە کەسی خۆڕاگری هەڵگرتووی باری گران.

سەنگکرۆژ (ف-ك): بەردخۆر، کینایەیە لە ئازایی و بەجەرگی.
سەنگلاخ (ف): بەردەلان، جێی بەردین.
سەنگیندڵ: دڵ بەویقار، دڵگرانبەها.
سەواد (ع): ڕەشایی.
سەوار (ف): سوار.
سەودا (ف): تێکچوون، ماخۆلان، گرفتاریی عیشق.
سەوگەند (ف): سوێند.
سەوی: قەرتاڵە، بەرچنەی گەورە.
سەهل (ع): ئاسان.
سەهم (ف): ترس، سام.
سەهو (ع): هەڵەکردن لە بێئاگاییدا.
سەهی (ف): ڕێك.
سەهیسەرو (ف): سەروی ڕاست.
سەهیقامەت (ف): بەژن ڕێك و ڕاست.
سەهیقەد (ف): بالاڕێك.
سەیدوسێنان: سێوسێنان، دێیەکی ناوچەی (قەرەداخ) لە سلێمانی.
سەیفی عەلی (ع): شمشێری عەلی، شمشێرێك هەمیشە لە ڕووی ناهەقیدا لە کێلان دەرهاتووە و دوژمنکوژ بووە.
سەیل (ع): لێشاوی ئاو، لافاو.
سەیلاب (ف): لافاو، سێلاو.
سەیوان: گردی سەیوانی بەری ڕۆژهەلاتی شاری سلێمانی.
سەیەلان (ع): ڕۆیشتن، جاریبوون.
سەید (ع): نەوەی پێغەمبەر، گەورە.

سیاهماران (ف): ڕەشماران.
سیاهی (ف): ڕەشی.
سیاوەش (ف): کوڕی کەیکاووس، ڕۆستەم بە منداڵی فێری شەڕ و ڕاو و ئازایەتی کرد و چووە شەڕی ئەفراسیاب و دواجار خوێنی بە دەستی ئەو ڕێژرا.
سێب (ف): سێو.
سێبی ذەقەن (ف): سێوی چەناگە، کینایەیە لە خڕی و جوانی.
سێبی غەبغەب (ف): سێوی سوور و سپی جوانی گۆشتی ژێرچەناگە.
سپەر (ف): قەڵغان کە ئامرازێکە جەنگە.
سپەرئەفگەندە (ف): قەڵغان فڕێدان، کینایەیە لە تێشکان و دەست لە شەڕ هەڵگرتن و خۆبەدەستەوەدان و هەلاتن.
سیحرئافەرین (ف): سیحرباز، دروستکەری جادوو.
سێراب (ف): تێراو.
سیراط (ع): پردی سیرات، ئەو پردە کە بەسەر ئاگری دۆزەخەوەیە، باریکترە لە موو و تیژترە لە ئەڵماس، مەردوم لە ڕۆژی حەشردا لێی دەپەڕێتەوە.
سێراو (ف): تێراو. (ئاو)ەکەی کوردییە.
سیلخ (ع): دوادوایی مانگ.
سیلسیلە (ع): زنجیر، زنجیرە.
سیلسیلەجۆ (ف): بەدوای زنجیردا گەڕاو.
سیلسیلەموو (ف): موو بە زنجیرە، مووی درێژ و ئەڵقە ئەڵقەی لوولی ئەگریجە.

سیم (ف): زیو، کینایەیە لە سپیوسۆڵی یا سپیبوونەوە و خوێنتێدانەمان لە ترساندا.
سیماب (ف): جیوە.
سیمابگوون (ف): وەك جیوە، کینایەیە لە پەشۆکان و ڕەنگپەڕین.
سیمبەر (ف): لەشسپیوسۆڵی وەك زیو.
سیمذەقەن (ف): چەناگە وەك زیوی سپی.
سیمورغ (ف): عەنقا.
سیمیا: زانیستێکە مرۆڤ شتی نائاسایی بێ جێبەجێ دەکا، یا ڕێ لە شتی ئاسایی دەگرێ.
سیمینعوزار (ف): ڕوخسار زیوینی سپی.
سینان (ع): سەرەڕم، نووکی تیژی هەر شتێ.
سینە (ف): سنگ.
سینەزەنان (ف): بەسنگکوتان
سینەسۆزان (ف): سنگسووتاو، دڵسووتاو.
سینەی کەمان (ف): بەزەویداکەوتن و هەستانەوەی تیر و نەپێکانی نیشان، یان سینەکەمان کە ئامرازێکی کۆنی مۆسیقایە.
سیوەیل: بەری ڕۆژهەڵات و سەرسنووری (شارباژێری سەخت) لە سلێمانی.
سیەه (ف): ڕەش.
سیەهبەختان (ف): بەختڕەشان، بێبەختان.
سیەهچەشمان (ف): چاوڕەشان.
سیەهدڵ: دڵڕەش.
سیەهرۆژ (ف-ك): ڕۆژڕەش، بەدبەخت.
سیەهروو (ف): ڕووڕەش.
سیەهبەختانە (ف): چارەڕەشانە.
سیەهبەختی (ف): بەختڕەشی، بێبەختی.
سیەهدڵمەردومان (ف): هەردوو گلێنەی دڵڕەش و بێبەزەیی چاوەکان.
سیەهچەشم (ف): چاوڕەش.
سیەهمار (ف): ڕەشمار، کینایەیە لە ئەگریجە.

## (ش)

شاپوور (ف): ناوی دوو پادشای ساسانییە، ناوی سێ جەنگاوەری ئازای ناو شانامەیشە کە یەکیان هی ڕۆژگاری خوسرەوی پەروێزە.
شاطر (ف): تەتەر، نامەبەر.
شاخ (ف): لقی دار.
شاخسار (ف): لقوپۆپی دار.
شادان (ف): شادمان.
شاطر (ف): پێشڕەوی کاروان، پیادەیەك بە بەرگی تایبەتەوە لە پێشی گالیسکە یا ئەسپی پادشا و گەورەکان بڕوا، چابوك و چالاك، ئازا، زیرەك و ژیر.
شافیعی: ئیمامی شافیعی خاوەنی مەزهەبی شافیعی لە ئیسلامدا.
شاگرد: قوتابی، بەردەستی وەستا کە وردەوردە فێری پیشەکەی دەبێ.
شاڵ: قوماشی لە خوری تەنراو، پارچەیەکی وەك بەرماڵ و فۆتە و پەشتەماڵ بەسەر شاندا دەدرێ، پشتێن.

شام (ف): ئێواره، سەرەتای شەو.
شامه (ع): هەستی بۆنکردن.
شانەزەن (ف): شانەکەر.
شاوەتەن: شاوە- مەلێکی کەوەلەی قاچ و مل درێژی لەدەم ئاودا ژیاوە، شاهۆ، شینەشاهۆ. واتە لەش وەك لەشی شاوە.
شاه (ف): پادشا، داشی هەرەگرنگی یاریی شەترەنج، کە بە هەموو لایەکدا دەجوولێ و بە هەر جوولەیەك خانەیەك دەباتەوە.
شاهراه (ف): شارێ، رێی گەورە و فراوان.
شاهوار (ف): شاهانە، شایستەی پادشا، بەنرخ.
شاهوو: شاهۆ، چیایەکی بەرزی ناوچەی (هەورامانی لهۆن)ی شاری (پاوە)ی ئوستانی (کرماشان).
شاهی (ف): پادشایی.
شاهی، شایی (ف): پارەیەکی سەردەمی قاجاری کە کردوویەتیە پەنجا دینار.
شاهی نەقشبەند: مەبەست خواجە محەمەدبەهائوددینی بنیاتنەری تەریقەتی نەقشیە کە رێبازێکی سۆفێتییە.
شاهید (ع): یار، دۆست.
شاهین (ف): شاهێن، جۆرە بازێکی ڕاو.
شتاب (ف): پەلە، ڕاکردن.
شرەنگ (ف): ژەهر، کاڵەکەمارانە.
شرعەبا: عەباشر.
شکاف (ف): کەل، شکستە، درز.
شکست (ف): تێشکان، شکان.
شکۆفە (ف): خونچە، گوڵی تازەپشکووتوو.
شکەم (ف): سك.
شکەن (ف): پێچولوول.
شکەنج (ف): پێچ و چینی ئەگریجە.
شمشاد (ف): درەختێکە گەڵای هەمیشەیی و دارەکەی سەخت و ڕێکە.
شنۆ: شنەی با.
شوان: ناوچەیەکی سەر بە (کەرکووك).
شوتوور (ف): وشتر.
شوتورمورغ (ف): وشترمر، کە باڵ باڵندە و بە قاچ و مل و پشت وشترە.
شوتوری نەوت: وشتری گەڕۆڵ کە نەوت و زفتی لێ درابێ، لە عەرەبیدا دەڵێن: البعیر الأجرب، أي المقیّر.
شۆر (ف): هەرا و ئاشووب، عیشق، دێوانەیی؛ سوێر.
شۆرش (ف): هەراوهوریا، ئاشووب و فیتنە، شۆر و خرۆش.
شۆرەزار (ف): زەویی خوێدار، شۆرەکات.
شورطه: بای هەڵکردوو بە هەمان ڕووی کەشتی کە باشە. پێچەوانەکەی بای موخالیفە.
شۆریده (ف): پەرێشان، شێواو، ئاڵۆز و بژ.
شۆریدەبەخت (ف): بەخت ئاڵۆز و تێکچوو.
شوستوشۆ (ف): شتن، خاوێنکردنەوە.
شوعلەوەر (ف): ڕووناکیبەخش، داگیرساو. (شوعلە) عەرەبییە.
شوکرانە: سوپاسگوزاری.
شووشتەر: شارێکی سەر بە ئوستانی خووزستان لە باشووری ڕۆژاوای ئێران.

شووم (ع): نەگبەت.
شوهرەت (ع): شۆرەت، ناووبانگ.
شەئامەت (ع): نەگبەتی، شوومی.
شەبدێز (ف): ئەسپە ڕەشەکەی خوسرەوی پەروێزی پادشای ساسانی.
شەبرەنگ (ف): ڕەنگ وەك شەو تاریك و ڕەش.
شەبرەو (ف): شەورۆ، بەشەورێ‌کردوو.
شەبگیر (ف): دەمی بەرەبەیانی.
شەبنشین (ف): شەونشین.
شەبە (ع): سووککراوی (شەبەه)ە، شەوە، مووروووەبەردێکی بریقەداری ڕەشی بەنرخە.
شەبەیخوون (ف): هێرشی لەپڕ کە دوژمن بە خۆی نەزانێ، بەسەردادان.
شەتاو: ئاوی زۆری بەفری تووەاوەی کوێستان.
شەخص: گۆڕی پیاوچاکان، بەتــایبەتی گۆڕی دیاری وەها کە داری لە سـەر و بەردا ڕووێنرابێ و دەوری بە وشکەکەڵەك هەڵچنرابێ.
شەراب (ع): مەی.
شەرابی جەی: شەرابی نایاب و بەناووبانگی (گەڕەکی جەی)ی شاری (ئەسفەهان).
شەرارە (ع): پریشکی ئاگر.
شەرح (ع): کتێبێکە جاران فەقێ خوێندوویانە، لێکدانەوە.
شەڕرار (ع): شەڕانی، چەتوون.
شەرك (ع): شەرەك، تەپکە و داوی ڕاوچی.
شەرمەسار (ف): شەرمەزار.
شەرەر (ع): گڕ، پریشکی ئاگر.
شەرەربار (ف): ئاگراوی.
شەش‌دەر: شەش‌دەرگا، دۆخێ لە تەختەنەردا کە یاریکەرێکیان مۆر (پوول)ەکانی شەش خانەی بەرامبەر بە یاریکەرەکەی‌تر دەگرێ و یاریکەری دووەم جووتێ شەشیش بێنێ، ناتوانێ مۆری خۆی بجوولێنێ.
شەط (ع): چەمی گەورە.
شەعشەعە (ع): ڕەونەق، شەوقدانەوە.
شەفاعەتخواه (ف): تکاکار، داواکەری لێبوردن و بەخشین لە گوناه.
شەقام: ڕاستەڕێ.
شەق‌کردن (ع-ك): دوولەت‌کردن.
شَقُّ القَمَر (ع): مانگ دووکەرت‌کردن، موعجیزەیەکی حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ).
شەقوەشێن: ئەوی شەق دەوەشێنێ.
شەکڵ (ع): شێوە.
شەکەر (ف): ئەو تۆزە شیرینە کە لەناو نەیچەکەدایە و گرتوویەتە ئامێز.
شەکەرئەفشان (ف): شەکر و شیرینی وەشاندن.
شەکەرخار (ف): نازی وەك شەکر شیرین، چونکە مانایەکی (خار) نازە، یا شەکرخۆری شەکرداکرۆژ، کینایەیە لە قسەشیرین.
شەکەرخەند (ف): زەردەخەنەی وەك شەکر شیرین، خاوەنی ئەو زەردەخەنە شیرینە.
شەکیب (ع): ئۆقرە، خۆگری.
شەم: شەمع، مۆمی داگیرساو.

شەمر (ع): شەمری ذیلجەوشەنی بکوژی ئیمام حوسێن (خ.ڕ).

شەمس: شەمسی تەبریزیی سۆفی و پیری مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی. دووجار لەبەر دووزمانیی موریدان (قۆنیە)ی زێدی مەولەویی بەجێ‌هێشت وکارێکی زۆری تێ کرد.

شەمس‌لیقا (ف): ڕوو و دیداری وەك خۆر ڕووناککەرەوە، ناسناوی دڵخوازەکەی ئالپ ئارسلانی سەلجووقی.

شەمشیر، شەمشێر: شمشێر، ئامرازێکی کۆنی شەڕ.

شەمشێرداری (ف): شمشێرهەڵگری، شمشێربازی، کاری شمشێربەدەستەوەبوون بۆ بڕینی سەری ئەوانەی وا بڕیاری سەربڕینیان دراوە.

شەمعی فەنەر: بە چرایەك یا مۆمێ وتراوە کە دەوراندەوری گیراوە و هەوا لێی نەداوە و ناکواوەتەوە.

شەمعی کافووری (ف): مۆمی سپی کە گرانبەهایە.

شەمە (ف): کەمێك.

شەمەر (ف): حەوزی بچووك، گۆلاو، هەر شوێنێ ئاوی تێدا کۆبووبێتەوە و وەستابێ.

شەنا (ف): مەلە.

شەوئاهەنگ (ك-ف): ئاهەنگی شەوانە.

شەوپەرست: حەزلەتاریکی‌کردوو، کینایەیە لە سەوداسەریی ئەگریجەی ڕەشی یار.

شەوچرابین: ئەوی بە شەو چرا ببینێ.

شەوچراغ (ف): شەوچرا، گەوهەرێکە وەك چرا لە شەودا دەگرێ و دەوروبەری ڕۆشن دەکاتەوە.

شەوق: ڕووناکی‌دانەوە.

شەوکەت (ع): شان‌وشکۆ.

شەولەناو: شەوەکی، شەو هێشتا لەناودا بێ، گەردوگوڵی بەرەبەیان کە تاریکی مابێ.

شەوها: چەندین شەو.

شەه (ف): پادشا.

شەهد (ع): هەنگوین.

شەهدخێز (ف): شیرینی‌بەخش.

شەهدنۆش (ف): هەنگوینخۆر.

شەهر (ف): شار.

شەهرەزوو، شارەزوور: ناوچەیەکی فراوانی ڕۆهەڵاتی شاری سلێمانییە.

شەهرەوا (ف): پارەی قەڵب کە پادشای دەوڵەت بەزۆر ڕەواجی پێ دەدا، یا پارەیەك کە تەنها لەو شارە کە سککەی لێ دەدرێ، برەوی هەیە.

شەهری دڵ (ف): شاری دڵ، کینایەیە لە گەورەیی و فراوانی.

شەهلا (ع): تایبەتمەندیی نێرگزێکە کە ناوەڕاستەکەی سوور یا وەنەوشەییە، کینایەیە لە چاوی مەست و جوان و فریودەر.

شەهیدی کەربەلا (ع): کینایەیە لە حەزرەتی حوسەینی کوڕی ئیمامی عەلی.

شەیهەکەر: حیلەکەر، ئەسپێك بحیلێنێ.

شبیش (ف): ئەسپێ.

شیتاب (ف): پەلـەپەل.
شێخەباس: شێخ عەباس، شەخس و زیارەتگایەکی خوارووی سلێمانی بووە.
شێخی صەنعان: داستانی شێخی سەنعان، کە کابرایەکی موسوڵمان بوو، لەبەر خاتری کچەمەسیحییەك لە دین وەرگەڕا و بوو بە مەسیحی. دواجار بووەوە بە موسوڵمان.
شێخی مەعنەوی (ع): مەبەست جەلالـەددینی رۆمی خاوەنی (مەثنەویی مەعنەوی)یە.
شیراز: شارێکی باشووری ئێران و ناوەندی ئوستانی فارسە.
شیرخوار (ف): شیرەخۆرە.
شێرئەوژەن: شێربەئەرزدادەر.
شێرخوو (ف): خووی وەك خووی شێر، ئازا.
شێرگیر (ف): شێرگر، ئەوی شێر بگرێ، کینایەیە لە ئازایی و چاونەترسی.
شێرمەردانە: مەردانە وەك شێر.
شێرۆ: شێرۆیەی کوڕی خوسرەوی پەروێز کە باوکی خۆی کوشت.
شێرهەیبەت (ف): ئەوی سام و هەیبەتی شێری هەبێ.
شیرە (ف): تراوی تکاو، شیلـە.
شیرەت (ف): چەمووش، تووش و شەڕانی، هار و بەگوڕەگوڕ.
شێری بێشە: شێری دارستان، شێری ئازا.
شێری ژیان (ف): شێری تووڕە.

شیرین: ژنی خوسرەوی پەروێزی ساسانی و خۆشەویستی فەرهاد.
شیریندەهان، شیریندەهەن (ف): دەمشیرین.
شیریندەو (ف): خۆشڕەوت، شیرینڕەوت، جوان غارکردوو.
شیرینزوبان (ف): زمانشیرین، قسەخۆش.
شیرینسوخەن (ف): زمانشیرین، قسەخۆش.
شیرینقەد (ف): باڵای شیرین.
شیشە (ف): پیاڵە، شووشە.
شیشەپەز (ف): شووشەکوڵێن، شووشەدروستکەر.
شیشەی دڵ (ف): شووشەی دڵ، کینایەیە لە ناسکی.
شیشەی دیدە (ف): چاو، شوبهێنراوە بە شووشە و فرمێسکی تێدا کۆدەبێتەوە.
شیعری سەلیقی (ع): شیعری عادەتی و باوی بە سەلیقەوە نووسراو.
شیفا (ع): چاكبوونەوە.
شیفاجۆ (ف): شیفاخواز.
شیفادارو (ف): دەرمانی شیفابەخش.
شێفتە (ف): عاشقی سەرلێشێواو، تێکچوو، شێواو.
شیکافکردن: کردنەوە، دادڕین، قڵیشاندن.
شێلگ: دەستڕێژی تفەنگ و ڕیزی گوللـە.
شینکەوا: کەواشین.
شیوی ئاودار: شیوێکی باکووری ڕۆژاوای سلێمانییە بە لای (سەرچنار)دا.

صاحێب‌ئافەرین (ف): جادووگەر، سیحرباز.

صاحێب‌ئیعتیبار (ع): ڕێزدار و بەحورمەت، حیساب‌بۆکراو، بەهەندگیراو.

صاحێب‌ئیعجاز (ف): خاوەن‌موعجیزە، موعجیزەنوێن، جادووگەر.

صاحێب‌ستەم (ف): ستەمکار.

صاحێب‌سینان (ف): تیربەدەست، تیرهاوێژ.

صاحێب‌فەن، صاحێب‌هونەر (ف): هونەرمەند.

صاحێبقڕان: دەوڵەمەند و خاوەن‌پارە، بنەماڵەیەکی ناسراوی سلێمانی.

صاحێب‌کەرامەت (ف): شەرەفمەند، بەکەرامەت.

صاحێب‌گونەه (ف): گوناهبار، خەتابار.

صاحێب‌مەکان (ع): خاوەنی جێ‌وڕێ، خودا.

صاحێب‌نگین (ف): خاوەن زێڕ و زیوی سەر موستیلە، گوایە موستیلەکەی حەزرەتی سولەیمان ناوی خودای بەسەرەوە بووە و بەو هۆیەوە حوکمی مەردوم و جنۆکەی کردووە، بەختدار.

صاحێب‌نەظەر (ف): خاوەن‌بیر.

صانیعی گوڵ (ع-ك): گوڵدروستکەر، کینایەیە لە خودا.

صوبح‌دەم (ف): دەمی بەرەبەیان.

صوبحگاه (ف): دەمی بەیانی.

صوبحی صادیق (ع): شەفەق، بەرەبەیان کە ڕووناکیی خۆری تێدا لەناو تاریکیدا دەردەکەوێ.

صوحبەت (ع): هاوڕێیەتی، ناشنایەتی.

صوڵب (ع): پشتی پیاو، مووراغەی پشت.

صوورەتخانە (ف): شوێنی وێنەتێدادانان.

صەبا (ف): بای لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە هەڵکردوو.

صباح الخیر (ع): بەیانیت باش.

صەبووح (ع): خواردن یا خواردنەوەی بەیانی.

صەحرای سینە (ف): بیابان و دەشتی سنگ کە دڵی تێدایە. کینایەیە لە وشك‌وبرینگی و چۆڵیی سینە بەبێ یار.

صەحن (ع): حەوشە، مەیدان.

صەدا (ع): هاوار و بانگ و دەنگ، دەنگدانەوە.

صەدادان: بانگ‌کردن، هاوارلێ‌کردن.

صەدپارە (ف): سەدپارچە، لەت‌لەت.

صەڕڕاف (ع): پارەگۆڕەوە، کینایەیە لە دڵدار.

صەڕڕافی غەم: ئەوی خەم دەگۆڕێتەوە بە خۆشەویستی، عاشق.

صەعب (ع): قورس، گران، زەحمەت و ئەستەم.

صەعبییەت (ع): گرانی، قورسی.

صەعوە (ف): فیسقە، چۆلەکەی بچووك.

صەفا (ع): نەشئە و خۆشی.

صەفا و مەروە: لە ڕێوڕەسمەکانی یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربانە لە حەجدا. دوو تەپۆڵکەی نزیکی مەککە و ئاوی زمزمە،

حاجییان بە پەلە بە نێوانیاندا دێن و دەچن بۆ یادکردنەوەی خاتوو "هاجەر"ی هاوسەری حەزرەتی ئیبراهیم (خ.ڕ) کە لەوێ بەدووی ئاودا دەگەڕا.
صەفای سینە (ع-ف): دڵسافی.
صەفحە (ع): تەخت، تەختی تەوێڵ.
صەفوەتدەهـ (ف): ئارامیبەخش، پاککەرەوە.
صەفەر (ع): مانگی سەفەر، گوایە بەتایبەتی کوڵەچوارشەممەکەی شوومە.
صەلابەت (ع): ڕەقی، وشکبوون و نەبزووتن.
صەڵاحەت (ع): شایستەگی و بەرژەوەند، کارچاکی، سوودمەندبوون.
صەنەم (ع): بت.
صەنەما (ف): ئەی بت! ئەی بتەکەم.
صەنعات (ع): پیشە و سەنعەت.
صەیحە (ع): هاوار.
صەیدئەفگەن (ف): نێچیربەئەرزدادەر.
صەیدی حەرەم: نێچیری حەرەمی کەعبە کە ڕاوکردنیان قەدەغەیە.
صەیقەل (ع): ژەنگپاککەرەوە، مشتومالدەر.
صیحەت (ع): تەندروستی، سەلامەتی.
صیدق (ع): ڕاستگۆیی.
صیددیق (ع): ناسناوی ئەبووبەکری صیددیقی یەکەم خەلیفەی ئیسلامە (خ.ڕ).
صیفەتنایاب (ع-ك): سیفەت چاك و ناوازە.

## (ض)

ضەخیم (ع): گەورە.
ضەرب (ع): لێدان.
ضەمیر (ع): دەروون، ویژدان.
ضەو (ع): ضەوء، ڕووناکی.
ضەیقەت (ع): تەنگانە.
ضیا (ع): ڕووناکی.
ضید (ع): دژ.
ضیددەین (ع): دوو دژ، دوو شتی ناکۆك.
ضیعف (ع): لاوازی و بێهێزی، بێدەسەڵاتی و ناتوانی.

## (ط)

طائیری دەوڵەت (ف): طیر السعد، باڵندەی بەختەوەری.
طارەم (ف): خانووی دارین، هەیوانگومەزی، ئاسمان.
طاس (ع): تاس، کاسە.
طاق (ع): تاق، هیلالی، کەوانی وەك مانگی یەكشەوە.
طاقی کیسرا: ئەو کۆشکە گەورەیەیە کە کیسرای دووەمی پادشای ساسانی لە (تەیسەفوون)ی خوار بەغدا دروستی کرد و بە تاقی کیسرا ناسراوە.
طالش: ناوچەیەکی سەرووی ئێرانە.
طالیع (ع): بەخت و ناوچاوان.
طالیعزەبوون (ف): بەختڕەش، بەدبەخت.

طاووسی: تاووسی، وەك پەڕی تاووس ڕەنگاوڕەنگ.
طوڕڕە: زوڵف، ئەگریجە، ئەو مووانەی کە لەملاوئەولای تەوێڵەوە بەسەر ڕوودا شۆڕ دەبنەوە.
طوعمە (ع): چەشەی بۆ نێچیر دانراو لە ڕاودا.
طوغرا (ف): فەرمانی شاهانە.
طوغرول (ف): جۆرە باڵندەیەکی ڕاوی لە توخمی بازە.
طـوّفان (ع): تۆفان، ئاوهەستان، لافاو.
طـوّمار: تۆمار، کۆمەڵەنامە یا هەر کۆمەڵەنووسراوێك کە بدرێتە دەم یەك و لوول بکرێ.
طومان: تەومان، ژێردەرپێ.
طوور: ئەو کێوەی چیای (سینا) کە بەرگەی دەرکەوتنی نووری خودای نەگرت و سووتا، بوو بە کل.
طووسی نەوزەر: پاڵەوانێکی کۆنی ئێرانییە، پلەی سپەهبودی لە دەرباری پادشایاندا هەبووە و داوای تاج و تەختی کردووە.
طووطیئاواز (ف): ئاواز و بانگ خۆش وەك هی تووتی.
طوول (ع): درێژەکێشان، درێژی.
طوولانی (ع-ك): درێژ.
طەبع (ع): تەبیعەت، سروشت.
طەبعکەر (ع-ك): تەبیعەتکەر، وەك کەر هەڵکەوتوو.

طەبیعەتغەضەنفەر (ف): شێرتەبیعەت، وەك شێر هەڵکەوتوو.
طەڕاوەتدەھ (ف): ڕەونەقدەر و جوانیبەخش، تەڕوبڕ.
طەرەب (ع): کەیف و شادی.
طەرز (ع): تەرز، جۆر.
طەرف (ع): طەرەف، لا.
طەریق: تەریق، خەجاڵەت و شەرمەزار.
طەلاّ (ف): زێڕ، کینایەیە لە ڕەنگی زەرد.
طەلاّکار (ف): لەزێڕدروستکراو.
طەلعەت (ع): ڕوخسار.
طەڵەبکار (ع-ك): داواکار.
طەلیسم (ع): تەلیسم، پارچەکاغەز یا مەعدەنێکە جادووگەر یا فاڵچی نەخشێکی لەسەر دەکا یا شتێکی لەسەر دەنووسێ بۆ لادانی دەردێك یا بەلایەك لە کەسێك یا لە شتێك، گوایە کاریگەریی دەبێ.
طەمەع (ع): چاوچنۆکی، تەماع.
طەواف (ع): بەدەورداگەڕان.
طەوف (ع): بە دەوری شتێکدا سووڕانەوە.
طەوق (ع): ملوانکە، گەردنبەند.
طەویلە: تەویلە، ژوورێکی گەورەی درێژکار بۆ تێدا بەستنەوەی ولاخی بەرزە و گوێدرێژ، بەتایبەت لە زستاندا.
طەیکردن (ع-ك): پێچانەوە، مەسافەبڕین.
طەیەران (ع): طەیران، فڕین، باڵگرتنەوە.
طیـپ، تیپ: تاقمی سوپا.
طیفل (ع): منداڵ.

(ظ)

ظاڵمخەصڵەت (ف): کردەوە وەك هی ستەمکار.

ظاڵمدڵ (ف): دڵڕەق، بێبەزەیی، دڵمردوو.

ظاهیر (ع): ئاشکرا و دیار.

ظوڵمەت (ع): تاریکی.

ظوهوور (ع): دەرکەوتن.

ظەرف (ع): دەفر، قاپی چێشتتێکردن.

ظەریفان (ف): نوکتەزانان، گوفتارشیرینان.

ظەڵم: سەرچاوە و تاڤگەیەکی ژوور دێی (زەڵم)ی سەر بە ناحیەی (خورماڵ)ی ناوچەی هەڵەبجەیە لە سلێمانی.

ظیلل (ع): سێبەر.

(ع)

عاج (ع): ددانی فیل، ئێسکی جۆرە ماسییەکە.

عاریض (ع): ڕوخسار، کوڵم.

عافییەت (ع): نۆش.

عاقیبەت (ع): سەرەنجام، ئەنجامی کار.

عالیجاه (ف): پایەبڵند.

عوبوودییەت (ع): بەندایەتی، کۆیلەیی.

عوجب (ع): لەخۆباییبوون، خۆپەرستی.

عوذر (ع): بەهانە، بیانوو.

عوریانی (ع): ڕووتوقووتی، بێبەرگی و هەژاری.

عورووج (ع): بەرزبوونەوە.

عوزلەت (ع): گۆشەگیری، دوورەپەرێزی.

عوصفوور (ع): چۆلەکە.

عوقابی غەم (ع): هەڵۆی خەم، کینایەیە لە خەمێکی توند و بەئازار.

عوقبا (ع): قیامەت، دوارۆژ.

عوقدە (ع): گرێ، گرێی دڵ.

عولەما (ع): کۆی (عالم)ە، زانایان، زانایانی ئایینی ئیسلام.

عومەرەها: کۆی (عومر)ە، چەند تەمەنێك، عومرەکان.

عومەر: عومەری کوڕی خەتتابی سێیەم خەلیفەی موسوڵمانان (خ.ڕ).

عونناب (ف): دارێکی دڕکاوییە، بەری لە زەیتوون دەچێ و چاکترین جۆری سوور و شیرینە و بۆ پاڵفتەکردنی خوێن بەسوودە و تایش سووك دەکا.

عووج (ع): عووجی کوڕی عەنەق کە زەلامێکی قووچ و درێژی ئەفسانەییە.

عەبداڵ: ڕەند و دەروێش، وێڵ و سەرگەردان.

عەبهەر (ع): نێرگس، کینایەیە لە چاوی یار.

عەبەث (ع): بێهوودە، بە خۆڕایی، بێسوود، گاڵتەجاڕی.

عەجەب (ع): عەجایب، سەیر.

عەجەمیشێوە: وەك عەجەم، کینایەیە لە نەزان و تازەکار.

عەدوو (ع): دوژمن.

عەدەم (ع): نەبوون، مەبەست لێی مردنە.

عەذارا (ع): کۆی (عەذراء)ە، کچی شوونەکردوو.
عەذرا: عەذراء، دڵخوازی "وامیق" کە چیرۆکێکی دڵداریـیان هەیە.
عەرایض (ع): کۆی (عەریضە)یە، ئەرزوحاڵ، سکاڵانامە.
عەرش: تەختی ئاسمانی.
عەرصە (ع): مەیدان.
عەرعەر (ع): درەختیچکی جوان و گەورەیە، کینایەیە لـە بالاّی بەرز و شۆخ.
عەرووس (ع): بووك.
عەرەبدیدە (ف): چاو وەك چاوی عەرەب ڕەش و جوان.
عەزا (ع): پرسە و ماتەمینی.
عەزم (ع): نیاز.
عەزە: کورتکراوەی ناوی عەزیزە، کە دەبێ مەیتەری ئەسپ بووبێ.
عەزیز: عەزیز بەگی بابان، هێمایە بۆ عەزیزی میسر.
عەصای مووسا (ع): داردەستەکەی مووسایە کە -بەپێی ئایەتی ژمارە ١٠٤ی سوورەتی (أعراف) ((فألقی عصاه، فاذا هي ثعبان مبین))- لەبەردەم جادووگەرانی فیرعەونـدا بوو بە ئەژدەها و ماری جادووگەرانی قووت دا. ئاماژەیشە بە ئایەتەکانی ژمارە ١٧-٢١ی سوورەتی (طه): ((قال هي عصاي أتوکّؤا علیها وأهّش بها غنمي ولي فیها مآرب اخری. قال القها یا موسی. فالقاها فاذا هي حیّة تسعی. قال خذها ولاتخف سنعیدها سیرتها الاولی)).
عەطارید (ع): لـە حەوت ئەستێرە گەڕۆکەکان و یەکەم هەسارەی نزیکی خۆرە.
عەفو (ع): لێبوردن، بەخشین.
عەقرەب (ع): دووپشك، کینایەیە لـە پێچولوولـی ئەگریجە.
عەقڵکەر (ع-ك): بە عەقڵ کەر و نەزان.
عەقەب (ع): پاش، دوا، مەبەست پشتە.
عەقیق (ع): یاقیق، بەردێکی سووری گرانبەهایە.
عەقیمئاسا (ع-ك): وەك نەزۆك.
عەکس (ع): شەوقدانەوە، پێچەوانە، وێنە.
عەکسپەذێر (ف): وێنەوەرگر، وەك شتێ لـە ئاوێنەدا ببینرێ.
عەلامەت (ع): نیشانە.
عەلەف (ع): ئاڵف، ئالیکی حەیوان.
عەمدەن (ع): دەسەنقەست.
عەموود (ع): کۆڵەکە.
عەمەل (ع): کاری خێری پێکەوەی ژن و مێرد.
عەنبەر: ماددەیەکی بۆنخۆشە، لـە ناو گەدە یا ڕیخۆڵەی ماسیی عەنبەردا دروست دەبێ و لـەسەر ڕووی دەریا کۆدەبێتەوە و هەڵیدەگرن، یا کاتێك ئەو ماسییە ڕاو دەکرێ، ئەو ماددەیە لـە سکی دەردەهێنرێ.
عەنبەرینموو (ف): مووی بۆنخۆشی بۆنی عەنبەر پێوە.

عەندەلیب (ع): بولبول.
عەنقا (ع): سیمورغ، باڵدارێکی ئەفسانەییە، کینایەیە لە شتێ کە ناوی بێ و خۆی نەبێ.
عەنقاصیفەت (ف): سیفەتی عەنقای هەبێ.
عەنکەبووت (ع): جاڵجاڵۆکە.
عەهد (ع): سەردەم.
عەیادەت (ع): سەردانی نەخۆش.
عەیان (ع): ئاشکرا، بەرچاو.
عەین (ع): خۆ، خود.
عیبرەت (ع): بەپەندبوو، سەیروسەمەرە.
عیجز (ع): لەکارکەوتن، بێتوانایی.
عیززەت (ع): قەدرزانین، شانوشکۆ.
عیسا: عیسای کوڕی مەریەمی پێغەمبەری مەسیحییەکان.
عیسانەفەس (ف): وەك فووی عیسا مردوو زیندووبکاتەوە.
عیشرەت (ع): پێکەوە بە شادی ڕابواردن، هاونشینی.
عیشقباز (ف): دڵدار، عاشق.
عیشقی مەجازی (ع): عیشقی ڕووکەش.
عیشوەجۆ (ف): بەناز، بەدوای نازدا گەڕاو.
عیشوەساز (ف): بەنازونووز، نازفرۆشی فێڵباز.
عیشوەگەر (ف): نازفرۆش، فێڵباز.
عیصمەت (ع): داوێنپاکی، پاکیزەیی.
عیظم (ع): گەورەیی.
عیقد (ع): ملوانکە، گەردنبەند.
عیللەت (ع): دەرد.
عینان (ع): جڵەو، لەغاو.
عینین (ع): نەزۆك، شلەپەتە، نێرەمووك و ئەو پیاوەی کە لە پیاوەتی کەوتبێ و دەعباکەی هەڵنەستێ.

## (غ)

غائیبانە (ع-ك): لە پاشملە.
غائیلە (ع): ترس و پەژارە.
غار (ع): ئەشکەوت.
غازە (ف): سووراو.
غافڵ (ع): بێئاگا.
غالیب (ع): زۆربە، زاڵ.
غایب (ع): نادیار، خۆلەبیرچوونەوە لەبەر بیرکردنەوە.
غریو (ف): هاوار و فەریاد.
غوبار (ع): تۆز.
غوبارئالوود (ف): تۆزاوی، تۆزلێنیشتوو.
غورروور (ع): لەخۆباییبوون.
غوصصە (ع): خەم و کەسەر.
غولام (ع): خزمەتکار.
غولل (ع): زنجیر و پێوەند.
غوول (ع): دێو، بوونەوەرێکی ئەفسانەییە، لە شاخ و دۆڵی دوور لە ئاوەدانیدا دەژی و ڕێبوار لە ڕێ لادەدا و سەری لێ دەشێوێنێ.
غونچەدەم: دەم وەك خونچە بچووك و جوان.
غەبراء (ع): خاك.

غەبغەب: گۆشتی دەرکەوتووی ژێرچەناگەی مرۆی قەڵەو.
غەرق (ع): خنکاو، نوقوم.
غەزا (ع): خۆراك، شەڕی داگیرکاریی موسوڵمانان دژی کافران.
غەزنە، غەزنەین: شارێکی مێژوویی ڕۆژهەڵاتی ئەفغانستان کە "ئالپ تەکین"ی مەملووکی تورك کردیە پایتەختی بەرەبابی دەسەڵاتداری غەزنەوی. یەعقووب لەیث بنیاتی نا و عەلائەددین حوسێن غووری لە سەدەی شەشەمدا وێرانی کرد.
غەزەلخوانی (ف): غەزەلخوێنی، شیعروتن.
غەضەنفەر (ع): شێر.
غەفڵەت (ع): بێئاگایی.
غـەفووری ڕەحـیم: لێبـووردەی بەبـەزەیی، کینایەیە لە خودا.
غەڵـطان (ف): خەڵتان، تێکەڵ.
غەمدیدە (ف): خەمدیو، خەمبار.
غەمزە (ع): نیونیگا، ئیشارە بە تیلەی چاو، چاوهەڵتەکاندن.
غەمزەدە (ف): خەمگین و دڵتەنگ.
غەو: دەنگی زۆر بەرز.
غەوارە: تیرەیەکی هۆزی جافە.
غەوغا (ع): هاتوهاوار و هەرا، ئاژاوە و ئاشووب، خەڵکی زۆر و بەیەکداچووی ئاژاوەگێڕ.
غەوواص (ف): قەوواس، کەوانکێش و تیروەشێن.
غەیرەز (ف): غیراز، جگە لە.
غیلمان (ع): کۆی (غولام)ە، بەندەی گەنج و جوان.

## (ف)

فائیدە (ع): کەڵك.
فائیق، فایق (ع): سەرکەوتوو، باڵادەست، زاڵ.
فارووق (ع): ناسناوی حەزرەتی عومەری کوڕی خەتتاب (خ.ڕ)، جیاکەرەوەی هەق و ناهەق.
فاریغ (ع): خاڵی و بەتاڵ، ئاسوودە.
فاش (ف): ئاشکرابوو، بڵاوبووەوە لەناو خەڵکدا.
فاطان: فاتمە.
فایض (ع): خاوەنی خێر و بەرەکەت.
فرۆچوون (ف- ك): چوونەخوار.
فرووزان (ف): داگیرساو.
فسـوردە (ف): ژاکاو.
فسوون (ف): فێڵ و تەڵەکەبازی.
فگار (ف): نەخۆش.
فنا في النور (ع): نوقمی بیرکردنەوە لە جوانی و ڕووناکیی ڕووی یار.
فومە: ئاڵتوون و زیو.
فوتووری چاو: مەستیی چاو.

فورات: ڕووباری فورات کە سەرچاوەکەی لە کورستانی تورکیایە.
فونوون: کۆی (فەن)ە، هونەر، جۆراوجۆر، فێڵ.
فەتتان (ع): ئاژاوەگێڕ، فیتنەگێڕ.
فەتح (ع): داگیرکاریی وڵاتان، دەرگاکردنەوە.
فەحل (ع): نێر، نێری هەر ئاژەڵێکی ئامادەی جووتبوون.
فەحوا (ع): مەعنا، واتا، ناوەڕۆك.
فەخرولبەشەر (ع): فخر البشر، شانازیی مرۆڤایەتی، مەبەست حەزرەتی محەممەدە (د.خ).
فەراخ (ف): فراوان.
فەراز (ف): بەرز، هەوراز.
فەرامورز (ف): کوڕی ڕۆستەمی زاڵ.
فەرامۆشخانە (ف): جێیەك کە هەموو کەس و هەموو شتێکی تێدا فەرامۆش دەکرێ.
فەرایض (ع): کۆی (فەریضە)یە، ئەو شتانە کە ئیسلام فەرزی کردوون لەسەر موسوڵمان.
فەرد (ع): شتی تاقانەی بێوێنە.
فەردا (ف): سبەینێ.
فەردی (ف): تاقانەیی.
فەردی قەدیم (ع): تاقانەی کۆن و لەمێژینە، کینایەیە لە خودا.
فەردی مەجاز (ع): دەسەڵاتداری تازەپێگەیشتوو.
فەردی یەکتا (ف): تاقانەی بێوێنە، کینایەیە لە خودا.
فەڕڕوخقەددەم (ف): پێوقووم بە خێر و فەڕ و بەرەکەت.
فەرسەخ (ع): سێ میل یا دوازدە یاردە (باڵ).
فەرضەن (ع): گریمان.
فەرع (ع): لق‌وپۆپ.
فەرق (ع): تەوقەسەر.
فەرماندەهی دەهر (ف): کاربەدەستی ڕۆژ و زەمانە.
فەروەردین (ف): خاکەلێوە، یەکەم مانگی وەرزی بەهار و یەکەم مانگی ساڵی هەتاوی.
فەرهاد: عاشقی شیرینی کچی شای ئەرمەنستان و نەیاری خوسرەوی پەروێز و هونەرمەندی خاوەننەخشەکانی سەر کێوی بێستوون لە نزیکی کرماشان.
فەرەحئەفزا (ف): شادی زیادکەر.
فەرەحناك (ف): شاد و خۆشحاڵ.
فەرەنگ: ڕۆژاوایی و بەتایبەتی ئەورووپایی.
فەرەنگیخوو (ف): کردەوە و خووی وەك خووی ڕۆژاوایی.
فەرەنگیمەذهەب (ف): بە دین ڕۆژاوایی یا کافر.
فەریاد (ف): بانگ و هاوار.
فەریب (ف): فریو، خەڵەتاندن.
فەصد (ع): کەڵەشاخگرتن، خوێنگرتن، حجّامة. مەبەست ماچکردنە، چونکە وەك کەڵەشاخگرتن خوێن لە جێی دیاریدا کۆدەکاتەوە.

فەصصاد (ع): کەڵەشاخگر، خوێنگر، حجّام، عاشق، ئەوی ماچ دەکا.
فەصڵ (ع): وەرز.
فەضا (ع): پانتایی، دەشت.
فەغفوور (ف): ناسناوی پادشاکانی وڵاتی چین. لە (بەغپوور- کوڕی خودا)وە وەرگیراوە.
فەقد (ع): لەدەستدان.
فەقیرە: دێیەکی ناوچەی (قەرەداخ) لە سلێمانی.
فەلاخوون (ف): قۆچەقانی، قەڵماسنگ.
فەلەك (ع): چەرخی گەردوون، ئاسمان، ڕۆژگار.
فلك الأطلس (ع): چەرخی گەردوون، دەیەم فەلەکە کە دەوری دنیا و نۆ فەلەکەکەی‌تری دنیای داوە.
فەنا (ع): نەمان، مردن.
فەواق (ع): غەرغەرەی سەرەمەرگ، قوڕگەگیرەی دەمی گیانەڵاّ.
فەوت (ع): لەناوبردن.
فەقد (ع): ونکردن.
فەووارە (ع): فوارە، ئاوپژێن، ئەو ئاوەی کە بە گوژم لە لوولەوە بۆ سەرەوە بەرز دەبێتەوە.
فەیض (ع): خێروبێر، بەرەکەت.
فەیلەقووس: پادشایەکی کۆنی ڕۆم.
في المثل (ع): بۆ نموونە.
فیتنەها (ف): کۆی فیتنە، ئاژاوەی زۆر.
فیتنەئەنگێز (ف): ئاژاوەبەرپاکەر، فیتنەهەڵگیرسێن.
فیراق (ع): لێك‌جیایی.
فیردەوس (ع): بەهەشت.
فیرعەون: زنجیرەی پادشایانی کۆنی حوکمداری میسر، کینایەیە لە ستەمکاری و ملهوڕی.
فیرقەت (ع): جیایی و دووری لە دۆست.
فێست (ف): جۆرە کڵاوێکی ئافرەتان.
فیکرهیچی (ع-ك): بیر و بۆچوونی پووچەڵ و بێ‌بناغە.
فیلجوملە (ع): کەمێك، نەك هەموو.
فیل‌خوراك (ع-ف): خواردنی هێندەی خواردنی فیل، یا ئەوەندەی فیلێك خواردن.

## (ق)

قائیم (ع): بەپێوەڕاوەستاو.
قابغ (ت): قابوق، قاوغ، کالان، ئاماژەیشە بۆ کونی پاش و پێش. دارێکی درێژی سەربەئەڵقەیە، سوار لە تیربازیدا بە یەڵغار تاو دەدا و تیر بۆ ئەڵقەکە دەهاوێ، ئەگەر بچێتە ناوی، بە براوە و دەست‌ڕاست دادەنرێ.
قابیض (ع): گیانکێش، فریشتەی گیان‌کێشان، ئیزرائیل.
قابیضی قودرەت (ع): فریشتەی گیان‌کێشان.
قادر (ع): خودای توانا، قادر پاشای کوڕی سلێمان پاشای کوڕی ئیبراهیم پاشای بابان کە محەمەدنەجیب پاشای والی بەغدا لە ١٢٥٨ك

(١٨٤٢-١٨٤٣ز)دا کردی بە میری بابان و تەختی میرایەتیی نەدی.

قابیل (ع): شایان.

قاتیل (ع): بکوژ.

قاروون: دەوڵەمەندێکی سەردەمی مووسا پێغەمبەر (د.خ)، کە لێی هەڵگەڕایەوە و دوژمنایەتیی کرد، تا خودا خۆی و سامانیی بەقوڕدا برد.

قارەمان: دێیەکی ناوچەی (قەرەداخ) لە سلێمانی.

قاز (ف): کەمترین پارەی سەردەمی قاجاری. ١٠ دە قاز کردوویەتیە ١ یەك شاهی.

قازوغ (ت): قیسپ، تیر، سنك، کینایەیە لە دەعبای نێرینە.

قاژ: قەلەڕەش.

قاصید (ع): نامەبەر، تەتەر.

قافڵە (ع): کاروان.

قاقوم: گیانـەوەرێکی چـکۆلـەی وەك سمـۆرەی پێستی نەرم و سپی و گرانبەهایە.

قامەت (ع): بالاّ.

قایم (ع): قائم، ڕاوەستاو.

قڕگە: دێیەکی نزیکی باکووری ڕۆژهەلاّتی شاری سلێمانی.

قرمزیپۆش (ف): بەرگی سوور پۆشیو.

قرمزیقەهر (ف): تووڕەیی و غەزەب سوور، تووڕەیـــەك کە خوێنڕشتنی بەدوادا بێ.

قرۆش: دراوێکی مەعدەنیی هاوتای چل پارەی تورکی بووە.

قزلەر: دێیەکی ناوچەی (سووورداش) لە سلێمانی.

قصن: قسن، زیارەتگا، هەر جێ‌گۆڕێك وشکەکەڵەکی لە دەور هەڵچنرابێ.

قصەی بەرحەق: قسەی ڕاست و ڕەوان.

قلب الأسد (ع): ناوەڕاستی هاوین، ناوەڕاستی پێنجەمین بورجی ساڵ کە گەرما تاو دەستێنێ، گەلاوێژ، ڕۆشنترین ئەستێرەی شێوەی گەردوونیی شێر.

قوبە (ع): گۆپکە، گومەز.

قودرەت (ع): تواناییی خودا.

قورب (ع): نزیکی.

قوربانگاه (ف): جێی قوربانیلێسەربرین.

قۆرخ: دێیەکی ناوچەی (شارەزوور) لە سلێمانی.

قوسطەنطین: قوستەنتینییەی پایەختی زووی ڕۆمەکان و ئەستەموولی ئێستا.

قوشچی (ت): بازەوان.

قوطب (ع): جەمسەر.

قولزوم: دەریای سوور، سوور.

قولزومی عیشق (ف): دەریای سووری عیشق، کینایەیە لە گەورەیی و ڕێی خویناویی عیشق.

قوللاپ: ئامرازی لێگیرکردن بۆ ڕاکێشان.

قوللغ (ت): قوللوق، بەرتیل.

قوڵین: هەڵقوڵین.

قوو: باڵندەیەکی جوانی ملدرێژی بێپەردەداری پەرنەرمی ڕەنگ سپی یا ڕەشە.

قووت (ع): خۆراك، بژیوی.

قووەت (ع): هێز.
قەبا (ع): کەوا.
قەبض (ع): گرتن، لێگرتنەوە.
قەبلاندن: خەملاندن، مەزەندەکردن.
قەت، قەد (ع): قط، هەرگیز.
قەپان: ئامرازی کێشانەی بار.
قەجەر: قاجار، بنەماڵەی حوکمداری وڵاتی ئێران پێش حوکمی بنەماڵەی پەهلەوی.
قەحط (ع): قاتی، گرانی.
قەد: باڵا.
قەدەح (ع): پیاڵە.
قەدەحدەرکەف (ف): پیاڵەبەدەستەوە.
قەدەم (ع): پێ.
قەدەمخوشکەك (ف): پێوقووم شەڕ، بێخێروبێر، بێفەڕ.
قەدیم (ع): کۆن.
قەدیمجانباز (ف): گیانبەختکەری کۆن.
قەرار (ع): بڕیار.
قەرەسوو: بەشێکی چەمی کەرخە کە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی کرماشانەوە سەرچاوە دەگرێ، بە ناوی چەمی (مرك) لە فیرۆزئابادەوە دێتە دێهاتی ماهیدەشتی ڕۆژهەڵات و پاش تێکەڵبوون بە ئاوی (گراب)، ناوەکەی دەبێتە قەرەسوو و ڕوو دەکاتە باشووری ڕۆژهەڵات. بە نزیکی نەوتپاڵێوی کرماشاندا تێدەپەڕێ و دەڕژێتە چەمی (گاماسیاب). پاشان لەگەڵ ئاوی (گشانی) یەکانگیر دەبێ و چەمی (سەیمەرە) پێكدەهێنێ و لە درێژەی ڕێڕەوی خۆیدا ناوی دەبێتە (کەرخە) و دەڕژێتە (هور العُظیم).
قەڕن (ع): سەدساڵ.
قەز (ف): ئاوریشم.
قەزبین: شاری قەزوێن لە باکووری ئێران، دەریاچەی قەزوێن (خەزەر).
قەسیم (ع): دابەشکەر، خودا.
قەشان: دێیەکی ناوچەی (ماوەت) لە سلێمانی.
قەصد (ع): مەبەست.
قەضا (ع): قەزاوقەدەری خودایی، چارەنووس.
قەف قەف: بەند بە بەند (لە قامیش و حەیزەراندا).
قەفا (ف): پشت.
قەفاخواردن (ف-ك): لە پشتەوە لێدران.
قەلادە (ع): گەردنبەند، ڕستی سەگ و تانجی.
قەلب (ع): دڵ، لەشی ئادەمیزاد، ناوەڕاستی سوپا.
قەڵب: ناڕەسەن، ساختە، خراپ.
قەڵبەزە: دێیەکی ناوچەی (دەربەندیخان) لە سلێمانی.
قەلبی دڵ (ف): ناوجەرگەی دڵ.
قەللاب (ع): بارگۆڕ، فێڵباز، پارەی قەڵب دروستکەر.
قەڵەمدان: قوتووی قەڵەم و مەرەکەب.
قەلەندەر (ف): ڕەند، دەروێش، خاکی.
قەمەر (ع): مانگ.
قەند (ف): شەکر.

قەندەهار: شارێکی باشووری ڕۆژاوای (کابول)ی پایتەختی ئەفغانستان.
قەندیل: شاخێکی بەرزی ناوچەی سلێمانی لە سنووری نێوان هەردوو کوردستانی عیراق و ئێران.
قەنناد (ع): قەندساز، شیرینی دروستکەر، حەڵواچی.
قەوس (ع): کەوان، نۆیەم مانگی ساڵی هەتاوی کە وشکەسەرمای پاییز -بەتایبەتی- لە کوێستانەکاندا دەست پێ دەکا، سەرماوەز.
قەوی: بەهێز، بەدەسەڵات.
قەویدەست: پەڵئەستوور، دەستومەچەك بەهێز، بەدەسەڵات.
قەویشەوکەت (ف): زۆر بەشانوشکۆ، خاوەنی شکۆمەندییەکی بەرز.
قەهر (ع): غەزەب، تووڕەیی، زۆرداری.
قەهرکردن (ع-ك): تووڕەبوون، زۆرداریکردن.
قەهرناك (ف): تووڕە.
قەی (ع): ڕشانەوە.
قەیاغ (ت): قایق، جۆرە بەلەمێکی سەرەتاییی پەڕینەوەیە لە چەم بە سەوڵ لێ دەخوڕرێ.
قەید (ع): کۆتوبەند، زنجیر.
قەیس: قەیسی عامیریی شەیدای لەیلا.
قەیصەری: ڕاستەبازاڕ، گوزەر، کینایەیە لە گەورەیی.
قەیچی (ت): مەقەست.
قیاس (ع): بەراورد، ئەندازەگرتن، پێوانە، کێشان.
قیام (ع): هەستان، ڕاستبوونەوە.
قیامەت (ع): ڕۆژی قیامەت، هەستانەوەی هەموو مردووان لە ڕۆژی حەشردا.
قیبلەنوما (ف): قیبلەنوێن، ئامێرێکە میلەکەی هەر بۆ لای قیبلە وەردەچەرخێ.
قیرقاج (ف): هەڵگێڕوداگێر، سەروخوارکردن، خواروخێچ.
قیرگوون (ف): وەك قیر ڕەش، ڕەشی قەترانی.
قیرگوونزوڵف (ف): ئەگریجە وەك قیر ڕەش.
قیرگوونشەب (ف): شەوی وەك قیر ڕەش و تاریك.
قیسپ: داری دەستی سەرتیژکراو بۆ تەیمان دروستکردن.
قیسمەت (ع): بەش و نسیبی خودایی، چارەنووس.
قیصصە (ع): بەسەرهات، چیرۆك.
قیندیل (ع): چرا.

## (ك)

کائاوەر (ك-ف): کاهێن، ئەوی کا دەهێنێ.
کابول: پایتەختی ئەمڕۆی ئەفغانستان.
کاخ (ف): کۆشك.
کارخانە: کارگە، جێی دروستکردن.
کارزار (ف): جەنگ.
کاسبهای شەهری (ف): کاسبەکانی ناوشار.

کاسەگەردان (ف): کاسەگێڕان، کەسێ کاسە بگێڕێ بۆ داوای شت.
کاشیف (ع): پەردەلادەر، ئاشکراکەر.
کاغەزی قەند (ف): کاغەزی پێچانەوەی کەللەشەکر، کینایەیە لە سووکی و بەرگەنەگرتن.
کافرصیفەت (ف): بە سیفەت و خوو وەك کافری بێدین.
کافرۆشی: تیرەیەکی هۆزی جافە.
کافوور: شیرەی وشکەوەبووی دارێکی سپیی بۆنخۆشە.
کاکوڵ (ف): کاکۆڵ، زوڵف.
کالیار: ترۆزییەکی گەورە و درێژە و تامێکی لەنێوان تامی کاڵەك و ترۆزیدا مەیلەو ترشی هەیە.
کام (ف): ئارەزووە دڵ.
کامگار (ف): بەختیار.
کانیی ئاسکان: کانی و سەراوێك لە رۆژاوای سلێمانی، ئێستا گەڕەکێکی گەورەیەتی.
کاووس (ف): دووەم پادشای کیانی و ناودارترین کەسی زنجیرە و نەوەی کەیقوباد.
کاووش (ف): هەڵکۆڵین.
کاه (ف): کا.
کاهی (ف): کینایەیە لە ڕەنگی زەردی ئەنجامی ترس یا نەخۆشی.
کچان: دێیەکی ناوچەی (سەنگاو) لە گەرمیان.
کردگار: خودا، دروستکەری دنیا.
کرمان: شارێکی باشووری رۆژهەڵاتی ئێرانە.
کزلك (ف): قەڵەمبڕی بچووك، چەقۆی چکۆلە.
کشتەك: چەند داوەدەزووی پێکەوەبادراو.
کشتزار (ف): کشتوکاڵ، مەزرا و دێیەر.
کلید (ف): کلیل.
کلێسا: پەرستگای گاوران.
کۆ (ف): مەنزڵ، بەردەرگا، دەوروبەری.
کۆتا، کۆتاه، کۆتەه (ف): کورت.
کۆتەڵ: جلوبەرگی مردوو کە لەسەر ئەسپەکەی ڕێك دەخرێ و چەند شینگێڕێکیش دێن و دەچن و مردوو دەلاوێننەوە.
کوجا (ف): لە کوێ، بۆ کوێ.
کوچك: بەرد.
کوحل (ع): کل.
کحل الجواهر (ع): کلی وەك گەوهەر.
کودوورەت (ف): دڵتەنگی، ناپاکی.
کودەك (ف): ساوا.
کوردکوژە: جۆرە خورمایەکی ناخۆشە.
کوردی: ناسناوی شیعریی مستەفا بەگی صاحێبقران.
کوڕڕە (ف): بێچوو.
کورکە: دەنگی وڵاخی یەکسم کە وادەی ئالفبێدانی بێ.
کورکەکورك: کورکەی یەك لەدوای یەك.
کۆزیلکە: خڕبوونەوە وەك کۆزی مەڕوماڵات.
کۆستە: دێیەکی نزیکی شاری سلێمانی.

کوشت‌وگیری (ف): زۆران‌گرتن، کوشتن و گرتن.
کولبه (ف): خانووی ویرانه، کەلاوه (بۆ دڵی عاشق دەوترێ).
کۆڵبەدۆش (ك‌ـف): کۆڵبەکۆڵ، کۆڵ به شانەوه.
کوللی (ع): لە زاراوەکانی مەنتیقه.
کوله (ف): کڵاو.
کۆمەڵ: ژماره یا برێکی زۆر.
کونجوشك (ف): چۆلەکە.
کونده: مەشکەی گەورەی ئاوکێشان.
کۆنەداغ: داخی کۆن.
کۆنەکەمان (ك‌ـف): کۆنەکەوان، مەبەست لەمێژه چەماوەتەوه.
کوهەن، کوهنه (ف): کۆن.
کوهەنزەخم (ف): کۆنەبرین.
کوهەنسەوداگەر (ف): کۆنەبازرگان.
کۆه (ف): کێو.
کۆهسار (ف): شاخ‌وداخ.
کۆهکەن (ف): فەرهاد، کێوهەڵکەن، مەبەست فەرهادی عاشقی شیرینه که نەخشەکانی ئەوی لە شاخی بێستوون هەڵکەندووه.
کوور (ف): کوێر.
کووس (ف): نەقاره، تەپڵی شەڕ.
کووچه (ف): کۆڵان.

کووفه: شارێکی ناوەڕاستی عیراقه لەسەر ڕووباری فورات، حەزرەتی عەلی (خ.ڕ) کردیه بارەگای خۆی و لەوێ کوژرا.
کووکنار (ف): توێکڵ و گوڵی خاشخاش که تاڵه و مەردومی پێ بێ‌هۆش دەبێ.
کووکووزەنان (ف): کووکووکەران، کووکوو دەنگی کۆترەباریکەیه، کینایەیه لە چۆڵەوانی.
کوێت: ئەسپی کوێت که سووری ئاماڵ‌ڕەش و بەکاره.
کەبك (ف): کەو.
کەبکی جەنگ‌ئاسا، کەبکی جەنگی (ف): وەك کەوی شەڕەکەو.
کەبکی دەری (ف): باڵندەیەکی وەك کەوه و سێ ئەوەندە لەو گەورەتره، دەنووك‌درێژ و چنگۆڵەبەهێزه، زیاتر لە ئێران و چین و ئەفغانستان دەبینرێ.
کەبووتەر (ف): کۆتر.
کەتان: قوماشێکی سپی تەنکه.
کەثرەت (ع): زۆری.
کەچ: لار، خوار.
کەچنەظەر (ف): ڕوانین چەوت و خوار.
کەچەك (ف): قولاپ، تێلای ئاسنی سەرنوشتاوه.
کەچڕەوش (ف): ڕەفتار چەوت و خوار.
کەدوو (ف): کوولەکە.
کەرامەت (ع): ئەو کاره لەعادەت‌بەدەرەیه که پیرانی تەریقەت پیشانی دەدەن.

کەربەلا: شارێکی عیراقە، ئیمام حوسەین و یارانیی تێدا شەهید کران و گۆڕیان لەوێیە.
کەرەج: شارێکی باکووری (تاران) لە ئێران.
کەسب (ع): پەیداکردن.
کەشاکەش (ف): کێشمەکێش، ڕاکێشان بە هەر لایەکدا، دەردەسەری.
کەشش (ف): هێزی ڕاکێشان.
کەششاف (ع): کتێبی "ئەبولقاسم مەحموود کوڕی زەمەخشەرییە بۆ لێکدانەوەی قورئان لە ڕووی ڕێزمانەوە، جاران فەقێ خوێندوویانە، پەردەلێهەڵماڵ.
کەشکۆڵ: توورەکەی تایبەتی دەروێش کە لە ملی کردووە و دەسکەوتی سواڵی تێکردووە، لە کۆندا قەپیلکی گوێزی هیندی بووە کە هێلکەیی و قووڵە، دەروێش زنجیری تێخستووە و سواڵی پێوە کردووە.
کەشیش (ف): قەشەی گاوران.
کەعبەی ویصال (ع): گەیشتن بە یار شوبهێندراوە بە حەجی ماڵی خودا.
کەف (ع): لەپی دەست، بەری پێ، دەست.
کەففە (ع): تای ترازوو.
کەلام (ع): قسە، ئاخاوتن.
کەڵبە: ددانی پێشەوەی سەگ یا هەر دڕندەیەك.
کەما: جۆرە گیایەکی کێویی کوێستانییە، وشك دەکرێتەوە بۆ زستانی حەیوان لە ناوچە ساردەکانی کوردستان.
کەمان (ف): کەوان.
کەمانئاسا (ف-ك): وەك کەوان چەماوە.
کەمانئەبروو (ف): برۆکەوانی.
کەمبەها: کەمنرخ، هەرزان.
کەمحەریف: هاونشینێکی کەم.
کەمخیرەد (ف): کەمعەقڵ.
کەمڕەوش (ك-ف): کەمڕۆیشتوو.
کەمفڕ: کەمفڕیو، مەلێك توانایی فڕینی ماوەیەکی کورت و کەم بخایێنێ.
کەمۆڵە: کاسەی بچووکی دارین.
کەمەر: ناوقەد و پشتێنە.
کەمەربەستە: ئامادە، پشتێنی بەندایەتی لە پشت بەستوو.
کەمەند (ف): یەکەی پێوانی درێژی کە هاوتای درێژیی گوریسی کەمەند دروستکردنە، یا پەتی درێژی سەربەئەڵقە بۆ گرتنەوە و بەستنەوەی ڕاکردوو.
کەمەندار (ف): کەماندار، کەوانبەدەست.
کەمین (ع): بۆسە.
کەمینگاه (ف): حەشار، جێی بۆسە و خۆشاردنەوە.
کەنار (ف): باوەش، قەراخ، داوێن، دەورووبەر.
کەنارگرتن: چوونەلاوە، گۆشەگیری.
کەنز (ع): گەنجینە، کتێبێکە جاران فەقێ خوێندوویانە.
کەنعان: سەرزەمینی کۆنی فەلەستین کە خاکی گفتپێدراوی ئیسرائیلییەکان بوو، پاش ئەوەی لە میسر هاتنە دەرێ، ڕوویان تێکرد و لێی نیشتەجێ بوون.

کەوان: ئامرازی لۆکە و خوری شیکردنەوە، چەماوە، کەوانی تیروکەوان.
کەوبار: بێچووەکەو.
کەوبەزێن: ئەوەی کە کەو دەبەزێنێ.
کەودەن: دەبەنگ، گێژ.
کەوکەبە: ورشەوپرشە، گەورەیی.
کەوی تۆر: کەوی سرك و ڕامنەکراو.
کەه (ف): کا، وشەکە سووککراوەی (کاه)ە.
کەهروبا: کارەبا، جۆرە بەردێکی بەنرخە، کا بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ و پێیەوە دەنووسێ.
کەهکەشان: کۆمەڵەئەستێرەکانی کاکێشان.
کەی (ف): پادشا، شاهنشاه، هەریەکە لە پادشایانی زنجیرەی کیان.
کەیخوسرەو (ف): پادشای دادخواز.
کەیقوباد (ف): یەکەم پادشای کیانی و لە نەژادی فەرەیدوونە. پاش مردنی گرشاسب، زاڵ ڕۆستەمی کوڕی ناردە کێوی ئەلبورز. ئەویش کەیقوبادی بردە ئێران و تاجی شاهانەی لەسەر نا.
کەیل: لێوان، پڕ.
کەیوان (ف): ئەستێرەی زوحەل کە –دەڵێن– لە حەوتەم ئاسماندایە.

کیا (ف): کەهیا، کاربەدەستی گەورە، وەزیری یەکەم لە ویلایەتدا.
کیذب (ع): درۆ.
کیش، کێش (ف): ئایین.
کیشمیر: ناوچەیەکی دڵگیری سەرووی هیندستانە، لە ساڵی ١٩٤٧ەوە کە هیندستان (پاکستان)ی لێ جوێ بووەوە، ئەویش لەو نێوانەدا دابەش بوو. کینایەیە لە جوانی.
کیشوەر (ف): وڵات.
کێش: کێشانە.
کێشان: ڕاکێشان.
کیفایەت (ع): بەس.
کیلك (ف): قەڵەم.
کیمیا: زانستێکە، پێشینان دەیانوت ئەو کەسەی بیزانێ، دەتوانێ مەعدەنە بێنرخەکان بکا بە زێڕ. دەڵێن زوو ئەوانەی کیمیایان بزانییایە، کەسیان فێر نەدەکرد و تەنها بە نەوەی خۆیانیان دەوت.
کێوی قاف: کێوێکی خەیاڵییە، دەوری جیهانی داوە. هەندێك دەڵێن سیمورغ هێلانەی تێدا کردووە.

## (گ)

گاڕان: ملەیەکی نزیکی ڕۆژهەڵاتی شاری (مەریوان) لە کوردستانی ئێران.
گازن: شفرەی زیندروو، پارچەپۆڵای تیژی سەر وەك دەمەتەور بۆ بڕین و تاشین و ڕێك-کردنی چەرم بەکاردێ.

گاگەلچەرێن (ك–ف): گاگەلـلەوەڕێن، گاوان.
گاه (ف): کات.
گاو و ماهی (ف): ئەفسانەی (گا و ماسی) کە –گوایە– گۆی زەوی بەسەر پشتی گایەکەوەیە و گاکەیش لەسەر ماسییەکە و ئەو

جووته ڕایانگرتووه، که دهجوولێنهوه، بومهلهرزه پهیدا دهبێ.
گرانجان (ف): نابووت و هیچوپووچ، ڕهزاقورس، لهشبهبار.
گرانخێز (ف): لهشقورس، لهشبهبار، تهمهڵ.
گرانمایه (ف): بهنرخ، گرانبهها.
گرانمیهری (ف): قورسیی خۆشهویستی، خۆشهویستییهکی گرانبهها.
گرانوهزن (ك-ع): به کێش قورس.
گربهستن: ئاگرگرتن، داگیرسان.
گرتنهدڵ: له دڵدا ڕاگرتن.
گرتنهگوێ: گوێلێبوون، بیستن.
گرد (ف): خڕ، بازنهیی، به دهوری.
گردخوان (ف): کۆبوونهوه لهسهر سفره.
گردهشین: گردێکی نزیکی دێی (شێوهکهڵ) له ناوچهی (شاربازێڕ)ی سلێمانی.
گردهکوێت: ئهسپی کوێتی خڕهڵه. کوێت، ئهسپی سووری ئاماڵڕهشه که خۆشڕۆ و بهکاره له ڕۆییندا.
گرێژه: دێیهکی نزیکی ناوچهی (سهید صادق) له سلێمانی.
گرێشمه (ف): کریشمه، ناز، ئیشاره به چاو.
گریه: گریان.
گزره: پووشوپهڵاشی کۆکراوهی پاش خهرمانههڵگرتن.
گزگل: بهرێکی ناوکلۆری دارمازوو، کینایهیه له گون.
گلان: ڕهتهڵبردن و کهوتن، ههڵهنگووتن.

گۆ: گۆی دارین یا شتیتر.
گوداڵ (ف): شوێنی نزم و چاڵوچۆڵ و قووڵ و پێچوپهنا.
گودروون: چیای پیرهمهگروون له سلێمانی.
گوربه: پشیله.
گوربهخوو (ف): خووی پشیله ههڵگرتوو، کینایهیه له سپڵه.
گورجی: خهڵکی گورجستان، کینایهیه له سپیپێستی.
گورز: کوتهك، ئامرازێکی سهرئهستووری دهسکداره بۆ شهڕ، کینایهیه له دهعبای نێرینه.
گورێز (ف): ههڵاتن.
گورێزان (ف): ههڵاتوو، ڕاکردوو.
گورێزدان (ف-ك): ڕاکردن.
گوزهر (ف): تێپهڕین.
گوزهرگاه (ف): ڕێی تێپهڕین، ڕاڕهو.
گوزهشت (ف): بهسهرچوو، ڕابورد.
گۆزهگهر (ف): ئهوی گۆزه و کووپهی گڵین دروست دهکا.
گوستاخ (ف): گورجوگۆڵ، ڕووههڵماڵراو، بوێر.
گوستاخانه (ف): ئازایانه، به ڕووقایمی، بێشهرمانه.
گۆگردی ئهحمهر (ف-ع): ماددهیهکی نامهعدهنیی زهردڕهنگی ناژاراویی ئاگرگره، له دهرمانسازی و لاستیكدروستکردندا بهکاردێ. گۆگردی سوور بۆنناخۆشه،

لەباتیی جەواهیرات وەك ئاگر دەدرەوشێتەوە و زۆر نایابە، پێی دەڵێن (أبو الأجساد).

گولان: گردێکی زنجیرەی (گردی سەیوان)ی نزیکی ڕۆژهەڵاتی سلێمانی، کاتی خۆی مردووانی نەخۆشیی گولیی بەجیا لێ نێژراون. پاش ناشتنی "سۆفی یارە"ی تۆپچیی میرایەتیی بابان لەسەر ئەو گردە، ناوەکەی گۆڕاوە بە گردی مامەیارە.

گوڵئەحمەد: دێیەکی ناوچەی (شارەزوور) لە سلێمانی.

گوڵئەفسوردەگی (ف): گوڵ ژاکان و سیسبوون.

گوڵبەدەن (ف): لەش وەك گوڵ جوان.

گوڵبەرگ (ف): لەش وەك پەڕەی گوڵ.

گوڵخەن (ف): توونی حەمام، جێی ئاگرەکەی.

گوڵدەستە: چەپکەگوڵ.

گوڵڕوخ (ف): گوڵڕوو، ڕوومەتگوڵ، ڕوو وەك گوڵ جوان.

گوڵزار (ف): گوڵستان.

گوڵشەکەر: شیرینییەکە لە شەکر و پەڕەی گوڵی سوور دروست دەکرێ.

گوڵشەن (ف): گوڵزار.

گوڵعومەر: خورماڵ لە ناوچەی (شارەزوور)ی سلێمانی، ئێستا ناحیەیەکی هەڵەبجەیە.

گوڵقەبا (ف): کەوا لە گوڵ، ئەوی کەواکەی وەك گوڵ جوانە.

گوڵگوڵ: وەك گوڵ ئاڵ و جوان و بەردەوام.

گوڵستان (ف): باخچەی گوڵ. لە شەکر و گوڵاو دروست دەکرێ.

گوڵعوزاران (ف): ئەوانەی کە کوڵمیان وەك گوڵی سوور ئاڵە.

گوڵگوون (ف): بە ڕەنگی گوڵ سوور.

گوڵگەشت(ف): گەڕان بەناو گوڵ و گوڵزاردا.

گوڵنار (ف): گوڵەهەنار، یا گوڵی هەنارەکێوی کە ئەو گوڵە نەبێ، بەری نییە.

گوڵی چیهرە (ك-ف): ڕوخساری وەك گوڵ جوان.

گونبەدی: وەك گومەز، گومەزی.

گووڕ: کەری کێوی.

گووسالەی سامیری: گوێرەکەیەکە پیاوێکی جوولەکەی "سامیری" ناو لە زێڕ دروستی کرد و لە پاشملەی حەزرەتی مووسا بانگی خەڵکی دەکرد بیپەرستن.

گوهەر (ف): گەوهەر.

گوێچکەفیل: گوێی فیل، کینایەیە لە گون.

گوێسەنگین (ك-ف): گوێقورس، گرانبیست.

گوێسپەر (ك-ف): گوێ وەك قەڵغان، گوێزل.

گوێژ: دارێکی دڕکاویی سەخت و بەردارە.

گوێژین: لە دارگوێژ دروستکراو.

گەبر: گاور، مەسیحی.

گەرد: تۆز، دەوروبەر، سووڕانەوە.

گەرداب (ف): گەرداو، گێژاو.

گەردش (ف): جم‌وجووڵ، سووڕانەوەی چەرخ، گەڕان و سووڕان.
گەردەن (ف): سەرومل.
گەردەنسەقاقوش (ف): مل وەك بەرگەردنی دەڵـب و داکەوتووی سەقاقوش کە مەلـێکی گەورەی دەنووکـزلی ماسیخۆرە.
گەردەنکەچی: زەلیلی و ملـخواری، سەرشۆڕی، فەرمانبەرداری و گوێڕایەڵی.
گەردەنگیر (ف): یەخەگیر، داوێنگیر، شتێ بەرۆکی مەردوم بگرێ، هەر شتێکی مایەی گرفتاری و ناڕەحەتی.
گەردەنە (ف): ملـە، یاڵ.
گەرگین (ف): گەڕۆڵ، پاڵـەوانێکی سـەردەمی کاووس و کەیخوسرەو.
گەرمجوستەن(ف):غار و ڕۆیینیگەرم و گورج.
گەرەكبوون: ویستن.
گەریبانچاك (ف): یەخەدادڕاو.
گەز: دارگەزۆ، دارۆکەیێکە گەڵای ورد لقەکانیی داپۆشیوە و شیرەی شۆکە دەردەدا.
گەزبوون: قابیلی پێوانەکردن و ئەندازەگرتن.
گەزتن: گەستن.
گەزمەچی (ف): حەسحەس، شەوگەرد.
گەژدوم (ف): دووپشك.
گەشکە: فێ لێهاتن (بەتایبەتی بۆ منداڵ).
گەلوو (ف): قوڕگ، گەروو.
گەمیە: کەشتی.
گەنجی قاروون (ف): ماڵ و سامانی زۆری وەك ئەوەی قاروونی زەمانی مووسا پێغەمبەر (د.خ)، کە بە ناخی زەویدا چوو.
گەند: بۆگەن.
گەندومینڕوو (ف): گەنمڕەنگ، ئەسمەر.
گەندومینگوون (ف): وەك گەنم، گەنمڕەنگ، ئەسمەر.
گەواە (ف): شایەت.
گەهوارە (ف): بێشکە، لانك.
گەی: مانگرتنی وڵاخی بەرزە، پێچەقاندن.
گەیلان: هەرێمێکی باشووری دەریاچەی (خەزەر) لـە ئێران.
گیاە (ف): گیا.
گێژ: گێژاو.
گێسوو (ف): زوڵف، ئەگریجە.

(ل)

لابەقا (ع): نەمان، فەوتان و لـەناوچوون.
لاپێچکە: ئەملاوئەولای دەست و پێی وڵاخ.
لاجان: ناوچەیەکی لـە ٦٦ دێ پێکهاتووی کوردستانی ئێرانە؛ لای باکوور دێهاتی نەغەدە، لای خواروو مەنگوڕ، لای ڕۆژهەڵات شاروێران و یاڵتەمر و لای ڕۆژاوایش دێهاتی خانێ دەوریان داوە.
لاجڵەو: ئەسپی ڕامنەکراو و سـەرڕەق.
لازم (ع): پێویست.
لازمە (ع): پێویستی.

لاله (ف): گولاڵەسوورە، گوڵەمێلاقە، چرا.
لالەڕوخ (ف): ڕوخسار ئاڵ و سوور وەك گولاڵەسوورە.
لالەڕوو (ف): ڕوومەت وەك چرا.
لالەغاو: ئەملاوئەولای دەمی وڵاخ کە لەغاوی تێدەکرێ. بۆ بنیادەمیش بەکار دەهێنرێ.
لالەگوون (ف): گوڵڕەنگ.
لایعقل (ع): عەقڵ بۆ نەچوون.
لچشوتور (ك-ف): دەمولەوس وەك هی وشتر.
لوججه (ع): قووڵاییی ئاو، نێرینەی ئاو، لافاو.
لۆدە: کۆمەڵە کا و گیا، یا کادانێکی درێژی تەنیشتی ئاوایی، لە قوڕ تا پشتێنەیەك بەرز بکرێتەوە و پڕ بکرێ لە کا و سەرەکەی بە قۆڕی سواخ بدرێ.
لوقمه (ع): پاروو.
لوقمەبڕێ: مایەی بڕین و لەدەستدانی خواردن، یا (لوقمەبەرێ): ئەوی خواردن دەبا، یان (لۆقە بە ڕێ): لە ڕێدا لۆقنە و بە هەنگاوی درێژ دەڕوا.
لۆنگ (ف): دەرپێی درێژ، فۆتەی حەمام.
لووتچەکوش: لووتی وەك چەکوش درێژ.
لووتداژەندن: سەرشۆڕکردنەوە لە بێزاریدا.
لووشکە: لووشکاندن، دەنگی وڵاخ لە کاتی ئالیكپێدان،یا ئاوبۆبرجن، یان بینینی بێچوویدا.
لوولوو (ع): لوءلوء، مرواری.
لەناگرخستن: سووتاندن، گڕتێبەردان.
لەب (ف): لێو.
لەبتیشنەگان (ف): لێوتینووەکان.
لەبخوشك (ف): لێوتینوو.
لەبنشینی (ف): لێونشینی، گیرسانەوەی لای لێو بۆ ماچکردن، وەك گۆشەنشین.
لەبنهاتن: هەڵتەکین، داڕووخان، لەبنەوە کۆتاییپێهاتن.
لەبواکردن (ف): دەمکردنەوە، ئاخاوتن.
لە پێتا: لە پێتدا، لە پێناوتدا.
لەحظه (ع): چاوتروکاندنێك، ئانوساتێك.
لەحم (ع): گۆشت.
لەحەد (ع): لەحد، گۆڕ.
لەخلەخە (ف): تێکەڵەیەکی شتی بۆنخۆشی وەك میسك و عەنبەر و کافوور.
لەخۆبوردن: بوورانەوە، لەهۆشخۆچوون.
لەداوترساو: مەلێك لە تەپکە و داو ترسابێ، ترسنۆك و سڵەمیو.
لەذذەت (ع): لەزەت، تام.
لەرزش (ف): لەرزە.
لەطیفیی لەب (ع): دڵگیری و ناسکیی لێو، لێوناسکی.
لەعل (ف): جۆرە بەردێکی گرانبەهایە، ڕەنگی سووری مەبەستە.
لەعلی ڕوممانی: کینایەیە لە لێوی سووری ڕەنگهەناریی یار.
لەعوهدەهاتن: دەرەقەتهاتن، پێوێران.
لەغزش (ف): لەرزین، لەرزە.
لەغەط (ع): دەنگ و قرەقڕ، یا دەنگێ کە تێنەگەی.

لەقافڵەدان:پەلاماردانورووتکردنەوەی کاروان.
لەقلەقئاسا: وەك حاجی لەقلەق.
لەقلەقخەرام (ف): لەنجە وەك ڕەوتی حاجی لەقلەق.
لەقورنیشتن: خۆ لە قوڕ هەڵکێشان، ئەوپەڕی خەمباری و پەژارە بۆ کۆست و نەهامەتی.
لەمحە (ع): ئەوەندەی چاوبەیەکدادانێك، چاوترووکاندن.
لەناکادا: لەناکاودا.
لەنگەر: لەنگەری کەشتی، وەستان و ئارام گرتنی کەشتی لە کەناری دەریا.
لەنگەرڕاگرتن: لەسەروەستان و مانەوە.
لەوحەخوان (ف): لەوحخوێنەوە. لەوح، لاپەڕەی گەورە و پان یان تەختەڕەشی بەردەستی منداڵی بچکۆلە.
لەوحی تەربییەت (ف): ئەو تەختە کە منداڵان مەشقی نووسینیان لەسەر کردووە.
لەولەوچ؟: لەبولەچ، لچولێو.
لەوەندی: کەسێ کاری لەوەند بکا، خزمەتکاری و هەژاری، دەروێشی.
لەهوو (ع): گاڵتە و ڕابواردن.
لەیلاوەشان (ف): هاوچەشنانی لەیلا.
لیباس (ع): جلوبەرگ.
لێبردن: شتێ بردنە ناو شتێکیتر، تێخستن.
لیسە: کاغەزی سمارتە.
لیسك (ف): تیغی دەمخواری کەوچكتاشین.
لێکین (ف): بەڵام.
لیموو (ف): لیمۆ، دەرمانی تای عاشق.
لیوا (ع): ئاڵا، بەیداخ.

(م)

ماء الحیاة (ع): ئاوی ژیان، ئەو ئاوەی کە دەڵێن لە شوێنێکی تاریکدایە و هەر کەس لێی بخواتەوە نامرێ.
ماجەرا (ع): ڕووداوەکان، لە بنەڕەتدا واتە ئەوەی ڕووی دا.
ماچین: جێی ماچکردن کە لێوی یارە، وڵاتی چینی گەورە.
ماخۆلیا: ماخۆلان، تێکچوونی مێشك و سەوداسەری کە دەبێتە مایەی خەیاڵکردنەوەی بێهوودە و پڕوپووچ، ماخۆلان، سەرەخولە.
مادەر (ف): دایك.
مادەرزاد (ف): زگماك.
مارانی ضەححاك (ف): دوو برینەکەی سەر شانی زوحاك.
ماسیدەر: دێیەکی بەری (گەرمك)ی ناوچەی پێنجوێن، (مەریوان)یش دێیەکی هاوناوی هەیە.
ماشیطە (ع): شانەکەر و ئارایشکەری ئافرەت بۆ جوانترکردن.
ماشیطەی مەرگ (ف): ڕازێنەوە بۆ مردن، ڕازاندنەوەی دوژمنە وەك بووك بە خوێنی برینی جەستەی خۆی.
ماڵشدان (ف-ك): ماڵین.
مالوان: دێیەکی نێوان (عەربەت) و (سەیید صادق) لە سلێمانی.

ماڵی کەوان: پانتایی ناو کەوان، بەشە چەماوەکەی کەوان.

مانەند (ف): هاوچەشن، وێنە.

مانی: کوڕی فاتکە و لە زەمانی شاپووری یەکەمی ساسانیدا داوای پێغەمبەریی کرد و ئایینەکەی پەرەی سەند. موبەدەکانی زەدەشتی لە دژی کۆبوونەوە و کوشتیان. وێنەکێشان یەکێك بوو لە بەهرە گەورەکانی. کتێبەکەی کە ناوی (ئەرژەنگ)ە، چەمکەکانی ئایینەکەیی تێدا بە وێنە بە خەڵك گەیاندووە.

ماوەت: ناحیەیەکی ئەوسای قەزای (شاربازێڕ) لە سلێمانی.

ماه (ف): مانگ.

ماهتاب (ف): تریفەی مانگ، ڕووناکیی مانگ.

ماهڕوو (ف): ڕوومەت وەك مانگ جوان.

ماهی (ف): ماسی.

ماهیچە (ف): مانگی بچکۆلەی وێنەی مانگی یەکشەوە، کە لە زێڕ و زیو و جەواهیرات دروست دەکرا و لەسەر ئاڵای پادشایان دادەنرا.

ماهی دووهەفتە (ف): مانگی چواردە.

ماهی ڕۆزە (ف): مانگی ڕۆژوو، ڕەمەزان.

ماهی کەنعان: مانگی وڵاتی کەنعان (سەرزەمینی کۆنی فەلەستین) کینایەیە لە حەزرەتی یووسف (خ.ڕ).

مایل (ع): شۆڕ و لاربووەوە، ئارەزوومەند.

مایە: مەهەك، پاشماوەی نەخۆشی کە وەك برین یا لوو دەردەکەوێ.

مر: مریشك.

مرووەت (ع): پیاوەتی، جوامێری.

مزە: ئەو ئەندازە ئاردەیە کە ئاشەوان لەباتی کرێی هاڕینی باراش وەریدەگرێ.

مشتە: ئامرازێکی سەرپان و دەسكبارێك و قورسی پەڕۆ و چەرم کوتانی پینەچی و کڵاشکەر.

مشتی فیرعەونی: وەك چنگی فیرعەونی ستەمکار، کینایەیە لە زۆرداری.

موئمین (ع): موسوڵمان، خاوەنباوەڕ.

موباهات (ع): شانازی و خۆبەزلزانین.

موبەددەلبوون (ع-ك): گۆڕان.

موتتەکا (ع): ڕاگر، ئەوەی خۆی بەسەردا بدرێ و ڕای بگرێ، پشتی.

موجەددەر (ع): ئاولاوی، چاڵوچۆڵ.

موجەسسەم (ع): بەرجەستە، دیار و بەرچاو، خراوە شێوەی تەن.

موجتەهید (ع): زانای ئایینیی گەورەی شیعە.

موحریق (ع): مایەی سووتاندن.

موحکەم (ع): وشەی ڕەوان و ئاشکرا کە لێکدانەوەی پێ نەوێ، ئەو بەشەی قورئانیشە کە لێکدانەوە هەڵناگرێ.

موحەصصەن (ع): قایمکراو، شوورابۆکراو، پارێزراو.

موحەصصیل (ع): باجگر، کۆکەرەوەی باج و داهات. مەبەست فریشتەی گیانکێشانە.

موحەققەر (ع): ناچیز، بێقەدر.
موحیط (ع): دەورەدەر (بازنە).
موختار (ع): ئەحمەدی موختار، ناساوێکی حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ).
موختەص (ع): تایبەت.
موختەصەر (ع): کورت و پوخت.
موخەیەر (ع): سەرپشك.
مودارا (ف): لەگەڵ ساچان، دڵڕاگرتن، لەگەڵ کەسێك هەڵکردن.
مودام (ع): هەمیشە، شەراب، بارانێ کە هەمیشە بباریّ.
مودخەل (ع): ڕژد و پارەپیس.
موددەعی (ع): ڕەقیب، نەیار و بەدکار، داواکار.
مودیر (ع): بەڕێوەبەر.
موراد (ع): مراز، مەبەست.
موڕڕە: کەسی زۆر ڕژد، ئەبوو موڕڕە کە ئیبلیسە، چەکوش.
مورغ (ف): پەلەوەر.
مورتەضا (ع): ناسناوی خەلیفە عەلی کوڕی ئەبووتالیب (خ.ڕ).
مورده (ف): مردوو.
موردەگان (ف): مردووان.
موردەمادەر (ف): دایكمردوو.
مورەصصەع (ع): ڕازاوە بە جەواهیر.
موژگان (ف): کۆی (موژە)یە، برژانگەکان.
موسافیر (ع): ڕێبوار، سەفەرکەر.
موستەوجیب (ع): شایستە.
موسەللەط (ع): زاڵ، باڵادەست.
موشتاق (ع): پەرۆش، سەوداسەر.
موشتەری: کڕیار، پێنجەمین و گەورەترین ئەستێرەی گەڕۆکی کۆمەڵەی خۆر.
موشك (ف): میسك.
موشكبۆ (ف): میسكبۆ، بۆنی وەك میسك.
موشكسا (ف): وەك میسك بۆنخۆش.
موشكفشان (ف): بۆنی میسك بڵاوکەرەوە.
موشكیل (ف): زەحمەت، ئەستەم.
موشكیلگوشا (ف): ئەوی چارەسەری کێشە بکا، گرێکوێرەکەرەوە، خۆشەوەکەرە.
موشكین (ف): هەر شتێ بۆنی میسکی لێ بێ.
موشكینزوڵف (ف): زوڵفی بۆنی میسك پێوە.
موشكین زوڵف و پەرچەم (ف-ك): زوڵف و پەرچەمی بۆنی میسك پێوە.
موشكینکەمەند (ف): کەمەندی بۆنی میسك پێوە.
موشەڕڕەف (ع): پیرۆز، شەرەفمەند.
موشیر (ع): ڕاوێژپێکراو، ڕاوێژکار.
موصطەفا (ع): ناسناوێکی حەزرەتی پێغەمبەرە (د.خ).
موصەللا: جێیەکی خۆشی شاری (شیراز)ی زێدی "حافظ" لە ئێران.
موصەووير (ع): وێنەگر.
موصیبەتها (ع- ف): کۆی (موصیبەت)ە، بەڵا و نەهامەتی.
موطیع (ع): ملکەچ، گوێڕایەڵ.
موعتەریف (ع): ددانپێدانەر.

موعجیزه (ع): شتێکی ناباوی بەمرۆڤنەکراو کە هەر پێغەمبەران دەتوانن بیکەن.
موعەظظەمتر (ع-ك): گەورەتر.
موعەمما (ع): مەتەڵ، قسەیەکە ماناکەی شاراوە بێ و بە ئاسانی نەزانرێ.
موغەیلان: درەختێکی کورتەباڵای دڕکاویی خۆراکی وشترە، لە دەشتە بێئاوەکاندا دەڕوێ. ئەوەندە بەرز نییە کەس بتوانێ لەژێریدا دابنیشێ.
موفلیس (ع): نابووت، مایەپووچ، لات و هیچنەدار.
موقابیل (ع): بەرامبەر.
موقارین (ع): شتێ کە هاوڕێ و لەگەڵ شتێکیتر بێ.
موقتەضا (ع): ئەنجام، پێویست.
موقتەضای طەبع (ع): ئەو خووەی کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤە.
موقیم (ع): جێگرتوو، نیشتەجێ.
موکافات (ع): پاداشی ڕۆژی قیامەت.
مول (ف): شەرابی ترێ.
مولازیممەنصەب (ع): خاوەنپلەوپایە.
موڵحید (ع): خودانەناس، بێدین.
مونتەظیر (ع): چاوەڕوان.
مونعیم (ع): خاوەننیعمەت، ئەوەی کە خەڵك موحتاجی دەستودەهەندەیەتی.
مونقەطیع (ع): بڕاوە، کۆتاییپێهاتوو.
مووان: دێیەکی ناوچەی (شارەزوور) لە سلێمانی.
موور (ف): مێرووله.
موورخەصڵەت (ف): تایبەتمەندیی مێروولەی هەیە، کینایەیە لە مرۆی لەسەرخۆی خۆگر.
مووریچە (ف): مێروولە.
مووسا، مووسە: حەزرەتی مووسا پێغەمبەر (د.خ).
مووشکاف (ف): مووقڵێش، کینایەیە لە وردبینی و زیرەکی.
موویمیان (ف): قەدباریکی، ناوقەد وەك موو باریك، بەلەباریکەیی.
موهرە (ف): مۆری یاری، مووراغەی پشت، ناوەڕاست.
مەبنی (ع): بنیاتنراو، دامەزراو.
مەبهووت (ع): ڕەنگبزڕکاو، کز و مات.
مەتاع (ع): کەلوپەل، شتی فرۆشتن.
مەثنەوی: شاکارە شیعرییەکەی مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی.
مەجرووح (ع): بریندار.
مەجزووب، مەجذووب (ع): ڕاکێشراو، جەذبەلێهاتوو.
مەجلیس (ع): کۆڕی دانیشتن و کۆبوونەوە.
مەجمەر (ع): ئاگردان، پشکۆدان، کینایەیە لە سینە.
مەجمەعە (ف): سینی.
مەجنوون (ع): دێوانە و شێت، قەیسی عامیریی دڵداری لەیلا کە بەهۆی عیشقی لەیلاوە وێڵی دەست و بیابان بوو.

مەجنوونکوش (ف): مەجنوونکوژ، بکوژی مەجنوون.
مەجووسی (ع): ئاگرپەست.
مەحجووب (ع): داپۆشراو (مەبەست شەرمنە).
مەحروور (ع): تادار.
مەحرووقدڵ (ف): دڵسووتاو.
مەحرەم (ع): ژن و پیاوێ کە دەستنوێژیان لەیەکتر نەشکێ.
مەحزوون (ع): خەمبار.
مەحشەر (ع): جێی لێکۆبوونەوەی خەڵك کە لە ڕۆژی حەشردا زیندوو کراونەتەوە و لە کردەوەی دنیایان دەپرسرێتەوە.
مەحشەرشەفیع (ع—ف): تکاکاری ڕۆژی جێی حەشری مەردوم.
مەحض (ع): پوخت، تەنها بۆ ئەوە.
مەحفەل (ع): کۆڕ. مەحفەلها: کۆی مەحفەلە.
مەحکەممەهار (ف): داری لووتی وشتر و پەتەکەی پێیەوە بەستراوە قایم بێ.
مەحموود: مەحموود ئاغای شێوەکەڵ، سەرۆکی شارەدێی شیوەکەڵ لە ناوچەی شارباژێڕ، کە لایەنگری حوکمی میرایەتیی بابان بوو. پاش ڕووخانی بابان، بە فێڵ هێنرایە سلێمانی و ژەهرخواردوو کرا. "پیرەمێرد" گەورەیی ئەو پیاوەی لە پیەسێکی شانۆییدا نیشان داوە.
مەحموودسان (ف): وەك سوڵتان مەحموودی غەزنەوی.
مەحمەل (ع): بارگەوبنە. مەحمەلها: کۆی مەحمەلە.
مەحو (ع): نەماو، پووکاوە.
مەحەببەت (ع): خۆشەویستی.
مەحەلل (ع): شوێن.
مەخلووط (ع): تێکەڵ.
مەخموور (ع): مەست، شەراباوی.
مەدار (ع): تەوەرە،کە بەرداشی لەسەر دەگەڕێ.
مەدح (ع): ستایش، پێداهەڵدان.
مەدد (ع): درێژی، درێژەکێشان، ماوە، هەڵچوونی شەپۆلی ئاو.
مەددی نەظەر (ع): تا چاو بڕبکا.
مەدرەسە (ع): حوجرەی فەقێ کە لەپاڵ مزگەوتدایە.
مەذبووحوار (ف): وەك سەربڕدراو.
مەر: مەگەر، بۆچی.
مەراق: خەفەت و داخ، خەیاڵ و خولیا.
مەربووط (ع): پێوەبەستراو.
مەرتەبە (ع): ئاست، پلەوپایە.
مەرجان: پاشماوەی ڕەنگسوور و نیشتووی گیانەوەری دەریاییی بەکۆمەڵژیاوی مەرجانە کە لە جەواهیرسازی و ڕازاندنەوەدا سوودی لێ دەبینرێ، کینایەیە لە سوور و ناڵ.
مەرحەمەت (ع): ڕەحم.
مەرد (ف): پیاو، جوامێر.
مەردوم (ف): گلێنەی چاو، خەڵك.
مەردومئازاری: ئازاردانی مەردوم.

مەردومەك (ف): گلێنەی چاو.

مەركەب (ع): شتێ بۆ سواربوونی وەك ئەسپ.

مەركەزشناس (ف): پایەناس، شارەزای كاروباری حوكم.

مەرگە: دێیەكی ئەوسای سەر بە ناوچەی (پشدەر) لە سلێمانی.

مەرگی موفاجات (ك-ع): مردنی لەپڕ.

مەروان: كوڕی حەكەمی چوارەم خەلیفەی ئومەوییە، كە دەسەڵاتی لە سوفیانییەكانەوە بردە دەستی مەروانییەكان. لە سەردەمی خەلیفە عوسمانی كوڕی عەففاندا (خ.ڕ) وەزیر و ڕاوێژكار بوو و بەشداری شەڕی (جەمەل)یش بوو. پاشان داوای خەلیفایەتیی كرد. سەرەتا خەڵكی ئوردون بەیعەتیان پێ كرد، ئەمجا چووە شام و لەسەر تەختی خەلیفایەتی دانیشت.

مەستوور (ع): داپۆشراو.

مەسجید (ع): مزگەوت.

مەسقەت (ع): مەسقەط، پایتەختی ئەمڕۆی مەملەكەتی عومان.

مەسكووك (ع): سككەی لێدراو، پارە.

مەسكەن (ع): نشینگە.

مەسموو‌ع (ع): گوێلێگیراو، بیستراو.

مەشام (ع): مشامّ، ئەندامی بۆنكردن، لووت.

مەشریق (ع): ڕۆژهەڵات.

مەششاطە (ع): ئەوی ئافرەت دەڕازێنێتەوە، كە شانەیشی دەكا.

مەشتاقی ئەزەل (ع): مەشقكەری ئەزەل، كینایەیە لە خودا.

مەشتاك (ع): پوازێكی نووكتیژە لە كلكەبێڵ و باڵتە دادەكوترێ تا لەق نەبێ، كینایەیە لە دەعبای نێرینە.

مەشق: ڕاهێنان و فێركردن.

مەشقجۆ (ف): بەدوای مەشق و فێربووندا گەڕاو.

مەشوەرەتجۆ (ف): خەریكی پرس و ڕاوێژ.

مەشوی: ناسناوی "مەحوی"ی شاعیری گەورەی كورد لە سەرەتای ژیانی شیعروتنیدا.

مەشهەد (ع): گۆڕ، جێی شەهیدبوون، شارێكی ئوستانی (خوراسان)ی ئێرانە و گڵكۆی ئیمام عەلی ڕەزای لێیە.

مەصحەف (ع): قورئانی پیرۆز، كینایەیە لە ڕووی یار.

مەصطەبە (ع): سەكۆ، پاردە.

مەصڵەحەتبین (ع-ك): ئەوی خێر و چاكە لە كاردا ڕەچاو دەكا.

مەضرووب (ع): لێدراو.

مەضموون (ع): ناوەڕۆك، واتا، ئەوەی لە نامەدا نووسراوە.

مەضموونكەش (ف): ماناكێش، واتادار و قووڵ.

مەطبەخها (ف): كۆی (مەطبەخ)ە، ئاشپەزخانەكان.

مەطـڵەبقەوی: داوا گەورە و بەهێز.

مەطـڵووب (ع): داواكراو، ئامانج.

مەظــڵووم: زوڵمڵێکراو.
مەظەننە (ع): گومان دەبرێ، مەزەندە، بۆچوون.
مەعبەر (ع): جێی پەڕینەوە، گوزەرگا.
مەعشووق (ع): دڵخواز، یار.
مەعیووب (ع): عەیبدار، لەکەدار.
مەغلووب (ع): بەزیو، تێشکاو.
مەقام (ع): پلەوپایە، شوێن، ئارامگا.
مەقدەم (ع): پێ‌وقووم، هاتن.
مەقصەدنەدیو (ع–ك): بەمەرامنەگەییو، نائومێد.
مەکان (ع): شوێن.
مەکتەبخانە: قوتابخانە.
مەکتووب (ع): نامە، نووسراو.
مەککارەبازاڕ (ف): شەیتانبازاڕ، بازاڕێکی فریودەری پڕ لە فێڵ و ساختەکاری.
مەکین (ف): مژین.
مەگەس (ف): مێش.
مەلفووفە (ع): پێچراوە، نامە یا قەباڵە یا هەرچییەکیتر.
مەللاح (ع): کەشتییەوان، مەلەوان.
مەلەخ (ف): کوللە.
مەلەخطەبع (ف): تەبیعەتکوللە، کە بەسەر هەر جێیەکدا بدا، وێرانی دەکا.
مەلەكخەصڵەت (ف): فریشتەخەسڵەت.
مەمات (ع): مردن.
مەنار (ع): منارەی مزگەوت، بینای بەرز کە ناو بە ناو بۆ دیاریکردنی دوورایی لە ڕێگادا دروست کراوە.

مەنازیل (ع): کۆی (مەنزیل)ە، ماڵان.
مەنبەع (ع): سەرچاوە، چاوگە.
مەنزڵگا (ع–ف): جێگە.
مەنصوور (ع): مەنصووری حەللاج کە ناوی ئەبوومەغیث حوسێن کوڕی مەنصوور و هاوچەرخی خەلیفە موقتەدیری عەبباسی بوو. بە تۆمەتی لەدین لادان گیرا و خرایە زیندان. سەرئەنجام بە فەرمانی حامید کوڕی عەبباسی وەزیری موقتەدیر، پاش ئەشکەنجەدانێکی زۆر، کوژرا. چەند کتێبێکی نووسیوە.
مەنصەب (ع): پایە.
مەنع (ع): نەهێشتن، ڕێلێگرتن.
مەنگەنە: گیرە.
مەنن (ع): گەزۆ، یەکەی کێشانەی بەرامبەر بە سێ کیلۆگرام، کینایەیە لە زۆر، کۆمەڵ.
مەنناع (ع): قەدەغەکەر، ڕێبەرەبەست.
مەنی (ف): خۆپەرستی، خۆویستی.
مەواجیب (ف): مووچە.
مەوج (ع): شەپۆل.
مەوجسان (ف): وەك شەپۆل.
مەوزوون (ع): ڕێك.
مەوکیب (ع): سوار یا پیادەی یاوەری پادشاهان لە ڕۆیشتندا.
مەولا (ع): خاوەن و سەروەر.
مەولانا: مەولانا خالیدی نەقشبەندی، پیری ناوداری ڕێبەری تەریقەتی نەقشبەندی.
مەولەوی: مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی.
مەه (ف): مانگ.

مەهئاسا (ف—ك): وەك مانگ.

مەهار: دارێکە دەکرێتە لووتی وشتر و پەتێکی پێوە دەبەسترێ، لە لەغاوی ئەسپ بەکارترە بۆ ڕامکردن و ڕاکێشان.

مەهپۆشی (ف): داپۆشینی مانگی ڕوو.

مەهپەیکەر (ف): پەیکەر لە شێوەی مانگدا.

مەهتووك (ع): سووك و بێنرخ.

مەهجوور (ع): وازلێهێنراو، دوور لە یار، چۆڵکراو.

مەهوەش (ف): لە چەشنی مانگ جوان.

مەهیب (ع): بەهەیبەت، شکۆدار.

مەهی پەردەنشین (ف): مانگی لە پەردەدا دانیشتوو، مەبەست یاری جوانە.

مەهی دووهەفتە، مەهی چاردەهەم (ف): مانگی چواردە، کە شێوەی بازنەیەکی تەواو و پڕی هەیە، بَدْر.

مەی (ف): بادە، شەراب، ئەو خواردنەوەیەی کە مەردوم سەرخۆش دەکا.

مەیپەرستان (ف): مەینۆشان.

مەیفرۆشان: شەرابفرۆشەکان، مەیخانەچییەکان.

مەیکەدە (ف): مەیخانە.

مەیگوون (ف): وەك مەی تەماشاکردنی خەڵك سەرخۆش دەکا.

مەیل (ع): ئارەزوو، حەز.

مەینۆشی ف): مەیخواردنەوە.

میان (ف): ناوقەد.

میانبەستە: پشتێنبەستوو، خۆئامادەکردوو بۆ خزمەت.

میانزەنبوور (ف): ناوقەد باریك وەك ناوقەدی زەردەواڵە.

میثل (ع): چەشن، وەك.

میحاق (ع): مانگگیران.

میحراب: شوێنی پێشنوێژ لە مزگەوتدا، کینایەیە لە برۆی یار.

میحنەتسەرا: مەینەتخانە، ماڵی خەم و پەژارە، کینایەیە لە دڵی خەمگین.

میحنەتنوما (ف): مەینەتنیشاندەر.

میحەن (ع): کۆی (میحنەت)ە، نەگبەتی.

میخلەب (ع): چنگ، چڕنووك.

مێخئەفگەن (ف): بزمارکوت.

میرئات (ع): ئاوێنە.

میرئالاّ (ت): میرلیوا، پلەیەکی بەرزی ئەفسەری سوپای عوسمانییە.

میرزا: کاتب، خوێندەواری زوو کە لە نووسیندا بەردەستیی کردووە. ناسناوی کابرایەکی دیاری ناو ئەم کتێبەیە.

میروەحە (ع): باوەشێن.

میری سوور: شەخس و زیارەتگایەکی دیاری شارەزوورە، نەخۆش و بەتایبەتی شێتی دەبرایە سەر بۆ چاکبوونەوە.

میسکین (ع): داماو، بێچارە.

میسکینغەریب (ف): غەریبی داماو.

میصر: وڵاتی میسر لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا.

میعراج (ع): بەرزبوونەوە، میعراجی حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ)، ئەوڕەوی پێغەمبەر لە مزگەوتی ئەقصاوە بۆ ئاسمانەکان.

میعمار (ع): تەلارساز.

میغناطیس: موگناتیس، ئاسنڕاکێش.

میقراض (ع): مەقەست.

میقراضەك (ف): زۆرانبازییەکە، زۆرانگر هەردوو پێی لە مل یا ناوقەدی هاوزۆرانەکەی گیردەکا و دەیگوشێتە یەك تا دەییەزێنێ، وەك بڵێی مەقەستی لێ گیربکا و بیقرتێنێ.

میل (ع): نیشانەیەکی درێژ یا بینایەکی بەرزە لە ڕێگەوباندا بۆ ئەوەی ڕێبوار ڕێی لێ ون نەبێ، دووراییی چوار هەزار هەنگاو. کینایەیە لە بەرزی و درێژی.

مینادڵی: دڵی لە شووشە، مەبەست ناسکیە.

مینقار (ع): دەنووك.

مێوڵی: دێیەکی ناوچەی (قەرەداغ) لە سلێمانی.

میهر (ف): خۆشەویستی، خۆر.

میهماننەواز: دڵی میوان ڕاگر، میواندۆست.

## (ن)

نائیرە: هێز و توانایی.

ناب (ف): ساف و بێخڵتە.

نابەڵەد (ف): ناشارەزا.

ناپایەدار (ف): ناسەقامگیر، ناسەرنەبوو.

ناتەوان (ف): ناتوانا، بێهێز.

ناچخ، نەچەخ (ف): تەورزین.

ناچیدە (ف): نەچنراو، لەلقێنەکراوە.

ناخودا (ف): کەشتییەوان.

ناخونوەلادە (ف): نینۆك وەك سەرەتەشی.

نادر (ع): نایاب و دەگمەن، نادرشای دامەزرێنی زنجیرەی پادشایانی ئەفشاری کە کۆتاییی بە حوکمی صەفەوی هێنا و دەسەڵاتی، جگە لە ئێران و دەورووبەری، گەیشتە هیندستان.

نادرظوهوور (ع): بە دەگمەن دەرکەوتوو، دەست هەموو کەسێ نەکەوتوو.

نادیدە (ف): لەبەرچاونەگیراو، نەبینراو.

نار (ع): ئاگر.

نارنجی زولەیخا: زولەیخا شەیدای جوانیی حەزرەتی یووسف بوو. ژنانی میسر کە یووسفیان نەدیبوو، بڕوایان نەکرد و کەوتنە لۆمەی. ئەویش داوەتی کردن و نارنجی خستە بەردەستیان. کە خەریکی پاكکردنی بوون و یووسف بەسەردا هات، جوانیی یووسف وەها سەرنجی ڕاکێشان، ئاگایان لە خۆیان نەما و دەستی خۆیان بڕی. مەبەست ئەو نارنجەیە.

نارەسیدە (ف): پێنەگەییو.

نارین: جۆگەئاوێکی لای چیای (حەمرین)ە لە خوارووی کوردستانی عێراق.

نارینقەڵا: قەڵایەکی بچووکی ناوەڕاست کە چەند قەڵایەکیتری بە دەورەوە بێ، یان ڕەنگە ئەو قەڵا بچووکەی بە هەمان ناوەوەی شاخی (دمدم)ی سەردەمی "خانی لەپ زێڕین" بێ، کە حەرەمسەرای ماڵومنداڵی بوو.

نازپەروەر: بە ناز پەروەردەکراو.
نازش (ف): نازین.
نازکنیگار (ف): جوانئەخشێنراو.
ناسەلامەت (ك-ع): سەلامەتنەبوو.
ناسەنجیده (ف): نەکێشراو، لەکێشانەنەدراو.
ناصیح (ع): ئامۆژگاریکەر.
ناصییە (ع): ناوچاوان، تەوێڵ، لای پێشەوەی سەر.
ناظیم (ع): ڕێکخەر.
ناعالِم (ك-ع): نەزان، نازانا.
ناف، نافه (ف): ناوك.
ناقابیل: ناچیز و نابووت.
ناقە (ع): وشتری مێنگە.
ناقەزانوو (ع-ف): ئەژنۆ هێندەی ئەژنۆی وشتر.
ناکا (ف): ناکاو، کوتوپڕ.
ناگاه (ف): لە ناوەختدا، لەپڕ.
ناگەه (ف): ناخافڵ، کوتوپڕ، ناوەخت.
ناگوریز (ف): دەستهەڵنەگر، وازنەهێن، لێدەربازبوونی بۆ نییە.
نالی: ناسناوی شیعریی خدری مەلا ئەحمەدی مکایەڵیی شاعیری ناوداری کورد.
نام (ف): ناو.
نامورادی: بەئاواتنەگەییوی.
نامەد (ف): نەهات، نەگبەتی و بەدبەختی.
ناودان (ف): پلووسکی ئاو.
ناوەك (ف): جۆرە تیرێکە.
ناوەکئەفگەن (ف): تیرهاوێژ، تیرخەرەخوارەوە.
ناوەکئەنداز (ف): تیرهاوێژ.
نگین: ئەو بەردە بەنرخانەن کە دەکرێنە نقێمی ئەنگوستیلە و یاقووت یەکێکە لەوانە.
نموودار (ف): دەرکەوتوو.
نمەك: خوێ، نان و نمەك.
نمەکدان: خوێدان.
نمەکگیربوون: چاوبەرەوژێربوون، لەبەرچاوبوونی چاکە و جوامێریی یەکێك.
نوخوستین (ف): یەکەمین.
نودەما (ع): کۆی (نەدیم)ە، هاونشینان.
نوسخە (ع): ڕوونووسکراو.
نۆش (ف): هەنگوین، ئاوی زیندەگانی.
نۆشین: خواردنەوە.
نوصەیری (ع): خەڵکی دانیشتووی شاخی عەلەوییەکان و باکووری سووریا (دەشتەکانی حومص و حەما و حەڵەب). محەمەد کوڕی نەصیر بنیاتنەر و دامەزرێنی ئەم تیرەیەیە.
نوقرەگوون (ف): وەك زیو سپی.
نوقطەی بەصەر: گلێنەی چاو.
نوقطەی ثابیت (ع): یەخاڵی جێگرتوو کە لە جێی خۆی نابزوێ.
نوکتە (ع): خاڵی ڕەش لە شتی سپیدا و بە پێچەوانەیشەوە، مەسەلەی ورد.
نومایان (ف): ئاشکرا و دەرکەوتوو.
نووح: یەکەم پێغەمبەرە و دەگاتەوە بە ئادەم. بە باوکی دووەمی ڕەگەزی مرۆڤ دادەنرێ.

داستانی ژیانی ئەو و ڕووداوی تۆفان و کەشتیی نووح بەناووبانگە و لە قورئانی پیرۆزدا جێ‌کراوەتەوە. لەبەر ئەوەی میللەتەکەی سەرپێچییان لێ کرد، خودا داوای لێ کرد کەشتییەك دروست بکا. نووح و ئەوانەی وا باوەڕیان پێ هێنابوو و جووتی هەر گیانەوەرێك خرانە ناو کەشتی. تەواوی زەوی نوقمی ئاو بوو. هەرچییەك لە دەرەوەی کەشییەکەدا بوو، لەناو چوو.

نوون (ع): ماسی.

نەباتات (ع): کۆی (نەبات)ە، ڕووەکەکان.

نەجد: هەرێمێکی ناوەڕاستی ولاّتی سعوودیە.

نەحس (ع): شووم، مایەی نەگبەتی.

نەحل (ع): مێشەنگ.

نەخ (ف): تاڵی دەزوو.

نەخ نەخ (ف): کەم کەم.

نەخلی موراد: دارخورمای ئاوات، داری ئاوات. مانایەکی مەجازییە و وا ڕۆیشتووە، دەبێ لەبەر شیرینییەکەی بێ، دەنا دار هەر دارە.

نەدارا: بێ‌ماڵ‌وحاڵ، ئەوی هیچی نەبێ.

نەدامەت (ف): پەشیمانی، نەگبەتی.

نەدیم (ع): هاونشین.

نەردەبان (ف): پەیژە.

نەڕراد: زارهەڵدەر.

نەڕنایش: زەلامی گەورە و ناقۆلاّ.

نەڕنایش‌ژن: ژنی عووجی کوڕی عەنەق، ژنی گەورە و ناقۆلاّ.

نەریمان (ف): باپیری ڕۆستەم و باوکی سامە. پاڵەوانێکی ئازا و شەڕکەر بووە و دواجار لە قەلاّی (سپید)دا کوژراوە، ڕۆستەم تۆڵەی سەندووەتەوە.

نەزار (ف): باریك، بێ‌هێز و لاواز.

نەزاکەت (ف): نەرم‌ونیانی نیشاندان.

نەزاکەت‌عەجەم (ف): بە نەرم‌ونیانی وەك عەجەم.

نەزدیك (ف): نزیك.

نەزع (ع): گیانەلاّ.

نەسخ (ع): سڕدراوە، کوژاوە.

نەسرین: گوڵێکی بچووکی سپی و سەد پەڕەیە.

نەشئونوما (ف): پەیدابوون و گەشەکردن و گەورەبوون و پێگەیشتن.

نەشئە (ع): مەستی، خۆشی.

نەشکوفتە (ف): نەپشکوتوو.

نەشیب (ف): نشێو، نزمایی.

نەصارا (ع): گاوران.

نەظم (ع): ڕێکخستن، هەڵبەست.

نەظەر (ع): تەماشاکردن، ڕوانین.

نەغمەخوان (ف): نەغمەخوێن، گۆرانیبێژ.

نەفحە (ع): بۆنی خۆش. نەفحەها: بۆنە خۆشەکان.

نەفع (ع): سوود.

نەفەس (ع): هەناسە، دەروون.

نەفەس‌گرتن: هەناسەدانێکی هێواش و هەست‌پێ‌نەکراو، وەك ئەوەی ئەو کەسە هەناسەی لە خۆی بریبێ.

نەفیر (ع): ئاوازی بەرز.
نەقد (ع): پارە، دراو.
نەقدەدەرکەف (ف): پارەلەمشت، کینایەیە لە دڵلەسەردەست بوون.
نەقش (ع): نەخش، نیگار. نەقشی بەری پێ–جێپێ.
نەقارە (ف): ئاواز و ناڵەی مۆسیقا.
نەمروود: لە وەچەی حامی کوڕی نووحە، بە سەرکێشی و ملهوڕی بەرامبەر بە حەزرەتی ئیبراهیم خەلیل ناوی ڕۆیشتووە و بانگەوازی خودایەتیی کردووە.
نەم‌نەم (ف): دڵۆپ دڵۆپ.
نەمەك (ف): خوێ.
نەمەکدان (ف): خوێدان، دەفری خوێتێکردن، کینایەیە لە دەمی یار.
نەمەکرێز (ف): خوێڕێژ، مەبەست برین کولاندنەوەیە.
نەمەکزار (ف): خوێڵێن، جێی خوێ، کان بێ یا ئاو.
نەمەك‌سوود (ف): خوێتێسووراو، خراوە ناو ئاو و خوێ، گۆشتی کەباب کە خوێی تێدەکرێ و هەڵدەگیرێ.
نەمەکین‌ڕوو (ف): ڕووی جوان، ڕووی سوێر کە مرۆ تینوێتیی لێ ناشکێ.
نەمەکین‌لەب (ف): لێو سوێر و خوێدار.
نەنگ: شوورەیی.
نەو (ف): نوێ.
نەوا (ف): ئاواز.
نەوبەت (ع): نۆرە.
نەوبەر: نۆبەرە، یەکەم بەری دار.
نەوبەهار: سەرەتای بەهار.
نەوتی: دێیەکی ناوچەی قەرەداخ.
نەوحە (ع): شین و گریان.
نەوخێز (ف): تازەهەڵچوو.
نەوس: چڵێسی بۆ خواردن، کینایەیە لە دەعبای نێرینە.
نەوصۆفییەکان: صۆفیی تازەکار.
نەوع (ع): جۆر.
نەومیدی (ف): نائومێدی، بێهێوایی.
نەونیهال (ف): نەونەمام.
نەوید (ف): موژدە.
نەوێ: دێیەکی ئەمدیوی چیای سوورکێو لە ناوچەی سەیید صادق.
نەهار (ف): ڕۆژ، فراوین، نیوەڕۆژە.
نەهر (ع): ڕووبار.
نەهەنگ: ماسیی گەورە، حووت.
نەهەنگ‌ئاسا: وەك نەهەنگ.
نەی (ف): قامیش، قامیشی شەکر، شمشاڵ.
نەیرەنگ (ف): جادوو و فروفێڵ.
نەی‌شەکەر (ف): قامیشی شەکر.
نەی‌شەکەرقامەت (ف): بەژن وەك قامیشی شەکر شیرین و باریك.
نەی‌صیفەت: وەك قامیش کە زوو ئاگر دەگرێ و زوویش دادەمرکێتەوە.
نەیرەنگ (ف): جادوو، فێڵ.
نەیستان (ف): جاڕی نەی، قامیشەڵان.

نەینەوا: مووسڵ.
نیا (ف): نەوە، بەتایبەتی کوڕ و کوڕەزا، میراتگر.
نیثار (ع): پایەنداز، پێشکەشی بەرپێی خۆشەویست و بەڕێز.
نێرکەکاردوو: نێرك- لاسکی تازە و ناوەڕاستی گیا، کاردوو- گیایەکی گەڵاپانە، بە چێشت لێدەنرێ و دەخورێ. کینایەیە لە بێجورمی و قەوارەبچووکی.
نێری: حەبوانەکێویی شاخداری نێر.
نیشاط (ع): چاکی و گو رجوگۆڵی.
نیشتەر: نەشتەر.
نێش (ف): چزوو، ئازار، نووکی تیژی هەر شتێکی نووکداری وەك دەرزی و سووژن و خەنجەر و ئەوانە و چزی دووپشك و گازی مار و ئەو جۆرە ئازارگەیێنانە.
نیظامولمولك (ع): نظام الملك، ڕێکخەری کاروباری مەملەکەت، سەرەكوەزیرانی مەلەکشای سێیەم گەورەترین سوڵتانی سەلجووقی.
نیعمەتها (ف): کۆی (نیعمەت)ە، ڕۆزی و بژیو.
نیقاب (ع): ڕووپۆش، چارشێو.
نیك، نیکوو (ف): چاك.
نیكنامی (ف): ناوجوانی، ناوبانگچاکی.
نیکوورِوو: ڕوخسار جوان.
نیکی (ف): چاکی.
نیگاه یا نیگەهـئاهوو (ف): نیگای وەك نیگای ئاسك جوان.
نیگار (ف): یار، مەعشووقە.
نیگارش (ف): نووسین، نەخش و نیگار کێشان.
نیگارین (ف): نەخشین، ڕەنگین، نەخشێنراو.
نیگوون (ف): سەربەرەوخوار، سەرشۆڕ، دانەویو.
نیل (ع): ڕووباری بەناووبانگی وڵاتی میسر، شین.
نیلگوون (ف): ڕەنگ شین، نیشانەی پرسە و ماتەم.
نیلووفەرستان (ف): جاڕی گوڵەنیلۆفەر، کە گیایەکی وەك لاولاوە و گوڵەکانی ئاوی و سپی و بە ڕەنگیتریشن.
نیمجۆ (ف): نیو دەنکەجۆ.
نیمدانگ (ف): نیودانگ.
نیموەصڵ (ف): بەیەكگەیشتنێکی نیوەناچڵ.
نیهال (ف): نەمام.
نیهان (ف): پەنهان، نهێنی.
نیهانی (ف): نهێنی.
نییەت (ع): نیاز.

## (و)

وا (ف): کراوە.
وابوون: کرانەوە، دەمکرانەوە.
واپەسماندەگان (ف): لەپاشمردووماوەکان، ئەوانەی کە لە پاشدا دەمێننەوە.

وا حوسەین (ع): حوسەین ڕۆ.
وا حەسرەتا (ع): داخەکەم، بەداخەوە.
وادی (ع): شیو، دۆڵ.
واروون (ف): هەڵگەڕاوە و پێچەوانە، سەوەوخوار.
وازکردن: کردنەوە، والاکردن.
واژگوون (ف): وەرگەڕاو، هەڵگەڕاوە.
واقیف (ع): خەبەردار.
واکردن: کردنەوە.
وامیق: دڵداری شەیدای عەذرا کە داستانێکی خۆشەویستییان لەبارەوە هەیە. بەسەرهاتەکەیان هی پێش ئیسلام و سەردەمی ئەسکەندەری گەورەیە.
وجوود (ع): بوون.
وشتڕئاسا: وەك وشتر.
وەثەنی (ع): بتپەرست.
وەثەنی (ع): بتپەرست. وەثەن: بت.
وەجەب (ع): درێژایی بست.
وەحشەت (ع): تەنیایی، دڵتەنگی.
وەحشەتکردن (ف): سڵکردنەوە لە تەنیایی.
وەخشین: بەخشین.
وەر (ف): وە ئەگەر.
وەرامین: شارێکی سەر بە (ڕەی)ی جاران.
وەرع (ع): لەخوداترسان، خۆلەگوناهپاراستن.
وەر نە: ئەگەر وا نییە.
وەزن (ع): کێش، سەنگ.
وەزیدەن (ف): هەڵکردنی با.
وەستەك: هەر گیاندارێکی زۆرترین کات وەستاو.
وەش (ف): چەشن.
وەصف (ع): وەسف، باسلێکردن.
وەصڵ: بەیەكگەیشتن.
وەضع (ع): حاڵوبار.
وەطەن (ع): نیشتمان.
وەعدە (ع): وادە.
وەغا (ع): جەنگ.
وەفاکردن (ف): وەفاداری نواندن.
وەکیل: بنەماڵەیەکی ناسراو و دەسڕۆی ئەوسا شاری سنە لە کوردستانی ئێران.
وەلادە (ف): سەرەتەشی.
وەلیمونعیم (ف): سەرپەرشتی دابینکەری ڕۆزی.
وەلێ: بەلام.
وەندات: وەندییەکان.
وەه (ف): ئای.
وەهوەه (ف): هەی هەی، ئای ئای، وشەی دەربڕینی سەرسامییە.
وەهەق (ع): پەتێکی سەربەئەڵقەیە، دەکرێتە ملی ولاخ و پێی دەگیرێ.
وەیسە: دڵخوازی ڕامین کە داستانێکی دڵداریی زەمانی ئەشکانییە، بە سەرەنجامێکی ناخۆش کۆتایی پێ هاتووە.
ویداع (ع): ماڵئاوایی، خوداحافیزی.
وێرانەمەکان (ك-ع): شوێنێکی وێران.
وێرانەماڵ: ماڵلێتێکچوو.

ویرانەمەکان (ك-ع): جێی کاول و ویران.
ویژان: وتن.
ویسعەت (ع): فراوانی.
ویصال (ع): گەیشتن بە یار.

ویقار (ع): ڕێز و سەنگینی.
ویلایەت (ع): هەرێمی ژێر حوکمی دەوڵەتی عوسمانی.

(هـ)

هذا القیاس (ع): بەم پێیە.
هارووت: یەکێ لە دوو جادووگەرەکەی بابل (هارووت و مارووت)، کە بەهۆی گوناهیانەوە لە بیری بابلدا هەڵواسران.
هالە (ف): خەرمانەی دەوری مانگ لە شەوانی مانگەشەودا کە هەوای تێدا شێدار بێ.
هامان: وەزیر یا ڕاوێژکاری فیرعەون لە سەردەمی مووسا پێغەمبەردا (خ.ڕ)، کە خراپەکار بووە و فیرعەونی بە لاڕێدا بردووە و خراپەی پێ کردووە.
هاموون: سێ دەریاچەی ڕۆژهەڵاتی ئێران و ئەفغانستانە و گەورەترینیان ئەوی لای سیستانە. دەبێ مەبەست چۆڵ و دەشت و بیابانی ئەو ناوە بێ.
هاولاقی: هاوجووتی.
هایل (هائیل) (ع): سامناك.
هو الحق (ع): لەباتیی ((أنا الحق))ی حاڵی ((فنا فی الله))ی سۆفییەکان بەکارهاتووە. لەباتیی (أنا) مەبەستی دڵە، حەقیش خودا نییە و یارە.
هورموز (ف): ناوی پێنج پادشای دەوڵەتی ساسانییە. چوارەمیان کوڕی خوسرەوی یەکەم بوو. سەرەنجام بە پیلانی خوسرەو پەرویز خرایە زیندان و کوێر بوو.
هوزار (ع): بولبول.
هۆلاکوو: داگیرکەرێکی مەغۆلی و دامەزرێنی دەوڵەتی مەغۆلیی ئیلخانییە لە ئێران. میرانی فارس و ئیسماعیلیی لە ئەلموت ملکەچ کرد و خیلافەتی عەبباسیی لەناوبرد و سووریای گرت.
هوما (ف): پیرۆزە، باڵندەیەکە لە ئەفسانەدا بە پیرۆز و فەڕدار دانراوە. دەڵێن بەسەر هەر کەسێکەوە سێبەر بکا، دەبێ بە پادشا.
هوماسایە (ف): ئەوی سێبەری هومای بەسەرەوە بێ، کە -دەڵێن- بەسەر هەر یەکێکەوە بێ، دەبێتە پادشا.
هونەرگەرمی: گەرمەی هونەرنواندن.
هوو (ع): هُو، مەبەست زاتی خودایە هووەیدا (ف): ئاشکرا و دیار.
هەتاوبردوو: بە تاوی هەتاو سووتاو، گڕەبردوو، مەبەست یا گەرمای بەتین یان بێئاوییە.
هەتیتەی دڵ: هەتیتە پارچە پۆلایەکی کونکونە، زەڕەنگەران تاڵە زیو و زێڕی پێ دەگوشن و ڕاست دەکەنەوە. کینایەیە لە وردەکاری.

هەجوو (ع): داشۆرین.
هەدەر (ع): فیرۆ و خۆڕایی، خوێن بە خۆڕایی ڕژان.
هەراسان: وەڕس، بێزار.
هەرجا (ف): لە هەر کوێیەك، هەر جێیەك.
هەردەم (ف): هەموو کاتێك.
هەرزەگەرد (ف): بەتاڵ پێ، گەڕۆکی بێ کارە، بێ ئامانج سووڕاوە.
هەرەس: دارمانی بەفر لە بەهاردا کە هەموو ژێرەکەی دەتوێتەوە و بە پارچەی گەورە تل دەبێتەوە و زۆر جار بەسەر ماڵاندا دێ و کاولیان دەکا و خەڵکەکەی دەبن بە ژێرەوە، یا دارمانی زەوییە.
هەرەس کووبیدە (ك-ف): بەهەرەس کوتراو، هەرەس بەسەرداهاتوو.
هەزیان (ع): هذیان، وڕێنە، قسەی بێ سەروبەر.
هەزیمەت (ع): تێشکان، بەزین.
هەستی (ف): بوون، وجوود.
هەفتخوان (ف): داستانێکی شانامەیە و بەسەرهاتەکانی ڕۆستەمە لە ڕێی مازەندەران، کاتێ چووە بۆ ڕزگارکردنی کەیکاووس لە بەندی و تووشی شەڕ بووە، بە هەفتخوانی ڕۆستەم ناسراوە.
هەفتەم (ف): حەوتەمین.
هەلاهیل: ژەهرێکی کوشندەی بێ دەرمان.
هەڵتووڕاندن: ڕاکردن بە جووتەوەشاندنەوە، کەوتنە بەلەفیرە.
هەڵکردن: لابردن و فڕێدان.
هەڵگڕان: هەڵگیرسان، ئاگر تێ بەربوون.
هەڵۆبین: چاوی وەك چاوی هەڵۆ تیژ.
هەڵۆی غەم: خەم و خەفەتێکی زۆر و بەئازار، شوبهاندنی خەمە بە هەڵۆی ڕاوچی.
هەڵەبجە: ناوچەیەکی ڕۆژهەڵاتی سلێمانی.
هەماغۆش (ف): هاوباوەش، باوەش لەناو باوەشدا، باوەش بە یەکتردا کردوو.
هەماوەرد (ف): دوو شەڕکەری بەرامبەر بە یەکتر وەستاو، هەریەکەیان هەماوەردی ئەوی تریانە.
هەمبۆ (ف): هاوبۆن.
هەمحوسن (ف): هاوجوانی، هاوشانی جوانی.
هەمداستان (ف): هاوداستان، هاوبەسەرهات.
هەمدۆشی (ف): هاوشانی.
هەمدەرد (ف): هاودەرد، هەمان تاڵی و سوێری چێشتوو.
هەمدەرس (ف): هاودەرس.
هەمڕاز (ف): هاوڕاز، هاودەم.
هەمڕەه (ف): هاوڕێ.
هەمزاد (ف): هاوسك، هاوزا، هاوزەمان و پێکەوە لەدایکبوو.
هەمزانوو (ف): هاوئەژنۆ، ئەژنۆ بە ئەژنۆوە، هاوخەم و هاودەم.
هەمسیلك (ف): هاوڕشتە، دوو شت کە بەیەکەوە بهۆنرێتەوە.
هەمشانی (ف-ك): هاوشانی.
هەمفەرد (ف): دۆست، ئاشنا.

هەمەنزڵ (ف): هاوماڵ.
هەمنشین (ف): هاونشین، هاوماڵ، هاودەم.
هەمەجا (ف): لە هەموو شوێنێکدا.
هەمیسان: دیسان، دووبارە.
هەنگام (ف): کات، دەم.
هەنگامە (ف): کۆبوونەوەی خەڵك بۆ تەماشاکردنی شەڕی یاریکەران، ئاژاوە و ئاشووب، هەراوهوریا.
هەواکردن: ئارەزووکردن.
هەواگەرمی: کاتێ هەوا لە هاویندا گەرم دەبێ.
هەوشار: شاهیندژ، کاتی خۆی شارۆچکەیەکی نێوان بۆکان و مەراغە و میاندوواوە لە کوردستانی ئێران، ئێستا شارێکی گەورەیە.
هەولێر: شاری هەولێر.
هەیوولا (ف): پەیکەر.
هیجر (ع): دووری و لێجوێبوونەوە.
هیچنەدان (ف): هیچنەزان.
هیلال (ع): مانگی یەكشەوە.
هیلال ئاسا: وەك مانگی یەكشەوە.
هیممەتبوڵەند (ف): ورەبەرز.
هیندوو: هیندی، کینایەیە لە ڕەشپێست، ڕەش بۆ خاڵ و زوڵف، پاسەوان، خزمەتکار.
هیندوویی‌خاڵ: خاڵ ڕەش.
هیندوویی‌گێسوو (ف): ئەگریجەی ڕەش.
هێزمفرۆش (ف): دارفرۆش.

## (ی)

یاری غار (ف): کینایەیە لە ئەبووبەکری صیددیقی هاوسەفەری حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) لە کۆچەکەیدا لە (مەککە)وە بۆ (مەدینە) کە لە ئەشکەوتی (ثەور) مانەوە و بەرچاوی خەڵکی قورەیش نەکەوتن. ئاماژەیشە بە ئایەتی ژمارە ٤٠ی سوورەتی (التوبة): ((إلا تَنصُروه فَقد نَصَره الله، إذ أخرجَه الذين كَفروا ثاني اثنين إذ هما في الغار إذ يقول لصاحبه: لا تحزن إنّ الله معنا فأنزل الله سكينته عليه وأيده بجنود لم تروها وجعل كلمة الذين كفروا السُفلى وكلمة الله هي العُليا والله عزيز حكيم)).
یاقووتی ئەحمەر (ع): فرمێسکی سوور.
یاقووتی لەب (ف): لێوی ئاڵ و سوور.
یاڵ: تووکی ملی ولاخی یەكسم.
یۆز (ف): دڕندەیەکی لە پڵنگ بچووکترە.
یومن (ع): بەرەکەت.
یووسف: کوڕی یەعقووب پێغەمبەرە. براکانی ڕقیان لێی بوو، چونکە باوکی بە منداڵی زۆر خۆشی دەویست. بۆیە لە بیاباندا خستیانە ناو بیرێك. کاروانچی لە بیر دەریانهێنا و لە میسر فرۆشتیان. زولەیخای ژنی عەزیزی میسر شەیدای بوو و کە ملی بۆ نەدا، لە زیندانی نا. پاشتر بووە حوکمداری میسر.
یەئجووج و مەئجووج: میللەتێکی مایەی سەرئێشە بوون. ئەسکەندەری گەورە بەربەستێکی لەبەردەمدا دروست کردن تا ڕێگری لە خراپەکاریان بکا.

یەد (ع): دەسەڵات و زۆر.
یەدبوون: دەسەڵات هەبوون، هەبوونی هێز و توانایی، بۆ لوان.
یەدی بەیضا (ع): دەستی سپی، ئەو دەستەی مووسا کە لە بەردەمی "فیرعەون"دا کردی بە باخەڵیدا و دەریهێنا، بوو بە ڕووناکی و بەرەو ئاسمان بەرز بووەوە. ئەمە بووە مایەی سەرسامییان.
یەسار (ع): چەپ.
یەعقووب: کوڕی ئیسحاق پێغەمبەر و باوکی حەزرەتی یووسف.
یەغما (ف): تاڵان.
یەقین (ع): ڕاستی، قسەهەڵنەگر، بێچەندوچۆن.
یەکایەك (ف): یەك بە یەك.
یەکەتاز (ك-ف): پێشەنگ.
یەك تەویلە: پڕی یەك تەویلە.
یەکجیهەت (ف): یەکلا، یەکدڵ، هاودڵ.
یەکخستن: دووشت کردن بە یەك، لێکدانی دوو شت.
یەکدەم (ف): هەناسەیەك، تاوێك.
یەکدڵ: هاودڵ، نەگۆڕ و لەڕێیخۆلانەدەر.
یەکشەبە (ف): یەکشەوە.
یەککەتاز (ف): سواری تاك و خێرا لە غاردا.
یەل (ف): پاڵەوان، ئازا.
یەلدا (ف): درێژترین شەوی پایز کە ڕێکەوتی دواین شەوی پایز و یەکەم ڕۆژی زستان دەبێ. وشەکە لە بنەڕەتدا سریانییە، شەوەزەنگ.
یەلی: پاڵەوانی.
یەم (ف): دەریا.
یەمی ئەشك (ف): دەریای فرمێسك، کینایەیە لە فرمێسکی زۆر.
یێرش (ت): هێرش، پەلامار.

سنبلی طرّه که پر ژینه بپهلوی گلا　　مو بمو هر یکه داویکه لرّی مرغی دلا

روشنی دا و بدل روژن تیم تخدنگ　　دکتی لهی زرزی دستی تحکانت لی کلا

سری تحنه دهنت جاکه زراین قناعت　　نمکت آلوده کن با جگری نفسلا

گر لروی گل دلی من شاده بی خنده تو　　با بدا دست قضا مردم دیدم بجلا

یارکله بو له دلم چونکه نسوتا لفراق
لعقصه رحقی وسالمی مسکین حجلا

دیده ما
بی تماشای خالی تو خالی له مردم　　عکسی او بو مردمی دا نالیسه ردیده ما

شعله نی دا فرصتی پروانه ظلمت سیات　　سر بر سته لبی شمعا همو پوشیده ما

وانبولیوت سبزه ما خیالی تو　　غنچه سیراب شکفت چو پیچیده ما

روی وک لالت له تشناکی تا رنگیکی بیت　　داغ حسرت تا قیامت بو دلی بچیده ما

تا دلیم مرو تکه رحیمی جور تو افزون بی　　داد بیدادی لکو سیا هرو نا شنیده ما

کوا ترازوی قیاسی وزن حتی بی تم　　مهر سنگینت گلقه دل نا سنجیده ما

نظم سامانی لکوی بو عاشقی شوریده بخت　　موی شفته سرم درهم شوریده ما

نالی

سنبلی طرّه که پرچینه بپهلوی گلا — مو بمو هر گریه داوکیه لری مرغی دلا

روشنی داوه بدل پورتن سیمی تخنگت — وک الهی ززی دستی تخانت بە گلا

سری نکتهٔ دهنت چاکه نزانن قفلت — نمک آلوده مکن با نجمیری نفسلا

گرلروی گل دلی من شاده بی خندهٔ تو — با بدا دست قضا مردم دیدم بجلا

یارگله بو له دلم چونکه نسوتا لفراق

لقصه رجعی وسالی پسکین حجلا

بی تماشای خالی تو خالی له مردم دیده ما — عکسی او بو مردمی دانالسر دیده ما

شعله‌یی دا فرصتی پروانه طلعت کا بیات — سربرسته لبی شمعا هموتو شیده ما

وانجو لیوت لسبروه ما خیالی تو — غنچه سیراب نشکفت چون تا چیده ما

روی وک لالت له شمانک تاکه رنکی ریت — داغ حسرت تا قیامت بو دلی بخشیده ما

تا دلیم مرو تکه رحسی جور تو افزون بی — داد بیدادی لکو شیا هرو نا شنیده ما

کو آترا روئی قیاسی زن چنی پی تلم — مهر پسکینت لکلشه دل نا سنجیده ما

نظم سامانی لکوی تو عاشقی شوریده بخت — موی شعشه سرم زرد جسم هموزو لیده ما

نالی

شعلەی اشکم دلی هەلبی بروما     هەتا بی بحری ئاغەکز بروما

درانی چونە احوالم لە هجرت     وکو شەونم لەناو گەڕی زەقوما

لەپیر پیشاعروسی یا دوصلت     بەرونا ئی بحنە آرزوما

دمی وصفی دمی تعنیت دلرزی     رگی گردن لە سەر تعنیت گلوما

لەسحری غمزەی معلومم اگرچی     ارسطو بم لە ادراکی عقلوما

لەکورەی دل دەبن دمی آە سردم     تعجب تیغ بی لیت وچاوی تیغ ما

تجاوزکی لە کاسپام لە امرت

کسی نی دیوە روبختی لەموما

وکو فوارە خوین دفتلی دمی بحم حلقوما     بەدل چو پیستە تا سوراخی بکات لە پەهلوما

مگروحتی لەسپری خال حیرت دانەی زنع بی     لە سیا بی مردمکت تیکی انگل لە اشکم لەسەر بوما

لەهجرت مصیبت ناشلی سرهبرم مکدم     تخوینی اشکما چپیا وپیشانی زرابوما

لەسەر رولادەتاری طرە مشکین بابالات     حبشی دەستی لە طاول رانکیشی لەسەر بوما

اگرچی کارەیە دەردەم ولی دیلەیە لە شکینم     بەپرزینی حکیم آزرقی حیرت بەدار روما

سالم

بساطه دوست دلبر دلی پامالم کرینه
لماوجمعی پریشانتا بحلقه چینی گیسوما

کری به تو نسبت طرّت به مشک خطا ‌ ‌ ‌ بو خطا فخره به سا بو منه لیس خبط و خطا

شیوه ابروی طاقت همه جا دیه نظر ‌ ‌ ‌ دکری دل طرف تو وه کو قبله نما

کی بچکالی باهوی غمزه دکوی طاق دل ‌ ‌ ‌ تا له زاغی خمی زلفت هیتی قبله نما

ابد از رنگ عدم نایته رو کی شاهی عشقت ‌ ‌ ‌ بدمی تیغی سپیته ا درزی آب بقا

لد ولا زلف بلا جو که به لا دنو یتی ‌ ‌ ‌ نفی مانندی لطیفی رخی جانانه دکا

کی لسر طره دکا دست خیالم بربت ‌ ‌ ‌ تو بهی کیه بکا دسته سنبل بقلا

مرغ پروحشتی دل ادشو وتقی بی ‌ ‌ ‌ لرخ وطره تو در دکوی دام و حب

نقد جان و دل ودین پشکشی یک نکهت ‌ ‌ ‌ کر قبولی کی لمی سوخته دل زوی نما

دره ساپحه بخوینی دلی پامالم کره
شبه ام رنگه بدایم نیه وک رنگی حنا

چاوه کت وحشی یا مبلی جامی می دکا ‌ ‌ ‌ هرچه می بکا لکل تو او لکل امی دکا

مستو سیری چینی زلفت کاندوزی عارضت　　هەر کسی پێی نی دیوە تاریکی لەبر شوقی چرا

من دەمێکە خۆبخۆی یاری قدیمی شارەزام　　دشمنی یارانی دێرینە و بە دشمن آشنا

غرقی بحری عشقە سالم دەستی یا پای چەندی نیە

قەد شنا ناکا لە دریادا کەسی پێت و پا

رازی دل اگر بتریت خبر دا　　ددی دەستی نگارینت بسر دا

شطی خوینی دی بەرو ناگرتی جگر بە　　دەمی یکە بە پێ پسکی دیدە بردا

قبولا بی حجی کعبەی وصالت　　اگر دل حلقەی او زلفە بر دا

اوند عقدەی نهانم کوتە ناو دل　　دەرتیم بایە ام دەردە دەر دا

بجی تیریت دلم دەردی نیەنم　　با پێستقبال توکربی لە دەر دا

دلیم وک قامت دلگیر بسروش　　اگر سیب و گل و سنبل ثمر دا

لە تیمی جور و بێ حدی ترحم　　دلرزی دل لحالاتی نظر دا

روانم بی نثاری برقی شمشیر

اگر بو کشتنی سالم خنجر دا

فلک رحمت لە دل سلبت مدرکا — بناغی پیتیم اگر زیروزبر کا

تماشی عشقی بی پرس لە لدا — دلی سینە پیپر بی وترکی سرکا

کە سلطانی خیالت بتنە خاطر — دلی شاهی حنرد میلی سفر کا

دلی بهرام گورە ترکی چاوت — لە دل بندیوە قطعە تیری خرکا

مطاعی جا بنە پاینداری عنبرت — اگر بوشاه رایی دل گذر کا

دنیمە ظرف خاطر با دولت — اگر طبعم تمنای گلشکر کا

پریشانم دکا وک ملکی شا — لفاتت پر حر کیسو کمر کا

حلالی کردم مردم دل العتبا — نظرکا غمزەت ائیمی پیدر کا

وصالت با بیعت الحبة المؤمن — لروتا کربلم شق القمر کا

دکا تسخیر دل چاوت بایما — سراسر اینی عظم کرلسبر کا

بدل و اکرو دل تیری لغمزت

لمهرو پشتی سالم سپر مدرکا

حکایتی خواجە طوطی دل بوری دامکم سودا — منطقی کچپی دی بدل تاونینیا

